ناوی کتێب: چەپکێك لە مێژووی کۆمەڵە

نووسینی: برایم جەلال

بابەت: لێکۆڵینەوە

تایپ: نازەنین هەواس ، شاناز رەمزی، کوردستان کەریم

تیراژ: ٢٠٠٠ دانە

ژمارەی سپاردن: (١٣٧٠) ی ساڵی ٢٠١١

دیزاینی بەرگ و ناوەڕۆك: هەرێم عوسمان

چاپ: چاپخانەی چوارچرا

چاپی دووەم: ٢٠١٢

# پێشکەشە

- بەهەردوو  برای شەهیدم خەلیل و هاوار
- بە شەهیدانی کوردستان
- بەمناڵەکان و خێزانەکەم

# سوپاس و پێزانین

- سوپاس و پێزانینی بێپایان بۆ ئەو کەسەی کە تەنها خۆم دەزانم چەند ماندو بووە.
- هەموو ئەوانەی هاوکاری و بەشداری ئەو کتێبەیان کردووە.

## پێرستی ناوەڕۆك:

[redacted]



[redacted]

[redacted]



[redacted]

[redacted]

[redacted]



[redacted]

[redacted]



[redacted]



[redacted]

# پێشەکی

**ئیبن خەلدون دەڵێ:**

**نوسەری مێژوو، ئەو کەسەیە کە لە نوسینی مێژوودا پەیڕەوی ئەم مەرجانەی خوارەوە دەکات:**

**- شارەزای سیاسەتی ئەو ماوەیە بێ ، کە مێژووەکەی دەنوسێ.**

**- شارەزای باروودۆخی دەوروبەری ئەو وولاتە بێ ، کە مێژووەکەی لەسەر دەنووسێ.**

**- بێ لایەنانە و نوسەری راستی رووداوەکان بێ.**

**- باش بە باش و خراپ بە خراپ هەڵسەنگێنێ.**

**- نەترس و خۆ بە بەرپرس بزانێ بەرامبەر مێژوو.**

**- هیوادارم خوێنەری بەڕێز لە خوێندنەوەی ئەم مێژووە کەم تەمەن و ناوەرۆك دەوڵەمەندەی کۆمەڵەدا، بگاتە سەر ئەنجامی سەلماندنی ئەو راستیەی کە:**

**کۆمەڵە: بەرپەرچدانەوەیەکی بابەتی و خۆیی باری دراوی خوارووی کوردستان بوو، بۆ ئەو بارودۆخەی ناوەڕاستی ساڵی ١٩٧٠ کە گەلی کوردی لەو پارچەیەی کوردستاندا تێ کەوتبوو. پاشماوەی شەڕی ناوخۆی نێوان جەلالی، مەلایی، گەمەی رژێمی بەعس لەگەڵ هەردوولا، کاریگەری پلانی نێودەوڵەتی لەسەر کێشەی کوردو دەستەوەستانی ئەو دوو لایە بەرامبەری ، دەست ڕۆیشتوویی دەرەبەگایەتی و بیری خێڵەکی لەلایەكو بۆرژوازی کوردی پاشکۆی بورژوازی رژێمی حوکم بە دەست لەگرتنی جڵەوی خەباتی گەلی کورددا، لەلایەکی تر ، پاشان بێ توانایی و رەدوو کەوتوویی حزبی شیوعی عراقی بۆ سیاسەتی سۆڤیەتی ئەوسای قەتیس ماوی نێوان بەرداشی شەڕی ساردا.**

کۆمەڵە، یەکەم ئەزموونی سەلماندنی بیری کوردستانی پێشکەوتووخوازی موتوربەکراو بە بیر و ئایدیای کرێکاران و ڕەنجدەران، دوور لە سیاسەتی بۆرژوازی کوردی پاشکۆی بۆرژوای حوکم بە دەست و بیری خێڵەکی خۆداسەپێنەر و ریفیزیۆنستی بوو، داهێنەری تێزی چارەسەری کێشەی رزگاری نیشتمانی و کێشەی چینایەتی بوو، بە رابەری کرێکاران و رەنجدەرانی کوردستان و بە بیروبۆچوون و تیۆری مارکسیزم لینینزمی گونجاو لەسەر مەیدانی کار (خوارووی کوردستان) بەپێی بارودۆخی دوای ساڵی ١٩٧٠- ١٩٧٥.

سەلمێنەری سەرکەوتنی بیر و تیۆری پشت بە خۆبەستن و باوەڕبوو بە سەرچاوەی لە بڕان نەهاتووی جەماوەری کوردستان و هاوکاری شۆڕشی رزگاریخوازی ناوچەکە و جیهان، پاراستنی سەربەخۆی سیاسی و رێکخراوەیی خۆی لە مەیدانی کارو بیرو تاکتیك و ستراتیژدا. هیوادارم خوێنەری بەڕێز لێم ببورن ، کە لە ناوەرۆکی ئەم مێژووە کورتەدا وەك پێویست باسی حزب و رێکخراوەکانی تری کوردستانم نەکرد بێ. لەبەر ئەوەی بابەتی ئەم مێژووە تایبەتە بە کۆمەڵە، نەك هیچ پارت و رێکخراوێکی تر، بۆیە بە پێویستم نەزانیوە تەنیا لەو شوێنەدا نەبێ ، کە پەیوەندیان بە مێژووی کۆمەڵەوە هەبێ باسیان بکەم ، و هەرگیز بەوە لێك نەدرێتەوە کە لە رۆڵ و رادەی تێکۆشان و دڵسۆزی و خەبات و قوربانیەکانیانم کەم کرد بێتەوە. بە پێچەوانەوە هەموو حزب و رێکخراوەکانی بەشدار بوو، لە شۆڕشی نوێدا لەگەڵ کۆمەڵەدا و کۆمەڵەش لەگەڵ ئەواندا تەواوکەری یەکتری بەردەوامی شۆڕشی نوێ بوون، بە هەموو هەڵە و کەم و کوڕی و مێژووە تاڵەکانیانەوە و بە هەموو سەروەری و سەرکەوتنەکان و ئامانجە پڕ شکۆکانیانەوە . جگە لەمەش شارەزاییەکی ئەوتۆی دیوی ناوەوەی ئەو حزب و رێکخراوانەی تر نیم.

هیوادارم گەر ناوی کەسایەتیەك بە باشە یا بە خراپە لێرەدا هاتبێ دڵرەنجاو نەبن و بە کای کۆن بە با کردنم بۆ لێك نەدەنەوە ، ئەمە مێژووە و مێژووش پێویستە ئاوێنەی راستیەکان بێ، دیارە رێگای (٢٢) بیست و دوو ساڵ تەمەنی خەباتی کۆمەڵەش وەك رێکخراوێکی چەپی پێشکەوتوخواز و شۆڕشگێڕ بە دەرنەبووە ، لە هەڵە و ململانێ و یەکگرتن ، لە نوچدان و سەرکەوتن ، لە گومرایی و خۆنەویستی . گەلێ هۆ هەبوون کە هانیان دام بە نوسینەوەی ئەم مێژووە هەستم، لەوانە شەهیدبوونی ژمارەیەك لە دەستەی دامەزرێنەرانی کۆمەڵە و بەرپرسیاران و شارەزایانی ناو کۆمەڵە ، دابرانی هەندێکی تر یان بۆ ماوەی چەند ساڵێك لە کۆمەڵە جا یان بە هۆی دوورکەوتنەوەیان بۆ دەرەوەی وڵات یا خۆکێشانەوەیان لە کۆمەڵە یا بەندبوونیان لە زیندانەکانی بەعسیەکاندا ، کە هەر یەك لەو هۆیانە دەبێتە مایەی دروستبوونی کەم و کوڕی لە مێژووی کۆمەڵەدا ، هۆیەکی تر ئەوەیە کە بەندە لە سەرەتای دامەزراندنی کۆمەڵەوە تا رۆژ و کاتی هەڵوەشاندنەوەی ، ئەندامێکی ملتزم و کارای ناو کۆمەڵە بووم . جا لە هەر ئاستێکی لێپرسراویدا بووبم ، ئاگاداری زۆربەی رووداوەکانی ناوەوەی بووم و بەشداری هەموو چاکە و خراپەکانیشیم و لە هیچی پەشیمان نیم و شانازیش بە هەموویەوە دەکەم . جگە لە هەڵوەشاندنەوەی ، کە بە گەورەترین هەڵەی مێژوویی شۆڕشی کورد و بەرپرسانی هەڵوەشاندنەوەی لە ناو کومەڵە و یەکێتیی نیشتمانیشیی دەزانم.

## " ئەبێ رابوردوو بووروژێنم  تا ئایندە بە ئاگا بێنم".

گەلی کورد لە خوارووی کوردستان دووچاری کێشەیەکی ناوخۆی بێ چارەسەر و ئایندە نادیار هاتبوو. شەڕی ناوخۆی نێوان هەردوو باسکەکەی پارتی دیموکراتی کوردستان (مەلایی، جەلالی) لە هەموو ڕوویەکەوە کاری کردبووە، سەر رەوتی بزاڤی کوردی ،وەك پەنجە شێر ئاوقای بالای کوردایەتی و خەباتی رزگاری نیشتمانی و کێشەی نەتەوەیی ببوو.

دەستە چیلەی ئاگری شەڕی ناوخۆش ئەو لاوە دڵ گەرم و کورد پەروەرانە بوون ، کە لە ڕیزەکانی هەردوو لادا دەستە بەندیان کرد بوو. چەندین خێزان لەناو خۆیاندا بوو بوونە دوو بەشی دژ بە یەك، دەیان برا و ئامۆزا و خزم و تەنانەت باوك و کوڕ دژی یەکتری سەنگەر بەندیان لێکتر کرد بوو.

سیاسەتمەداران و رۆشنبیرانی دەسەڵاتداری ریزەکانی هەردوولاش بۆ پاراستنی دەسەڵاتە تەسکەکانی حزبایەتی خۆیان، بە بیانوی بیرو بۆچون و رەوتی خەباتی راست ، گوایە شێوەی تێکۆشانی پڕ شکۆ و بە دروشمی بریقەداری کوردایەتی رەسەن و رەوتی پێشکەوتووخوازی، نەك هەر تەقەلایەکیان بۆ کۆتایی بەو شەڕە ناوخۆیە بە خەرج نەدەدا، بەڵکو هەر لایە دەیەویست پتر خۆی بەهێز کات و چەندی بۆی بکرێ هێزی جەماوەری خۆی پتر بکا و گورزی پشت شکێن لەوی تر بوەشێنێ . زۆرجار خوێنەری مێژوو لە مێژوونووس دەپرسێ و داوا دەکا، بەڵگە مێژووییەکان بۆ پشتیوانی لە نوسینی مێژووەکە کوا ؟ کامەیە ؟. بەڵگە مێژووییەکان کە تۆمار کراوە و وەك شایەتێك لە بەردەمی خوێنەراندا بێنە گوفتار گەر لە بلاوکراوەکانی حیزبەکان و وتاری سەرکردەکان و نوسین لە ڕۆژنامەکاندا هاتبن، پێم وایە پتر رەنگدانەوەی بیروبۆچوونی حزبەکان و سەرکردەکان و

نوسەری رۆژنامەکان خویانن . وەك لەوەی راستی نا و دەروونی جەماوەر و روداوەکان بن .

لە مێژووی شۆڕشی ئەیلول (١٩٦١ – ١٩٧٥) سەبارەت بە بارودۆخی ژانەکانی گەل و هەلومەرجی ئەوسای رەخسانی مەیدانی سەرهەڵدانی بیری چەپی کوردستانیم دیاری کردووە و پێویست بە دووبارە کردنەوەی ناکات.

بەلام راستیەکان ئەوە دەسەلمێنن کە زۆربەی هەرە زۆری گەلی خواروی کوردستان و بگرە جگە لە لایەنگرانی هەردوو باسکی جەلالی و مەلایی، سەرتاسەری جەماوەری کوردستان دژی شەڕی ناوخۆ بوون ، لەگەڵ هەڵسەنگاندنی هەردوو تای تەرازوی شەڕەکەدا کە بێ گومان لاسەنگ بوە و لایەکیان تاوانەکانی قورستر و لایەکیان سووکتر بووە.

لە هەمان بارودۆخی نا و ماڵی کوردستاندا هەل و مەرجێکی تر هەبوو ، کە زۆر کاریگەر بوو، بۆ سەر هەڵدانی بیری چەپی کوردستانی، ئەویش بارودۆخی دەسەڵات داسەپێنراوی بەعسەکانی عیراق بوو، بەسەر گەلانی عیراقدا ، و مامەڵەی لە تەك کێشەی کورد و چۆنیەتی چارە سەرکردنیدا.

# بەشی یەکەم.
# ژانەکانی گەل و لە دایکبوونی کۆمەڵە.

**ا ـ ١. کێشەی نێوان دوو باسکەکەی پارتی (جەلالی ـ مەلایی) .**

هەر وەك لە هەردوو بەشەکەی کتێبی (خوارووی کوردستان و شۆڕشی ئەیلول) بە درێژی باسی ئەو دوو لایەنە و کاریگەری باش و خراپیان لەسەر ڕەوتی بزافی کورد و ئایندەی تێکۆشانی گەلدا کراوە، هەمەلایەنە هەڵسەنگێندراون، و تا ڕادەیەکیش باس لە کاریگەری بارودۆخەکە لەسەر سەرهەڵدانی بیرۆکەی چەپی کوردستانی کراوە،

هەر لە سەرەتای ساڵی ١٩٦٨ وە، گەرمەی شەڕ و پێکدادانی ئەو دوو باسکە و لە هەمانکاتیش ساڵی ترۆپکی بێزاری ڕۆشنبیران و کوردپەروەران و چەپخوازانی کوردستانی بوو، لە باروو دۆخەکە و هەردوو باسکەکە . بیری چەپی کوردستانی سەری هەڵدا و بە شێوازی جیاجیا لاوانی خوێن گەرم و کوردستانی پێشکەوتوخواز لەلایەك و لەلایەکی تریشەوە هەندێ لە سیاسیە خاوەن ئەزمون و خاوەن کەسایەتی و سیاسی و نیشتمانپەروەر کەوتنە دەستپێکردنی خۆپەروەردەکردن و خەڵك پەروەردە کردنیش بە بیری کوردستانی پێشکەوتوو خوازی و مارکسیزم - لینینیزم - و بیری ماوتسی تونگ.

بەکرەجۆ، لەگەڵ ئەوەی بنکە و بارەگای سەرەکی سەرانی باسکی (جەلالی) بوو، مەڵبەندی کێشانی نەخشە و پلانی خۆشکردنی شەڕی ناوخۆیی لایەنێکی شەڕەکە بوو، بەلام لە هەمان کاتیشا بوو بوو ، بە بنکەیەکی دالدەی کەسایەتیە شۆڕشگێڕەکانی ئێرانی و کوردی ڕۆژهەلاتی کوردستان کە زۆربەیان هەلگرانی بیری چەپ و کەسایەتی ناو حزبە چەپە جیاجیاکانی ئێرانی بوون، ئەوانە کاریگەرییەکی زۆریان هەبوو لەسەر لاوە چەپەکانی ئەو باسکە و پەیدابوونی

بـرەوی چـەپی کوردسـتانی و بـیری مارکسیزم ـ و بـیری ماوتـسی تـونگ . ئەمـە ڕاستیەکە و ناشاردرێتەوە ، لە مێژووی خەباتی گەلی کورد دا لە خوارووی کوردستان و سەرهەڵدانی بیری چەپی کوردستانی و پاشان لە دایکبوونی کۆمەڵە. بـەڵام ئـەو ڕاسـتیەش ناشـاردرێتەوە کـە بـەکرەجۆ نـە بنکـەی سـور و نـە مەڵبەنـدی پێشکەوتنخوازی و نەقوتابخانەی پەروەردەکردنی جـەماوەر بـە ئایـدیای مارکسیزم - لینینیزم نەبوو، بە مەبەستی نەهێـشتنی شـەڕی نـاوخۆ و لـە بەریـەك هەڵوەشـاندنی ڕابەرایەتی خێڵەکی و بۆرژوازی و پاشکۆی بۆرژوای نەتەوەی سـەر دەسـتە و حـوکم بە دەستی ڕەفتار فاشی بەعس.

لەناو ئەو کەسایەتیە ئێرانی و کوردیانە دا، کەسایەتیەکانی وەك: (ئیرەجـی کـشکولی ، خسرەوی سەفایی ، مراد ،سەفا و سیاسەتمەداری هۆشمەند و خاوەن بیر و هوشیار "کروش لاشایی"* بوو، نازناوەکەی دکتـۆر جـەلال بـوو.ئـەم پیـاوە هـەڵگری بـیری چـەپ بـوو، یـەکێك بوو،لـە سـەرکردەکانی " سـازمانی أنقلابـی إیـران " کـە دواتـر ناوەکـەیان بـوو ، بـە حزبـی زەحەتکێـشانی ئـیران . دکتـۆر جـەلان یـەکێك بـوو، لـە توندڕۆکانی (حزبی تودە) ی ئێران ، کە پەیڕەوانی خەتی سۆڤیەتی بوون، پاشـان لـە سـاڵی ١٩٦٥ لەبـەر بـێ بڕوایـی بـەو ڕێبـازە و کارتێکـەری سیاسـەتی چـین و بـیری ماوتسی تونگ ، لەگەڵ چەند هاوڕێیەکیدا لە حزبـی تـودە جیابونـەوە و ڕێکخراوێکـی چـەپیان بـە نـاوی (سـازمانی أنقلابـی ایـران)، واتـە ڕێکخـراوی شۆڕشـگێڕی ئـیران دامەزراند.

دکتۆر جەلال پەیوەندیەکی توندی لەگەڵ جەلال تاڵەبانی دا هەبوو ، توانی کاریگـەری لەسەری هەبێ و بە جەلال تاڵەبانی بسەلمێنێ ، کە خوارووی کوردستان پێویستی بـە

---

ئەم پیاوە دوای ماوەیەك بە دزییەوە لە سنوری کوردستانەوە گەڕایەوە ئیران و چووە تاران ، تا بە نهێنـی کار بکا. بەڵام لەلایەن ساواکەوە گیرا و لەسەر تەلەفزیۆن دانی بە خـۆی و هـەموو دەسراوەکانی حزبەکـەی دانا و لە ژیانی سیاسەتدا کوژایەوە.

ڕێکخراوێکی چەپی (م.ل) هەیە کە موتوربەکراو بێ بە بیروڕای ماوتسی تونگ ، لە هەمان کاتیشدا کاری دەکرد بۆ برەودان بە ئەزموونی چین و لێك چواندنی چین و کوردستان لە چەندین ڕووەوە.

کاریگەری د. جەلال لەسەر جەلال تاڵەبانی و پەیوەندی توندی جەلال تاڵەبانیش بەلاوە خوین گەرم و هوشیارەکانی باسکی جەلالی و بڕوابوونی تەواویشی بە ئەزمونی چین و دیموکراسی گەلی شۆڕشی چین، بووە هۆی سەرهەڵدانی بیری چەپی (م.ل) بیروباوەڕی ماوتسی تونگ لەناو لاوەکانی سەر بەو باسکە.

دکتۆر جەلال پێی وابوو، کە خوارووی کوردستان زەمینەیەکی لە باری لە دایکبوونی ڕێکخراوێکی چەپی سەر بە بیری ماوە، بە مەرجێ لە دوو لاوە کاری بۆ بکرێ.

أ- کار بکرێ بۆ پێکهێنانی هۆیەکی ڕاگەیاندن جا ڕۆژنامە یا مانگنامە یا وەرزنامە بێت ، ببێتە مینبەری بڵاوکردنەوەی ئەو بۆچون و بیروباوەڕ و هێڵە.

ب - وردە وردە ئەڵقەی بچوك بچوکی ڕۆشنبیری پێك بهێنرێ، تا ببێتە ناوکی دروستکردنی ڕێکخراوێکی چەپی سەر بە بیری ماوتسی تونگ.

مام جەلال قۆڵی لێ هەڵماڵی و کەوتە پەیوەندی و کارکردن لەناو کەسانی هوشیار و ڕۆشنبیرەکانی ئەوسای باسکی جەلالی لەلایەك و لەلایەکی تریشەوە هەستا بە دەرکردنی گۆڤاری (رزگاری) لە ١٩٦٩ دا کە لە چاپخانەی شۆڕش لە بەغداد چاپ دەکرا.

بوونی بەکرەجۆ بە مەڵبەندی داڵدەی کەسایەتی ڕێکخراوە چەپەکانی ئێرانی "لەبەر پەرۆشی بۆ عەلی نەبوو، بەڵکو بۆ هەریسە بوو".

* پارتی باسکی (مەلایی) تا ناوچەوانی لە پاشکۆیەتی سیاسەتی حوکمی ئێراندا نقوم ببوو ، تا ئەو ڕادەیەی کە ببوو بەپارێزەری ئاسایشی سنوری ئێران و عیراق و زامنکەری هێمنی و ئارامی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بۆ فەرمانڕەوایی شای ئێرانی، و ببووە بەشێك لە هێزی چەکداری محەمەد ڕەزا شا بۆ پاراستنی ئارامی ناو ئەو

بەشەی کوردستان، لەلایەکی تریشەوە ببوون، بە ڕاوکەری کەسایەتیە کوردی و ئێرانیە شۆڕشگێڕەکان چ لەسەران و ئەندامانی حزبی دیموکرات و چ لە ئەندامان و سەرانی سازمانی أنقلابی ئێران ، کە لە دواییدا بوونە سازمانی زەحمەتکێشانی ئێران.

* پارتی باسکی (جەلالی) کە ئەمانیش نقومی پاشکۆیەتی سیاسەتی حوکمی بەعس ببوون و ببوونە بەشێك لە هێزی چەکداری بەعسیەکان بۆ لێدانی باسکی مەلایی و بەرژەوەندی شای ئێرانی لە ناوچەکە، بێ شك دەبوونە مەڵبەندی داڵدەی تێکۆشەرانی ئێرانی لەبەر ئەم دوو هۆ گرنگە.

١- دوژمنی دوژمنم دۆستمە.

٢ـ بۆ بە بەرداکردنی بەرگی پێشکەوتووخوازی و نوێخوازی بە تان و پۆی باسکەکەیاندا و هەڵفریواندنی جەماوەری زۆری ڕۆشنبیران بەو ناوەوە.

بەڵگەی ئەو ڕاستیەش ناوەرۆکی نوسینەکانی ناو ڕۆژنامەی (رزگاری) بوو،کە زۆربەی نوسەرانی لە کەسایەتی ناسراوی ناو باسکی (جەلالی) بوون و ڕۆژنامەکە ببووە مینبەری بڵاوکردنەوەی بیری چەپ و پێشکەوتووخوازی. سەرهەڵدانی ئەو بیرۆکەیە لە ناو باسکی جەلالیدا بووە مایەی خەملاندنی لایەنێکی چەپی بیر پێشکەوتووی کوردستانی لەناو ئەو باسکەدا و پاشان هەوڵدان بۆ کنەکردن و بنکۆڵکردنی ئەو باسکە و خورت بوونی ئەو بنەما چەپە، کە لە ئایندەدا لە کۆنگرەی جەلالی ساڵی ١٩٧٠ گەورەترین ڕۆڵیان لە هەڵوەشاندنەوەی ڕێکخراوەیی و چەکداری ئەو باسکەدا بینی و بوونە لایەنێکی دامەزرێنەرانی کۆمەڵە.

## ١ـ ٢. حزبی شیوعی عراقی و بۆچوونی لەسەر کێشەی کورد.

حزبی شیوعی عیراقی لەو کاتەدا واتە لە بارودۆخی سەرهەڵدانی بیری چەپی کوردستانی و هەوڵدان بۆ لە دایکبوونی ڕێکخراوێکی چەپی کوردستانی، دوو بەش بوون بەشێکیان بە ناوی "قیادەی مەرکەزی"، و بەشێکی تریان بەناوی "لیژنەی مەرکەزی".ئەمانیش وەك دوو باسکەکەی پارتی ببوونە پاشکۆی دوو لایەنی دوور لە شیوعیەت مارکسیزم و بگرە بەدەر لە سادەترین شێوەی چەپخوازی.لایەکیان تا تەوقی سەر خۆیان گرێدا بوو بە سیاسەت و رابەرایەتی خێڵەکی پارتی باسکی "مەلایی" و لایەکیشیان بە سیاسەتی پارتی فەرمانڕەوای حزبی بەعس.

رۆشنبیران و نوێخوازان و چەپخوازانی کوردستانیش ، هەروەك چۆن رووناکایی و تروسکەیەکی هیوای سەرکەوتنیان لە هەردوو باسکی "مەلایی ـ جەلالی"دا، نە دەدیت هەر واش هیچ تروسکاییەکیان لەو دوو باسکەی حزبی شیوعی عیراقیشدا نە دەدیت هەر بۆیەش ئەو نوێخوازانە پێیان وابوو، کە دەبێ هەوڵی پێکهێنانی ڕێکخراوێ بدەن ، کە بەدەر لەپاڵەپەستۆ و کارتێکەری هەر چوار باسکەکە "مەلایی ـ جەلالی ـ قیادە ـ لیژنە مەرکەزی" بێ و بتوانێ خوارووی کوردستان و شۆڕشەکەی و کێشەکەی لەو گێژاوە رزگار کات.

هەر بۆیەش لەناو ئەو دوو باسکەی حزبی شیوعیشدا هەندێ کادر و ئەندام و کەسانی رۆشنبیر کەوتنە هەوڵدان و بیرکردنەوە لەپێکهێنانی ڕێکخراوێکی چەپی بە دەر لەسیاسەتی هەردوو بەشەکەی حزبی شیوعی عراقی.ئەمانیش لە دوا جاردا بوونە لایـــــــــــــەنێکی دامەزرێنـــــــــــــــــــەرانی کۆمەڵـــــــــــــــــــە.

بۆچوونی ئەوسای حزبی شیوعی عیراقی لەسەر مەسەلەی کورد و کێشەی کورد، بۆچوونێکی سەقامگیر و نەگۆڕ و روون و ئاشکرا نەبوو؛ بەڵکو پابەندی هەڵوێست و بۆچوونی سۆڤیەت بوو، لەسەر کێشەی کورد، هەر بۆیەش هەرکات نێوانی عیراق و سۆڤیەت خراپ بوایە، لایەنگری شۆڕش و دژی هەموو جۆرە گفتوگۆ و دانوستاندنێك بوون لەگەڵ عیراق و داوای چەندین خواستی پتر لە داخوازی هەردوو باسکەکەیان

دەکرد. هەر کاتێکیش نێوان سۆڤیەت و عیراق باش بوایە، دەکەوتنە تەقەللادان لەگەڵ بارزانی بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ رژێمی عیراقی و کارئاسانی کردن بۆ گەیشتنە ئەنجام و دەسهەڵگرتن لە چەندین خواستی سەرەکی بە ناوی (شروت تعجیزیە) بەم جۆرە هەڵوێست و جێگۆڕکەیە لە بڕیاردا، گەلی کوردستان هیچ هیوایەکیان بە مانیش نەما بوو.

## ١ـ ٣ سەرهەڵدانی بیری چەپی نەتەوەیی و کوردستانی.

نەبوونی رێکخراوێکی چەپی کوردستانی، و بگرە سەپاندنی بیرۆکەی نەگونجانی رێکخراوێکی چەپی کوردستانی بە بیانووی نەگونجاوی (م. ل) و هەستی نەتەوەیی پێکەوە، لەلایەك، و لەلایەکی ترەوە پەرەسەندنی دیاردەی خۆپەروەردەکردنی لاوان و رۆشنبیرانی کورد بە ئایدیۆلۆژیای م.ل و بیری ماوتسی تۆنگ و تێکەلکردنی بە هەست و بیری کوردستانی بە پێی بارودۆخی ئەوسا ، فاکتەرێکی زۆر کاریگەر بوو ، بۆ ئەوانەی خواستیاری رێکخراوێکی لەو جۆرە بن ، هەڵسن بە گەڵاڵەکردنی کۆمەڵێکی لەو جۆرە، لەلایەکی ترەوە بارودۆخە جیهانیەکە و گەشەسەندن و بەهێزبوونی هێزی چەپ و رزگاریخوازی جیهانی لە وولاتانی ژێر دەستە و چەوساوەی ئەمریکای لاتین و ئەوروپا و ئەفریقا و ئاسیادا، و کاریگەری ڕاستەوخۆ و نا ڕاستەوخۆیان لەسەر برەو پەیدابوونی بیری چەپ و (م. ل) هەبوو لەناو دەستەی رۆشنبیران و لاوان و کرێکارانی کورددا.

لەو کاتەدا شۆڕشی " ڤێتنام ،لاوس ، ئەنگۆلا، کینیا، موزامبیق، نامیبیا، کامبۆدیا، فەلەستین، ئیرلاندا، ئەریتریا، زەفارو...هتد".لەپێناو رزگاری و ئازادی و سەرفرازیدا، و سەرکەوتنی چەندین شۆڕش و بزوتنەوەی رزگاریخوازی تر کە هێزی سەرەکی لەر ابەرایەتیکردنیان هێزی چەپ و رێکخراوی پارتی کرێکاری و رەنجدەران بوو لە ئارادا بوون.

دیسانەوە ناکۆکی و ململانێ توندی ئایدۆلۆژی نێوان هەردوو ئۆردووگا گەورەکەی شیوعی سۆڤیەت و چین لەلایەك و لەلایەکی ترەوە پەیدابوونی چەندین هێڵی چەپی جیهانی جیاجیا و هەموشیان بە ناوی (م. ل ی راستەقینەوە) وەك:

- هێڵی کۆری" کیم ئیل سۆنگ،" .
- هێڵی ئەلبانی "ئەنوەر خۆجە" .

ئەمانە هەمووی ، زەمان و زەمینی لە باری گەشەکردنی چەند دەستەیەکی چەپی کوردستانی بوون ، لە دواییدا هەموویان پێکەوە بوونە هەوێنی لە دایکبوونی کۆمەڵە.

## ١ـ ٤. بارودۆخی ئەوسای عێراق و حوکمڕانی بەعسیەکان .

بەعسیەکان هەر لەوکاتەدا حوکمیان گرتە دەست لە ١٩٦٨/٧/١٧ دا، بەعس ئەمجارە، بە پیلان و بەکارهێنانی چەند دەسەڵاتدارێکی ناو سوپا و بە ئەزموونێکی نوێ و پتر لە کودەتای شوبات دەستیان بەسەر حوکمدا گرت. بەپێچەوانەی ساڵی ١٩٦٣ ئەمجارە بە درێژەدان بە پەیوەندی باش لەگەڵ جەلالی و کردنەوەی دەرگای گفتوگۆ لەگەڵ مەلایی مامەڵەیان لە تەك کێشەی کورد و ناوخۆی عێراقدا کرد.لەسەر ئاستی سیاسەتی دەرەوەیان پەیوەندی خۆیان لەگەڵ سۆڤیەت و ئۆردوگای بە ناو سۆسیالیستی باشتر کرد.

ئەمجارەیان بەعس نەخشەیەکی درێژخایەنیان بۆ لێدان و لەناوبردنی بزاڤی رزگاریخوازی کورد دارشت ، کە لە کتێبی (خوارووی کوردستان و شۆڕشی ئەیلول) بە درێژیو تێر و تەسەلی باسم کردوون و دووپات کردنەوەیان لێرەدا بە پێویست نازانم.

بیری چەپو دەستە چەپەکانی کوردستانی بە شیکردنەوەی شوناسنامەی چینایەتی پارتی بەعسیان و هەڵسەنگاندنی ئایدۆلۆژیای ناسیۆنالیستی شۆڤینیتی پان عەرەبیان و سروشتی خۆرسکی چاوچنۆکی چینایەتیان ، لەوە گەیشتبوون کە هەرگیز رۆژێ لە رۆژان بۆرژوای بیرۆکراتی نەتەوەی سەر دەستە لە وڵاتێکی فرەنەتەوەیی وەك عێراقدا، کە دەستی بەسەر حوکمدا گرت و هەموو شادەمارەکانی

ئابوری وڵات و بەڕێوەبردنی سیاسەتی ووڵاتی کەوتە ژێردەست و پایەی دەسەڵاتی میلیتاری خۆی لەناو سوپادا قایمکرد، نە مل بۆ چارەسەرکردنی کێشەی ڕەوا و ڕزگاریخوازی کورد دەدا و نە ڕێگەش بە هیچ هێز و حزب و تاقمێکی تر دەدا، سەر بەرزکاتەوە و نە بڕواشی بە هیچ جۆرێك داننان بە بچوکترین بنەمای دیموکراسی دەبێ. بەڵکو بە پێچەوانەوە لە پارتێکی بۆرژوازی بچوکی شۆڕشگێڕەوە دەبێتە پارتێکی بۆرژوای بیرۆکراتی شۆڤینی ناسیۆنالیست و هەڵخلیسکا و بەرەو دکتاتۆریەت و توتالیتری و میلیتاریزمی لە هاوشانی فاشیزم و نازیسمی پێشینیان بۆ بارودۆخەکە، هەڵمسان و پەرەسەندنی مەترسی دەسەڵاتی بەعسیەکان و پەککەوتەیی و گەندەلی و بێ توانایی هەردوو باسکی جەلالی و مەلایی.

# بەشی دووەم:
# کۆمەڵە لە" ١٩٧٠" وە تا ناوەڕاستی ساڵی "١٩٧٦" .

## ٢ـ ١. لە دایك بوونی کۆمەڵـەی مارکسی ـ لینینـی ـ کوردسـتان بیروبـاوەڕی ماوتـسی تۆنگ.

دوای بـەیانی ١١ ی ئـاداری ١٩٧٠ و لـەو کاتـەی کـە باسـکی جـەلالی نـوقمی بێهۆشـی تێکشکانە سیاسی و چەکداریەکەیان ببـوون و باسـکی مـەلایش مەسـتی سـەرکەوتنی رووکەشی بەیانی ئادار ببوون و رژێمـی بەعسیش لـە هـەوای بـە دەسـتهێنانی یەکـەم هـەنگاوی سـەرکەوتنی سیاسـەتە سـتراتیژیەکەی خـۆی دا بـوو ، بـۆ هەڵتەکانـدنی شۆرشی کورد، دەستە بیر پێشکەوتوو چەپەکانی خەملّیوی بارودۆخە مێژووییەکە لـە ١٩٧٠/٦/١٠ *دا بــە کۆبونەوەیــەکی هەمەلایــەنی یــەکبونی خۆیــان و پێکهێنــانی رێکخراوێکی چەپی کوردسـتانیان بـە نـاوی (کۆمەڵـەی مارکسی ـ لینینـی کوردسـتان بیری ماوتسی تۆنگ) راگەیاند .

کۆمەڵە لە سێ دەستەی بە شـێوە لـە یـەك جـوداو بـە نـاوەرۆك لێـك نزیـك پێکهـات، دەســتەیەکیان بــە نوێنەرایــەتی شــەهیدی ســەرکردە شــەهاب شــێخ نــوری، و دەستەیەکیان بـە نوێنەرایـەتی مـام جـەلال و دەسـتەی سـێهەمیش بـە نوێنەرایـەتی نەوشیروان مستەفا و هاورێکانیان.

ئەم سێ دەستەیە خاڵەکانی یەکانگیریان پتر بوو، لـە خاڵـە جیاوازەکـان ، هـەر بۆیـە لەسەر بەرنامەیەکی کاتی وەك پەیرەوێك رێکەوتن ، کـە کۆمەڵـە کـاری لەسـەر بکـا و پەیرەی بکـات. هـەر لـەو کۆبونەوەیـەی یەکگرتنەشدا، بڕیاریانـدا کـە بـەردەوام بـن

---

*دیسان صلاح خەرسان لە کتێبەکەیدا"التیارات السیاسیە فی کردستان العراق"لاپـەرە ٣٢٨ مێـژووی لـە دایك بوونی کۆمەلەی بە ١٩٧٠/٧/١٠ دیاری کردووە،کە راسیەکەی ١٩٧٠/٦/١٠

لەسەر تاوتوێکردنی خاڵە جیاوازەکان. ئەوەندەی من لە دەمی هەندێ لەو هاوڕێیانەی بەشداری کۆبوونەوەی دامەزراندنی کۆمەڵە بوون‌و بۆیان باس کردووم،* خاڵەکانی جیاواز لە نێوان ئەو سێ دەستەیەدا، ئەم خاڵانەی خوارەوە بوون:

**١ـ کەسانێك لە دەستەکەی مام جەلال وەك " فواد شێخ ئەنوەر، ئەشرەف شێخ شەرەف، خوالێخۆشبوو فازیل مەلا مەحمود "خاوەنی ئەو بیرە بوون ، کە هەوڵ بدرێ کۆمەڵە بکرێ بە عراقی و ببێتە ئەلتەرناتیفی حزبی شیوعی عیراقی.لە کاتێکدا کە هەردوو دەستەکەی تر دژی ئەو بیروڕایە بوون. بەلام دژی ئەوە نەبوون، کە لەناو کۆمەڵەدا ئەو بۆچوونە تاوتوێ بکرێ و مشتومڕی لەسەر بکرێ.**

**٢ـ رایەك هەبوو،کە پێویستە سەرکردایەتی کۆمەڵەی پێکهاتوو لە دەستەی دامەزرێنەران بە کۆمەڵێ بێ ، تا گرتنی کۆنفرانس یا کۆنگرەیەك و ئەوسا بە هەڵبژاردن سکرتێر هەڵبژێردرێ . بەلام رایەکی دژ بەوە هەبوو،کە پێویستە هەر لە یەکەم بەیانی راگەیاندنی دامەزراندنی کۆمەڵەوە، کۆمەڵە سکرتێری هەبێ و لەناو دەستەی دامەزرێنەردا هەڵبژێردرێ، خاوەنی ئەم رایە دەستەکەی مام جەلال بوون و دەیانویست مام جەلال سکرتێری کۆمەڵە بێت.**

**٣ـ ئامادە نەبوونی نەوشیروان مستەفا بۆ کارکردن لە ڕێکخراوێکدا کە (مام جەلال) ی تیا بێت. لەبەر ئەوەی رای وابوو، کە مام جەلال لەهەر رێکخستنێکدا بێت رێگە بە کار و بیروڕا و بڕیاری بە کۆمەڵە نادات. ئەنجام بە گشتی لەسەر پەیڕەوێکی ناوخۆ و کە بە دەستوری کومەڵە ناوبراو و چەند خالێکی تری هاوبەش**
**رێکەوتن و بانگەشەی دامەزراندنی کۆمەڵەیان بە شێوەی نهێنی و بە بەیانێك راگەیاند.**

---

*فەرەیدون قادر لە ساڵی ١٩٧٠ لەشاری بەغدا، شەهید شە هاب لە ساڵی ١٩٧٤ لەشاری کەرکوك، نەوشیروان مستەفا لە ساڵی ١٩٧٨ لە ناوزەنگ .

## هەندێ لە بڕیارەکانی دەستەی دامەزرێنەر:

١- بڕوابوون و کارکردن بە سەرەتای سەرکردایەتی بە کۆمەڵ و بڕیاری بە کۆمەڵ و کاری بە کۆمەڵ.

٢- رەتکردنەوە و پەسەندنەکردن و کار نەکردن بە بڕیاری تاکی.

٣- سەرکردایەتی بە کۆمەڵیەوە بەپێی بارودۆخ سکرتێر بۆ ماوەیەك دیاری دەکرێت و دەبێ تا هەڵکەوتنی بارودۆخی گونجاو بۆ هەڵبژاردنی سەرکردایەتی و سکرتێر بە دەنگدانێکی ئازاد و دیموکراتیانە لە کۆنفرانس یا کۆنگرەیەکدا.

٤- هیچ جۆرە بڕیارێکی تاکی یا کەمایەتی، نا سەپێنرێ و بڕیاری سەرکەوتو هی زۆربەیە.

٥- کاری رێکخستن و رێکخراوەیی بە نهێنی دەکرێ و شێوەی پەیوەندی نهێنی دەبێ.

٦- ئامانجی سەرەکی و ستراتیژی کۆمەڵە خەبات دەبێ ، بۆ بەرپاکردنی شۆڕشی رزگاری نیشتمانی و سەرکردایەتیکردنی خەباتی قۆناغی رزگاری نیشتمانی و بە دەستهێنانی مافی چارەنووس بۆ گەلی کورد.

٧- دەست نەخستنە کاروباری سیاسی و رێکخراوەیی پارچەکانی تری کوردستان و رێگرتن لەسەر هەڵدانی بیری داسەپاندن و بەزینی سنوری کاری بە کۆمەڵی بوو.

## بەم جۆرە سەرکردایەتی کۆمەڵە پێکهات لە :[1]

---

*[1] صلاح خرسان لە کتێبی (التيارات السياسيه فى كردستان العراق) و بە یارمەتی ومەعلوماتی عادل مراد،سەبارەت بە پێکهاتەی کۆمەڵە نوسیویەتی کە لە چوار هێل پێك هاتوون:-

١-هێلی جەلال تاڵەبانی

٢-هێلی شێخ شەهاب

٣-هێلی نەوشیروان

٤- هێلی فەریدون عبدالقادر

حەوت ئەندام کە بریتی بوون لە:

١ـ جەلال تاڵەبانی.وەك (سکرتێر).

٢–شەهاب شێخ نوری وەك (جێگر).

٣. نەوشیروان مستەفا ( ئەندام).

٤. جەعفەر عبدولواحید (ئەندامو لێپرسراوی هەولێر).

٥. فەریدون عەبدولقادر ( ئەندامو لێپرسراوی کەرکوك).

٦. ئاوات عبدولغفور ( ئەندامو لێپرسراوی سلێمانی).

٧. محەمەد میرزا سەعید ملا عەباس ( ئەندام و لێپرسراوی بەغداد).

٨. ئەرسەلان بایز*( ئەندامی سەرکردایەتی) بووە.

---

بەلام راستیەکەی لە "٣" هێل پێکهاتبوو،چونکە فەریدون خۆی لە هێلی شێخ شەهاب بوو.

واتە هێلی:

١– شێخ شەهاب

٢– جەلال تاڵەبانی

٣– نەوشیروان مستەفا

هێلی شەهید شەهاب بریتی بوون لە:" شێخ شەهاب شێخ نوری ، فەریدون عەبدولقادر،محەمەد میرزا سەعید،جەعفەر عبد ولواحید ، ئاوات عبدولغفور "

هێلی جەلال تاڵەبانی بریتی بوون لە: "جەلال تاڵەبانی ، فواد شێخ ئەنوەر، ئەشرەف شێخ شرف ، فازل مەلا مەحمود"

هێلی نەوشیروان بریتی بوون لە: " نەوشیروان مستەفا ، شازاد سائیب ، رفعت مەلا مەحمود ، مەحمود مەلا عزەت"

سەرچاوە: صلاح خرسان لاپەرە (٣٢٨).

---

*لە (کتێبی التيارات السياسيه فی کردستان العراق (صلاح خرسان) ل ٣٢٩ وەرگیراوە وهاتووە.

بەلام راستیەکی وایە کە ئەرسەلان بایز هەرگیز لە سەرکردایەتی کۆمەڵەدا نەبوە، تا پاش هەلگیرساندنی شۆرشی نوێ.

جەلال تالەبانیش کەهەر لەسەرەتاوە خاوەنی ئەو بۆچوونە بوو، کە بۆ قۆناغی پاش بەیانی ١١ ئادار خەباتی گەلی کورد پێویستی بە بوونی دوو رێکخراوی "بۆرژوازی ئاشکراو، مارکسی نهێنیە"، بۆیە هیچ بەشداریەکی لە سەرکردایەتی کۆمەڵەدا نەکرد. بەلکو سەرپەرشتی پارتی شۆرشگێری کوردستانی دەکرد، لە کۆنگرەی (٨) هەشتدا بریاری لەسەر درا و پاشانیش هەلوەشایەوە و دواجار" ستار تایەر شەریف" بووە میراتگری ئەو حزبە کارتۆنیە.

نەوشیروان مستەفاش پاش تەقینەوەی نارنجۆکەکەی دواناوەندی کوردستانی کچان لە سلێمانی بریاری گرتنی دەرچوو، ماوەیەك لە شارەزوور خۆی شاردەوە و ماوەیەك لە قەسری لای بارزانی و پاشان چوو بۆ دەرەوە و هیچ پەیوەندییەکی بە کۆمەڵەوە نەما.

## ٢ـ ٢. پەیرەوی کۆمەڵە و ئۆرگانی ناوەندی کۆمەڵە.

کۆمەڵە پەیرەوێکی کاتی ناوخۆی هەبوو، کە مارکسیزم ـ لینینزم و بیری ماوتسی تونگ دەنگی دابۆوە،لەناویا و لەناوەرۆکیشدا. پەیرەوەکە بریتی بوو، لەپێشەکیەکی کورت سەبارەت بە بارودۆخی کوردستان و عیراق و ناوچەکە و پێداویستی لە دایکبوونی رێکخراوێکی چەپی کوردستانی لەوجۆرە، پاشان ناوی کۆمەڵە و شێوەی رێبازەکەی کە پەیرەوکردنی مارکسیزم ـ لینینیزم ـ بیرو باوەری ماوتسی تۆنگ بوو، و ئامانج و ستراتیژی کۆمەڵە.

وەك:

- **چۆنیەتی بوون بە ئەندام ومەرجەکانی ئەندامەتی.**
- **ئەرك و فرمانەکانی ئەندام پاشان مافەکانی ئەندام.**

**- شێوەی کاری کۆمەڵە و ئۆرگانەکانی.**

پرەنسیپەکانی رێکخستن و رێکخراوەیی ناوکۆمەڵە، کە لە هەموویان دیارتر و رونتریان ناوەندێتی دیموکراتی بوو. بوون بە ئەندام لە کۆمەڵەدا زۆر سەخت بوو، کە لە پێشا دەبوایە تاقی بکرایەتەوە و پاشان بخرایەتە ناو بازنەیەکی پەروەردەیی و رۆشنبیری و بابەتەکانی خۆپەروەردەکردن و رۆشنبیری بریتی بوون، لە فێربوونی سەرەتایەك لەسەر مەتریالیزم و دیالەکتێك و میتافیزیك و چونیەتی سەرهەڵدانی فەلسەفەی میتافیزیکی و پاشان مەتەریالیزمی و رێچکەکانیان، وپتر بۆ ئەم بابەتە، سەرچاوەکانی مارکس و ئەنگلز و هیگل و فیئورباخ و چی تر دەسکەوتبانە و پاشان سەرچاوەکانی مارکسیزم ـ لینینیزم لەسەر مەسەلەی چینایەتی و نەتەوایەتی و سیاسەت و دەسەڵات و بەرێوەبردن دەخوێنران و بەکاردەهێنران. سەرچاوەکانی ماوتسی تونگ لەسەر دیموکراتی نوێ، شۆرشی درێژخایەن، ناکۆکی ، دەسەڵاتی گەل، شارەزایی پەیداکردن لەسەر شۆرشی چین و ئەزمونەکانی ئەو شۆرشە، پەیداکردنی شارەزایی لەسەر مێژوو ئەدەبی کورد و کوردستان،و کێشەی نەتەوایەتی، هەڵکەوتەی جیۆپۆلۆتیکی،و کێشەی چینایەتی و شوێن و سەنگەری کرێکاران و سەنگیان و رادەی دروستبوون و گەشەکردنیان، لەناو پەیرەوەکەدا دیاریکرا بوو ، کە: ئەم خاڵانەی خوارەوە تەنیا لەکاتی کونفرانس یا کۆنگرە دەگۆردرێ.

**١- ناوی کۆمەڵە.**

**٢- رێبازی کۆمەڵە.**

**٣- سەرکردایەتی کۆمەڵە مەگەر مەرجەکانی سەرکردایەتی لەدەسدا، یان لەبەندیخانە ئیعتراف بکات یان شەهید بێ یان بە کۆبونەوەیەکی فراوان کە ٢/٣ ئەندامانی بەشداربن.**

لەناو کۆمەڵەدا ڕێکخستن زۆر سەخت بوو، دەبوایە ئەندامێك کەسێك رەچاو بکات بۆ ڕێکخستنی لەدوای رەچاوکردن و بڕینی ماوەی بازنەی ڕۆشنبیری ئەوسا دەکرایە ئەندام و ئەرکی خۆپەروەردەکردنەکەی گرانتر و ئەرکی ڕێکخراوەیشی پتر دەبوو.زۆرجار کە ڕەچاوکراوەکە لەلایەن یەکێك لە ئەندامانەوە دەخرایە بازنەی ڕۆشنبیرییەوە بێ ئەوەی بە خۆی بزانێ بۆ چییە. تا وای لێدەهات خۆی دەگەیشتە ئەو بڕوایەی ، کە دەبێ هەوڵبدرێ بۆ پێکهێنانی ڕێکخراوێکی چەپی کوردستانی، ئەوسا (مفاتحه) پێی دەوترا کە ڕێکخراوێکی لەو جۆرە هەیە و ناویشی (کملك) ە واتە (کۆمەڵەی م. ل. کوردستان).

کۆمەڵە ئۆرگانێکی تایبەت بە خۆی نەبوو، وەك ڕۆژنامە یا مانگنامە یا وەرزنامە دەر بکات ، کە زمان حاڵی ڕێکخستنەکە بێت، بەڵکو ڕێچکەی دەرکردنی نامیلکە بۆ هەر بابەتیك دەگیرایەبەر بۆ ڕێنمایکردنی ریزەکانی ڕێکخستن.

کۆمەڵە هەر لە سەرەتاوە بڕیاری وا بوو، کە شێوەی خەباتی نهێنی بگرێتەبەر و خۆی لەلای هیچ کام لە حزب و ڕێکخراوەکانی ئەوسا و حکومەتیش ئاشکرا نەکات، مەبەست لەم بڕیارەش ئەوە بوو کە خۆی بپارێزێ لە گورزی کوشندە و ڕاوەدونان، تا ئەو کاتەی باش پتەو خورت دەبێ و مەیدانی کاری فراوانتر و توانا و ئەزمونی ڕێکخراوی پتر دەبێ. بەڵام بارودۆخی دوای بەیانی ئادار و ئەو دەرفەتەی ، کە لە وتوویژی نێوان پارتی و حکومەت رەخسا، هاوڕێیانی کۆمەڵەش ئەو بایەخە گەورەیەیان نەدا بەپاراستنی نهێنی، گەر کەسێك هەبوایە بۆ چاودێری کردنی وورد ، بە ئاسانی دەیتوانی بوونی ڕێکخستنێکی نهێنی درك پێ بکا ، هاوڕێیانی کۆمەڵە لە هەر شوێنێك بۆیان بلوایە بیروڕای خۆیان دەوت ، کە بیروڕاکانیشیان بە ئاسانی هەست پێدەکرا و دەناسرایەوە ئەڵقە ڕۆشنبیرییەکان لە باتی ئەوەی جگە لە کاتی کۆبوونەوە، لە یەك دابڕانایە، بەپێچەوانەوە زۆربەی کاتەکانی خۆیان پێکەوە بەسەر دەبرد، کە دەبووە هۆی گومان لە سەریان، و ئەم کارە بووە هۆی دروستبوونی

گومان لەسەر زۆربەی هاوڕێیانمان بە تایبەت لە ساڵی ١٩٧٥ پاش ئاشبەتاڵ کە زۆربەیان بە هۆی گومانی ئەو جۆرە پەیوەندیانەوە گیران.

## ٢-٣ .بەسراو دروستکردنی ئەڵقەو شانەی کۆمەڵە.

لە مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٧٦ بانگهێشت کرا بووم ، بۆ بەشداری کردن لە کۆنگرەی (٨) هەشتەمی پارتی باسکی جەلالی ، ئەوسا لە بەڕێوەبەرایەتی شارەوانی بەسرا کارمەند بووم، و لەهەمان کاتیشا لە مانگی نیسانی ساڵی ١٩٧٠ لەسەر داوای پارتی باسکی مەلایی دوورخرابومەوە بۆ بەسرا.

بوونم لە بەغداد وەك ئەندامی کۆنگرە و لەدایکبوونی کۆمەڵە لەو کاتەدا، هەلی ئەوەی بۆ ڕەخساندم کە دوو ڕۆژ دوای لە دایکبوونی کۆمەڵە (فەریدون عبدولقادر) ببینم و هەواڵی لە دایکبوونی کۆمەڵەی پێ ڕاگەیاندم. بێ هیچ دوو دڵییەك خۆشحاڵی و ڕەزامەندی خۆم بۆ کارکردن لە کۆمەڵەدا دەربڕی و بە نامەیەك بۆ دەستەی دامەزرێنەرانم نارد. دوای ڕۆژێك وەڵامەکەم بە پەسەندکراوی درایەوە. واتە لە ١٩٧٠/٦/١٤ وەك ئەندامێك لە ڕیزەکانی ڕێکخستنی کۆمەڵەدا دەست بەکاربووم و پاش گەڕانەوەم بۆ بەسرا، یەکەم ئەڵقەی ڕۆشنبیری کۆمەڵەم دورستکرد ، کە پێکهاتبوو لە: (وەستا عابید بەرگدوور، خەڵکی هەڵەبجە بوو، هەر لەمناڵیەوە کەوتبووە بەسراو، لەوێش لە خێزانێکی عەرەبی بەسراوی ژنی هێنا بوو، کاك ئەکرەم نائیب زابت بوو، لە هێزی دەریایی و خەڵکی سلێمانی بوو، وەستا قادری سەرتاش خەڵکی سلێمانی بوو، پاش تەواوکردنی خزمەتی سەربازی هەر لەبەسرا گلی خواردبۆوە، کاك کەریم ناسراو بە کەریم پیکەڵو کە خەڵکی سلێمانی بوو، زمان زانێکی شارەزا بوو، لەزمانی ئەڵمانی، ئینگلیزی، فارسیو عەرەبی و لە شۆڕشی ئەیلول مترجم بوو، لە بارەگای مەکتەبی سیاسی و پاشان بارزانی).

## د. فوئاد معصوم و مەلاییەتی.

لە کۆتایی مانگی ٧٠/٦ ماوەی ١٠ رۆژم مۆڵەت لە شارەوانی وەرگرت تا بچمەوە سلێمانی بۆ ژن گوێزانەوە، لە سلێمانی نەمتوانی بە خۆشی وەك خەڵکی لە یەکەم هەلی خۆشی ژیانم دا بە شێوەیەکی ئاسایی و بەپێی داب و نەریتی کوردەواری ئاهەنگ بکەم ، بەڵکو لەبەر هەڕەشە و گوڕەشەی مەلایی بە ناچاری بە شەو لە سلێمانیەوە ژنم گوێزایەوە بۆ بەسرا، کە ڕۆیشتمەوە بەسرا (مارسیری ناویّ و سیریش لەلانەکەیدا سەوز دەبیّ).

لیژنەی ناوچەی بەسرای مەلایی بارەگایان برد بووە خانوویەك بەرامبەر ئەو خانووەی من گرتبووم . ئەو کاتە د. فوأد مەعصوم ی کۆیی لێپرسراوی لیژنەی ناوچە بوو، لە مەلا مستەفا مەلایی تر بوو.

فوأد مەعصوم و دەستە و تاقمەکەی بەشێکی کارەکانیان تاقیبکردنی کوردەکان و بیروبۆچوون و رەوتی سیاسیان بوو. رۆژێك لە دووکانی کاك عابیدەوە ناردیان بە دوامدا، کە چوم فوأد مەعصوم لێی پرسیم :" برادەر وا دیارە لە ٦٦ ەکانی ، بۆیە پاش بەیانی ئادار گەیشتویتە بەسرا؟". منیش تەنیا وەڵامم ئەوە بوو ، "هەر چیەك بوو بم بەختیارم کە دوو شت نەبووم (مەلایی و بەعسی)". فوأد مەعصوم هەڕەشەی کرد ، کە گوایە لەسەر ئەوە سزام دەدەن. بە هەرحاڵ کاك فوأد وەڵامێکی تری لەوەی پێشوو رەقتری دەست کەوت . لە مانگی ١٩٧١/٤ پاش وەرگرتنەوەی باسکی جەلالی لەناو باسکی مەلاییدا ، منیشیان لەسەر لیستی باسکی جەلالی ناونووس کرد بوو، بەو هۆیەوە لە رێگەی ئیحسان شێرزاد ، کە وەزیری شارەوانیەکان بوو، منیش لە بەسراوە گویزامەوە بۆ سلێمانی و لە ڕووی کاری رێکخراوەیشەوە لەگەڵ فوأد ئەنوەر قەرەداغی و د. کەمال خۆشناو و سمکو فتح ئەڵڵا و مامۆستا رفعت مەلا و مامۆستا محمود مەلا عزەت وەك ئەندامی لقی سلێمانی پێشنیار کرا بووم.

لە ١٩٧١/٤/٢٧ بانگ کرام بۆ یەکەم بەشداربوونم لە کۆبونەوەی لقی سلێمانیدا و هەر ئەو رۆژە لە سەرەتای کۆبوونەوە "ئیستقالەم لە ریزەکانی پارتی" دا، بە کاك عەلی عبدالله کە هەم پارێزگاری سلێمانی و هەم لێپرسراوی لق بوو.

لەسەر " ئیستقالە کردنەکەم ، رێگەشیان نەدام لە سلێمانی بم و دوای دوو رۆژ بڕیاری گواستنەوەمیاندا بۆ شارەوانی سیروان –دوجەیلە".

## ٤ـ٢ . هەڵەبجە و پێکهێنانی یەکەم ئەڵقەی رۆشنبیری کۆمەڵە.

لە ١٩٧١/٦/١٥ دا بە ناچاری لـە شـارەوانی سـیروان دەسـت بـەکار بوومـەوە. گەلـێ هاورێی کۆنم کە لە کاتی کارکردنم لە لیژنەی ناوچـەی قـەزای سـلێمانی (٨ ق. س) کارم لەگەڵدا کرد بوون لەسلێمانی، پاش بەیانی ئادار گەڕابوونـەوە هەڵەبجـە. لەوانـە: " کـاک مـەلا رووف، کـاک مـەحمود "خولـە کەشـکۆڵ" کـە پاشـان لـە شۆڕشـی نـوێ حوزەیرانی ١٩٧٦ دا بە (شیخ عەلی) ناسرا".

کـاک مـەلا رووف پـاش تێکەڵبوونـەوەی باڵەکـەی پـارتی (م. س) ناسـراو بـە باسـکی جەلالی بە باڵەکەی تری پـارتی ناسـرا و بـە باسـکی مـەلایی، لەگـەڵ پارتیـدا دەسـتی بەکار کردبۆوە و وەك ئەندامی لیژنەی ناوچەی هەڵەبجە لەپارتیدا کاری دەکرد.

مەلا رووف لە ماوەی کارکردنم لە شـارەوانی سـیروان، بـۆ مـن پـشتیوانێکی زۆر بـاش بوو، بۆ پاراستنم لەو گێچەڵانەی کەپێیان دەکردم، بە تایبەت لەلایـەن فـازل سـۆرانی کـە هـەم کـرا بـوو بـە قائیمقـامی هەڵەبجـە و هـەم لێپرسـراوی لیژنـەی ناوچـەی هەڵەبجەی پارتی بوو.

لەو ماوەیەی کە لە شارەوانی سیروان کارم کـرد.هەوڵمـدا لـە شـاری.هەڵەبجـە یەکـەم شانەی ئەڵقەی رۆشنبیری کۆمەڵە پێکبێنم و یەکەم کەسیش لـە هەڵەبجـە کـاک خولـە کەشکۆڵ ، ناسراو بە کاك شێخ عەلی بوو، کە پەیوەندیم پێوە کـرد و پاشـان بـوو بـە لێپرسراوی ئەڵقە و دواتریش رێکخستنی کۆمەڵە لە شاری هەڵەبجـە. لـە ١٩٧١/٦/٢٧ دا بوو، لە ١٩٧١/٨/٢٥ داوای دوو هەفتە پشووی ساڵانەم کـرد، چـووین بـۆ رانیـە بـۆ ماڵی باوکم.

لەو ماوەیەدا پەیوەندیم بە دوو هاورێی پێشینەی خۆمەوە کـرد" شـەهید ئیـبراهیم خەلیل و کاك مراد زینەدین". هەردووکیان کارمەند بوون لە رانیەو دوای مـشتومڕێکی چـەند رۆژی، بـوونی کۆمەڵـەم لای هـەردووکیان ئاشـکرا کـرد و یەکـەم شـانەی کۆمەڵەمان لە رانیە پێکەوە نا.

لەو کاتەدا ڕێکخراوی کۆمەڵە لە سلێمانی زۆر پێویستی بەوە بوو، کە قورسایی خۆی بخاتە سەر ناو شار لە ڕووی پەرەپێدانی ڕێکخستنەوە، بە تایبەتی کە تەمومژی بیری عیراقچێتی لە ناو ریزەکانی کۆمەڵەدا سەری هەڵدا بوو. داوام لێکرا بە هەر شێوەیەك بێ هەوڵ دەم بگەڕێمەوە سلێمانی.لە ڕێگەی دۆستێکمەوە لە بەڕێوەبەرایەتی شارەوانیەکانی سلێمانی (مديريه بلديات السليمانيه) شوێنێکی چۆڵم بەپلەی نوسەر دۆزییەوە کە دوو پلە لە خوار کارەکەی خۆمەوە بوو، هەوڵمدا بە پلەی نوسەر بگەڕێمەوە سلێمانی، بەڵام بێ ئەوەی ئاگاداری یەکتر بین، لەڕێگەی شەهید شەهابەوە بە هۆی شێخ قادری ژن برایەوە ئەو شوێنەیان بۆ ئاسۆی شێخ نوری دیاری کرد بوو.

ناچار شوێنی کار کردنم لە شارەوانیەوە گوێزرایەوە بۆ دائرەی (تقاعد).لە ١٩٧١/٩/١٧ دەستم بەکاری فەرمانبەری وەك (أمين صندوق) لە دائرەی تەقاعودی سلێمانی کرد. لەناو کۆمەڵەدا پاش گەڕانەوەم لە بەسرا، هەر لە سلێمانی لە شانەیەکدا بووم.کە پێکهاتبوو لە: " فواد شێخ ئەنوەر قەرەداغی، ئەشرەف شێخ شەرەف تاڵەبانی، ئاوات عبدولغەفور، بەندە".

هەر لە یەکەم کۆبونەوە لە گەڵیاندا هەستم بە بوونی ناکۆکیەکی بیروڕا لە نێوانیاندا کرد ، بە ئاشکرا فوادو ئەشرەف داوای گرتنەبەر و چەسپاندنی ڕێبازی عیراقیان لەناو کۆمەڵەدا دەکرد، ئاوات و بەندەش لایەنگری ڕەوتی کوردستانی کۆمەڵە بووین.

## ٥-٢ سەرهەڵدانی بیری عیراقچێتی.

هەر پاش لەدایکبوونی کۆمەڵە، بەماوەیەکی زۆر کورت، هەندێ لە ڕۆشنبیرانی بیرچەپ و بێزرا و بروانە بوو،بە حزبی شیوعی عیراقی هەردوو باڵەکەی لیژنە و قیادەی مەرکەزی و هەندێ لە ڕووناکبیر و بیر چەپەکانی پارتی شۆڕشگێری ناسراو بە (جەلالی) چووەنە ناو ریزەکانی کۆمەڵەوە بەو هیوایەی بتوانن (کۆمەڵەی مارکسی

لینینی کوردستان - بیری ماو) ببێتە ئەلتەرناتیڤی هەردوو باڵی حزبی شیوعی لە عیراق‌و پارتیش لە کوردستاندا.

سەرهەڵدانی بیری عیراقچێتی لەناو کۆمەڵەدا هەر لەناو دەستەی دامەزرێنەرەوە تا ئەڵقەکانی رۆشنبیری تەنیەوە، ئەوەش بوو بەهۆی سەرهەڵدانی مشتوومڕێکی تێر وپڕ و چڕ لەناو ریزەکانی کۆمەڵەدا.

سەرانی بیری عیراقچێتی لە ئاستی سەرەوەی ریزەکانی کۆمەڵەدا بریتی بوون لە:" فازیلی مەلا مەحمود) کەپاشان لە شەهیدکردنی د. عبدالرحمن قاسملو لە شاری ڤیێنا لە وولأتی نەمسا، ئەویش شەهیدکراو . پێش تر لە کاتی شۆڕشی ئیسلامی ئێران دا، لە بەیروت بوو، و یەکێك لە کەسایەتیە هەرە نزیکەکانی مستەفا چەمران بوو.

شاسوار جەلال ناسراو بە (شەهید ئارام) کە دوای ئاشبەتاڵ و گرتنی زۆربەی ئەندامانی سەرکردایەتی کۆمەڵە لە ١٩٧٥ دا، کۆمیتەی هەرێمەکانی دامەزراند. شەهید ئارامیش وەك هاوڕێکانی تری لە ریزەکانی کۆمەڵەدا نەما، بەڵام گرتنی بە کۆمەڵی ئەندامانی سەرکردایەتی و سکرتێری کۆمەڵەی بە هەل زانی بۆ دروستکردنی کۆمیتەی هەرێمەکان و کۆکردنەوەی زۆربەی ئەندامە کۆنەکانی خاوەن رەوتی عراقچێتی لە ناویدا.

فواد شێخ ئەنوەر قەرەداغی، ئەویش وازی لە کار هێنا لە ریزەکانی کۆمەڵەدا و پتر خۆی بە کاری نوسینەوە خەریك کرد و رۆژێ لە رۆژان دژایەتی کۆمەڵەی نەکرد. ئەشرەف شێخ شەرەف، ئەمیش خۆی لە کار لە ناو کۆمەڵەدا کشاندەوە. ئەو بەڕێزانە و هەندێ ئەندامی خوارەوەی ریزەکانی کۆمەڵە هەوڵی زۆریاندا بۆ سەپاندنی رێباز و ڕەوت و بیر و ئایدۆلۆژی عراقچێتی لەناو کۆمەڵەدا و پاشان دارشتنی پەیرەوێکی ناوخۆی حزبێکی عیراقی سەرتاسەری بۆ کۆمەڵە و گۆڕینی ناوەکەشی بە (کۆمەڵەی مارکسی - لینینی عراقی - بیری ماو)

سەرهەڵدانی بیری عیراقچێتی و ناکۆکی لەگەڵ لایەنی بیری کوردستانی لەناو کۆمەڵەدا، بووە هۆی پەیدابوونی مشتومرێکی زۆر و گرتنە بەری رێبازی دیالۆگ بۆ لابەلاکردنەوەی ئەو کێشەیە،و بوو بە فاکتەرێکی زۆر کاریگەر لە گەشەپێدان و پەرەپێدانی کۆمەڵەدا لە رووی چۆنایەتیەوە، هەر دوولا، واتە (عیراقیو کوردستانی) تەقەلای ئەوەیان دەدا، کە راستی و رەوایی بۆچوونەکانی خۆیان بسەلمێنن، بۆ ئەمەش پەنایان دەبردە بەر دەیان سەرچاوەی کوردی خۆماڵی و عیراقی و ناوچەییو دەرەوە ، لە هەموو بوارەکانی (مێژوویی، فەلسەفی، ئابووری، جیۆپۆلیتیکی، ئەزموونی گەلان و وولاتانی شۆرشگێری سەرکەوتوو ژێرکەوتوو، گەلان و وولاتانی داگیرکراو نیمچە کۆلونی، نووسینەکانی مارکس، ئەنگلز، لینین، ستالین، هۆشی منە، ژەنەرال جیان، ماوتسی تونگ، لین بیاو، ئەنوەر خۆجا، منیر شفیق... هتد).

ئەو ململانێ ناوخۆییە ماوەی نزیکە ساڵێکی خایاند ، تا دواجار بریاردرا کە بۆ ماوەی (٢) دوو مانگ هەردوو بۆچوونەکە بە بەڵگەکانیانەوە بخەنە بەردەم رێکخستنەکانی کۆمەڵە تا لە ماوەی ئەو دوو مانگەدا بە شێوەیەکی دیموکراتیانە رای خۆیانی لەسەر بدەن و لە ئەنجامدا زۆرینە بەلای کام لایەندا بوو، ئەوەیان بمێنێتەوە و ئەوی تریان بێ (تکتل وأنشقاق) وەك تاك لە کۆمەڵە بچنە دەرەوە. لە ئەنجامدا لە مایسی ١٩٧٢ لایەنی کوردستانی زۆربەی هەرەزۆر دەرچوو، ئەوانەش کە لایەنی بیری عیراقی بوون لە کۆمەڵە چوونە دەرەوە.

بەو هەڵبژاردن و دەنگدانە زۆر نهێنیەی کۆمەڵە ، رێگای برایانە و دیموکراتیانە و لۆجیکی بۆ لابەلاکردنەوەی ناکۆکی ناوخۆ گرتەبەر و سەرکەوتوانە بێ زیان گەیاندن بە کۆمەڵە و رێکخستنەکانی کێشەکە چارەسەر و لابەلاکرا*.

---

*- کۆمەڵە هەیکەلی رێکخراوەیی پێك هاتبوو لە: "سەرکردایەتی، لیژنەی شارەکان، شانە سە رەکیەکان، شانەکان، بازنە رۆشنبیریەکان" بەرنامەی خۆپەروەردەکردنیان جیا بوو.

بیروڕای عیراقچێتی لەناو کۆمەڵەدا تـا دروسـتبوونی ئاشـبەتاڵ سـەری هەڵنەدایـەوە ، بـەڵام پـاش تێکـشکان و پـەرش و بڵاوبـوونی شۆڕشـی ئـەیلول و ئاشـبەتاڵکردنی بنەماڵەی بارزانی و سەرانی پارتی دیموکراتی کوردستان، کۆمەڵەش کەوتە بەر زەبری شکستی ئاشبەتاڵ و ئەویش ناکۆکی و دوو و سێ بەرەکی کەوتە نـاو ریزەکانیـەوە و جارێکی تر بیروڕای عیراقچێتی لەناویا سەری هەڵدایـەوە کـە لـە شـوێنی خۆیـدا بـە درێژی باسی لەسەر دەکەین.

---

لەبازنەکان پتر گرنگی بە مێژووی کورد و کێشەی کورد و شیکردنە وەی چینایەتی لە کوردستان ، شۆڕشە کانی کورد هۆکارە کانی سەرنە کە وتنیان.

لەشانەکاندا، کتێبی (کوردایەتی) جەلال تاڵەبانی، شیکردنە وەی چینایە تی لە صین کە کرابو بە کوردی ، و بزوتنەوەی جوتیاران لە خۆنان کە هەرێمێکی صین بوو، کتێبی ما العمل (لێنین) ، منیفیستی یەکەم بەیانی کومونیستی، وچۆن ریزە کانی حزب هەڵدە سەنگێنن کە کۆمەڵە بڵاوکراوەیەك بوو ماوتسی تونگ نوسیبووی.

لەشانە سەرەکیەکاندا: کتێبی بەچی دەستپێبکەین (بماذا نبدأ) (لێنین) ، بەرەی نیشتمانی (الجبهە الوطنیة) (دیمترۆف)، یادەوەرییەکانی کیم ئیل سۆنگ کە بەشێکی بەندە کردبوویە کوردی لەعەرەبیەوە، بەرەی نیشتمانی (جەلال تاڵەبانی)

لەلیژنەی شارەکان: بەرەی نیشتمانی (ما و)، مارکسیزم. لینینزم تیۆری شۆڕشگێڕانە (منیر شەفیق) مارکسیزم. لینینیزم شۆڕشی چەکداری (منیر شفیق) ، دیموکراسی گەلی (ماو) لەمەر ناکۆکی (فی التناقض) (ماو)، شۆڕش و شەڕی درێژخایەن (لین جیاو) سەرکردایەتی،جگە لەوەیش هەر سەرچاوەیەکی تری بە سوود دەسکەوتایە هەم خۆیان پێ پەروەردە دەکرد و هەم بە پێی ئاستی رێکخستنەکان دایان دەبەزاندە خوارەوە.

## ٦ـ٢ هەڵوێستی کۆمەڵە لەمەڕ سیاسەتی جیهانی و کێشەی چین و سۆڤیەت .

**رای کۆمەڵـە سـەبارەت بـە سیاسـەتی جیهـانی وولاتـانی سـەرمایەداری و هـەردوو ئۆردوگاکەی شیوعیەت (چین و سۆڤیەت) وولاتانی بە ناو سۆسیالیستی و جیهانی سێهەم ئەوسا بەم جۆرەی خوارەوە بوو.**

### أـ بەرامبەر وولاتـانی دراوسێ و داگیرکەرانی کوردستـان.

١ـ عـیراق دەوڵـەتێکی بـۆرژوای بیرۆکراتـی داگیرکـەری نەتـەوەی سەردەسـتە، پایـەگای دەسـەلاتی لەسـەر بنـەماکانی تـاك دەسـەلاتی حزبـی تەسـك بنیـات نـاوە، رەفتـاری سیاسیانەی سەبارەت بە گـەلانی عـیراق لەسـەر بناغـەی شۆڤێنیـستی عـەرەبی پـەیرەو دەکا، لە رووی ئابوریەوە گرێ دراوی وولاتانی سەرمایەداری و ئیمپریالیزمی ئەورووپیـە.
لە رووی هاوپەیمانێتی سەربازییەوە ، خۆی گرێداوە بە ریڤیژنستی سۆڤیەتیەوە.
٢ـ ئێـران، دەوڵـەتی دەسـەلاتداری کۆنەپەرسـتی و بـاوك سـالاری و توێـژێکی بـچوکی بورژوای مولْکداری فارسیە.
پایەگای دەسەلاتی لەسەر داموو دەزگا سەرکوتکەرەکانی بەناو ئاسایش و مخابـەرات و سوپا دارێشتوە ، رەفتاری سیاسیانەی دەربارەی گەلانی ئێران، لەسەر بنـەمای ئایدیای پـان ئیرانیـزم و داسـەپاندنی دەسـەلاتی توێـژی سـەرووەی نەتـەوەیی فارسـە ، بەسـەر نەتەوەکانی تـری تورکمـان و ئـازەر ، کـورد و عـەرەب و بلوجـدا ، ئـەویش دەوڵـەتێکی داگیرکەرە لەسەر خاکی کوردستان.
لـەروی ئابورییـەوە گرێـدراوی دەوڵەتـە سـەرمایەدارەکان و ئیمپریالیـەکان و پۆلیـسی پارێزەری بەرژەوەندی ئابوری ئینگلیز و ئەمریکایە لە ناوچەکەداو سەنگەری پێشەوەی ئیمپریالیزمە لە ناکۆکیدا لەگەڵ چین و سۆڤیەت دا.
٣ـ تورکیا، دەوڵـەتی دەسـەلاتداری میلیتـاری تـورکی کەمالیزمـە، دەوڵـەتی داگیرکـەری بەشـی هـەرە گـەورەی کوردسـتانە، لـەرووی پانتـایی زەوی و ژمـارەی دانیـشتوانی کـوردەوە، لـە رووی ئابورییـەوە پاشـکۆ و گرێـدراوی ئـابوری وولاتـانی سـەرمایەداری و

ئیمپریالیزمی جیهانییە. لە ڕووی ئایدۆلۆژییەوە دەوڵەتی بۆرژوازی تورکی کەمالیزمی شۆڤینی هەرە دەمارگیری نەتەوەپەرستی و سەر گۆی زەوییە و تارادەی ڕاسیستیی و خۆپەرستن.

ب ـ دەوڵەتە عەرەبیەکان، بەگشتی پێچەوانەی خواستو ویستی گەلانی عەرەبین و ئەمانیش لە ڕووی سیاسی و ئابورییەوە دابەشبوون بەسەر پاشکۆیەتی هەردوو پایەگای سەرمایەداری ئیمبریالیزمی و ریڤزنیستی سۆڤیەتی دا.

هەڵوێستیان لەسەر کێشەی فەلەستین، هەڵوێستێکی دوورەپەرێز و نادیارە و هەموویان دەیانەوێ لەسەر ئاستی جیهانی بازرگانی پێوە بکەن و لەلایەکی تریشەوە هەر دەوڵەتە دەیەوێ کێشەی فەلەستین و ڕێکخراوە فەلەستینیەکان و بزوتنەوەی رزگاریخوازی فەلەستینی بەخۆیەوە گرێدا و بیکاتە کارتی فشار لەسەر هەر وڵاتێکی تر کە تووشی ناکۆکی بێت لەگەڵیان. فەلەستینیەکان و کێشەی فەلەستین بۆتە کێڵگەی تاقی کردنەوەی نفوز و دەسەڵاتی ئەو پارت و ئەو ڕێکخراو ئەو دەوڵەت و ئەم دەوڵەتی تری عەرەبی و هەر یەکە لای خۆیەوە لغاوێکی ئەستوریان کردۆتە دەمی بزوتنەوەی رزگاریخوازی فەلەستینی و بە ئارەزووی خۆیان و بەپێی بەرژەوەندی خۆیان هەڵیان دەسوڕێنن.

کۆمەڵە بڕوای تەواوی بە ڕاستی و ڕەوایی شۆڕشی فەلەستین و زەفار هەبوو لەناو بزوتنەوەی رزگاریخوازی فەلەستینی دا پەیوەندی توندی هەبوو لەگەڵ بەرەی گەلی رزگاری فەلەستین (الجبهة الشعبية لتحرير فلسطين) بەرابەری جۆرج حەبەش.

ج ـ سەبارەت بە وڵاتانی سەرمایەداری، بە جیهانی یەکەم دەزانرا لە دزینی سەرمایەی جیهان و بە گەورەترین ئیمپریالیزمی نوێشی دادەنا و لە ڕووی کۆنترۆڵکردنی مۆنۆپۆلی جیهانیەوە بە گەورەترین دەسەڵاتیشی دەناسین لە ڕووی دەستبەسەرداگرتنی هەموو سەرچاوە و شادەمارەکانی ئابووری جیهانیە ، و بە دوژمنی هەرە گەورە و سەرسەختی بەرەی رزگاریخوازی گەلانی ژێر دەستەو وڵاتانی داگیرکراوی دەناسین.

د ـ سەبارەت بە یەکێتی سۆڤیەت و وڵاتی تری ئۆردوگای سۆسیالیستی، کۆمەڵە ڕای وابوو، کە یەکێتی سۆڤیەت و هەموو وڵاتانی تری سۆسیالیستی، جگە لە (چین، ڕۆمانیا، ئەلبانیا) هەموویان دەوڵەتی حزبی دەسەڵاتداری ریڤیزنیستی، هەموویان لە

ڕێبازی م.ل لایان داوه و هەموویان دەوڵەتێکی میلیتاری دکتاتۆریان بەسەر گەلەکانیاندا داسەپاندوە.
لەڕووی ئابوورییەوە دەوڵەتی توێژێکی نوێن لە بۆرژوادا ، دەسەلات لە حوکمدا دەسەلاتی دکتاتۆری میلیتارییە ، نەك دکتاتۆری پرۆلیتاری بە پێچەوانەوە پرۆلیتاریا لە هەموو چینەکانی تری کۆمەڵ بێ بەش ترە لە حوکم و دەسەلاتدا چ سیاسی و چ ئابوری.
کۆمەڵە پێی وابوو، ئەو دەوڵەتانە لە سیاسەتی دەرەوەیاندا، لایەنگری دەوڵەتانی داگیرکەر و دکتاتۆر و شۆڤیەتی بوون ، لە ئاست وولاتان و گەلانی ژێر دەست و داگیرکراویشدا بێدەنگ و بگرە یارمەتیدەری داگیرکەران بوون.
کۆمەڵە بۆ پشتڕاستکردنەوەی بۆچوونی خۆی هەمیشە ئێران و عیراق و تورکیای بە نموونە دەهێنایەوە ، کە چۆن سۆڤیەت و وولاتانی تری سوسیالیستی پشتیان کردۆتە کێشەی کورد و چەندیش هاوکاری ئابوری و سیاسی و سەربازی ئەو دەوڵەتانە دەکەن لە ڕێگەی چەندین پەیمان و پەیوەندی سیاسی و ئابوری و سەربازییەوە لەگەڵیاندا.
لەگەڵ ئەوەی کە کۆمەڵە لە ناکۆکی نێوان چین و سۆڤیەتدا لایەنگری چین بوو،ماوتسی تونگی بە خەلیفەی لینین دەزانی و پێی وابوو، کە چاکترین ئەزموون چینە بۆ ئەوەی کورد پەیڕەوی بکات لە خەباتی ڕزگاریخوازی خۆیدا، باشترین دەسەلاتی پرۆلیتاری و گەلیش لە حوکمدا ئەو ئەزموونەیە ، کە لە چین دا هەیە و ناسراوە بە (دیموکراتی گەلی) باشترین ئەزموونی حوکمە، بەلام ڕەخنەشی لە هەندێ سیاسەتی چین گرتووە لە سیاسەتی ناوخۆ و دەرەوەشیدا. بۆنموونە:
١ـ پەیمانی نێوان چین و شای ئێران له ١٩٧١ دا.
٢ـ پشتگیری چین لە کودەتای پینوشیت بەسەر حوکمی شیوعیەکاندا لە وولاتی چیلی لە مانگی ١٩٧٣/٩ کە قەسابخانەیەکی تیا دروستکرد.
کۆمەڵە سەبارەت بەو سیاسەتەی دەرەوەی چین لەمەڕ ئێران و چیلی، هەڵوێستی خۆی بە دەرکردنی بابەتێك ڕاگەیاند، کە بە توندی ڕەخنەی لەو سیاسەتەی چین گرتبوو.
٣ـ شۆڕشی ڕۆشنبیری "ماو"، کە کۆمەڵە پێی وابوو، ئەو قۆناغە لایەنی باش و لایەنی خراپیشی هەبووە.

نە ڕووی بە خۆداچوونەوەدا، واتە بە حزب داچوونەوە و هەڵسەنگاندنی ئەندامانی سەرکردایەتی و سزادانی لە خۆبایی بووان و ئەمیرەکانی شەڕ و لادەران لە ڕێبازی م. ل و پاکتاو کردن و بۆڵ بژێرکردنی ناو ماڵی حزب، لەلایەن کۆمەڵەوە بە لایەنە باش و گەش و پرشنگدارەکەی هەڵدەسەنگێندرا. لە ڕووی ئابووری (پیشەسازی، و کشتوکاڵی) بە لایەنە خراپ و زیان بەخشەکەی دەزانی.

## ٢ـ ٨* دەورەی کادران.

کۆمەڵە جگە لەوەی کە ئەرکی هەرە گەورەی سەر ئەستۆی ئەندامەکانی و شانە و ئەلقە ڕۆشنبیرییەکانی، بە خوێندنەوە و خۆپەروەردەکردن دەست نیشان کرد بوو،و بەپلەی دووهەم گرنگی بە چەندایەتی دابوو، هێشتا هەر لە هەوڵی پێگەیاندنی کادیری سەرەکی و ناوەندی دابوو. کۆمەڵە پێی وابوو ،کە دەبێ لە پێشەوە هەوڵی باشکردن و بەرەو پێشەوەبردنی لایەنە چۆنایەتیەکەی ناوخۆی بدات و بە ئەرکی یەکەم و

---

* - لە کتێبی: مامۆستا جەمال تاهیر (قارەمانی شۆرش‌و زیندان) لەوبەشەی ئاسۆ شێخ نوری لەسەری نوسیوە لاپەڕە (٥٥ تا ٥٩ ) لەلاپەڕە (٥٦) دا دەڵێ:

بە کۆمیتەی هەرێم بەڕێنمایی کۆمیتەی سەرکردایەتی خولێکی وشیاری بۆ ژمارەیەك لەکادرەکانی کردەوە، خولەکە لەسەرەتادا (٢) گروپ بوون، بەڵام بەهۆی درێژبوونەوەی ماوەی خولەکە بەشێك لەهاوڕێیان لێی کشانەوە.

ئاسۆ دیارە باش بیری نەماوە، راستە دوو گروپ بوون تاماوەی ٣ مانگ بەجیاجیا کۆدەبوونەوە، بەڵام بەهۆی وازهێنانی هەندێك‌و گوێزانەوەی هەندێکی تر کە ژمارەی هەردوو گرووپەکە لەسەرەتاوە ئاوات عبدالغفور کەلێپرسراوی هەردوو گروپەکە بوو وەك ئەندامی سەرکردایەتی، دلێر تایەر، عومەر سیدعەلی، جەمال تایەر، کەمال عەلی، خەسرەو بابان ، بەکر حسین، حەمە سابیر، فهمی شێخ ئەنوەر، ئاسۆ شێخ نوری، وە بەندە وەپتر لە ٤ دانیشتن لەماڵی ئێمە دابوو کە لەسەروی نقابەی مامۆستایانی ئێستادا بووین. رەنگە پاش دوورکەوتنەوەی هەندێکمان کرابێتەوە بەیەك گروپ‌و ئەوانە مابنەوە کە ئاسۆ نوسیویەتی: جمال قادر، ئاوات غفور، دلێر تایەر، عومەری سەید عەلی، کمال عەلی، خەسرەو بابان، و ئاسۆ شێخ نوری.

سەرەکی هەموو ئەندامێکی دەزانی، پاشان و بەپلەی دووەم گرنگی بە باشکردن و بەرەو پێشەوە بردنی لایەنە چەندایەتیەکە.
بۆیە لە ساڵی ١٩٧٢ بە دەقی لە مانگی ١٩٧٢/٧ دا یەکەم دەوری کادری لە سلێمانی بەنهێنی کردەوە ، ژمارەیان پێك هاتبوون لە (٨) کەس کە لەهەفتەیەکدا یەك جار کۆ دەبوونەوە بۆ ماوەی شەو و رۆژێك مشتومڕو بیروڕا گۆڕینەوەیان لەسەر ئەو بابەتانە دەکرد، کە بۆ ئەو دەورەیە دیاری کرا بوو. ئەوانەی بەشداربوون و لە بیرم مابێ ( ئاوات عبدولغفور، دلێر سەدیق، شەهید فەهمی شێخ ئەنوەر، ئاسۆ شێخ نوری، جەمیل تایەر، خەسرەو بابان، عومەر سید عەلی، بەندە). من ماوەی ٧ دانیشتن لەو خولەدا بەشداریم کرد، بە هۆی گوێزانەوەم لە دائیرەی تقاعدی سلێمانیەوە بۆ دائیرەی تقاعدی کەرکوك لەو خولە دابڕام.
هەر لەو کاتەی کە لە بەسراوە بەهۆی (أستعاب) کردنی پارتی شۆڕشگێڕ (جەلالی) لەناو پارتی دیموکرات (مەلایی) دا منیش گوێزامەوە بۆ شارەوانی سلێمانی بەو نیازەی ، کە لەناو پارتی (مەلایی) دا کار بکەم، بەلآم کارم نەکرد. ئەندامانی لقی سلێمانی و لێپرسراوی لق (عەلی عبدالله) ڕێگەیان نەدام لە شارەوانی سلێمانی کار بکەم و ناردیانم بۆ شارەوانی سیروان.
ئەو کاتە هەندێ لە بەڕێوەبەرایەتیەکانی دەوڵەت لە ژێر دەسەڵاتی حوکمی زاتی دا نەبوو، راستەوخۆ بە ناوەندەوە بەسترا بوونەوە، بۆ نموونە بەڕێوەبەرایەتی ئاسایش، دەزگای سوپایی، بەڕێوەبەرایەتی دارایی کە چاودێری خانەنشینی (ملاحظية التقاعد) سەر بە بەڕێوەبەرایەتی دارایی بوو، منیش گۆڕینی کارەکەم لە شارەوانیەوە بۆ خانەنشینی بە هەل زانی بۆ گەڕانەوەم بۆ سلێمانی. بەلآم لە چاودێریەتی خانەنشینی سلێمانیشدا ، لە دژایەتی و پلان و تەقەلای برایانی دەسەلآتداری مەلایی دەرباز نەبووم.
ئەو کاتە من سندوق ئەمنی چاودێریەتی خانەنشینی سلێمانی بووم، ئەو دائیرەیە سەر بە خەزێنەی سلێمانی بوو، (شێخ جەمال) بەڕێوەبەری خەزێنە و (عەلی لاوە) چاودێری (ملاحظ) ی دائیرەکەمان بوو،ئەو دووانەش پێکەوە گەلێ کاکەلە و برالەی

ژێر بە ژێریان لەگەڵ یەکدا هەبوو.هەر لە یەکەم مانگدا لە گەڵیان تووشی کێشە بووم. من وەك سندوق ئەمینی دەبوایە بەپێی یاسای معاش ئەوسا هەموو خانەنشینەکان خۆیان و ناسنامەی خانەنشینەکان بۆ معاش ئامادە بوونایە، و ئەوانەش کە بەهۆی نەخۆشی یا کەم ئەندامی ئەوتۆ کە توانای هاتنیان نەبووایە، دەبوایە سندوق ئەمینی بچوایە بۆ ماڵیان و پەنجە مۆری پێ بکردنیایە و ئەوسا موچەکەیانی بدایە بە کەسێك لەکەس و کاری. بەڵام هەر لە یەکەم مانگدا کاتی دانی مووچە، عەلی لاوە بانگی کردمە ژوورەکەی خۆی و پێ ووتم: (ئێمە نزیکەی ٣٠ـ٤٠ خانەنشینی پەککەوتەمان هەیە. کە هەموو جارێ "عومەر رەزا" ی فەراشی خەزێنە لیستی (قائیمە) ی معاشەکەیان دەباتە ماڵەوە و لەوێ پەنجەمۆریان پێ دەکات و مۆرەکانیشیان لێ دەداو ئێمەش پارەکان بۆ کاك شێخ جەلال شێخ رەشید بەڕێوەبەری خەزێنە دەنێرین و ئەویش بە عومەر رەزا دا بۆیان دەنێرێ، یا هەندێکیان خۆی بۆیان دەباتە ماڵەوە).

موچەدان دوو رۆژ بوو، عومەر رەزا هات و لیستەیەك ناوی پێ بوو، کە پتر لە (٢٠٠) ناو بوو، بردی بۆ لای کاك حامید هەورامی کە ئەوسا نووسەر بوو،لێپرسراوی بەشی لیستی مووچە و ئیزبارە بوو.پاش دوو رۆژ عومەر رەزا بە باوەش لیستی مووچە و یەك تورەکەی زل مۆری خانەنشینانەوە هاتە لام و داوای کۆی مووچەی ئەو خانەنشینانەی کرد، و باوەشە لیستەکەی دامێ ، کە پتر لە ٢٠٠ خانەنشین و هەمووشی مۆر و پەنجە مۆرکرا بوو. منیش بۆم نەکرد و پارەکەشم نەدایە و، ووتم: کە معاش تەواو بوو،خۆم دەچمە ماڵی هەموویان و پارەکەیان دەدەمێ و پاشان بە (عومەر ڕەزا). شم ووت : کە ئەو لیستانە هەمووی دەدەمە بەڕێوەبەرایەتی (تحریاتی جنائی) تا بزانن ئەو پەنجە مۆرانە هی خاوەنەکانیانە یان نا ، عومەر رەزا ترساو ووتی: " هەمووی پەنجەمۆری من و فەراشەکەی ترمانە،کە بە هەر دە پەنجەی دەست و هەر دە پەنجەی قاچ مۆرمان کردووە".

بڕیارمـدا کـە موچـەکانیان نـەدەم، و بـۆ مـانگی ئاینـدە بـە بڵاوکراوەیـەك داوام لـە خانەنشینان و کەس‌و کاریان کرد ، کە تـا مـاوەی ٣ی مـانگ پێویـستە (بەرحـەیاتی) یـان بدەن بـە دائـیرە و خۆیـان یـان کەسـێکیان لـە دائـیرە ئامـادەبن بـۆ وەرگرتنـی مووچەکانیان. لەو کۆمەڵە خانەنشینە نزیکەی (٢٥) کـەس بەرحـەیاتیان هێنـا کـە لـە ژیاندان، و ئەوانی تر هیچ وەڵامیان نەبوو، پاشان دەرکەوت کـە نـەماون و میراتگـری یاسایشیان لەپاش بەجێ نەماوە. لەسەر ئەو کارە کە گەڵێ لە کەس وکاری خانەنشین نەماوەکان، دەستیان لەگەڵ شێخ جەمالـدا تێکـەڵ بـوو،و دەسـەڵاتداریش بـوون لای پارتی (مەلایی).و لەلایەکی تریشەوە لێپرسراوانی پارتی ، هەر لە هەوڵی دەرپەڕانـدنم دابـوون، لەسـەر داوای پارێزگـای سـلێمانی ، داوای گواسـتنەوەم لـە بەڕێوەبەرایـەتی گـشتی دارایـی ناوەنـدەوە کـرد بـوو، بـۆ هـەر شـوێنێکی دەرەوەی سـنوری ئۆتۆنـۆمی،منیش بـە ڕاپۆرتێـك لـە هۆکـانی داوای گواسـتنەوەکەم بەڕێوەبەرایـەتیم ئاگادار کرد و لیژنەیەکیان نارد بۆ لێکۆڵینەوە، و پاشـان بۆیـان دەرکـەوت کـە تـا ئەمنیـەکی زۆر لــە مووچــەی خانەنــشینانـدا کــراوە بــە تایبــەتی (خانەنــشینانی ڕووداوەکـانی ژووروو) (شـهداء حـوادث الـشمال)، بۆیـە پێیـان ڕاگەیانـدم کـە لەبـەر بارودۆخی ووتووێژ، ناکرێ داوای پارێزگار پـشتگوێ بخـرێ. سەرپـشکیان کـردم بـۆ هەر شوێنێکی تر خۆم هەڵی بژێرم جگە لە ناوچەکانی ئۆتۆنۆمی.

پاش پرس بە کۆمەڵە، هاوڕێیانی کۆمەڵە بـۆ ئـەو کاتـە بـە چـاکیان زانـی ، کـە داوای کەرکوك یا ئاکرێ بکەم کە لە سنوری ناوچـەی ئۆتۆنـۆمی دا نـەبوون . منـیش داوای کەرکوکم کرد، لەبەر ئەوەی هاوڕێیـانی کۆمەڵـەش زیـاتر جـەختیان لەسـەر کـەرکوك کرد، و کەرکوك بۆ من ، لە سلێمانیەوە نزیك بوو، دەمتوانی لانی کەم، هەفتەی جارێ سەر لە ماڵەوە بدەم ئەو کاتە هاوسەرم مامۆستا بوو، پـێم وابـوو ، کـە ڕازی نـابن بـە گواسـتنەوەی بـۆ کـەرکوك. بـەڵام پـاش دوو مـانگ ئـەویش هاتـە کـەرکووك و لـەوێ دەستی بە کاری مامۆستایی خۆی کرد.

دەست ناپاکی شێخ جەمال رەشید و عەلی لاوەو چەندانی تر لە دایەرەکانی خانەنشینیاندا لە سلێمانی و هەولێر و بەسرا و مەسلّدا لە ساڵی ١٩٧٨ دا کەر کەوت، کە لەکاتی خۆیدا دێمە سەریان.

## ٢ـ ٩ کەرکوك و پێکهێنانی رێکخراوی شار .

لە ١٩٧٢/٩/١ لە چاودێرێتی خانەنشینانی کەرکوك دەس بەکاربووم‌و هەر ئەو رۆژەش لە پارێزگای کەرکوك چاوم بەکاك (فەرەیدون عبدولقادر) کەوت و پاش چەند رۆژێك یەکەم کۆبوونەوەمان کرد.بە ئامادەبوونی (فەرەیدون، عەلی بچکۆل، ئیحسان نجم "ئەبو شهاب"، وبەندە). کە بەناوی رێکخراوی شاری کەرکوکەوە کارمان دەکرد.

کەرکوك بۆ من وەك قوتابخانەیەك بوو،کە چەند دەرسێکی لێ فێربووم* .

١ـ بۆم دەرکەوت کە رادەی چەوساندنەوە لە کۆی زۆربێ و چەقی چەوساندنەوە لە کۆی خۆی داکوتی، دانیشتوانی ئەو شوێنە لە رووی کلتور و رۆشنبیرییەوە دواکەوتووترین و لە رووی گیانی بەرەنگاری و خەبات و دڵسۆزی و پاکی و تێکۆشانەوە پێشکەوتوون.

٢ـ بۆم دەرکەوت کە چەقی ململانێی نەتەوەیی لەهەر کوێ یەکدا بێ، لەو شوێنە گیانی نەتەوەیی گەلێ بەرزترە لە شوێنەکانی تر، بۆیە خەڵکەکانی یا تێکۆشەر و

---

*ـ ١ـ نەوشیروان مستەفا، پەنجەکانی یەکتر دەشکێنین، لا، ١٠٤. دەڵێ: لە پاش بەیانی ١١ ی ئادار و بە تۆمەتی شەبەکەی تەخریب لە ١٩٧٠ حکم درا بە غیاب و لە بەغدا خۆی شاردەوە.

٢ـ لە شوباتی ١٩٧١ لەگەڵ جەماعەتی جەلال چوونە حزوری عەرشی بارزانی لا، ١٠٥ پەنجەکانی نەوشیروان لانی کەم لەمانگی ١ ی ١٩٧٢ دا چۆتە نەمسا لا، ٧ ـ لە کەناری دانوبەوە.

٣ـ هەر لەو کاتەوە کە چۆتە نەمسا هەموو کارو چالاکیەکی سیاسی خۆی دابراندوەو دوور گرتووە ل ـ ١٤ ـ لە کەناری دانوب.

خەباتکەرن کە زۆربەی کوردی کەرکوك بوون، دەیان دژەکورد و خۆفرۆشن کە بەشی هەرە کەمی کوردی کەرکوك بوون، لانی سێهەمی تێدا نیە واتە کوری رۆژو بێ بار.

٢- بۆم دەرکەوت بەڕاستی لەهەر شوێنی کارگەو پرۆژەی پیشەسازی زۆرتر بێ، لەو شوێنەش ململانێی چینایەتی بەهێزترە و، زۆربەی هەرە زۆری لە شکری ڕێکخراوە چەپەکان لە کرێکار و ڕەنجدەر پێکدێن، کە ڕێژەی کرێکار و ڕەنجدەری لە چاو رۆشنبیر و ووردەبۆرژوا لە شاری سلێمانی لەناو ڕێکخستنی کۆمەڵەدا ١ بۆ ١٠ یەك بۆ دەش نە دەبوو، بەڵام لە کەرکوك دا تەواو بەپێچەوانەوە، ڕێژەی کرێکاران‌و خوێندکارو ڕەنجدەر زۆرینە بوو،لەناو ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەدا.

هەر لەو کۆبوونەوەیەدا بڕیار درا کە ئەڵقەو شانەکانی کۆمەڵە بە شێوەی (فەرشی) ڕێکبخرێ. کۆمەڵە بە پێچەوانەی هەموو حزب و ڕێکخراوەکانی کوردی و عیراقی پێش خۆی و سەردەمی خۆشی ڕێچکەی ڕێکخستنی فەرشی گرتەبەر و ڕێچکەی ڕێکخستنی (هەرەمی) بەلاوەنا.

ڕێچکەی هەرەمی بریتیە لە بەستنەوەی ٣-٥ و زۆرجار زیاتریش ، بەپێی بارودۆخ و شێوەی کاری ئاشکرا یا نهێنی لایەنگر یا پاڵێوراو یا ئەندام پێکەوە، بە یەك سەرۆك شانە و چەند شانەیەك بە یەك شانەی سەرەکی،و چەند شانەیەکی سەرەکیش بە یەك ڕێکخراو کە سنوری ناوچەی (ناحیە) یەك یا گەڕەکێکی گەورەی شاری بوو، و پاشان بەستنەوەی چەند ڕێکخراوێك بە یەك لیژنەی ناوچەوە کە سنووری چالاکی قەزایەك و پاشان بەستنەوە چەند لیژنە ناوچەیەك بە یەك لقەوە ، کە سنوری چالاکیەکەی پارێزگایەکە و تا چەند لقێکیش بە دەزگای سەرکردایەتیەوە.

بەڵام ڕێکخستنی فەرشی یا تەزبیحی بریتی بوو،لە تەنیا دوو کەس لە یەك بازنە یا شانەدا و هەر یەك لەم دوانەش لەگەڵ یەك کەسی تردا لە بازنەیەکی تر بوون و بەو جۆرە و هەر دوو بازنەش یەك کەس لێپرسراوی بووە، کە ئەو لێپرسراوە لە هەر

بازنەیەك تەنیا یەك کەسی دەناسی. بەو جۆرە هیچ ئەندامێك لەناو ڕێکخستنەکانی لە دوو کەس پتری نە ناسیوە.

هەر کەسێ بۆ راکێشان و پەیوەندی کردن پێوەی رەچاو بکرایە، دەبوایە پێش پەیوەندی پێوەکردنی راپۆرتێکی تێر و تەسەلی لەسەر ئەو کەسەی رەچاوی کرد بوو، بنوسیایە (ناوی شوێنی تەواو - پیشە - تەمەن - رابووردوی سیاسی، کەسایەتی کۆمەڵایەتی - هەڵسوکەوتی - حەزو ئارەزووەکانی، ناو و ناوبانگی لەناو خەڵکی ).
گەر پەسەندبکرایە ئەوسا دۆستایەتی لەگەڵ دەگیرا و بێ داوەر پێ بزانێ (بۆچی؟) دەخرایە ئەڵقەی رۆشنبیریەوە.

هەر یەکەمان لەلای خۆمانەوە بەپێی گونجاوی و دەرفەت دەس بەکار بۆین بۆ چوونە ناو (کرێکارەکانی کورە گەنجەکان ، قوتابخانەی ئایینی ، کرێکارانی نەوت کە مابوون ، ناو فەرمانبەرایەتیەکان و کرێکارانی رۆژانەی مەیدانی کارگە لە مەیدانی حەسیرەکە و جووت قاوە بەیانیان کۆدەبوونەوە) ، خوێندکارانی ناوەندی و ئامادەیی بۆ ئەوەی لە شوێنی کارەکەمدا لانی کەم شوێن پێی خۆم بکەمەوە، زۆرم بەلاوە گرنگ بوو، کە لە دەوروبەری خۆمەوە دەستبەکاری رێکخستن بکەم.

چاو دێرێتی خانەنشینی کەرکوك پێك هاتبوو لە -١١- فەرمانبەر کە هەموویان بە رەچەڵەك کورد بوون، بەڵام دوانیان خۆیان بە تورکمان دەزانی و بە کوردییەکی نزیك زاراوەی سلێمانیش دەدوان. دوو فەراش کە یەکیان کورد بوو ، یەکیشیان عەرەب.لەناو کوردەکاندا سەرەتا پەیوەندیم لەگەڵ دووانیان باش بوو، هەولم لەگەڵ دەدان کەپێکەوە بخوێنینەوە، ئەو دوانە ماڵەکانیشیان لەگەڵ ئێمە نزیك بوون و هاتووچۆی خێزانیشمان لەگەڵ یەك پەیدا کردو هەموو رۆژێکیش پێکەوە بەیانیان و نیوەڕوان بە یەك سەیارەی کرێ هاتوچۆی دائیرەمان دەکرد . ئەنجام کاك مستەفای سایەق و شەهید فەیسەڵ تاڵەبانی (شەهید سیروان) و کاك عەدنانم مفاتحە کرد.بەڵام

پاش ٨ مانگ پێکەوە خۆپەروەردەکردن و کاك بەهائەدین فەراشە کوردەکەشم بە جیا لەوان ڕێکخست و پاشان کردمن بە دوو شانەی جیا.

هەر لەو گەڕەکەی خۆمان نانەواخانەیەك هەبوو، یەکێك لە کرێکارەکان کە نان پێوە دەربوو، ڕەچاومکرد بۆ خۆڵی نزیك کردنەوە تا پەیوەندی دۆستانەی تەواوم لەگەڵدا بەست و پاشان ئەویشمان ڕێکخست، ناوی حەمید بوو (شەهید بێستوون کەرکوکی) لە ڕەزگەو مارەدوو شەهید بوو. شانەیەکی ترمان پێکهێنا، لە کاك حەمیدی پۆلیس کە لە شۆڕشی نوێدایە حەمیدی گومرگ ناسراو لە کاك ئەحمەد کرێکار کە لێپرسراوی کەرتی ڕێکخستنی کۆمەڵە بوو، لە ناوچەی چەمچەماڵ لە شۆڕشی نوێدا، و کاك حەمە صالح.

ڕێکخستن لە کەرکوك بەرەو پەرەسەندنێکی باش ڕۆیشت ، کاك فەرەیدون عبدولقادر سەرپەرشتی دەکرد. لە مانگی ١٩٧٣/٥ لە ڕێگەی ڕێکخستنەوە ئاگادار کراین ، کە هەندێ لە ئەندامانی دەستەی دامەزرێنەر و چەند هاوڕێیەکی ئاستی سەرووی کۆمەڵە وازیان لە کار هێناوە، لەوانە ـ کاك نەوشیروان مستەفا بە هۆی سەفەریەوە بۆ وڵاتی نەمسا، هەر وەك خۆشی لە کتێبی (لەکەناری دانوبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ) لاپەڕە ـ١٤ـ ئاماژەی پێکردووە.

شاسوار جەلال کە پاشان بە شەهید "ئارام" ناسرا . لەبەر ئەوەی ڕەوتی کۆمەڵە لەگەڵ بۆچوونی ئەودا ناگونجێ . قەبارەی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لە شارەکانی سلێمانی و کەرکوك و هەولێر زۆر گەشەی کرد بوو، لە هەر دوو ڕووی چۆنایەتی و چەندایەتیشەوە، پێویستی بەوە دەکرد کە:

١ـ سەرکردایەتی کۆمەڵە لە نزیکەوە سەرپەرشتی ڕێکخستنی شارەکانی هەولێر و سلێمانی و کەرکوكو شانەکانی بادینان و بەغداش بکات.

٢ـ کۆمەڵە ئیتر پێویستی بە ئۆرگانێکی ناوەندی خۆی هەبوو، کە لانی کەم بتوانێ بیروڕاکانی ناو کۆمەڵ یەکبخا (وەحدە الفکر).بۆیە بڕیاردرا کە شاری کەرکوك وەك ناوەندێك دیاری بکرێ و بکەوێتە بازنەی پەیوەندی نێوان شارەکان.

### ٧ـ٢ خۆماڵیکردنی نەوتی و هەڵوێستی کۆمەڵە لەسەری.

حکومەتی بەعسی ، پاش وتوویژێکی زۆر لەگەڵ مونۆپۆلەکانی نەوتی ئینگلیزی و فەرەنسی و ئەمریکی و کولبنکیان . لە ١/٦/٩٧٢ دا بڕیاری خۆماڵیکردنی نەوتی عێراقی راگەیاند جگە لە بەشی فەرەنسی کولبنکیان کۆمەڵە بە دەرکردنی بەیانێك هەڵوێستی خۆی لەسەر ئەو خۆماڵی کردنە دەربڕی . کۆمەڵە بەیانێکی تێرو تەسەل و هەمەلایەنەی لەسەر چۆنیەتی خۆماڵیکردن و جۆری خۆماڵی کردن و مەبەست لە خۆماڵی کردن دەرکرد و بە ٣ بەڵگەش روونی کردەوە ، کە نەوتی عێراقی خۆماڵی نەکراوە ، بەڵکو بە بەعسی کراوە.

١ـ لەو رووەوەی کە خۆماڵی کردنی نەوت یەکێکە لە ئەرکە شۆڕشگێڕییەکانی گەل ، کاتێ کە بە شۆڕش یا راپەڕین شۆڕشێکی ئابوری سیاسی کۆمەڵایەتی فەرهەنگی بە ئەنجام دەگەیەنن. واتە لە ڕووی ئابوورییەوە شێوەی بەرهەمهێنان و پەیوەندی بەرهەمهێنان دەگۆڕدرێ بە سوودی هێزی بەرهەمهێنان. بەلام خۆماڵیکردنی نەوتی عێراقی بە بڕیارێکی سەرپێی و سەرووی دەسەلاتدارانی حزبێکی تاکڕە و دکتاتۆر و بیروکرات بێ گەڕانەوە بۆ پرس و رای گەل بێ هیچ جۆرە گۆڕانێك لە شێوەی بەرهەمهێنان و پەیوەندی بەرهەمهێنان ، بەلام بە گۆڕان لە هێزی بەرهەمهێنان بە دەرکردنی کرێکارە کوردەکان و نیشتەجێکردنی عەرەبەکان لە شوێنیان ، بە گوێزانەوەی بەرهەم و سەرمایەی بەرهەمی نەوت لە بانقەکانی مۆنۆپۆلەکانەوە کردن و جورت کرد و بەهێزکردنی لە ڕووی چەك و جبەخانەوە.

خۆماڵیکردنی سامانی سروشتی بە هەموو کانزاکانیەوە بە نەوتیشە کاتی دەکرێ و مانای پڕ بە پێستی خۆماڵی دەگەیەنێ کە بە حوکمی گەل و یاسای گەل و بڕیاری گەل و لەپێناوی سوود و بەرژەوەندی زۆرینەی گەل دابێ و بە شێوەیەکی راست و بنچینەیی لە ژێر دەسەلات و کارتێکەری کۆمپانیا و مونۆپۆلەکانی سەرمایەداری جیهانی دا دەربهێنرێ.

٢- خۆماڵیکردنی نەوت، کاتێ دەکرێ کە پێشەکی نەخشەی چۆنیەتی دۆزینەوەی بازاری ئازاد و بێ داسەپاندن مەرجی لە پەسەندکردن نەهاتوو لە دەستنەدانی سەربەخۆیی و سەربەستی کڕین و فرۆشتنی بۆ داڕێژرابێ و بتوانێ تاسەر بەرامبەر بەپلان و نەخشەی وڵاتانی سەرما یەدرا و مۆنۆپۆلەکان خۆڕاگرێ و تووشی فەساد و قەیرانی ئابوری نەبێ.

حکومەتی عیراقی ، نەك هەر خاوەنی ئەو نەخشە و بیرکردنەوەیە نیە، بەڵکو خۆماڵی کردنەکەش تەنیا بۆ هەڵوێست فرۆشتن و بڕیارێکی سەر پێییە ، کە لە سەرەتاوە بەشی فەرەنسا و کۆلبنکیاتی نەکرد و پاشانیش لە ڕێگەی سۆڤیەت و چەند وڵاتێکی تری سەر بە سۆڤیەتەوە بەپێی بڕیاری بازاڕی مۆنۆپۆلی جیهانی نەوت (ئۆپیك) و بەو نرخەی کە ئەوان سەپاندویانە بەسەر بازاڕی نەوتی جیهاندا، عیراق نەوتی خۆی دەنێرێتە دەرەوە و بەهەمان کۆمپانیاکانی نەوتی خاوەن بەش لە عیراق دا دەیفرۆشێتەوە، واتە چوون لە دەرگاوە کۆمپانیانی بیانی نەوتی لە عیراق کردە دەرەوە ، بەناوی خۆماڵی کردنی نەوتەوە ئاواش لە پەنجەرەوە دەیانهێنێتە ژوورەوە.

٣- لەگەڵ بڕیاری بەناو خۆماڵیکردنی نەوتەوە، دروشمی شۆڤێنیستانە و بەعسیانەی پەیوەندار بە نەوتی عیراقی بەرز کرایەوە (نفط العرب للعرب) کە بە داخەوە زۆربەی پارت و ڕێکخراوە عەرەبی و عیراقیەکان نەك دژی ئەو دروشمە رەگەزپەرستانەیە نەوەستان ، بگرە بە شانازیشەوە پەسەندیان کردووە ، بۆتە دروشمی رەسمی رژێمەکە و لە هەموو بۆنەو و تاور بەیانێکیاندا رەنگی داوەتەوە.

أ- لەو ڕووەوە کە نەوتی عیراق بە تەنیا هی عەرەب نیەو موڵکی هەموو گەلانی عیراقە، دەبوایە بووترایە (نفط الشعب للشعب)

ب - لەو ڕووەوە کە نەوت هەم لە عیراقی عەرەبی و هەم لە کوردستانی عیراقیش هەیە و بە ناو هەموشیان خۆماڵی کراون رەوایە بووترێ (نفط العراق للشعوب العراقية)

ج ـ لەو ڕووەوەش کە بەعس لەسەر کار و حوکمڕانی و بە زۆرەملێ خۆیان بەسەر گەلانی عیراقدا داسەپاندوە و هەرخۆشیان خاوەنی ئەو بڕیارە سەرپێیەن و نەك بە تەنیا نەوت بەڵکو هەموو سامانی سروشتی عیراق و کوردستان لە خزمەتی قایمکردنی دەسەلاتی خۆیان و بەهێزکردنی هێزە سەرکوتکەرەکانیان لە ( مخابرات و أستخبارات و أمن و سوپا) خەرج دەکەن، دەبوایە ئەو لەکە پڕ شەرمەزارییە شۆڤێنیستانەیان بە ناوچەوانی عەرەبدا نە نوساندایە و پێیان ووتایە (نفط العراق للبعث).

ئەوە کورتەی ناوەڕۆکی بەیانەکە بوو ، کە لە ڕاستیدا گەلێ زانیاری و خشتەی ئابووری و ئاماری بەڵگەداری ڕێژەی سوود و زیانی لەو جۆرە خۆماڵیکردنە و ڕێژەی خەرج و داهاتی نەوت و هەڵهێنجان و زیانی زیاد کردنی هەڵهێنجانی تێدا بوو، کە بە داخەوە نەمتوانی بیان نووسم کۆمەڵە لە زۆربەی بۆنە گرنگەکاندا هەڵوێستی خۆی بە دەرکردنی بەیان لەسەریان دەربڕیوە، بۆ نموونە لە مانگی ١٩٧٢/٥ دا بەیانێکی لەسەر هاوبەشکردنی حزبی شیوعی عیراقی لە حوکم لەگەڵ بەعسیەکان دەرکرد و ولانی کەمی مەرجەکانی بەشداریکردنی حزبێکی شیوعی لە حوکم لەگەڵ حزبێکی بۆرژوازی بیروکرات و نەتەوەپەرستی و شۆڤیەنی وەك بەعس باسکرد بوو تیایدا ئەوەی ڕونکردبوەوە لە دیدی م.ل وە کە کەی و چۆن م.ل کان لەگەڵ بورژواو بە تایبەت لەگەڵ چ جۆرە بۆرژوازەیەکدا هاوبەشی لە حوکمدا دەکەن.

## ٢-١شەهابی شێخ نوری و ئاڵای سوور*

**هەروەك لە بەشی ٢-٩ دا ئاماژەم بەوە كردوە كە كۆمەڵە بڕیاریدا:**

أ- ناوەندی كاری خۆی بەرێتە شاری كەركوك ، تا بتوانێ لە نزیكەوە سەرپەرشتی رێكخستنەكانی سلێمانی، هەولێر، بادینان و بەغدا و كەركوك بكات.

ب - دەركردنی ئۆرگانێكی ناوەندی كۆمەڵە.

لە مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٧٣ كۆبونەوەیەكی هەڤاڵانی سەركردایەتی كۆمەڵە و بە بەشداری سێ ئەندامی پێشكەوتووی كۆمەڵە لەماڵی (فەرەیدون عەبدولقادر) لە كەركوك بەسترا كە بریتی بوون لە : "هەڤاڵان شەهاب شێخ نوری ، فەرەیدون عەبدولقادر، شەهید جەعفەر عبدالواحد، حەمەی میرزا سەعید، ئاوات عبدالغفور". ئەوانەش كە بانگ كرا بوون بۆ بەشداریكردن لە كۆبوونەوەكە شەهید عبدولرەزاق (فستق فرۆش) لە هەولێر لەگەڵ شەهید جەعفەردا، ئاسۆی شێخ نوری لە سلێمانی لەگەڵ حەمەی میرزا سەعید، و بەندە لە كەركوك لەگەڵ فەریدون عبدولقادر و ئیحسان (ئەبو شەهاب) دا.

---

*- بابەتەكانی ئەو ژمارەیە واتە ژمارە (٢) ی ئاڵای سوور.

١- چۆنیەتی پەروەردەكردنی كادرو پەیوەندیكردن بەجەماوەرەوە.

٢- كورتەیەك لەسەر ترۆتسكیەت وجیفاریستی و شۆرشی كوبا.

٣- چەپكێك لەكتێبی (مناظرة حول الخط العام للحركة الشيوعية العالمية) كە بریتی بوو لەچەند نامەیەكی ئاڵوگۆڕ كراوی نێوان كۆمیتەی ناوەندی حزبی شیوعی سۆڤیەتیو چینی.

٤- بارزانیو دەرەبەگایەتی كوردی.

٥- شیكردنەوەی چینایەتی كۆمەڵگای كوردی بەوەرگرتنی نمونەیەك لەسەر باری چینایەتی ناوچەی رانیە كە بەندە نوسیبووی.

*سەبارەت بەگرنگی ئاڵای سور لەناو ریزەكانی كۆمەڵەداو بۆگرنگیدانی پتر بەئاڵای سور، سەركردایەتی كۆمەڵە بریاری دا كە لیژنەیەكی رۆشنبیری بۆ سەرپەرشتیكردنی دەركردنی ئاڵای سوور دیاری بكرێ كە لەمانگی ١٩٧٣/١٢ دا بریاری لەسەر دراو پێك هاتن لەشەهاب شێخ نوری، فەرەیدون عبدولقادر، ئیحسان نەجم ، و بەندە.

ئەو کۆبونەوەیە وەرچەرخانێکی گەور ەبوو ،لە ژیانی ڕێکخراوەیی کۆمەڵەدا لە هەردوو رووی چۆنایەتی و چەندایەتیەوە ، کە گرۆتینێکی زۆر بە جۆشی بە باری ڕێکخراوەیی کۆمەڵەدا. لەو کۆبونەوەیە بڕیاردرا کە شەهید شەهاب بە نهێنی بێتە کەرکوك و لە نزیکەوە سەرپەرشتی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە بکات . دابینکردنی شوێنی حەوانەوە و کاری ڕێکخراوەیش بڕیاردرا کە لەلای بەندە و لە ماڵی بەندە بێ بە ناوی نهێنی (خاڵە عوسمان) ەوە . هەر لەو کۆبوونەوەیە بڕیار درا کە ئۆرگانی کۆمەڵە ژمارەی (١) ی (مانگی تەمموز) بە ناوی (ئاڵای سوور) دەربچێ . و بڕیاردرا کە لیژنەیەك بۆ سەرپەرشتی سەرجەم ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە پێك بێت کە هەر لەو کۆبوونەوەیەدا لە شەهید شەهاب، شەهید جەعفەر، فەرەیدون عبدولقادر پێك هات . بڕیار درا کە سەرپەرشتی کردنی ڕێکخستنی هەولێر بە شەهید جەعفەر و سلێمانی بە ئاوات عبدولغەفور و کەرکوك بە فەرەیدون عبدولقادر بسپێردرێ.

ژمارە یەکی "ئاڵای سوور".لە مانگی تەمموزی ١٩٧٣ دا دەرچوو.کە یەك لە بابەتەکانی بریتی بوو لە هەڵسەنگاندنێکی وردی "بەرەی نیشتمانی و نەتەوەیی پێشکەوتووخواز" ی نێوان حزبی بەعسی و حزبی شیوعی، و هەڵوێستی کۆمەڵە لەسەری ئاڵای سوور بابەتەکانی بریتی بوون ، لە چۆنیەتی گەشەپێدانی کۆمەڵە، هەڵوێست لەسەر رووداوی کات ، بابەتی تیۆری وەرگێڕدرا و بە تایبەتی لە نوسینەکانی م. ل و ماوهۆشی منە و کێم ئیل سونگ.

لە مانگی ١٩٧٣/١١ کۆمەڵە لە ژمارە (٢) ی ، ئاڵای سووردا هەلوێستی بە ڕاشکاوی لەسەر شەڕی ٧٣/١٠/٦ ی نێوان جولەکەو عەرەب دەربڕی، کە گەوهەری بابەتەکە خۆی لەم خاڵانەی خوارەوەدا کۆبەند دەکرد.

أـ پشتگیریکردنی گەلی فەلەستین لە خەباتی رەوایدا بۆ رزگارکردنی خاکی بە زۆر داگیرکراو.

ب ـ دەربڕینی ناڕەزایی و دژایەتیکردنی تیۆر و فەلسەفەی زایۆنیزمی وەك فەلسەفەی داگیرکەرو خۆ داسەپێنەر و فراوان خوازی (أستعمار أستطاني توسعي).

ج ـ پەچە هەڵماڵین لە ڕووی دەوڵەتە عەرەبیە داکۆککەرەکان لە فەلەستین ، لە ڕووی ناسنامەی چینایەتیان و جۆری حوکمڕانیان و مەبەست و خواستیان لە داکۆکی کردن لە فەلەستین و پاشان چۆنیەتی گرێدانەوەی هەر ڕێکخراوێکی فەلەستینی بە یەکێك لەو دەوڵەتە عەرەبیانەوە و پارچە پارچە بوونی ڕێکخراوەکانی رزگاریخوازی فەلەستینی و پابەندی هەر ڕێکخراوێکیان بە سیاسەت و خواست و ویستی جیاجیای دەوڵەتانی عەرەب (عێراق ـ سوریا ـ مصر ـ لیبیا ـ تونس ـ مغرب... هتد)

د ـ کێشەی فەلەستین لە نێوان گەمەی دەوڵەتە عەرەبیەکان و سوڤیەت و وولاتانی بە ناو سوسیالیستی و نێوان وڵاتانی سەرمایەداری.

هـ ـ پێشبینیکردنی ئەنجامێکی نەشیا و بە خەباتی ڕەوای گەلی فەلەستین ، سەبارەت بە دەستێوەردان دەوڵەتە عەرەبیەکان لە کێشەکەیان و پاشان گرێ دراوی بە ئەو دەوڵەتە عەرەبیانەش بە وولاتانی سەرمایەداری جا سیاسی یا ئابوری ، کە ئەوانیش پاڵپشتی هەرە بە هێزی زایۆنیزمی و دەوڵەتی ئیسرائیل بوون.

لە مانگی ١٩٧٤/١ دا کۆمەڵە لە ژمارە(٣)ی ئالای سووردا کە دوا ژمارەی بوو ، وتارێکی چڕ و پڕی لەسەر باری ئەوسای ووتووێژی نێوان مەلامستەفا و بەعس بڵاوکردەوە ، لەژێر ناونیشانی (ڕەوتی ووتووێژ بەرەو کوێ ؟ و هەڵوێستمان لە کاتی شەڕ بوونەوەدا، لەو ووتارەدا بەپێی ئەو باروودۆخە ئاڵۆزەی عێراق و کوردستان، و ئەو گرژی و توندییەی نێوان پارتی و بەعس ، و لەبەر تیشکی مشتومڕە چڕوپڕە نا دۆستانەکانی رابوردووی نێوان (التآخي، الثورة) دا ، و بێ ئەنجام مانەوەی کێشەکان ، پتەوتر و خورتر بوونی پەیوەندی نێوان مەلا مستەفا و ئێران و ئیسرائیل و ئەمریکا لەلایەك و هەنگاونانی خشکەیی بەعسیەکان بۆ جێبەجێ کردنی پلانە ستراتیژیەکانی دژ بە شۆڕش و گەلی کورد ، هەر لە ساڵی ١٩٦٨ وە تا ئەو کاتە و دواتریش ، بە خۆ قایمکردن و تەیارکردنی سوپاکەی بە نوێترین چەك و تفاقی جەنگی سۆڤیەتی و ئەڵمانی و ئەمریکی... هتد، گۆڕانکاری لە سیاسەتی ناوخۆ و دەرەوەی حکومەتی عێراقی . ئەمانە هەمووی پێشبینی دەسپێکردنەوەی شەڕی دەکرد . لەگەڵ هەڵسەنگاندنی وردی رژێمی بەعسی لە ڕووی شێوازی حوکم ناسنامەی

چـینایەتیان و رەفتـاری ئـەم جارەیـان لـە شـەڕداو مەبەسـتی سـەرەکیان لـە شەڕکردنەوەدا ، هەر لە هەڵتەکاندنی شۆڕش و کاولکردنی کوردستان تا شێواندنی ئـابوری کوردسـتان و سـیمای نەتەوایـەتی گـەلی کـورد و هەڵتەکانـدنی بنـەماکانی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و کلتوری کوردی لە خـوارووی کوردسـتاندا. هەڵسەنگاندنی سروشتی چینایەتی سەرکردایەتی پارتی و عەقڵی داینـەموی هەڵسوڕاندنی شۆڕش بە تایبەت مەلا مستەفا ، و پاشان پەیوەندییان بە ئێران و ئـەمریکا و ئیـسرائیلەوە ، و لێکدانـەوەی وردی سـود و زیانـەکانی شـەڕبوونـەوە و هەڵسەنگاندن و تـاوتوێ کردنـی هـەردوولای شـەڕ لـە تـای تـەرازووی بەرژەوەنـدی گـەل و کرێکـاران و رەنجدەراندا، کۆمەڵە لە بڕیاریدا بە بەشداری کردن لە شۆڕشدا ، بـەو قەبارەیـەی کـە هەیەتی و ئەوەی روون کردەوە کە:

– شەڕی ئەمجارە شەڕی مان و نەمانی گەلێکی ٤ ملیۆنیـە، شـەڕی لـەناوبردن و لـە ڕەگوریشە دەرێنانی بزوتنەوەی رزگاری نیـشتمانی یـا خـۆراگری و چۆکدادان بـە دوژمن و پێ سەلماندنی مافەکانیەتی.

– شەڕی هێرش و پەلاماری رژێمی بەعسی دکتاتۆر و فاشیە ، نەك بۆ سـەر بـارزانی یا پارتی ، بەڵکو بۆ سەر هـەموو گـەلی کـوردە ، نـەك هـەر بـۆ سـەر ناوچـەکانی ژێـر دەسەڵاتی پارتیە، بەڵکو بـۆ سـەر هـەموو کوردسـتانە ، فرۆکـە جەنگیـەکان و تۆپـە دوورهاوێژەکان و سوپا کاولکەر و داگیرکەرەکان و دەزگـا سـەرکوتکەرەکان هـەرگیز جیـاوازی لـە نێـوان مەلامـستەفا و کـوردێکی بـێ لایـەن ، لـە نێـوان پێـشمەرگەیەکی چـەکدار و کـوردێکی بـێ چـەك ، لـە نێـوان کەسـێکی نـاو سـەنگەر و پیرێکـی پەککەوتەی دانیشتوی ماڵی خۆیدا ناکات.

بۆیە کۆمەڵە بڕیاریدا ، کە لەدەسپێکردنەوەی شەڕدا، بە هەموو توانایـەوە پـشتگیری لە بەرەی گەل بکا بەرگری لـە بزوتنـەوەی رزگـاریخوازی نیـشتمانی و بەرژەوەنـدی زۆرلێکراوان بکات دژی رژێمی داگیرکەر و جینۆسایدی کوردستان.

ئالای سـوور تەمـەنی زۆر کـورت بـوو، لـە تـەمموزی ١٩٧٣ لـە دایکبـوو ، لـە مـانگی کانونی یەکەم ١٩٧٤ کـە ژمـارەی " ٣ " ی لـێ دەرچـوو ، ئـیتر ژمـارەی تـری لـێ

دەرنەچوو . کە ئەویش بە هۆی دەستپێکردنەوەی شەڕی مانگی ئاداری ساڵی ١٩٧٤ وە بوو ، کە زۆربەی سەرکردایەتی کۆمەڵە و لیژنەکانی سەرپەرشتیکاری ڕێکخستنەکانی شارەکان چوونە ناو شۆڕش.

بە پلەی سەرەکی شەهابی شێخ نوری خۆی سەرپەرشتی ئالای سووری دەکرد و زۆربەی ووتار و بابەتەکانیشی هەر خۆی دەینوسین بە هاوکاری و بەشداری شەهید جەعفەر عبدولواحید و فەریدون عبدولقادر لە نوسینی داو و بەندەش لە وەرگێڕان و هاوکاریکردنی ئیحسان نەجم (ئەبو شەهاب) لە رونیوکردنیدا بەو رونیو سەرەتاییەی کە کۆمەڵە خۆی دروستی کرد و لەو ماوەیەی کە شەهید شەهاب لە کەرکوك بوو، ڕێکخستنی کۆمەڵە زۆر گەشەی کرد ، چ لە ڕووی چەندایەتی و چ لە ڕووی چۆنایەتیشەوە ، کرێکاران و خوێندکاران بەشی هەرە زۆری ناو ڕێکخستن بوون.

لەبەر ئەوەی ماوەی پتر لە ٨ مانگ زۆربەی کاتم ، ڕۆژانە لەگەڵ شەهید شەهاب دا بوو ، بەپێویستی دەزانم لێرەدا کە جێی خۆیەتی ، هێندەی من شەهید شەهابم ناسیبێ بۆ خوێنەری بەڕێزی بناسێنم ، بە تایبەتی ئەوانەی کە هەر لە دوورەوە گوێ بیستی ناوی شەهاب بوون، و بەوانەش بسەلمێنم کە باش شەهابیان ناسیوە و بەلام هەرگیز وەك شەهاب خۆشی بە گەلی کوردیان نە ناساندوە ، کە هیوادارم هۆکەی نەگەڕێتەوە بۆ خۆپەرستی.

شەهید شەهاب پیاوێکی هێمن و لەسەرخۆ دەم بە پێکەنین ، لە گفتوگۆدا لەگەڵ بەرامبەرەکەی هەمیشە بێ دەنگ و گوێ ڕاگر لە بیروڕای بەرامبەرەکەی ، نەك هەر دور بوو لە سەپاندنی بیروڕای خۆی ، بەڵکو دژی داسەپاندن و زاڵکردنی تاك بوو ، بەسەر کەسی تر دا، ڕێزی زۆر لە بیروڕای جیاواز لە هی خۆی دەگرت ، پێی وابوو ، بیروڕای ڕاست ئەوەیە، کە زۆربە پەسندی بکات ، گەرچی هەڵەش بێت. هەر بۆیەش لە ساڵی ١٩٧١ دا لە سەرهەڵدانی بیری عیراقچێتی لەناو کۆمەڵەدا ، هەگیز بڕوای بەوە نەبوو، کە بە بڕیاری سەرپێی سەرکردایەتی ململانێی نێوان کوردستانی

و عیراقی ناو کۆمەڵە چارەسەر بکرێ ، پێی وابوو، بڕیاری سەرەوە (قرار فوقی) پەیڕەوکردنی دکتاتۆریەتی حزبیە و دوورە لە ڕاستی ، بۆیە و لەسەر داوا و سووربوونی شەهید شەهاب بڕیاردرا کە هەردوو بیروڕاکە لە کوردستانی و عیراقی کۆمەڵە ، بخرێتەوە بەردەم ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە بۆ مشتومڕ لەسەر کردن و سەلماندن بە یەکتری و بڕوابوون ،بە بیروڕاکە و پاشان گێڕانەوەی ئەنجام بۆ بڕیاری زۆرینە.

ئەو هەڵوێستە دیموکراتیانەیەی شەهاب وای لەو هەڤاڵانەی ، کە بڕوایان بە بەعیراقی کردنی کۆمەڵە هەبوو ، کرد ، کە خۆیان لە کۆمەڵە دووربخەنەوە و بچنە دەرەوە و کە ڕووی بنەما و ناسنامەی کۆمەڵەوە شەهاب بڕوای وابوو ، کە پێویستە کرێکاران بناغە و گەوهەری ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە بن و ڕەنجدەران و خوێندکاران و بۆرژوازی بچوکیش جەماوەری کۆمەڵە بن . هەر بۆیەش هەمیشە داوای لە ڕێکخستنی شارەکان دەکرد ، کە قورسایی خۆیان بخەنە سەر مەڵبەندە کرێکارییەکان بۆ ڕێکخستنی کرێکاران لە ڕیزەکانی کۆمەڵە دا.

شەهید شەهاب چەندین جار بە کردەوە ئەو بۆچوونەی خۆی سەلماند ، هەر لە بەسرا لە ساڵی ١٩٦٩-١٩٧٠ کە وەك کرێکارێك لەناو ماسیگرە هەژارەکانی بەسرا دا کاری دەکرد ، لە کەرکوك ئەو ماوەیەی کە خەباتی نهێنی دەکرد ، زۆربەی ڕۆژەکانی هەفتە جلوبەرگی کاری دەپۆشی و دەرۆیشت بۆ کار بۆ ناو کرێکارانی کورەی گەچەکان یان بۆ ناو کرێکارەکانی مەیدانی حەسیرەکە و جوت قاوە.

شەهید شەهاب توانایەکی یەکجار بە هێزی هەبوو ،لە قەناعەت هێنان بە بەرامبەرەکەی لە کاتی وتوویژد . زۆرجار ئەو توانایەی لە چاککردنی کەسانێکدا بەکار دەهێنا ، کە تووشی لادان ببوون لە کۆمەڵدا ، دوو نموونەی ئاشکرا لای زۆربەی ئەو کەسانەی کە ئەو لێوەی نزیك بوون ، دێنمەوە.

١ـ له كەركوك لـه گـەڕەكی ئیمـام قاسـم دووكـانێكی تەنەكەچـێتی بـچووك هـەبوو ، خاوەنەكەی پیاوێكی هەمیشە سەرخۆش و تەمەڵ و كار نەكەر بـوو. شـەهید شـەهاب بوو ، بە هاوڕێ و جاروبار دەچـوە لای دادەنیـشت ، لـە ماوەیـەكی زۆر كەمـدا كـاری كردە سەر تەنەكەچییەكە و وازی پێ خواردنەوەی بەردەوام و تەمەڵی هێناو كردیەی دۆست و پاشان هاوڕێ كۆمەڵە.

٢ـ له كاتی بەندیان لەگەڵ دوو سێ شەقاوە و چەقۆكێش و (گـەردن كلفتـی) كـوردی ئەویدا له بەندیخانە پێكەوە دەبن، بە جۆرێك كاری تێ كرد بوون، كە له سـاڵی ١٩٨١ دا لەگەڵ فەرەیـدون عبـدولقادر چـوینەوە سـەقز و هـەواڵی پرسـین و دۆزیماننـەوە ، كەسـانێكی تـر بـوون ، خـۆم گـوێم لێیـان بـوو ، كـە ووتیـان: ( ئێمـە ئـەم ژیانـەی ئێستامان داڕێژراوی كـاك شـەهابە بۆمـان ، و گـەر ئـەو نەبوایـە هـەر سەرلێشێوا و چارەگرانی ناو كۆمەڵ دەبووین ). شەهید شەهاب بـڕوای زۆر بـە كـاری بـە كۆمـەڵ هەبوو، تەنانەت لەناو ماڵیشدا ، ئەو ماوەیەی كە لە ماڵی بەندە خەباتی ژێـر زەمینـی دەكرد هەرگیز بەوە قایل نە دەبوو ، كە ژن تەنها لە ماڵەوە كار بكات ، هاوكارییـەكی لە ڕادەبەدەری كاری ناو ماڵی دەكرد ، له سەرەتاوە من دەمویست ڕێگەی نەدەم كـە هیچ كارێك بكا و هاوكارییەك بكات، بەڵام منیشی وا داری كار كردن كرد له ماڵەوە. ئەو كاتە یەك منداڵمان هەبوو ، بەناوی (سروشت) و ئەو ماوەیەی كە دایكی ، بـۆ كـار دەچوو بۆ قوتابخانە وەك مامۆستا و منیش دەچووم بۆ دائـیرە ، شـەهید شـەهاب بە جۆرێك ئاگاداری سروشتی دەكرد ، كە لە ماڵ بونایە.

شەهید شەهاب بڕوای تەواوی بە یەكسانی نێـوان ژن و پیـاو هـەبوو، پـێی وابـوو، كۆمەڵەی چاك ئەو كەسەیە كە بـە بـڕواوە خـۆی لـە ژنەكـەی جیانەكاتـەوە لـە هـیچ ئەرك و فەرمان و مافێكدا. و هەمیشە دووبارەی دەكردەوە كە گەر لە ئیشەوە له ناو خۆمانـەوە ، لـە ماڵـەكانی خۆمانـەوە لـەناو دایـك و خوشـك و ژنـانی كـەس و كـاری خۆمانەوە كار نەكەین و نـەیان خەینـە سـەر ڕێبـازی كۆمەڵـە و بـە كـردە بۆیـان نـە

سەلمێنین کە کۆمەڵە پشتیوانی بە هێزی خەباتی ژنانە، بۆ یەکسانی و وەك یەکی ژن و پیاو، لە خەباتی جەماوەریماندا سەرکەوتوو نابین . چەندین جار کە خوالێخۆشبوو (نازەنین) هاوسەری شەهید شەهاب دەهات بۆ لای بۆ سەردانی ، وەك پیشەی زۆر ژن دڵتەنگ و بێ زاری خۆی دەردەبڕی و دەکەوتە نارەزایی و گلەیی و گازەندە دەربڕین ، بەڵام بۆ یەك ساتیش هەڵچونێکم بە ڕەنگ و روو هەڵوێستی شەهابی سەرکردەوە نەدیت.

شەهید شەهاب بەردەوام سەرزەنشتی ئێمەی دەکرد ، لە هەڵسوکەوتمان لەگەڵ هاوسەرەکانماندا. شەهید شەهاب بڕوای تەواوی بە بیرو بۆچوونەکانی خۆی هەبوو، لە هەموو کات و سات و زەمان و زەمینێکدا هەوڵی دەدا پەیڕەوی بکات.

لە مانگی ١٩٧٤/٣ دا هەستم بەوە کرد بوو ، کە سیخوڕەکانی ( أمنی کەرکوك) چاودێریم دەکەن . شەوێك بۆ کاك شەهابم باسکرد ، لە وەڵامدا پێی ووتم: "گەر گیرای ، بە دار و دەستەی ئەو رژێمە بڵێ ، هەر وەك چوون مەلا مستەفا هەرگیز وەك پیاوێکی دینی عەقڵ عەشایەری رەفتار دواکەوتووی سەردەم ناتوانێ سەرکردایەتی خەباتی گەلی کورد بکات، ئێوەش وەك بەعس ، حزبێکی دکتاتۆری خۆداسەپێنەر و رەفتار فاشی ، ناتوانن تا سەر خۆتان بەسەر گەلانی عراقدا بسەپێنن"

پێم ووت :" خۆ گەر بگیرێم لە دەوڵەتێکی دیموکراتیدا نیم تا بمبەنە دادگایەکی کراوە و ئاشکرا و دادپەروەرانە دادگایم بکەن ، تا بتوانم ئەوە بڵێم و جەماوەر گوێ لە بۆچوونەکانم بگرێ؟".

پێی ووتم: " گەر کۆمەڵە بی دەبێ لە هەموو کات و ساتێکدا راستگۆ بی لەگەڵ بیروباوەڕ و بۆچوونەکانتا ، هەمیشە بیر لە بەرژەوەندی کۆمەڵە و گەلەکەت بکەیتەوە".

من ئەو کاتە وامدەزانی ئەو گفتوگۆیەی نێوانمان تەنیا بۆ ورەبەرزکردنەوە و بە سەربردنی گفتوگۆی ئەو شەوەیە.

بەڵام: شەهید شەهاب لە بەندیخانەدا ، نەك هەر راستگۆی خۆی لە دەربڕینی بیروڕاکانی دا سەلماند ، بەڵکو دەرسێکی ئەوتۆی جەلادەکان و سەرانی رژێمی بەعسی دادا ، کە مێژووی زیندانەکانی عیراقی تا ئەو کاتە بە خۆیەوە نەدیبوو ، نەك هەر وەك سەرکردەی کۆمەڵە رابەری خەباتی بێ وچان و پڕ لە قارەمانێتی و سەربەرزی و نەبەزینی هاوڕێیانی کۆمەڵەی لەناو زینداندا کرد، بەڵکو بووە پێشەنگی تێکۆشانی هەموو حزبەکانی تریش لەناو زیندانەکانی بەعسدا . سەروەری داهێنان و پەیڕەوکردنی دروشمی (کەم بژی ، کەڵ بژی) بەخۆی رەوابینی ، کە بوو بە رێچکەی هەموو هەڤاڵانی تری کۆمەڵە لە پاش خۆی و تا راپەڕین و تا شەهید کردنی کۆمەڵەش.

شەهید شەهاب لە ئیمانەوە لە بڕواوە لە ناخی بیر و هۆشمەندییەوە بڕوای بە خەباتی چینی کرێکاران و چەوساوە و گەلانی ژێر دەستە و وولاتانی داگیرکرا و هەبوو، هەر تیۆر نەبوو، بەڵکو لای ئەو پراکتیك بوو ، پێی وا بوو،لە هەر شوێنێکی ئەم جیهانە شۆڕشێکی چینایەتی، نەتەوەیەتی ، وولاتپارێزی هەبێ ، لە پێناو رزگاری چینایەتی ، نەتەوەیی ، شکستی نیزامُی ، دەبێ کۆمەڵە هەوڵدا پەیوەندی لەگەڵدا دروست بکا، هاوکاری بکات و پشتیوانی بکات ، هەڵوێستی خۆی لەسەر دەربڕێ.

هەر بۆیەش پەیوەندییەکی توندوتۆڵی بە شۆڕشی فەلەستین و بە تایبەت بە جۆرج حەبەش و بە شۆڕشی زەفار و بە شۆڕشی ئەریتریاوە هەبوو.لە مانگی ١٩٧٣/١٠ نوێنەرێکی بەرەی گەلی رزگاری ئەریتیری ، کە ئەو کات (عثمانُ سالح سبی) رابەرایەتی دەکرد، هاتە کەرکوك و لەماڵی بەندە کۆبونەوەی لەگەڵ نوێنەرەکە کراو پاشان لەو توانا کەمەی ئەو کاتی کۆمەڵە یارمەتیان درا*. بە دواداچوونی نوسین

---

*- لەهەوەڵی مانگی ١٩٧٤/٤ دا تعلیمات لەسەرکردایەتیەوە دەرچوو کە (ئەو شەڕە، شەڕی ڕژێمە لەگەڵ هەموو کورد، وە پشتگیریکردنی مافە رەواکانی گەلی کوردیش بەبەشداری بوون لەوشەڕەبۆ بەرگریکردن لەلەناوبرنی کوردو کوردستان دەکرێ، بۆیە سەرەڕای هەڵوێستی رونو ئاشکراتان لەسەر پارتیو سەرکردایەتی بارزانی. بڕیارماندا کە.

هەر هاوڕێیەکی کۆمەڵە دەیەوێ بەشدار لە شۆڕشدا بکات ئازادە بەمەرجێ:—

لەسەر شەهید شەهاب ( ژیانی ، ژیانی سیاسی ، بیروبۆچوونەکانی خەباتی شاخ و شاری ، ئاشکراو نهێنی ، ئاوارەیی و دەربەدەری، نەتەوەیی و نێونەتەوەیی خەباتی ئازادی و نێو بەندیخانەی، نە بە من و نە لێرەش دا دەکرێ.
**ئەوەندە دەڵێم : (شەهابی شێخ نوری، ئەو سەرکردە و رابەرەی کۆمەڵە و ئەو قۆناغەی خەباتی رەنجدەران بوو ، کە دژی دکتاتۆری و خۆداسەپاندن ، دژی لوتبەرزی لە خۆبایی بوون، دژی چەوساندنەوەی چینایەتی ، نەتەوایەتی ، کەسایەتی ، رەگەزی بوو ، دژی پاکتاوکردن ، تیرۆر ، پاوانکردن ، شەڕی براکوژی بوو).**

## ٢-١١هەڵگیرساندنەوەی شەڕ۔ بەندیخانە.

لە مانگی ١٩٧٤/٣ دا هە روەك لە کتێبی (شۆڕشی ئەیلول) دا ، بە درێژی باسم کردووە . هەموو هێماکانی دەنگی دەسپێکردنەوەی شەڕ و کۆتایی قۆناغی ٤ ساڵەی نە شەڕ و نە ئاشتی رادەگەیاند . کۆمەڵە وەك رێکخراوێکی ساوای تەمەن کەمتر لە چوار ساڵەی نهێنی و کەم ئەزموونی پراکتیکی بارودۆخی خەباتی چەکداری ، نەك

---

أ۔ چوونە دەرەوەی کارنەکاتە، سەر شێواندنی کاری رێکخراوەیی لەناوچەکەیدا.
ب ۔ ئەندامێکی کاریگەرو چالاك بێ، لەڕووی کارتێکردنی کۆمەڵایەتیەوە، واتە شارەزای تێکەڵ بوون بەجەماوەرو پەروەردەکردنی جەماوەربێ.
مەبەست لەبەشداریکردنی شۆڕش ئەوەیە.
أ ۔ بەشداریکردن لەبەرگریکردن لەشەڕی مانو نەمانی کورد.
ب ۔ رووناك کردنەوەی بیری دانیشتوانو پێشمەرگە بەدروستکردنی گیانی بەرگریو هەوڵ دان بۆ گرتنە دەستی جڵەوی هێڵی راستی خەبات.
ج ۔ بەهێزکردنی کادرانی کۆمەڵە لەڕووی کاری ناو جەماوەری جوتیاریو پاشان کاری پێشمەرگانەو شارەزابوون لەشەڕدا.
د ۔ گەشەپێدانو پەرەپێدانی رێکخستنەکان کۆمەڵە لەناو جوتیارانو توێژەکانی تری کۆمەڵ کە لەشۆڕشدان، دوور لەترسو لەرزی جەورو ستەمی رژێم.

هەر بێ لایەن و بێ هەڵوێست نەمایەوە لە ئاست بارودۆخە دراوەکەدا، بەڵکو نەشی ویست لە پەراوێزی رووداوەکانی ئایندەدا بمێنێتەوە.
کۆمەڵە هەر لەو مانگەدا لە ١٩٧٤/٢/١٧ دا کۆبوونەوەیەکی نیمچە فراوانی کرد و بڕیاریدا ، کە سەرکردایەتیەکی تایبەت بە شارەکان پێك بێنێ و نیمچە ئۆتۆنۆمیەکی لە کاری رێکخراوەییدا هەبێ ، بە ناوی (کۆمیتەی رێکخستنی شارەکان) هەر وەك بڕیاریش درا. کە جگە لە شەهید شەهاب و شەهید جەعفەر، هەموو ئەندامانی سەرکردایەتی و زۆربەی ئەندامانی تری رێکخستنەکانی کۆمەڵە ، کە دەکرێ و دەتوانن بەشداری شەڕی چەکداری بکەن، بڕۆنە دەرەوەو بۆ ناو ریزەکانی شۆڕش.
لە کۆتایی مانگی ١٩٧٤/٣ دا هەموو ئەو هەڤاڵانەی بڕیار بوو، بڕۆن لە هەموو شارەکان رۆیشتن و کۆمیتەی شارەکان بە سەرپەرشتی شەهید شەهاب کەوتە سەرپەرشتی کردنی رێکخستن ، بۆ پاراستنی رێکخستنی شارەکان ، بڕیاردرا کە هیچ جۆرە پەیوەندییەك لە نێوان سەرکردایەتی و هەڤاڵانی شاخ و نێوان رێکخستنی ناوەوەی شارەکان نەبێ و تەنیا شەهید شەهاب ئەڵقەی پەیوەندی نێوان هەردوو رێکخستنی شاخ و شار بێ.
سەرەتا لە کەرکوك بڕیاردرا کە هەڤاڵان فەرەیدون عبدولقادر، علی بچکۆل و حەمید شورتە (حەمیدی گومرگ) و بڕۆنە دەرەوە ، کە فەرەیدون و علی بچکۆل لە پێشەوە رۆیشتن وەلامیان ناردەوە ، کە بەندە نەچێتە دەرەوە، سەبارەت بەو بڕیارەی کە پاراستن دابووی دژی من و لەسەر راپۆرتی حەمە رەحیم (هەڤاڵ جوجەڵە، پاشان خاڵە حاجی) کە تاوانی ئەوەی دابوە پاڵ من .کە گوایە من لە حزبە داتاشراوەکەی ستار تایەر شەریف دا کار دەکەم.
بۆیە لیژنەی شاری کەرکوك پێکهێنرا لە هەڤاڵان ئیحسان نەجم ـ ئەبو شەهاب، ئەحمەد کرێکار، بەندە . بە سەرپەرشتی شەهید شەهاب ، ئەم لیژنەیە تا ١٩٧٤/٥/٢٧ کاری خۆی کرد.

له ١٩٧٤/٥/٢٨ دا لەناو ژووری دائیرەدا گیرام و برامە بەندیخانەی (أمنی کەرکوك) رێکخستنی دوو لە فەرمانبەرانی دائیرەکە و فەراشی دائیرەکە هەڤاڵ بەهائەدین ، بۆ ساتی گرتنەکەم کاردانەوەیەکی گەلی سوود بەخشی هەبوو . هەر پاش گرتنی من ، بەهائەدین بە بیانوی بردنی پۆستی دائیرەوە بە ماتۆرەکەی چوو بوو، بۆ ماڵی ئێمە و لە گرتنی من ئاگاداری کرد بوون، جگە لەوەش هاوکارییەکی زۆری دایکی سروشتی کرد بوو ، بۆ گوێزانەوەی خاڵە عوسمان* (شەهید شەهاب) و هەموو دیکۆمێنتەکان بۆ ماڵێکی بەرامبەرمان کە ماڵی هونەرمەندی ناسراو بە ناوبانگی کورد (مەدحت کاکەیی) بوو. ئەم کارە وەك هەنگاوی یەکەم لە نەدانی بەڵگە بە دەست رژێمەوە لە کاتی پشکنیندا ئەنجام درا بوو.

سەبارەت بەوەی کە بەندە یەکەم ئەندامی کۆمەڵە بوو ، لە بەندیخانەی رژێم دا تا ئەو کاتە و ئاگاداری تەواوی لیژنەی رێکخستنی شارەکانی کەرکوك و سلێمانی و هەولێرم هەبوو، هەڤاڵان مەترسی ئیعتراف کردنی منیان لا دوست ببوو . بۆیە هەم شەهید شەهاب و هەم ئیحسان نەجم و چەندین هەڤاڵی تریش لەوانە شەهید فەیسەل

---

*- ناوی کاك شەهاب نرا (خاڵە عوسمان) پاش گەڕانەوەی بۆ کوردستانو پاشان بۆ کەرکوك کە لە ماڵی ئێمە نیشتەجێ بوو بۆکاری ژێرزەمینی.

- وابلاوکرایەوە لەناو گەڕەکەکەدا کە خاڵە عوسمان خاڵی شوکری هاوسەرمەو خەڵکی لادێیەکی بازیانەو خێزانەکەی مردووەو بێ کەسەو هاتۆتەلای خوشکەزاکەی ئیتر ناوی خاڵەعوسمانی بەسەردا برا.

لەپاش چوونە دەرەوەی فریدون برادەرانی تر لەسەرەتای مانگی ١٩٧٤/٣ تا رۆژی گرتنم، هەموو بەیانو بلاوکراوەو نامەکانی سەرکردایەتی کۆمەڵە کە کاك شەهاب بەرپرسی بوو لەڕێگەی بەندەو شوکری هاوسەرمەوە لەکەرکوکو بۆ سلێمانیو بۆ هەولێر بۆلای جعفر عبدالواحد دەبرا، بەتایبەتی لەدەسپێکردنەوەی شەڕدا دوشەکەڵەی سروشتی کچەو پەڕۆ پاتاڵەکەی ئەومان بەکاردێنا بۆشاردنەوەیان.

تاڵەبانی لە کەرکوک ڕۆیشتبوونە دەرەوە و لە سلێمانی و هەولێریش تا ماوەیەك هەندێ هەڤاڵ خۆیان حەشاردا بوو.

بە ڕێکەوت ئەو ڕۆژەی کە من گیرام ، هەڤاڵ ئاسۆی شێخ نوری کە ئەندامی لیژنەی شاری سلێمانی بوو، بۆ کاری کۆمەڵە هاتبووە کەرکوک و بازاڕی حەسیرەکە، سەیارەیەکی کرێ دەگرێ و پێی دەڵێ بیبات بۆ دائیرەی تقاعد، لە ڕێگا سایەقەکە هەست دەکا کە ئاسۆ خەڵکی کەرکوك نیە و زمانی خەڵکی سلێمانیە، لێ دەپرسی کە بۆ لای کێ دەچێ ؟. بەڵام ئاسۆ خۆی نادا بە دەستەوە دەڵێ کاری تقاعدیم هەیە، سایەقەکە پێی دەڵێ: گەر بۆ لای برایم جەلال دەچی؟ مەڕۆ ؟ ئەمڕۆ بەیانی زوو گیرا . ئاسۆ بەپەلە دەڵێ :باشە. با بگەڕێنەوە ئەگەر ماڵەکەیان دەزانی بمبە بۆ ماڵیان خێزانەکەی خوشکمە؟. سایەقەکە پێی دەڵێ: ماڵیان دەزانم و هەموو ڕۆژێ من دەیبەم بۆ دائیرە لەگەڵ دوو سێ فەرمانبەری تردا و دەشیان هێنمەوە. بە ڕێکەوت "ئاسۆ" تووشی ئەو سایەقە دەبێ کە هاوڕێی خۆمان بوو . گرتنی من تا چەند ڕۆژێك بارێکی نا ئاسایی بۆ ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە دروستکرد. بەڵام پاش چەند ڕۆژێك کە ڕژێم لە گرتنی مندا هیچ هەنگاوێکی نە نابوو، بۆ گرتنی کەسانی تر یا گەڕان بە دوایاندا، ئەوسا هیوربوونەوە زانیبوویان کە هیچم نەدرکاندووە.

نامەوێ لەسەر باری ژیانی بەندیەکانی بەندیخانەکانی ڕژێمی بەعس و ڕەفتاری جەلادەکانیان لە گەڵیاندا و باری دەرونی و بژێوی و تەندروستی باسدەکەم . ناشمەوێ سەبارەت بە جۆرەکانی ئەشکەنجە و شەرە دەروونیەکان و سوکایەتی پێکردنەکان بنوسم، چونکە پێم وایە لە وەتەی دەسەڵاتی بەعسی حوکمڕانە لە عیراقدا، زۆربەی تێکۆشەرانی هەموو حزب و ڕێکخراوەکان ئەو بارەیان دیوە و بگرە دەیان بڵاوکراوە و کتێبیان لەسەر نوسیوە.

ئەوەندە دەڵێم لە ماوەی ٤ مانگدا وایان لێکردم کە تا ئێستاش پاشماوەی ئەشکەنجەکانیان پێوەم دیار بێ (نەخۆشی بڕبڕەی پشت و چاوکزی و شەوکوێری).

له ١٩٧٤/٩/٣٠ دا پاش ئەوەی هیچ بەڵگەیەكم نەدا بە دەستەوە و هیچم نە درکاند. چ لە بەندیخانەی ئەمن و چ لە بەندیخانەی مخابرات، بەردرام.

بەهۆی ئەحمەد کرێکارەوە ئاگاداری ڕێکخستنم کرد .كە بۆ ماوەیەك پەیوەندی خۆم دەپچڕێنم بۆ پاراستنی ڕێکخستن. لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٤ ناسیاوێکم کە لە (قلّم سڕی) پارێزگا کاری دەکرد، پێی ڕاگەیاندم کە بڕیارێك هەیە بۆ گوێزانەوەی فەرمانبەرە کوردەکان لە کەرکوك بۆ هەولێر و دهۆك و سلێمانی، و پێشی ووتم: کە هەوڵ دەدەن بەپێچەوانەی ویست و ئارەزووی فەرمانبەرەکان بێ، و ئامۆژگاریشی کرد گەر بمەوێ بچمەوە سلێمانی ، ئەوە بە داخوازی نامەیەك داوای گواستنەوە بکەم یا بۆ هەولێر یا بۆ دهۆك.

لەسەر ئامۆژگارییەکەی ئەو داخوازی نامەیەکم نوسی، بەڵام ئەنجامەکەی پاش ئاشبەتاڵ دەرچوو ، کە منیش و شوکریش شوێنی کارمان گوێزرایەوە بۆ سلێمانی . لە مانگی ١٩٧٥/٥ دا ڕۆیشتمەوە سلێمانی.

## ٢-١٢.ئاشبەتاڵ و کاردانەوەی لەناو کۆمەڵەدا.

لەگەڵ ئەوەی کە کۆمەڵە لە هیچ خاڵێکدا لەگەڵ پارتی و بارزانی یەکی نە دەگرتەوە، جگە لە خاڵی بەرگری کردن لە کورد و کوردستان. واتە هیچ ئەڵقەیەکی تاکتیکی یا ستراتیجی و یا ئایدیۆلۆژی ناوخۆیی نەبوو لە نێوانیاندا، کەچی کۆمەڵە بە هەستی کوردستانی و بەرگری کردن لە خاك و نەتەوە گەرچی بە قەبارەکەم بوو بە چۆنایەتی سەنگدار، بە ڕێژە ٤/٥ ئەندامانی چووە ناو سەنگەری بەرگری سەرەڕای ئەوەش هێشتا پاراستنی پارتی و لێپرسراوانی کەمتەرخەم نەبوون ، لە چاو سوورکردنەوە و دەست بەسەرکردن و گرتن و تەنگ پێ هەڵچنینی ئەندامانی کۆمەڵە لە ناو سەنگەریشدا.

بۆ نموونە: لە ماوەت مستەفا چاوڕەش کە ئەو کات واتە لە ١٩٧٤ دا لە پاراستن بوو ، ڕاسپێردرا بوو بۆ سەرنگومکردنی عومەر سەید عەلی ، کە زۆر جوامێرانە ئاگاداری کاك عومەری کرد بۆوە، دەست بەسەرکردنی (شەهاب و فەریدون لەپێنجوێن.

لەگەڵ ئـەو هـەموو رەفتـارە نـا شۆڕشـگێڕانەیەی پاراسـتن ، هێشتا نـەیانتوانی ئـەو هەڵوێستە راستەی کۆمەڵە بگۆڕن. لـە مـانگی ١٩٧٥/٢ دا سـەرکردایەتی دەرەوەی کۆمەڵە نامەیەکی بۆ کۆمیتەی ڕێکخستنی شارەکان نارد و پێشبینی ئەوەیان کرد بوو ، کە پلانێکی نێودەوڵەتی دژی شۆڕشی کورد لە ئارادایە، سەرکردایەتی پێی وا بـوو کە سەر ئەنجامی ئەو پلانە، شۆڕشی کورد تووشی یەك لەم ئەگەرانە دەبێ:

١ـ ئەگەری یەکەم ئەوەیە ، کە توشی دووبەرەکی ببێ و جارێکی تـر ڕووداوی سـاڵانی ١٩٦٤،١٩٦٦ دووبارە ببێتەوە، کە لایەك ووتوووێژ لەگەڵ دەوڵەت بکا و لایەکەی تر بەردەوام بێ لە شۆڕشدا.

٢ـ ئەگەری دووهەم ئەوەیە ، کە شۆڕش بە تەواوی جڵەوی لە دەست خۆیدا نەمێنێ و بە تەواوی بکەوێتە دوای پلان و ویستی دەوڵەتان واتە تەفر و تونا بوونی و مانـەوەی بکەوێتە سەر ئارەزووی دەوڵەتان.

٣ـ لە بارودۆخی ئەو دوو ئەگـەرە دا، پێشبینی ئـەوە دەکـرێ ، کـە کۆمەڵـەش بـەبێ خواستی خۆی تووشی گێژاوێکی سیاسی و ڕێکخراوەیی و پێشمەرگانە ببێت.

لە نامەکەدا داوای ڕا و بۆچوون و هەڵوێستی ناوەوەیـان کـرد بـوو لەسـەر نـاوەڕۆکی نامەکەیان.

ڕێکخـستنی نـاوەوە لـە ڕێگـەی ئاسـۆی شـێخ نورییـەوە لـە ڕاو بۆچـوونی خۆیـان، سەرکردایەتیان ئاگادار کردەوە.

ناوەڕۆکی وەڵامەکە خۆی لە دوو خاڵدا دەدیتەوە:

١ـ ڕێکـەوتن نامـەی ئـاداری نێـوان مـەلا مـستەفا و سـەدام حـسێن، بـارودۆخی هەڵوەشـانەوە و لـە ناوچـوونی پـارتی شۆڕشـگێڕی بـۆرژوای خۆفرۆشـی کـردوو هەلومەرجی لە دایکبوونی کۆمەڵەی هێنایە کایەوە.

٢ـ گەرچـی پلانـی نێودەوڵـەتی گـورزێکی کوشـندە دەبـێ و لـە بڕبـڕەی پـشتی شۆڕشگێڕی و خۆڕاگری گەلی کورد دەدرێ، بەڵام پێویستە کۆمەڵـە خـۆی بـۆ ئامـادە

بکا و هەلومەرجی لە دەس دەرچوونی جڵەوی شۆڕشی لە دەست پارتی عەقڵی عەشایەری و داسەپێنەر بقۆزێتەوەو ئەو تێکشکانە بۆ سەرکەوتنێکی تر بگوێزێتەوە.

لەگەڵ خوێندنەوەی رێکەوتننامەکەی جەزائیر لە نێوان ئێران و عیراقدا یەکەم سات لە ئێزگەی بەشی عەرەبی جوولەکەوە سەرەتای دەستپێکردنی کارەسات سەریهەڵداو ، ووشەی ئاشبەتاڵ وەك زاراوەیەکی کۆمەلایەتی جێگۆڕکەی کرد بۆ زاراوەیەکی سیاسی خۆچەسپێنەر لە فەرهەنگی سیاسی مێژووی خەباتی گەلی کوردا.

نامەیەکی تری هەڤالانی دەرەوە گەیشت لە ١٩٧٥/٣/٢٧ داو داوای رای رێکخستنیان کرد لەسەر بارودۆخی ئاشبەتاڵ و هەڵوێستی کۆمەڵە لەسەری کە:

١ـ لەگەڵ سەرهەڵدانی دیاردەی ئاشبەتاڵ و پچڕانی شیرازەی شۆڕش و نەمانی هیچ جۆرە سەرەتایەکی دیسپلین ، بەلام بە سەدان پێشمەرگە هەن ئامادەی چەك دانان نین و دەیانەوێ بەرگری بکەن لەگەڵ چەند فەرماندەیەك لەوانە (کاك عەلی عەسکەری) ئێوە راتان چیە؟ لەسەر ئەوەی " ئێمە لە دەرەوە ئەو هەلە بقۆزینەوە و بڕیار لەسەر گرتنەوەی جڵەوی شۆڕ بدەین".

٢ـ ئایا ئێمەش لەگەڵ ئەو لافاوەی رەوەی بەرەو ئێران دەروا بکەوین و لەوێشەوە بۆ دەرەوە.

٣ـ ئایا لەگەڵ ئەو دەیان هەزار کەسی تر بەرەو عیراق بیتەوە و بە نهێنی لە کاری ژێر زەمینی بەردەوام بین و ئەو هاوڕێیانەی کە مەترسیان لەسەر نەبێ بێ تەسلیمبوونەوە بچنەوە سەر کاری خۆیان بە تایبەتی خوێندکاران و کاسبکاران و کرێکاران.

وەلامی رێکخستنی ناوەوە ئەوە بوو، گەر بارودۆخی ناو شۆڕش لەو کارەساتە سەخت و روخاوی و بێ وورەییەدا و لەو بێ شیرازەیی و پاشاگەردانی و ئاشبەتاڵیەدا ، تا ئەو رادەیە لە باربوو ، کە بتوانن بە سەدان کەس بگرنەوە و جارێکی تر

ڕێکیانخەن و سازیان دەنەوە و جڵەوی شۆڕش بگرنە دەست، ئەوە بێ شک مانەوەیان و هاوکاریان لەگەڵ هەندێ لە فەرماندەکانی پێشمەگایەتی وەك (عەلی عەسکەری) کە یەکێکە لەو فەرماندانەی ئامادەیی مانەوە و بەردەوامی بە شۆڕشدان دەربڕیوە، ئەوە تەنیا هەڵوێستی راستە کە لەو بارودۆخەدا بیگرنەبەر.

بەڵام شەپۆلی شالاوی بە هێزی ئاشبەتاڵ و رووخانی وورەی شۆڕشگێڕی جەماوەر لەلایەن سەرکردایەتی پارتی و بارزانیەوە، قین و رق تورەیی جەماوەر بەرامبەر سەرانی شۆڕش هێندە بەهێز و بەپەلەو کوتوپڕ بوو ، کە لە ماوەیەکی زۆر کەمدا مرۆڤە شۆڕشگێڕەکان و سەرکردە بودەڵەکان و جەماوەرە پشت تێکراوەکانی رادایە ناو جوغزی (تەسلیمبوونەوەی بە کۆمەڵ بە ڕژێمی عیراق، و پەنابردنە بەردۆزەخی پەنابەری ئێران، و سەری خۆ هەڵگرتن بەرەو هەندەرانێکی نەزانراو ئەنجام نادیار)

لەو بارودۆخەدا رووداوەکان هێندە بەپەلەو خێرا بوون ، کە بەرلەوەی هاوڕێیانی کۆمەڵە بکەونەخۆ بۆ جێبەجێکردنی ئەرکی مێژوویی و شۆڕشگێڕی سەرشانیان، نەك هەر نەیانتوانی دەیان کەسیش قایل کەن بە مانەوە و چەك دانەنان، بەڵکو خۆشیان کەوتنە بەر شەپۆلی لافاوی تەسلیمبوونەوە.

پاش ئاشبەتاڵ و گەڕانەوەی ئەو بەشەی کە تەسلیم بە عیراق بوونەوە یان بێ تەسلیمبوونەوە گەڕانەوەیان بۆ ناو شار و شارۆچکەکانی خۆیان بە ڕاستر زانی لە چوونە ئێران یا هەندەران، هاوڕێیانی کۆمەڵەش بە ئەندامانی سەرکردایەتیشەوە بەر ئەم بەشە کەوتن و بێ تەسلیمبوونەوە بە عیراق گەڕانەوە ناو شارەکان.

بارودۆخی ئاشبەتاڵ، هەر وەك چۆن بۆ بارزانی و پارتی، سەرلێشێواوی و پچڕانی شیرازە بوو، هەرواش بۆ رژێمی عیراقیش تا ماوەیەکی کورت پاشاگەردانی و بێ سەروبەری دروستکرد. لەو پاشاگەردانی و بێ سەرو بەریەدا ئەندامانی کۆمەڵە (جگە لە سەرکردایەتی) توانیان بێ تەسلیمبوونەوە بگەڕێنەوە سەر کار و پیشەی خۆیان.

ئاشبەتاڵ هەر وەك چۆن رەنگدانەوەی خۆی هەبوو ، لە هەڵتەکاندنی ریزەکانی پارتی ، هەر وەك چۆن ئاشبەتاڵ بوو ، لە ڕیزەکانی هێزی چەکداردا ، هەر وەك چۆن ئاشبەتاڵ بوو ، لە ڕووی سیاسی و کاری ڕێکخراوەیی ناو پارتی بارزانیدا و ئەو پارتە بەهێز و دەوڵەمەند و بە تەمەنەی کردە ئاردی ناو درك و پارچە پارچەی کرد و ئەنجامەکەی لە دروستبوونی چەندین پارتی ، لە کەرت و پەرتبوونی ئەو پارتە دابوو، ئاواش ئاشبەتاڵ کاردانەوەی خراپی کردە سەر کۆمەڵەش.

دوای ئاشبەتاڵ و گەڕانەوەی زۆربەی هەرە زۆری ئەندامانی کۆمەڵە، پشێوی و بێ ورەیی و ناکۆکی کەوتە ناو ریزەکانی کۆمەڵەشەوە، بە تایبەتی ئەو بەشەی کە بەشداری شەڕی ساڵی ١٩٧٤ـ١٩٧٥ یان کرد بوو، تاڵاوی ئاشبەتاڵیان لە شاخدا بە گەرووداچوو بوو.

لەو بارودۆخە نالەبار و لەو ڕۆژە سەختانەدا گەلی بیرو بۆچوونی جیاجیاش لەناو ریزەکانی کۆمەڵەدا ، سەری هەڵدا. کە دەتوانین ئەو بیرورا جیاجیایانە لەم چەند بەشەی خوارەوەدا چڕوپڕکەینەوە.

١ـ تاقمێك پێیان وابوو، کە کۆمەڵەش وەك هەر حزبێکی تری بۆرژوازی ، ڕێکخراوی وردە بۆرژوازی کوردی یەو بە هیچ جۆرێك ناتوانێ وەك حزبێکی م. ل رۆڵی خۆی لە سەرکردایەتی کردنی خەباتی چینایەتی و خەباتی رزگاری نیشتمانیدا بگێڕێ. بۆیە رایان وابوو ، کە دەبێ کۆمەڵە خۆی هەڵوەشێنێتەوە و کە (م. ل) ە کانی ناو کۆمەڵە چاوەڕێ بارودۆخێکی لەبار بکەن بۆ پێکهێنانی ڕێکخراوێکی (م. ل) ی رەسەن.

ئەم بەشە بەم بیروڕا و بیانوەی سەرەوە، خۆیان لە کۆمەڵە کێشایەوە و هەندێ لە تیۆریستەکانی ڕوویانکردە هەندەران و بۆ دواجار لە کاری سیاسیدا هەرەسیان هێنا لەوانە (دلێر تایەر).

٢ـ بەشی دووهەمیان لەوانە بوون ، کەپێیان وابوو ، کۆمەڵە هێشتا لە ئاستی تیۆریدا کاڵ و سەرەتایەو لە ئەزموونی خەباتی سیاسیشدا کەم توانایە و پێویستی بەوە هەیە ، کە هەم هەندێ لە ئەندامانی بۆ دەرەوەی وڵات رەوانەکات ، بە تایبەتی

بۆ ناو ڕێکخراوە چەپەکانی وڵاتە سۆسیالیستەکانی وەك ئەلبانیا، کوبا، کۆریا، یوگوسلاڤیا، بۆ پەیداکردنی ئەزموون ، و هەم تا چەندساڵێکی تر بکەونەوە خەباتی ژێر زەمینی و بە خۆداچوونەوە و گەڕانەوە بۆ ئەڵقە ڕۆشنبیرییە سەرەتاییەکان و پتر خۆ بەهێزکردن لە ڕووی تیۆرییەوە.

ئەم بە شەش بروبیانوەکانیان جگە لە هەرەس هێنان و ماندوبوون و بێ وورەیی ، هیچی تریان پێوە دیار نەبوو، هەر بۆیەش دوای مانگێك لە گەڕانەوەیان لە ئاشبەتاڵدا، ریزەکانی کۆمەڵەیان جێ هێشت و پاڵیان لێ دایەوە و ئەوەی بە بیریشیاندا نەدەهات م. ل و تیۆر و ئەزموون بوو.

٣ـ بەشی سێهەمیان بە هەق کەسانی خاوەن بیروڕاو بۆچوونی تایبەت بوون لەسەر کۆمەڵە، و جیاوازی بیر، ئایدیۆلۆژی ، ڕێکخراوەییان لەگەڵ کۆمەڵدا هەبوو . بەڵام بە دوو ڕێبازی ڕێکخراوەیی جیاواز:

أـ لایەکیان بڕوایان بە ڕێکخراوی ڕەنجدەر و زەحمەتکێشانی کوردستانی هەبوو ، بە هەمان پەیڕەوی ناوخۆی کۆمەڵەوە . بەڵام بەئاڵو گۆڕکردنی لابردن و دانانی هەندێ بەند و پرەنسیپ و خاڵی نوێ ، بە تایبەت گۆڕینی ناوی کۆمەڵە ، پەیڕەوکردنی بێ لایەنی لە ناکۆکی چین و سۆڤیەت و ناسینی هەردوولایان بە وڵاتی سوسیالیستی لەوانە (شەهید برایم خەلیل)

ب ـ لای دووهەمی ، دژی ڕێبازی کوردستانی کۆمەڵە بوون، و خوازیاری پەیڕەوکردنی ڕێبازی عیراقچێتی و کردنی کۆمەڵە بە ئەلتەرناتیڤی حزبی شیوعی عراقی و ناسینی سۆڤیەت وەك وڵاتێکی سۆشیالیستی لەوانە (نجم الدین عەزیز ـ سالار)

هەردوو لایەنەکەی ئەم بەشە، نەیان دەویست لە کۆمەڵە جیاببنەوە یا بچنە دەرەوە و لە دەرەوەی ریزەکانی کۆمەڵەدا کار بۆ ڕێبازەکەیان بکەن، بەڵکو بە پێچەوانەی هەموو عورف و پرەنسیپێکی ڕێکخراوەیی و بە دەر لە ڕەوشتی سیاسی ، هەر لەناو ریزەکانی کۆمەڵەدا مانەوە و هەر بە ناوی کۆمەڵەوە کەسانی نوێیان ڕێکدەخست و لە

کۆمەڵەشیان دەشاردنەوە ، و لە هەمانکاتیشا کاریان بە گەنـدەڵکردن و هەڵتەکانـدنی بناغەی ڕێکخراوەیی کۆمەڵە دەکرد.

* لای یەکەمیان بەو جۆرە کارکردنە تا کۆتایی ساڵی ١٩٧٦ درێژەی کێشا، بـەڵام بـە شەهید بوونی (ئیبراهیم خەلیل) و مەفرەزەکەی لەسەر زمان لێدانی برایم حەسەن لـە ناوچەی هەڵەبجە لە / / ١٩٧٦ وە بەگرتنی (ئیبراهیم حەسـەن) لەلایـەن ڕژێمـەوە کـە هەردووکیان دوو تیوریستی ئەولایەنە بوون کۆتاییان هات ، بە تایبەتی پاش ئـیعتراف کردنی ئیبراهیم حەسەن لەسەر هەموو ئەندامەکانیان و هەندێ لە ئەندامانی کۆمەڵەش کە پێشتر ناسیبوونی، و لەکاتی خۆیدا بەدرێژی باسیان دەکەم.
بەڵام لای دووهەمیان واتە (عراقچێتی) هەر بـەردەوام بـوون لـە درێـژەدان بـەو شـێوە کارکردنە نا سیاسیانەیە لەناو کۆمەڵـەدا تـا سـاڵی ١٩٨٦ و پاشـان ئاشـکرابوونیان و جیابوونەوەیان لە کۆمەڵە بە ناوی (ئاڵای شۆڕش ـ ئاش ـ).
دوای گەڕانـەوەی سـەرکردایەتی کۆمەڵـە و زۆربـەی ئەنـدامانی لیژنـەی شـارەکان و ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە سەرکردایەتی بڕیاردا ، کە دوو جـۆر پەیوەنـدی ڕێکخراوەیـی لەناو کۆمەڵەدا پاش ئاشبەتاڵ پەیڕەو بکرێ.

---

*ـ ئەم تاقمەی کۆمەڵەی ڕەنجدەران بە ڕابەری ئیبراهیم حەسەن و ئیبراهیم خەلیل کەژمارەیان دەوروبەری ١٢ کەس، بوو لەنیوەی کۆتایی ساڵی ١٩٧٦ مەفرەزەیەکی ٦ کەسی ڕێکدەخەن بەسەرپەرشتی ئیبراهیم خەلیل و دەچنە ناوچەی هەڵەبجە.
لەناو شاریش ئیبراهیم حەسەن سەرپەرشتی شانەکەیان دەکا. هەر لەو کاتەدا لە سەردانێکی مەفرەزەکەیان ئاشکرادەکاو کۆپتەر دەچێتە سەریانو شوێنی مەفرەزەکەیان ئاشکرادەکاو کۆپتەر دەچێتە سەریان و هەموویان شەهید دەبن.
وپاشان ابراهیم حسن بووبە چاوساغی ئەمنو ئیستخبارات بۆ بەگرتدانی هاوڕێکانی و تەنانەت هەندێ لە ئەندامانی کۆمەڵەشی بە گرتدا کە پێشتر لە کۆمەڵەدا ناسیبوونی.

أ- پەیوەندی ڕێکخراوەیی ئەو هاوڕێیانەی بەشداری شۆڕش بوون لە ١٩٧٤ ـ ١٩٧٥ بە جیا بن.

ب ـ پەیوەندی ڕێکخراوەیی ئەوانەش کە بەشدار نەبوون بە جیا بێ.

جـ ـ بە هیچ جۆرێ نابێ ئەو دوو ڕێکخستنە یەکتری بناسن.

ئەم هەنگاوە بۆ پاراستنی ڕێکخستنە نهێنیەکانی کۆمەڵە بوو، لەناو شارەکان و ڕێگرتن لە هەوڵی ڕژێم بۆ ڕاوکردنیان ، کە هەندێك لەو هاوڕێیانەی بەشداری شۆڕشیان کرد بوو، لەلایەن ڕژێمەوە دەستنیشان کرابوون و دەکرا بە هۆی ئەوانەوە گەر پەیوەندییان بە هاوڕێکانی شارەکانەوە هەبوایە، ئەوانیش دەستنیشان بکرایە.

## ١٢.٢ کۆمیتەی شارەکان.

بۆ سەرپەرشتی کردنی کاری ڕێکخراوەیی ڕێکخستنی ناو شارەکان ، کۆمیتەیە پێکهات لە ٥ هاوڕێ ( یەك لە سلێمانی، یەك لە کەرکوك، یەك لە هەولێر، یەك لە بادینان، و یەك لە ئەندامەکانی سەرکردایەتی لێپرسراوێتی کۆمیتەکەی لە ئەستۆ بوو).

ئەم کۆمیتەیە بە هاوکاری کۆمیتەی سەرکردایەتی تا مانگی ١٩٧٥/٧ لەسەر کارەکانی خۆی بەردەوام بوو. لە مانگی ١٩٧٥/٧ دا یەکەم کە سێ، کە یەکێك بوو، لەئەندامانی سەرکردایەتی لەلایەن ڕژێمە وەرگیرا (حەمەی میرزا سەعید) بوو ، لەیەکەم ڕۆژێ ئەشکەنجەدا خۆی نەگرت و زمانی لە هاوڕێیان دابوو ، کە بە ڕاستی بە دەگمەن کەسانێك کە ئەو ناسیبوونی لە زمان لێدانی دەرباز ببوون.* هەر ئەو ڕۆژە سیخوڕەکانی ڕژێم توانیان (ئەنوەر زۆراب، محەمەد برزۆ، سەلام) دەسگیرکەن و لە

---

*ـ صلاح خرسان کتێبەکەی لاپەڕە ٣٣٦ (التیارات السیاسیە) ناوی علی بچکۆل و ئەرسەلان بە ئەندامی سەرکردایەتی ناو دەبا. لەراستیدا وانەبوو ، ئەرسەلان ئەندامی لیژنەی شاری هەولێر بوو، و عەلی بچکۆلیش لە ڕۆژی ١٩٧٥/٩/٢٢ دا گیران ئەندامی لیژنەی شاری کەرکوك بوو.

ماڵی ئەنوەر زۆراب دا لـە بەغدا تایپێـك و چـەند نامیلکـە و بڵاوکراوەیـەك بگـرن وەك بەڵگە لەسەر ئەنوەر زۆراب.
هەر لە هەمانکاتیش لەسەر زمان لێدانی حەمەی میرزا سەعید بڕیاری گرتنـی شـەهاب شێخ نوری ، جەعفەر عبدولواحد، فەرەیدون عبـدولقادر ، عومـەر سـەید عـەلی ، عـەلی بچکۆل ، ئەرسەلان بایز ، ئاوات عبدولغەفور ، و چەندانی تر دەرچوو.

## ٢ـ١٤. سەرەتـای پچڕانی شیرازە و رای بە کۆمەڵ .

دوای گرتنی حەمەی میرزا سەعید و شەهید ئەنوەر زۆراب و هاوڕێکانیـان ، کۆمیتـەی سەرکردایەتی کۆمەڵە و کۆمیتەی شارەکان کۆبوونەوە، لە سەرەتای مـانگی ١٩٧٥/٨ دا بۆ تاوتویٚ کردنی بارودۆخەکە بە تایبەتی پاش گەڕانەوەی فەرەیدون عبدولقادر لـە ئەورووپا و سوریا و بینینی هەڤاڵانی دەستەی دامەزرێنەری (ی. ن. ك) لـە ١٩٧٥/٦/١ و گفتوگـۆکردن لەگـەڵیان ،پاشـان بڕیاریانـدا کـە ئەنـدامانی سـەرکردایەتی بـەڕیٚ پێوانێکی سنووردار، لـە سـنوری ئێـران و تورکیـا و سـوریاوە بـچنە سـوریا و لـەوێوە لەگـەڵ هـەڤاڵانی دەسـتەی دامەزرێنـەری یـەکێتیی نیـشتمانیی کوردسـتاندا بگەنـە ئەنجامێك سەبارەت بە بارووددۆخی پاش ئاشبەتاڵ و ئایندەی باشوری کوردستان.
بۆیـە لـەمانگی ١٩٧٥/٨ دا هاوڕێیـان شـەهاب شـێخ نـوری ، جەعفـەر عبدولواحـد، فەرەیدون عبدولقادر، عومـەر سـەید عـەلی ، ئـاوات عبـدالغفور، * وەك سـەرکردایەتی ئەرسەلان بایز ، عـەلی بـچکۆل وەك ئەنـدامانی لیژنـەی شـارەکان لـە سـلێمانیەوە بـە ڕێگای شارباژێڕدا رووە و سنوری دەستکردی ئێران رۆیشتن ، بەو نیازەی کـە لەگـەڵ سەرکردایەتی یەکێتیی لە دەرەوە یەکبگرن و رێبکەون پێکـەوە هەرچـی زووتـرە بـە پێی بارودۆخ و زەمان و زەمینی ئەوسا کـار بکـەن ، بـۆ پڕکردنـەوەی ئـەو بۆشـاییە سـەختە سیاسـی و دەروونـی و شۆڕشـگێڕی و پێـشمەرگایەتیەی کـە بـە ئاشـبەتاڵی پـارتی و بـارزانی دروسـت ببـوو، و لـە وێـشەوە هەوڵـدەن چـەند بتـوانن لـە ڕێگـەی

دۆستەکانیانەوە لە ڕێکخراوەکانی فەلەستینی بە تایبەت بەرەی گەلی (جبهة الشعبية) و بەرەی دیموکراتی (الجبهة الديموقراطيه) و شۆڕشگێڕانی زەمانی چەك و کەرەسەی پێویست پەیداکەن و هەر بە ڕێگەی سێ سنوورەکەوە لە سوریاوە بیانگەیەننەوە کوردستان.و هەر کات بارودۆخ لەبار بوو، لەناو وولاتیش هەوڵ بدرێ دەستەی چەکداری پێکبێ بەو چەکانەی کە لە ئاشبەتاڵدا هەندێ لە هاوڕێیانی کۆمەڵە و هەندێ کەسایەتی تری شۆڕشگێڕ شاردبویانەوە.

ئەو هاوڕێیانە پاش گەیشتنیان بەو دیو سنور ویستویانە لە ڕێگەی چاوساغ و شارەزا و سنووراو سنور ڕێپێوانەکە بکەن، بەڵام لە چەم پاراو لە ۱۹۷٥/۹/۲۲ لەلایەن جەندرمەکانی "شا"وە دەیگرین و پاشان دەگوێزرێتەوە بۆ "زیندانی سەقز" و تا کۆتایی مانگی ۱۹۷٥/۱۲ لەوێ دەبن و پاشان لە ۱۹۷٦/۱/۱ دا بە گۆڕینەوەیان بە دوو ئەفسەری ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی کە لای ڕژێمی عیراقی بوون دەگۆڕینەوە و لە سنوری پێنجوێنەوە دەدرێنەوە بە ڕژێمی عیراقی. سەبارەت بە گرتنی ئەو هاوڕێیانە دوو جۆرە بۆچوون هەیە:

١ـ گوایە چاوساغ و ڕێپیشاندەرەکەیان سیخوڕی ڕژێمی ئێرانی بووە و ئەو لای ئێرانیەکان زمانی لێداون.

٢ـ دەڵێن لەپاش چوونیان بۆ ئەو دیوی سنور لە ماڵێك لایانداوە و چاوساغەکە بە تێراديتن لە ماڵەکە باسی ئەو هاوڕێیانەی کردوە ، خاوەن ماڵەکەش سەر بە بنەماڵەی بارزانی بووە ، و لای ئەوان زمانی لێداون و ئەوانیش لای ڕژێمی ئێرانی زمانی لێداون و گیراون . گرتنی پۆلی یەکەم و لە داوکەوتنی پۆلی دووهەمی هاوڕێیانی کۆمەڵە، کۆتایی بە ڕاونان و گرتن و وەدواداکەوتنی ڕژێمی عیراقی لە حەنای کۆمەڵە نەهێنا.

ڕژێمی عیراقی هەر لە بەغداوە تا دوا شاری باشوری کوردستان کەوتە چاودێری و پەلامار و راونان و گرتنی هاوڕێیانی کۆمەڵە.

له لای خۆمەوه بێ ئەوەی به خۆمی ڕەوا ببینم ، که تاوانی دۆزینەوه و گرتنی هاوڕێیانی کۆمەڵه بدەمه پاڵ هیچ ڕێکخراوێك ، بەڵام به ڕاشکاوییەوه دەتوانم ئەوه بۆ مێژوو تۆمارکەم ، که هۆکانی ئاشکرابوون و گرتنی هاوڕێیانی کۆمەڵه به تاك و به کۆمەڵ دەگەڕێتەوه بۆ:

أ- بێ ئەزموونی هەندێ لەو هاوڕێیانەی کۆمەڵه که ئەوسا ، واته ۱۹۷٤ بەشداری خەباتی شاخیان کرد بوو، له پاراستنی نهێنی شار و نەسڵەمینەوەیان له پەیوەندی تاکی خۆیان به هەندێ هاوڕێیانی کۆمەڵەوه که له شارەکان کاریان دەکرد، ئەو جۆره پەیوەندیه تاکی و کۆمەڵایەتیه ببووه هۆیەکی دەستنیشانکردنی هاوڕێیانی کۆمەڵه لەلایەن سیخوڕ و چڵکاو خۆرەکانی ڕژێمەوه.

ب - خۆ ڕانەگری هەندێ له گیراوان، چ لەوانه که له ڕێکخستنه نهێنییەکانی تاقمەکەی شەهید ئیبراهیم خەلیل دابوون (وەك ئیبراهیم حەسەن) که هەر له یەکەم ڕۆژی گرتنیەوه وەك چڵکاوخۆرێك لەگەڵ پیاو کوژەکانی ئەمنی ڕژێمدا ماڵ به ماڵ به دوای ئەوانەدا دەگەڕا که دەیناسین.

و چ له وانەی که له ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەدا بوون و خۆیان لەبەر ئەشکەنجەدا ڕانەدەگرت وەك حەمەی میرزا سەعید و کەسانی تر له کاتی خۆیدا دێمه سەر باسکردنیان.

جـ - ڕۆڵی ناڕاستەوخۆی کەسانی ڕوخاوی ناو دەزگا جاسوسیەکەی پارتی (پاراستن) پاش ئاشبەتاڵ و زمان لێدانیان لەوانەی که له شەڕی یەك ساڵەی ۱۹۷٤_۱۹۷٥ دا ناسیویانن.

د - پاش ئاشبەتاڵ و نەمانی مەترسی هیچ ئەلتەرناتیفێکی کوردی، بەهۆی ئاشبەتاڵی پارتی و بارزانی لەلایەك و ئاشبەتاڵی حزبی شیوعی عیراقیش لەلایەکی تر، به چوونه ناو حکومەتەکەی بەعسی و بەناو (بەرەی نیشتمانی دیموکراتی) بەعسی ، بووه هۆی ئەوەی که هەموو توانای ڕژێم له باشووری کوردستاندا تەرخان بکرێ بۆ هەڵتەکاندن و لەبەر یەك هەڵوەشاندنی ڕیزەکانی کۆمەڵه وەك ڕێکخراوێکی چەپی نوێی کوردی.

پۆلی دووهەمی دەستگیر کراوەکانی کۆمەڵە کە لەپەلامارێکی کوتوپڕی ڕژێم لە ناوچە جیاجیاکاندا لە ١٩٧٥/٩/١٨ دەستی پێکرد بووە هۆی گرتنی ٦ شەش هاوڕێی تری کۆمەڵە: (حاکم ئیبراهیم ـ شەهید ئەنوەر حەسەن، خدر عبدولرحمان، جەبار فەرمان، کاکە عەبە، سەعدون فەیلی).

حاکم برایم کە کۆنترین ئەندامی کۆمەڵە بوو ، هەر لە ساڵی ١٩٧٠ ەوە، ببووە ئەندامی کۆمەڵە لە ناوچەی خانەقین دا وەك سونبولێك سەیر دەکرا، کە بە داخەوە ئەویش یەکێك بوو لە خۆڕانەگرەکان. ئەم پۆلە هاوڕێیە بە هۆی خۆڕانەگری و زمان لێدانی یەك لە گیراوەکان پۆلی یەکەمەوە کە ناوی سەلام فەیلی بوو، گیران ، ئێستاش لە شاری قەزوینی ئێران دەژی. بەداخەوە سەلام خانەقینیەکی تر بەو تۆمەتە لەلایەن حکمت محمد (مەلا بەختیار) ەوە تاوانبار کراو لە ساڵی ١٩٧٩ لەلایەن مەلا بەختیارەوە تیرۆرکرا کە لە ڕاستیدا بۆ مەبەستێکی تر بوو، لەکاتی خۆیدا باسی دەکەم.

پۆلی سێیەمی گیراوەکانی کۆمەڵە ، لەلایەن چڵکاوخۆرەکانی ڕژێمەوە لە شارە جیاجیاکان لە مانگی ١٩٧٥/١١/١٩ ەوە دەستی پێکرد، بە گەورەترین پەلاماری ڕژێم بۆ سەر ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە دادەنرا تا ئەو کات، کە ئیبراهیم حەسەن لەگەڵ پیاوکوژەکانی ڕژێمدا لە یەك شەودا بەس لە شاری سلێمانی نزیکەی ٢٢ کەسیان گرت ، ئەوانە هەم لە هاوڕێیانی کۆمەڵە و هەم لە ڕێکخستنەکەی ئیبراهیم خەلیل و ئیبراهیم حەسەن و هەم لە خەڵکی تریشی تێدا بوو.

لەوانە : (عوسمانی نانەوا، عەلی موراد، حسێن ڕەزا، محەمەد عەتیە، ئاسۆ شێخ نوری، کەمال عەلی، فاروق، دارۆ شێخ نوری، مراد زینەدین، د. جەمیل عەلی، مام سەعیدی فەراش) و پاشان شەهید (ئازادی مەلا) ش.

* (عەلی مراد، ئاسۆ شێخ نوری) لەسەر زمان لێدانی شەهاب ناوێك بوو ، کە هەردووکیانی دەناسی لە مانگی ١٩٧٥/١٠ دا گیران.

دارۆی شێخ نوری لەسەر زمان لێدانی مام سەعیدی فەراش لە مانگی ٩ لە بەغداد گیرا. عوسمانی نانەوا ، و کەمال عەلی ، هەردووکیان لە بەندیخانەدا خۆیان نەگرت و دانیان بە کاری سیاسی و ئەندامەتی هاورێکانیاندا نا وەك سەرکردە و لێپرسراو.

بەو جۆرە زۆربەی ئەندامانی لیژنەی شارەکان و هەندێ لە ئەندامانی کۆمیتەی شارەکانیش گیران ، بۆیە جارێکی تر لە مانگی، ئەیلولی ١٩٧٥ کۆمیتەی شارەکان بە دەسپێشکەری بەندە ، شەهید عبدولرەزاق ، کاك حەمیدی گومرگ ، ئەحمەد کرێکار، پێك هات و بە ئەندامەتی ئیحسان نەجم (ئەبو شەهاب)، و شەهید ئازاد عبدولمەجید (ئازاد هەورامی).

ئەو کاتە ئیحسان لە بەغدا خۆی شاردبۆوە ، و ئازاد عبدولمەجید دیار نەبوو، تا پاش هێوربوونەوەی شاڵاوەکە ئەوسا زانیمان ، کە لە کۆیە خۆی شاردۆتەوە ، مۆری سەرکردایەتی کۆمەڵە هەر لە مانگی ١٩٧٥/٧ ەوە لە رێگەی کۆمیتەی شارەکانەوە درا بوو بە ئیحسان کە ئەندامی کۆمیتە بوو. بەڵام پاش چوونی ئیحسان بۆ بەغداد و خۆشاردنەوەی، توانیمان لە رێگەی شەهید (عەلی ئامەخان) ەوە ، مۆرەکە و هەندێ دیکۆمێنت بە دەست بخەینەوە. تا رۆژی ١٩٧٥/١١/٢٧ بەندە چوو بۆ بەغداد و لەگەڵ ئیحسان دا بە رێگاو شێوەیەکی تایبەت گەڕاینەوە شاری سلێمانی.

### جارێکی تر کۆمیتەی شارەکان.

دوای ئەو شاڵاوە گەورە و بەربڵاوەی رژێم بۆ سەر کۆمەڵە و رێکخستنەکانی کۆمەڵە، رێکخستنەکانی کۆمەڵە تووشی دابڕان و تێکچوونی شیرازە بوون، لە ئەندامانی کۆمیتەی شارەکان تەنیا شەهید عبدولرەزاق لە هەولێر، شەهید ئازاد هەورامی و ئیحسان نەجم لە کەرکوك و بەندەش لە سلێمانی مابووین.

ئیحسان و شەهید ئازاد بێ ئاگا لە یەکتری لەگەڵ دووهەم شاڵاوی گرتن کەرکوکیان بەجێ هێشت ، و رێکخستنی کەرکوکیان تەسلیم بە حەمید گومرگ (حەمید شورتە) و ئەحمەد کرێکار کرد بوو. ئیحسان چوو بوو بۆ بەغداد لە ماڵی زاواکەی (ستار تایەر

شەریف) خۆی حەشاردا بوو، بەلاّم شێخ ستاری زاوای بەوە لێی قایل نەبوو و وەعدی لە (تەها یاسین رەمەزان) وەرگرتبوو ، کە ئیحسان بباتە لای و ئیحسان بەوە قایل بێ کە کاریان لەگەڵدا بکات ، لە بەرامبەر ئەوەش رژێم یارمەتی ئیحسان بدا. ئیحسان لەگەڵ شێخ ستاردا ، تەها یاسین رەمەزانی بینی و بەڵێنی ئەوەی دابوو ، کە لە مەودوا روو بکاتە ژیانی تایبەتی خۆی و واز لە سیاسەت بێنێ. تەها یاسین بەوە لێی قایل نەبوو ، داوای لێکرد بوو، کە کاریان لەگەڵدا بکا، ئیحسان لە ترسی ئەوەی کە لەو دانیشتنەدا رێی بگرن ، گفتی ئەوە دەدا کە بیری لێدەکاتەوە و وەلاّمیان دەداتەوە ، بەلاّم پاش گەڕانەوەیان بۆ ماڵی شێخ ستار ، ئیتر ئیحسان لە بەغدا خۆی شاردەوە و بە هۆی (دادە فەهیمی) دایکیەوە ، وەلاّمی بۆ من نارد ، کە هەوڵ بدەین لە بەغدا دەربازی بکەین.

ئیحسان لە رۆژی ١٩٧٥/١١/٢٨ گەیشتەوە سلێمانی و دەس بەکار بوو لە کۆمیتەی شارەکاندا. شەهید ئازاد عبدولمەجید (ئازاد هەورامی) بێ ئەوەی ئاگاداری کۆمیتەی شارەکان بکا ، خۆی وونکرد و تەنانەت شوێنی حەشارگەکەی خۆی لای کەسمان ئاشکرا نە کرد بوو، تا شالاّوی گرتن دامرکایەوە ، ئەوسا زانیمان کە لە شاری کۆیە لای خوالێخۆشبووی برای خۆی حەشارداوە کەناوی مامۆستا (هۆشمەند) بوو، مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی کۆیە بوو. شەهید ئازاد نەگەڕایەوە بۆ کۆمیتەی شارەکان ، پاشان لە مانگی ١٩٧٦/١ شەهید ئارام (شاسوار جەلال) پەیوەندی پێوە کرد بوو ، قایلی کرد بوو، کە لە کۆمیتەی هەرێمەکان کار بکات.

بۆیە کۆمیتەی شارەکان بۆ جاری دووهەم لە (شەهید عبدولرەزاق لە هەولێر، ئەحمەد کرێکار و حەمید شورتە لە کەرکوك، ئیحسان نەجم و بەندە لە سلێمانی) پێکهات.

سەبارەت بەوەی کە رێکخستنەکانی کۆمەڵە بە شێوەی تاکی و تەزبیحی بوو ، هەر یەکێك لە کۆمەڵە بگیرایە رێکخستنەکەی وون دەبوو لە کۆمیتە و بەو جۆرە رێکخستنەکان بە زۆری بێ ئاگادار لە کۆمیتە کاریان دەکرد، کە ئەمە بووە هۆی

ئەوەی چەندین هێڵی جیاجیا و بێ ئاگا لە یەکتری لە سلێمانیدا دروست ببێ. بۆیە وەك کۆمیتە بڕیارماندا یەکێکمان بچێتە بەغدا و سەردانی گیراوەکان بکات ، بەڵکو هەر چۆنێك بێ هەندێ لەو هێڵانە بدۆزینەوە.

لە مانگی ١٩٧٥/١٢ شەهید "عەلی ئامەخان" مان نارده لای هاوڕێ بەندکراوەکان بە نامەیەکی دەمیەوە، بەو ڕێگەیە توانیمان بەشێك لە هێڵەکان بگرینەوە ، لەوانە ئەو هێڵەی کە هاوڕێ ئەکرەم سەید مەجید (دلێر) لێپرسراو بوو، هێڵێکی تر کە شەهید (حسێنی تاپۆ) ناسراو بە هاوڕێ شێرکۆ، و ئەو هێڵەی کە عوسمان نانەوا پێشتر دەیبرد بەڕێوە.

ئەوەی کە بەلامانەوە گرنگ بوو، ئەو تایپ و ڕۆنیۆ سەرەتاییە بوو، کە لای هاوڕێ دلێر بوو. یەکەم کارێ کە لە سەردەمی ئەو شاڵاوانەی ڕژێم پاش دۆزینەوەی تایپ و ڕۆنیۆکە ئەنجاماندا ، بەیانێك بوو، کە لە ١٩٧٥/١٢/٢٧ لەسەر بارو دۆخەکە دەرکرا. بەیانەکە ناوەڕۆکەکەی پتر بریتی بوو لە هەڵماڵینی پەچە لە ڕووی ڕژێم و دەزگا ئۆتۆنۆمیە داتاشراوەکەی کوردستان و ئاشکرا کردنی پلانەکانی ڕژێم بۆ شێواندنی ڕووی کۆمەڵایەتی و جوگرافی و سیاسی و تەنانەت نەتەوەیی کورد و خوارووی کوردستان، بە داسەپاندن و جێبەجێکردنی شاڵاوەکانی (بەعەرەبکردن‌و بەعەسی کردنی کوردو ناوچەکە) و پاشان دەربەدەرکردنی ناوچە سنوریەکان و قوڵایی ناوچەکانی کەرکوك و خانەقین و کفری‌و گەرمیان، بە تایبەت ئاماژەکردن بۆ پلانی ڕژێم لە مەڕ چۆڵکردن و سوتاندن و تەختکردنی گوندە سنوریەکان بە قوڵایی ٢٠ کیلۆمەترو بەندکردنی دانیشتوانیان لە ئۆردوگا زۆرەملێ تەڵبەندکراوەکاندا.

بەشێکی تری بەیانەکە بریتی بوو لە شەرمەزارکردنی ئەو شاڵاوە دڕندانەیەی بۆ سەر دانیشتوانی بێ تاوان و بێ چەك دەیکرد. لەو ماوەیەدا تا ڕادەیەك توانرا بەشێکی زۆری شیرازەی ڕێکخستنەکان بگێرینەوە وڕێکیان خەینەوە..

## ٢ـ١٥ کۆمیتەی هەرێمەکان .

سەبارەت بە خۆرانەگری (حەمەی میرزا سەعید) و زمان لێدانی لە هەندێ کەس کە ئەو کاتە لە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەدا نەما بوون یان ماوەیەکی زۆر بوو لەلایەن سەرکردایەتی کۆمەڵەوە سڕکرا بوون ، یان هەر بڕوایان بە کوردستانیەتی کۆمەڵە نەما بوو. بەشێك لەوانە کە بۆیان نە ڕەخسا بوو دەرباز بن ، ناچاربوون خۆیان حەشاردەن. لەوانە:

١ـ نەجمەدین عەزیز (سالار عەزیز) کە حەمەی میرزا سەعید ناوی برد بوو.

٢ـ شاسوار جەلال (شەهید ئارام) کە فەڕاشەکەی خۆی زمانی لێدا بوو.

٣ـ حکمت محەمەد (مەلا بەختیار) کە سەلام زمانی لێدا بوو.

ئەمان و چەندانی تریش لەگەڵ ئەوەی کە هاوڕێیانی کۆمەڵە نەبوون و بڕواشیان بە کوردستانی بوونی کۆمەڵە نەبوو، دووچاری خۆشاردنەوە و خۆحەشاردان ببوون.

هێڵێکی ژنانی کۆمەڵە پەیوەندییان بە منەوە هەبوو، لەوانە دوانیان،ئەوانیش هاوڕێ : (رووناك عەزیز و هاوڕێ حەلاوە)بوون. کە یەکیان خوشکی (سالار) و ئەویتریشیان خزمی بوو، بە منیان راگەیاند کە چەند کۆنە هاوڕێی کۆمەڵە هەن و بڕیاری گرتنیان لەلایەن رژێمەوە دەرچوە و خۆیان حەشارداوە دەیانەوێ بەندە ببینن تا وەك وەفاداری کۆمەڵە بۆیان، ڕێگەیەك بۆ دەرچوونیان لە سلێمانی دابنرێ.

لە ڕۆژی ١٩٧٥/١١/١٢ کە پێشتر کات و شوێنمان لە ڕێگەی روناك و حەلاوەوە دیاری کرد بوو لە ماڵی حەلاوە لەگەڵ سالار دا یەکمان بینی و پاش نزیکەی نیو کاتژمێر وتوویژکردن بەڵێنم پێدا کە خۆی و شاسوار جەلال پاش یەك هەفتەیەك لە سلێمانی دەرکەین ، تەنانەت شێوەی دەربازکردن و شاردنەوەشیان لە دەرەوەی سلێمانیدا باسکرا.

لەو هەفتەیەدا پەیوەندیمان کرد بە وەستا محەمەد مستەفا ناسراو بەحەمەی مەجید هاوار لە ڕانیە، کە ئەو کاتە بەڵێندەر بوو، کاری پردەکانی ڕێگای سەنگەسەر ـ دۆڵی شەهیدان ـ ڕەواندزی گرتبوو. وەستا محەمەد بەڵێنی داینێ ، کە ئامادەیە بە ناوی

خواسترا و وبه وێنـەی خۆیانـەوە دوو ناسـنامەی نقابـەی کرێکارانیـان بـۆ بکـات بـەو ناسنامانە لە سلێمانیەوە بگوێزرێنەوە بـۆ دۆڵـی شـەهیدان و لـەوێ بـە نـاوی چـاودێر بمێننەوە تا ئەو کاتەی خۆیان دەمێننەوە یا بەلایەکی تردا بیانەوێ برۆن.

هـەر لـە ڕانیـە کـاك ئەحمـەد سـەید زادە کـە یـەکێك بـوو ، لـە باوەڕپێکراوەکـانی ئیستخبارات و یەکێك بوو ، لەو هێڵەی کە لـە نـاو ئیستخباراتدا کاریـان بـۆ یـەکێتیی دەکرد و پەیوەندی ڕاستەوخۆ و تاکی بە منەوە هەبوو، ئامادەیی پیشاندا کە لەگەڵ لاندکرۆزەرێکی نەخۆشخانەی سلێمانی کە شۆفێرەکەی ناوی (عەبدوللا)یە ناسـراو بـە عەبدوللا قەڵەو، هاوڕێیەکی کۆمەڵە بـوو ، پێکـەوە لـە کـاتی دیـاریکراودا (نەجمـەدین عەزیز و شاسوار جەلال) لـە سـلێمانیەوە بـەو ناسـنامە خواسـتراوانە ببرێنـە ڕانیـە و دۆڵی شەهیدان.

لە ١٩٧٥/١١/١٩ ناسنامەکان ئامادەکران و پلانـی دەرکردنیـان لـە سـلێمانی دانـرا، و هەر لە ڕێگەی ڕووناکی خوشکی "نەجمدین "ەوە، وەلامم بۆ نجمـەدین عـەزیز نـارد ، کە بە ڕووناك یـان حـەلاوەدا وێنەیـەکی خـۆی و وێنەیـەکی شاسـوارم بـۆ بنێـرێ تـا بیدەن لـە ناسـنامەکان. هـەر هـەمان ڕۆژ ڕوونـاك پێـی ڕاگەیانـدم: کـە نەجمـە دیـن دەیەوێ ڕۆژی دواتر واتە ١١/٢٠ لە ماڵی حەلاوە چاومان بە یەك بکەوێ.

پـاش نیـوەڕۆی ئـەو ڕۆژە لەگـەڵ نەجمـەدین یـەکمان بینـی ، مـن پـێم وابـوو ، کـە دەیانەوێ سەبارەت بە دەرکردنیان لە سلێمانی بدوێن، بەلام زۆرم لاسـەیر بـوو ، کـە نەجمەدین ووتی: جارێ بڕیارمان داوە ڕۆیشتنەکەمان دواخەین تـا ماوەیـەکی تـر ، خۆمـان ئاگـادارت دەکەینـەوە، پاشـان کەوتـە پرسـیارکردن لەسـەر مـان و نـەمانی ڕێکخستنی کۆمەڵـە و هێڵـەکانی ڕێکخسـتن و پرسـیارکردن سـەبارەت بـە بـارودۆخی کۆمەڵە، لەپاش گرتن و ڕۆیشتنی ژمارەیەکی زۆر لە هەڤاڵانی و گەلـێ پرسیاری تـر ، سەبارەت بە سەرکردایەتی کۆمەڵە و کێ و چ کۆمیتەیەك سەرپەرشتی ڕێکخستنەکان دەکات؟.

من داوای لێبووردنم لێکرد ، که ناتوانم وه‌ڵامی هیچ کام لـه پرسـیاره‌کانی بده‌مـه‌وه ، هۆکه‌شی ئه‌وه بوو، که ئه‌و له‌و کاته‌دا له کۆمه‌ڵه سڕکرا بوو، و هه‌ڤاڵه‌که‌شی شاسوار له ڕیزه‌کانی کۆمه‌ڵه‌دا نه‌ما بوو. ئـه‌وه‌ی زۆر لام سـه‌مه‌ره و جێـی سه‌رسـوڕمان بـوو، ئه‌وه بوو ، که له وه‌ڵامی مندا نه‌جمه‌دین پێی ڕاگه‌یانـدم: کـه ئـه‌وان واتـه شاسـوار و نه‌جمه‌دین په‌یوه‌ندییان له‌گه‌ڵ هه‌ڤاڵێکی نوێنه‌ری خانه‌قین که له سلێمانیدایه و ناوی (حیکمه‌ت محه‌مه‌د) ه‌و له کۆیه‌ش په‌یوه‌نییان به ئازاد عبدولمه‌جید (ئـازاد هـه‌ورامی) وه، کـردووه و بڕیاریانـداوه ، کـه کۆمیتـه‌ی هه‌رێمـه‌کان لـه‌و هه‌ڤاڵانـه و به‌نـده‌ش پێکبێـــنن. له‌ســـــه‌ری ڕۆیـــــشت و پێناســـــه‌ی کۆمیتـــــه‌ی هه‌رێمـــــه‌کانی وه‌ك سه‌رکردایه‌تیه‌کانی کۆمه‌ڵه کرد ، وای نیشاندا که پاش ڕۆیشتنی زۆربـه‌ی ئه‌ندامانی سه‌رکردایه‌تی بۆ ئێران و گیرانی زۆربه‌ی ئه‌ندامه پێشکه‌وتووه‌کانی کۆمه‌ڵه، ئێستا کۆمه‌ڵه پێویستی به کۆمیته‌یه‌ك هه‌یه، که نوێنـه‌ری شـاره‌کانی کـه‌رکوك و سـلێمانی خانه‌قینی تێدابێ و پاشان نوێنه‌رێکی هه‌ولێریش بخرێته کۆمیته‌که‌وه.

من هه‌ر ئه‌وه‌نـده‌م بـۆ ڕونکـرده‌وه ، کـه ڕاسـته چـه‌ند هێڵێکـی ڕێکخـستنی کۆمه‌ڵـه به‌هۆی گرتنی لێپرسـراوه‌کانیانه‌وه تێکـچوون، بـه‌ڵام زۆربـه‌ی هێڵـه‌کان په‌یوه‌نـدییان هه‌یه و کۆمیته‌یـه‌کیش بـه نـاوی ڕێکخـستنی شـاره‌کان سه‌رپه‌رشـتی ڕێکخـستنه‌کان ده‌کـا. هـه‌رگیز بـۆ نه‌جمـه‌دین و شاسـوار و که‌سـی تـریش نیـه، لـه خۆیانـه‌وه و بـه بڕیـارێکی سـه‌رپێی خۆیـان، خۆیـان بکه‌نـه سـه‌رکردایه‌تی ڕێکخـستنی کۆمه‌ڵـه بـه تایبـه‌تی کـه هـه‌م نه‌جمـه‌دین و هـه‌م شاسـوار لـه‌م کاتـه‌دا ئه‌نـدامی کۆمه‌ڵـه نـین و ناشـتوانن سـه‌رکردایه‌تی و ڕابه‌ڕایـه‌تی ڕێکخـستنه‌کانی کۆمه‌ڵـه بکـه‌ن ، و منـیش ئاماده‌نیم له‌گه‌ڵیاندا کار بکه‌م، چونکه به هیچ جۆرێ ئه‌و شه‌رعیه‌ته‌یان نیه، و پێشم ڕاگه‌یاندن که ئه‌و کاره‌ی ئه‌وان ، جگه له پیلانێکی تێکده‌رانه‌ی ڕیزه‌کـانی کۆمه‌ڵـه ، هیچی تر نیه به‌م به‌ڵگانه‌ی خواره‌وه:

١ـ ئه‌و کاره ته‌نیا له هه‌لپه‌رسته‌کان ده‌وه‌شێته‌وه ، که به هه‌لی ده‌زانن سـه‌رکردایه‌تی وڵاتیان جێ هێشتووه و شـاڵاوی گـرتنیش به‌رده‌وامـه، هه‌لپه‌رسـتان بکه‌ونـه لادانـی

کۆمەڵە لە ڕێبازی ڕاستی خۆی ، بە تایبەتی کە، کەستان لەسەر جیاوازی بیروڕاتان لەسەر کوردستانی کۆمەڵە لە ڕیزەکانی کۆمەڵەدا نەماون.

٢ـ ئێوە دەزانن کە کۆمەڵە کۆمیتەی شارەکانی هەیە. سەرپەرشتی ڕێکخستنەکانی دەکا ، پێکهێنانی کۆمیتەیەکی تری سەرپەرشتیکەر ، مانای دوو کەرت کردنی کۆمەڵەیە و شان بە شانی شاڵاوەکانی ڕژێمی عیراقی دەبنە ماکی هەڵتەکاندنی کۆمەڵە.

٣ـ ئێوە کە ئێستا لە دەرەوەی ریزەکانی کۆمەڵەن و لە هیچ لایەک و لەلایەن هیچ ئەندامێکی کۆمەڵەوە هەڵنەبـژێردراون بەو ئەرکە هەستن، ئەم کارەتان مانای خۆداسەپاندنی بە زۆرەملی بەسەر کۆمەڵەدا دەگەیەنێ . و باش دەزانن کە هەموو خۆداسەپاندنێك و بیرێکی داسەپێنەرانە ، لەلایەن کۆمەڵەوە پەسەند ناکرێ. ئەو دانیشتنەمان پێکەوە کە لە ماڵی مامۆستا حەلاوەی پورزای نەجمەدین بوو، بە ئامادەبوونی ئەویش کۆتایی هات. ڕۆژی ١٩٧٥/١٢/١٠ هەڤاڵ ئەکرەم سەید مەجید ناسراو بە (دلێری سەید مەجید) ئاگاداری کردم کە شاسوار جەلال (شەهید ئارام) داوای لێ کردووە ، کە تایپ و ڕۆنیۆکەی کۆمەڵە کە لای ئەو حەشاردرا بوو، بیداتێ، و داوای رای ئێمەی کرد و منیش پێم ڕاگەیاند: کە بە هیچ جۆرێ نە تایپ و نە ڕۆنیۆ و نە ناوی هیچ کەسیان نەداتێ.

هاوڕێ دلێر داوای لێکردم کە گەر لەگەڵ شاسوار یەکتر ببینین باشتر نیە؟ منیش وەڵامی قایل بوونم دایەوە ، بەڵام تا پاش تەسلیم کردنەوەی شەهید شەهاب و هاوڕێکانی لەلایەن ڕژێمی ئێرانیەوە بە ڕژێمی عیراق وەڵامیان نەبوو؟.

لە ناوەڕاستی مانگی ١٩٧٥/١٢ شەهید عەلی ئامەخانمان ناردە دیوی ئێران بۆ سەردانی هەڤاڵانمان لە زیندانی سەقز و شەهید عەلی پاش دە ڕۆژ گەڕایەوە و ئاگاداری کردین کە ڕژێمی ئێرانی لە هەفتەی ئایندەدا هەڤاڵانمان بە دوو ئەفسەری ئێرانی کە لای عیراق بوون و ئۆپۆزسیۆن بوون و خۆیان تەسلیم بە عیراق کرد بوو دەگۆڕدرێنەوە.

کۆمیتەی شارەکان لە ١٢/٢٨ دا کۆبوەوە و بڕیاریدا ئەوەندەی بکرێ هەوڵ بدرێ بۆ فراندنیان لە کاتی ناردنیان لە سنورەوە بۆ دیوی عیراق ، بۆ ئەو مەبەستە کە ئاگاداری ئەوە بووین ئەو هەڤاڵانە لە سنوری پێنجوێنەوە دەدرێتەوە بە عیراق، شەهید عەلی ئامە خان چوو بۆ پێنجوێن و لەوێ بۆ ئەو کارە پەیوەندی لەگەڵ ڕێکخستنی کۆمەڵە کرد بوو.

لە ڕۆژی ١٩٧٦/١/١ هەموو هەڤاڵە گیراوەکانی ئێران لە پێنجوێنەوە درانەوە بە عیراق پاش ١ یان ٢ ڕۆژ بە ئۆتۆمبێلی پۆلیس نێردران بۆ سلێمانی . هەڤاڵان لە پێنجوێن هەوڵیان دابوو ، کە پەیوەندی بە بەندکراوەکانەوە بکەن و ئاگاداریان کرد بوون ، کە هەوڵدەدەن لە ڕێگا تەقە لە ئۆتۆمبێلەکە بکەن ، با بەندکانیش سود لەو هەلە وەرگرن و ڕاکەن، بە داخەوە شەهید شەهاب دژی ئەو ڕایە ببوو ، تەنانەت لە ڕێگاش هەڤاڵ (عەلی عەسکەری - ناسراو بە عەلی بچکۆل ویستبووی خۆی لە سەیارەکە هەڵداتە خوارەوە دیسان شەهید شەهاب قایل نەبوو. هەر لەو هەفتەیەدا لە سلێمانیەوە نێردران بۆ بەڕێوەبەرێتی (أمنی کەرکوك).

لە ١٩٧٦/١/٩ هەڤاڵ ئەکرەم سەید مەجید (دلێر) پێی ڕاگەیاندم کە شاسوار جەلال دەیەوێ یەکتر ببینین.

بە هەڤاڵ دلێرم ووت :" بۆ نزیکەی یەك مانگە ، کە تۆ داوات کرد و من پێم وابوو ، ئەوسا ئەو داوایەی تۆ، هی شاسوارە یەکتر ببینین، تا ئێستا دەنگیان نەبووە، بۆ ئێستا پاش تەسلیم کردنەوەی هەڤالان ،دەیەوێ یەك ببینین؟ وادیارە ئێستا ئیتر دڵنیابوون لە گرتنی هەڤالانی سەرکردایەتی و دەرباز نەبوونیان . بۆیە دەیەوێ یەکتر ببینین". بە هەر حاڵ قایل بوونم دەربڕی و ڕۆژی ١٩٧٦/١/١١ لە ماڵی هەڤاڵ دلێری سەید مەجید لەگەڵ شەهید شاسوار (شەهید ئارام) یەکمان بینی ، بە ئامادەبوونی هەڤاڵ دلێر و کۆبەندی گفتوگۆکانمان لە تەوەری ئەم خاڵانەی خوارەوەدا بوو:

**داواکانی شاسوار**

أ- ڕێکخستنەکانی هەردوو کۆمیتەکە پێکەوە ڕێکبخرێنەوە.

ب - هەردوو کۆمیتەکە ببنە یەك کۆمیتە و لە ژێر یەك ناویشدا کار بکەن.

ج - هەوڵ بدرێ گەر وەرزیش بێ ئۆرگانی کۆمەڵە دەربچێت.

د - بۆ مەبەستی خاڵی (ج) دەبێ کۆمیتەی شارەکان تایپ و ڕۆنیۆکەی کۆمەڵە تەسلیم بە کۆمیتە تێکەڵەکە بکات، کە هەر بە ناوی کۆمیتەی هەرێمەکانەوە بمێنێتەوە.

هەر ئەو پارەیەی کە هاوڕێیانی کۆمەڵە کۆیان کردۆتەوە بەو نیازەی، پارێزەرێك بۆ گیراوەکان پێ بگرن، بدرێ بە کۆمیتەی هەرێمەکان بۆ دروستکردنی، وەکرێت تا هەندێ لە ئەندامانی کۆمیتە کاری تێدا بکەن و لە وێشدا ئۆرگانی کۆمەڵە چاپکەن.

**داواکانی بەندە:**

١ـ ئێمە پێمان شك نایە، کە ئەوەی ناوتان لێتانەوە کۆمیتەی هەرێمەکان ڕێکخستنتان لەناو کۆمەڵەدا هەبێ. مەگەر بە (خط مائل)، چونکە ڕێکخستنەکانی ئازاد هەورامی ئاگاداریەتی، کۆمیتەی شارەکان سەرپەشتیان دەکەن، تۆش و نەجمەدینیش زۆر لە مێژە کۆمەڵە نین و لە کۆمەڵەش دابڕاون.

٢ـ کۆمیتەی شارەکان، بە هیچ جۆرێك دان بە شەرعیەتی ئێوەدا نانێن، تا لەگەڵتان تێکەڵ ببنەوە.

٣- هەر ئۆرگانێکیش دەربچێ، دەبێ هەر بە ناوی ئاڵای سورەوە بێ و هەمان ڕەوت ڕێباز و ئایدیۆلۆژی کوردستانیەتی کۆمەڵەی تیا ڕەنگ بداتەوە.

٤- کۆمیتەی شارەکان بە هیچ جۆرێ ئامادە نیە تایپ و ڕۆنیۆ و ئەو چەردە پارەیەی لە ئەندامان کۆکراوەتەوە بیدا بە ئێوە. دەکرێ بێ دروستکەن و ببنە پارویەکی

چەوری ئاسان بە دەسکەوتووی رژێم و گوڕزێکی کوشندە تریشی پێ لە کۆمەڵە بدرێ.

شاسوار لەو خاڵەی دوایی من گرژ بوو و واتێگەیشت ، کە من مەبەستم لە گومانکردن لەوە بوو، بە هەر حاڵ لەو دانیشتنە ئەنجامەکەی بەوە شکایەوە کە:

شاسوار سوور بوو لەسەر سەرکردایەتی کۆمیتەی هەرێمەکان و بەندەش لەسەر کۆمیتەی شارەکان و بڕیارماندا کە جارێکی تر و بە ئامادەبوونی ژمارەیەکی تریش لە هەر دوولا پێکەوە دانیشین.

رۆژی ١٩٧٦/١/١٥ شەهید عبدولرەزاق کە بە ئاگاداری کۆمیتەی شارەکان لە کۆمیتەی هەرێمەکانیشدا کاری دەکرد، ئاگاداری کردین کە کۆمیتەی هەرێمەکان بە تەمای ئەوەن بەم نزیکانە بڵاوکراوەیەکی ناوخۆ دەرکەن لە شێوەی مانفێستێك کە ئەم مەبەستانە بگرێتەخۆ:(سەرزەنشتکردن و هێرش بردنە سەر ئەندامە گیراوەکانی سەرکردایەتی کۆمەڵەی لە بەندیخانەکانی رژێم ، بانگەشەی بۆ "أصلاحی زراعی" چارەسەری کشتوکاڵی لە عیراق و کوردستان، وەك دروشمی خەباتی هەرە سەرەکی لەو قۆناغە، رونکردنەوەی بارودۆخی عیراق و ناوچەکە، و جیهان، ئامازەکردن بۆ ئەزموونی خەباتی گەلانی ژێر دەستە بە تایبەت ئەمریکای لاتین، راگەیاندنی کۆمیتەی هەرێمەکان وەك سەرکردایەتی کاتی کۆمەڵە، رەخنەگرتن لەپەیڕەوی ناوخۆی کۆمەڵە و ئامازەکردن بۆ گۆڕینی زۆر لە بەندەکانی پەیڕەوی ناوخۆ) رۆژی ١/١٦ کۆمیتەی شارەکان کۆبوونەوەیەکی کوتوپڕی کرد بۆ ناوکۆی کردنی ئەو نیازەی کۆمیتەی هەرێمەکان ، لە کۆمیتەی شارەکاندا دوو پێشنیار هەبوو.

أ- پێویستە کۆمیتەی شارەکان پەلە بکەن لە دەرکردنی بەیانێك لەسەر کۆمیتەی هەرێمەکان رونکردنەوەی چۆنیەتی پێکهاتەیان ، نیاز و مەبەستیان، رەوتی بۆچوونیان و رۆڵیان لە ناکۆکی عراقچێتی و کوردستانی و پاشان تاوانبارکردنیشیان بە تەقەلای کەرت و پەرتکردنی ریزەکانی کۆمەڵە.

ب ـ دووهەم پێشنیار ئەوە بوو، کە پەلە لەو کارە نەکرێ . بەڵکو هەوڵبدرێ بە زووترین کات پەیوەندی بە ئەندامە گیراوەکانی سەرکردایەتی بکرێ ، بە تایبەت شەهاب شێخ نورییەوە بکرێ.

١ـ بۆ ئەوەی رای ئەوان لەسەر ئەو کێشەیە بزانرێ.

٢ـ بۆ بەرگرتن لە ڕەفتاری بەیان و دژە بەیان ، کە رەنگە درزێك بکاتە ناو کۆمەڵە و لەو درزەشەوە رژێم بتوانێ دەلاقەیەکی تێ بکات.

پێشنیاری دووهەم بە دەنگی زۆر بەسەرکەوتو بڕیاردرا بەندە پەیوەندی بە شەهید شەهابەوە بکات.

کۆمیتەی شارەکان بۆ رێگرتن لە دەرکردنی یەکەم دەستە گوڵی کۆمیتەی هەرێمەکان کە بە مانیفێستی کۆمیتە هەرێمەکان و پاشان (ئاش) ئاڵای شۆڕش و پاشتر شەهید ئارام ناو دەبرا، بڕیارماندا تا پەیوەندی کردن بە بەندییەکانەوە ، هەوڵی دانیشتنێك لەگەڵ کۆمیتەی هەرێمەکان یان نوێنەریان بکەین.

لە رێگەی شەهید عبدولرەزاقەوە داوای دانیشتنێکمان لێکردن لە ١٩٧٦/١/٢٥ لە ماڵی شەهید سیروان (فەیسەل تاڵەبانی) نوێنەرانی هەردوولا کە بریتی بوون لە:(ئیحسان نەجم (ئەبو شەهاب)، شەهید سیروان، و بەندە لە کۆمیتەی شارەکان، حکمت محمد (مەلا بەختیار)، شەهید ئازاد هەورامی لە کۆمیتەی هەرێمەکان).

سەرجەمی گفتوگۆکانمان لە جوغزی بەیانە دەرنەکراوەکەی ئەواندا دەخولایەوە و ئەوان دانیان بەوەدا ناوە ، کە بە نیازی دەرکردنی ئەو بەیانەن ، ئێمە رای خۆمان لەسەر نا ڕاستی و نەشیاوی ناوەرۆکی بەیانەکە لە ٢ خاڵدا کۆ دەبێتەوە روون کردنەوەی خۆمان لەسەر دا کە بەمجۆرەی خوارەوە بوو:

١ـ باسکردنی ئەو هاوڕێیانەی ناو زیندان بە ناسنامەی ئەندامانی سەرکردایەتی کۆمەڵە لەو بەیانەدا، کە هێشتا دادگایی نەکراون دەبێتە بەڵگەیەکی گرنگ بە دەست رژێمەوە بە تاوانبارکردنیان بە تاوانی سەرکردایەتی رێکخراوێکی قەدەغە و دژە رژێم و ئۆپۆزسیۆن ، کە هێشتا هیچ کامیان دانیان بەوەدا نە ناوە، ئەو کارە ناراستەوخۆ

دەبێتە زمانلێدان لەو هەڤاڵانە و هاوکاریکردنی ڕژێم و پاشان بەرپرسیاری ئێوە لە بەردەم مێژوودا.

دیسان تاوانبارکردنی ئەو هەڤاڵانە کە تا ئەم دانیشتنەش پاڵەوانترین زیندانی ناو زیندانەکانی بەعس بوون لەسەر تاسەری عیراقدا بە:"أنتهازی، أنهزامی، معترف، متحرف"، لادانە لە هەموو پرەنسیپێکی سیاسیۆو تەنانەت ڕەوشتی کۆمەڵایەتیش)

وەڵامی نوێنەرانی هەرێمەکان بەرپەرچدانەوەی بۆچوونەکانی ئێمە بوو. ئەوان پێیان وابوو ، کە ئەو بەیانە تەنها بۆ ڕیزەکانی ڕێکخستنە و تەنانەت حکمت ووتی: (بۆچی ئێمە جاسووسی ڕژێمین ؟ تاوانبارمان دەکەن بە هاوکاری ڕژێم؟).

وەڵامی ئێمە ئەوە بوو، کە بڵاوکردنەوەی ئەو بابەتانە بە هەر ڕێگەیەك بێ وێنەی دەگاتە دەست ڕژێم، لەوانەیە کەسێك بگیرێو بەیانەکەی پێ بگیرێ ، لەوانەیە لە پشکنینی کەسێك، یا ماڵێك لەو بەیانەیان دەسکەوێ یا لەوانەیە لەم ناکۆکییەی ناوخۆدا پیاوێکی ڕژێم سوود لە بارودۆخەکە وەرگرێ و خۆی خزانبێتە ناو لایەکەوە و دانەیەکی لەو بەیانە دەسکەوێ.

٢ـ لەم بارودۆخەی ئێستادا کە ڕژێم کەوتۆتە ڕاگواستن و کاولکردن و سوتاندنی دێهاتەکانی کوردستان بە قوڵایی ٢٠ کیلۆمەتر لە سنورەکانی بەناو عیراق – ئێران ، عیراق– تورکیا، عیراق– سوریا، و دروستکردنی ئۆردوگای زۆرەملی کە دەیان کێشەی کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرهەنگی کوردی لە منداڵدانی خۆیدا هەڵگرتووە بۆ ئایندە و پاشان دەرکردنی کوردان لە زێدی خۆیان لە ناوچەکانی کەرکوك و کفری و خانەقین و بەشێکی گەرمیان و تعریبکردنی ناوچەکانیان ، ئایا بەرزکردنەوەی دروشمی (أصلاح زراعی) لەم بارووردۆخەدا و کردنی بە دروشمی کات و سات و قۆناغ بۆ جوتیاری کوردی ڕاگوێزراو و زەوی و زاری چۆڵکرا و سوتماك کراو ڕاستە؟ یان بەرزکردنەوەی دروشمی بەرگری لە گوندەکان لە ڕاگواستن لە سوتان لە چۆڵکردن و کاولکردن؟

ئێمه پێمانوایه لەم خاڵەشدا بەبێ دەنگی ئێوه لە بەیانەکەتان لە مەڕ ڕاگواستن‌و بەعەرەبکردن و کاولکردنی ناوچەکانی کوردستان و بەرزکردنەوەی دروشمی ( أصلاح زراعی ) بە ناڕاستەوخۆ بێ دەنگیە بەرامبەر سیاسەتی ڕاگواستن دیسانەوە حکمت محمد وەڵامی دایەوە، کە ئەو دروشمە دروشمێکی پێشکەوتوخوازانەی ئەم قۆناغەیە و ئەرکی خەڵکە مارکسیە ـ لینینەکانە ، کە داخوازی جێبەجێکەری بن و بەو کارەش دەبنە بەرگریکەر لە خواست و بەرژەوەندی جوتیاران کە هەژارترین و گەورەترین چین و توێژی کۆمەڵگای ئێمەن.

ووتم: (پێمان وایە نکۆڵی کردن لەو دروشمە و هەڵگرتنی هەر دروشمێکی تر لە شوێنی ئەو ، لادانە لە ڕێبازی مارکسیزم ـ لینینیزم).

ئێمه پێمانووتن :کە نکۆڵی لە ڕاستی و ڕەوایی ئەو دروشمە ناکەین. بەڵام کاتێك کە هەم جوتیار هەبێ و هەم زەوی، نەك کاتێ کە هەم جوتیار هەڵکەندراو ڕاگوێزراوبێ زەوی و زار، و هەم زەویش سوتماککراو کاولکراو.

٣ـ سەبارەت بە نیازی گۆڕینی ناوی کۆمەڵەو گۆڕینی بەشێکی زۆر لە بەندەکانی پەیڕەوەکەی پێمان ووتن : کە (کۆمەڵە ڕێکخراوێکە و لە ئەنجامی یەککگرتنی سێ هێڵ پێکهاتووە و بە قایلبوون و بڕیاری ئەندامەکانی ناو پەیڕەوی ناوخۆکەی دیاریکراوە ، ئێوە هەروا بە سانایی بە چوار کەس ناتوانن نە ناوی کۆمەڵە و نە پەیڕەوەکەشی بگۆڕن و ئەگەر بشتانەوێ بە بەیانێکی چوار کەسی ئەو کارە بکەن، ئەوە تەنیا ئاماژەیەکە بۆ بۆچوونی ئەو چوارەتان و ناتوانن هەرگیز ببنە نوێنەری ڕاو بیروبۆچوونی کۆمەڵە. لەناو ئەوان شەهید ئازاد هەورامی سەبارەت بە ناوی کۆمەڵە ووتی : (کام ڕێکخراو هەیە ناوەکەی هێندەی تەزبیحێ درێژ بێ " کۆمەڵەی مارکسی ـ لینینی ـ بیرو باوەڕی ماوتسی تۆنگ) ئەمە کەی ناوە؟ ڕاستە وایە بیروباوەڕی ماوتسی تۆنگەکەی لێ بکرێتەوە)

ئێمه پێمان ووت : کە پتر لە ٢ ساڵە ئەو ئەندامەی کۆمەڵەیە و هەرگیز ئەم نا قایلبوونەی بۆ ناوی کۆمەڵە دەرنەبڕیوە ، بۆیە پێمان وایە ئەوە ڕای شاسوارە ، بەڵام

ئەو دەیلێتەوە دانیشتنەکە پتر لە ٤ ـ ٥ سەعاتی خایاند لە ئەنجامدا گەیشتینە ڕێکەوتن لەسەر ئەم دوو خاڵە:

١ـ ئەوان ئەو بڵاوکراوەیە دەرنەکەن . (ئەمە داوای ئێمە بوو)
٢ـ کۆبوونەوەیەکی تر بکەین بە ئامادەبوونی شاسوار لەسەر ئەو خاڵانەی کە لە ١/١١دا لە نێوان شاسوارو بەندەدا کراوە (ئەمەش داوای ئەوان بوو) و ئەوان کات و شوێنی کۆبوونەوەکە دیاری بکەن.
بە پێچەوانەی ئەو ڕێکەوتنە هیچ وەڵامێکمان لە کۆمیتەی هەرێمەکانەوە پێ نەگەیشت تا لە ڕۆژی ١٩٧٦/٢/٨ دانەیەك لە (مانیفێستەکەی شوباتمان) لە ڕێگەی شەهید عبدلرەزاقەوە پێ گەیشت کە دەقاو دەق لە (١٦ ـ لاپەڕەی (دینا ٤) بە کوردی لە ١٦ لاپەڕەی خورشیدیدا ، هەمان بابەتەکانی تیا نوسرا بوو ك ەکاتی خۆی شەهید عبدولرەزاق بۆی باسکردوین و پاشان خۆشیان لە زاری حکمەتەوە لە دانیشتنی ١٩٧٦/١/٢٥ دا دانی پێدانا.
بە ڕاستی بۆ ئێمە دەرکردنی ئەو بەیانە و لەو ڕۆژە شوومەشدا ، کە یادی چونە سەر حوکمی بەعسیەکان بوو، لە ١٩٦٣ دا جێی کۆمەڵێ پرسیار و گەڕان بە دوای وەڵامیشیان بوو. کۆمیتەی شارەکان دیسانەوە کۆبۆوە و بڕیاردرا لەگەڵیان دانەنیشتن تا هەڤاڵانی زیندان دەبینن.
ڕۆژی ٢/١٠ سەردانی هەڤاڵانی بەندیخانەم لە بەندینخانەی (ئەبو غریب) کرد و لەوێ شەهیدان شەهاب و جەعفەر و هاوڕێ فەرەیدون عبدولقادر و ئاوات عبدولغەفور و عەلی بچکۆلم بینی ، لەگەڵ عومەری سەید عەلی و جەبار فەرمان و کاك دارۆ.
شەهید شەهاب وتی کەئەوە مەترسی لەسەر ئایندەی کۆمەڵە و کەرت و پەرتکردنی دروستدەکات پێویستە لێیان نزیك ببینەوە و ئاگاداری هەڵسوکەوتیان بن، گەر بکرێ باشترە پێکەوە کار بکەن و ڕێگەی ئەوە نەدەن ، کە کۆمەڵە بە دوو ئایدیۆلۆژی جیاواز و دوو هێڵی جیاواز کار بکات، پێویستە ئێوە ڕێگە لە گەشەکردنی بیروڕای

عراقچێتی له کۆمەڵەدا بگرن ، ئەویش بە کارکردنتان پێکەوه و دەبێ هەمیشە کۆمەڵە لەپەلاماری رژێم بپارێزن . رەنگە گەر بکەونە دژایەتی یەکتری ، هەردوولا توشی پەلاماری ڕژێم ببن و بە تایبەتی ئەوانە کە هەم نەجمەدین و هەم شاسوار زمانیان لێدراوه لەلایەن ڕژێمەوه بڕیاری گرتنیان هەیە ، ڕەنگە گەر بگیرێن زیانێکی تر و کەلێنێکی تر بخەنە کۆمەڵەوە. بۆیە من پێم باشە لە گەڵیان نەرم بن رێکەون و گەر خۆتان پێتان باش بێ بە یەکیشەوە کاربکەن و هەوڵدەن و نەهێڵن ڕێبازی کۆمەڵە بگۆڕێ و کوردستانیەتی کۆمەڵە لەم کاتەدا دروشمی سەرەکیتان، ئەو بەیانەش کە لەسەر ئێمە دەریان کردووه ، ئەوە ویژدانی خۆیانە لە ئایندەدا کە بۆیان دەرکەوت ئێمە نە معترف و نە منحرف و نە أنتهازی و نە أنهزامین و پاشان مێژووش بەرپەرچی ئەو بۆچوونانەیان دەداتەوه ، گەر ئێمە تاسەر خۆڕاگربووین. رەنگە رۆژێ بێ هەر ئەوان خۆیان داکۆکیمان لێبکەن. شەهید جەعفەر عبدولواحد. رای وابوو کە: (من پێم وایە کە ئەوەی خاڵە عوسمان (شەهید شەهاب) دەڵێ پێویستە خۆتان هەڵی سەنگێنن و گەر پێتان وابوو ، بۆ بەرژەوەندی کۆمەڵە باشە؟ پەیرەوی کا و گەر نا خۆتان بڕیاری بدەن .بەڵام بۆ بەیانەکەیان، ئایندە دەیسەلمێنێ کە ئەوەی ئەوان دەیلێن وا دەردەچێ یان بەپێچەوانەوە، گەر پێچەوانە بوو، ئەوە خۆیان پاداشتی ئەو هەڵوێست و بۆچوونە هەڵەیان لە مێژوو وەردەگرن ). فەرەیدون عبدولقادر رای وابوو، کە (خاڵە شەهاب رای چۆن بووه وا بکەن و پێشی ووتم: کە لەناو زیندان ئەو ناتوانێ هیچ بڕیارێك ، بۆ ئێمە بدات)

ئاوات عبدولغەفور پێی ووتم:(کۆمیتەی هەرێمەکان دەستیان خۆشبێ زۆر چاکیان کردووه و پێویستە هاوکاریان بکەن)

بیروڕای هەڤاڵانی بەندیخانەم بە ئەندامانی کۆمیتەی شارەکان گەیاند. ڕای کۆمیتەی شارەکان جگە لە شەهید عبدلرەزاق پێی وابوو ، کە کۆمیتەی هەرێمەکان ئەو

بەیانەیان بڵاونەکردۆتەوە و ئەو دانەشیان کە بە ئێمە گەیشتووە بۆ فشارخستنە سەر ئێمەیە، بۆیە پێمان باش بوو ، کە بەر لە بڵاوکردنەوەی دانیشتنێکیان لەگەڵ بکەین.
دیسان لە ڕێگەی دلێری سەید مەجیدەوە وەڵاممان بۆ شاسوار جەلال نارد: کە دانیشین و ڕۆژی ٢/١٤ بە ئامادەیی دلێر لە ماڵی ئەوان لەگەڵ شاسوار دانیشتین و هەمان قەوانە کۆنەکان لێدرایەوە و داوام لێکرد ، کە دەتوانین گفتوگۆ لەسەر پێکەوە کارکردن بکەین بە مەرجێ ئەو بەیانە بڵاونەکەنەوە.
بەڵام شاسوار بە ڕاشکاوی ڕایگەیاند کە بەیانەکە بڵاوکراوەتەوە و بۆ هێڵەکانی ڕێکخستن نێردراون . جێگەی خۆیەتی کە باسێکی کورتی هێڵەکانی ڕێکخستنی سەر بە کۆمیتەی هەرێمەکان بکەین.
دوای ڕوودانی ئاشبەتاڵ و کاریگەری لەسەر ریزەکانی کۆمەڵە و پەیدابوونی چەند بیروڕایەکی زۆر جیاواز لە یەکتر و تەقەلای برایم حەسەن و برایم خەلیل و کەسانی تر بۆ پێکهێنانی کۆمەڵەی ڕەنجدەران و کارکردن لەناو ریزەکانی کۆمەڵەشدا بە مەبەستی هەڵتەکاندنی، لە پێکهێنانی کۆمیتەی هەرێمەکان ئەو پەروپاگەندانەی کۆمەڵەی پاش ئاشبەتاڵ و هێلەکەی برایم خەلیل پەیوەندیان بە کۆمیتەی هەرێمەکانەوە کرد ، و بوونە جەماوەری ڕێکخستنی کۆمیتەی هەرێمەکان.
**هەر لەو دانیشتنە لەسەر سێ خاڵ ڕێکەوتن:**
١ـ هەوڵدەن چەند بکرێ ، بەیانی شوبات کۆکەنەوە و بەیانێکی تر دەرکەن ، کە ناوەڕۆکی بەیانی شوباتی تیا پوچەڵ کەنەوە ، بە تایبەت ئەو دوو خاڵەی پەیوەندی بە هەڤاڵانی سەرکردایەتی کۆمەڵە و بە دروشمی چارەسەری کێشەی کشتوکاڵیەوە هەبوو.
٢ـ کۆمەڵە هەر بەناوی خۆی و پەیڕەوەکەی خۆیەوە بمێنێتەوە ، بێ دەسکاریکردنی و بێ گۆڕینی ڕێبازی کوردستانیەکەی ، تا هەڵکەوتنی هەلی گرتنی کۆنفرانس یا کۆنگرەیەک ، کە بڕیار لەسەر هەر گۆڕانێك لە کۆمەڵەدا بدا.

٣ـ پاش دەرکردنی بەیانەکە واتە جێبەجێکردنی خاڵی یەك لەلایەن کۆمیتەی هەرێمەکانەوە ، ئەوسا کۆمیتەی شارەکان و هەرێمەکان رێکخستنەکانیان تێکەڵکەنەوە و ئۆرگانێکی دەرکەن بە ناوی ئاڵای سورەوە.

بە داخەوە شاسوار جەلال لە هەموو بەڵێنەکانی خۆی پەشیمان بۆوە ، با بڵێم پێچەوانەی بەڵێنەکانی رەفتاری کرد کە لە ٢/٢٥ بەیانێکی یەك لاپەڕەییان دەرکرد و ناوەرۆکەکەی بریتی بوو لە هەڵسەنگاندنی بەیانی شوبات و گرنگی لەو قۆناغەیاندا و سوربوون لەسەر پەیڕەوکردنی تەواوی ناوەرۆکەکەی.

## ٢.١٧ بەیانی شوبات لە هەڵسەنگاندنێکدا.

ئەگەر هەر کەسێك کەمێك لە دیسپلین گەیشتوو ، کەمێ لە رەوشتی سیاسی و کەمێکیش لە هەستی نەتەوایەتی و رێ و رەسمی کۆمەلایەتی گەیشتوو ، بکەوێتە هەڵسەنگاندنی بەیانی شوبات ، پێموایە هەر جۆرە بیروڕا و رێبازێکی سیاسی هەبێ ، با هەر بێلایەنانە رەفتار بکا ، بۆی دەردەکەوێ ، کە نەك هەر ناکرێ شانازی پێوە بکرێ ، بەڵکو دەبێ ئەو بەیانە بە هەڵەیەکی مێژوویی ناو مێژووی کۆمەڵە ئاماژە بکرێ.

من تەنیا کورتەیەك لە بەیانی ١٦ لاپەڕە خورشیدیەکەی ٨ی/ شوباتی /١٩٧٦ دەخەمە بەردەمی خوێنەر ، کە بە چاوی بارودۆخی ئەوسای مەسەلەی کورد تێڕوانینی رژێم بۆی ، هەلومەرجی چارەنووسی بەندیەکانی کۆمەڵە و گەڕانی رژێم بە دوای بەڵگەدا لەسەریان ، بارودۆخی ئەوسای کۆمەڵە و بەردەوامی شاڵاوی رژێم بۆ سەر رێکخستنەکانی ، لێك جیاوازی بارودۆخی خوارووی کوردستانی پاش ئاشبەتاڵ و هەستی رژێمی دکتاتۆری عێراقی لە سەرکەوتنەکانیدا بەسەر شۆڕشی ئەیلولدا ، لەگەڵ بارودۆخی ئەزموونی شۆڕشەکانی ئەمریکای لاتین ، بیخاتە بەر تیشکی لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندنێکی راست و پاشان بڕیاردانێکی نەترسانە لەسەری.

١ـ بەشی یەکەمی بەیانەکە ٨ لاپەڕەی واتە (نیوەی) بەیانەکە تایبەت بوو ، بە هێرش بردنە سەر ئەندامانی سەرکردایەتی کۆمەڵە کە هەموویان لە بەندیخانەی بەعسدا لە ژێر چەقۆی ڕژێم دابوون ، و تا ئەو کاتەی کە بەیانەکەش دەرچوو ، و تا مانگی ئاداریش کە شەهید (وەستا ئەنوەر) ی برای (خولە کەشکۆل) شێخ عەلی ، لە هەڵەبجە بەو بەیانەوە گیرا ، هیچ کامیان دانیان بە لێپرسراوی خۆیان لە کۆمەڵەدا نەنابوو نەشچووبوونە ژێر باری هیچ بروبیانو و خواست و هەڵبەستراوێکی ڕژێم. ئەو بەیانەی کە بە شەهید (وەستا ئەنوەر) گیرا لە کاتی دادگایکردنی بەندیەکان وەك بەڵگەنامەیەك لەسەریان بۆ دادگایی کردنیان و تاوانبارکردنیان بەکارهێنرا . ئەگەرچی شاسوار و نەجمەدین و حیکمەت ، تەنانەت ئازاد هەورامیش پاش گرتنی (شەهید وەستا ئەنوەر) نکۆڵیان لەوە دەکرد ، کە بەو بەیانەوە گیرا بێ . بەلام لە کۆنفرانسی یەکی کۆمەڵە لە مزگەوتەکەی (مالیمۆس) خولە کەشکۆڵ (شیخ عەلی) دانی پێدانا و رایگەیاند کە براکەی بەو بەیانەوە گیرا و وەك بەڵگەش لەسەری شەهید کرا.

بەشی یەکەمی: بەیانەکە باسی لە (أنهزامیەتی) ئەندامانی سەرکردایەتی دەکرد ، کە چۆن ترسنۆکانە لە کاتی ناسکدا کوردستانیان بەجێ هێشت و رایانکردە ئێران و لەوێش کەوتنە داوی ڕژێمی شای ئێرانەوە . درێژدادڕیەکی زۆری لەسەر دەنوسن تا دەگاتە سەر تاوانبارکردنیان بە (أنتهازی) و بێ باریان لە بەرامبەر ڕێبازی کۆمەڵە و لادانیان بەرەو بیروباوەڕ و ئایدیای بۆرژوازی بێ توانای نەتەوەپەرستی کوردی و پاشان لادانی کۆمەڵەش لە ڕێبازە ڕاستە پرۆلیتاریەکەی ، ئەم بەشەش هەر بێ تام لەسەری دەڕۆن و تا دەگەنە سەر تاوانبارکردنیان بە (معترف) و ترسنۆك و خۆڕانەگر لە بەردەم جەلادەکانی ڕژێم و پێوەنانی دەیان درۆ و دەلەسەی شاخ و باڵدار پێیانەوە.

من له خوێنەر دەپرسم : گەر ئەو هاورێیانەی سەرکردایەتی بەندکرا و أنهزامی بوونایە ، بیریان لە چوونە سوریا و کارکردن لە سەرکردایەتی یەکێتیی و پاشان پلاندانان بۆ شۆڕشی چەکداری دەکردەوە).

گەر ئەو هاوڕێیانە أنتهازی بوونایە ، وەك بەیانەکەی شوبات ناویان دەبا و بێ هەڵوێست بوونایە، هەر لە زیندانەکانی ئێراندا بەر نە دەبوون ؟ یان هەر نەبێ لە زیندانەکانی رژێمی عیراقدا نە یاندەتوانی هەر زوو خۆیان بفرۆشن و گەر وەك بەیانەکەی شوبات دەڵێ (منحرف) واتە لا دەر بوونایە، ئەوانیش وەك نوسەرەکانی بەیانی شوبات دەمێك کوردستانی و دەمێك مارکسیەکی عەیار ٢٤ و دەمێك پاڵەوانی مەیدان و دەمێکیش ترسنۆکێکی خۆرانەگر لە بەردەم کەمترین مەترسیدا نە دەبوون؟

گەر وەك نوسەرانی بەیانەکەی ٨ شوبات دەفەرموێ (معترف) بوونایە ، لانی کەم دەیانتوانی (أعتراف) لەسەر نوسەرەکانی بەیانەکە بکەن ، بە تایبەت کە شاسوار و نەجمەدین یش ، هیچ کامیان کۆمەڵە نەبوون ، یان نە یاندەتوانی کە بەندە چوو بۆ لایان داوامان لێ بکەن کە کاریان لەگەڵ نەکەین؟

و بەیانیشیان لەسەر دەرکەین و وەك ئەوان ئاسایی بەیانەکەشمان ببێتە بەڵگە لەسەریان؟

بەشی دووهەمی بەیانەکە: دەکەوێتە ڕازاندنەوەی ئەو بەشە بە چەندین ووشە و رستەی بە ناو مارکسیو پێشکەوتنخوازی و بەپەرۆشی بۆ جوتیاران و کرێکاران و لێدانەوەی قەوانە سواوە کۆنەکەی تحریفیەکانی عیراقی. باسکردن لەسەر (أصلاح الزراعی) و شیکردنەوەی و کردنی بە دروشمی قۆناغ بۆ خەباتکردن لە پێناویدا.

زۆر کەس لەوانەی کە ئەو کاتە بە مەبەستی لێدان لە کۆمەڵە و ڕێبازی کوردستانی ، بە شان و باڵی ئەو بەیانەدا هەڵدەدا و بە مانیفیستی سەردەم ناویان دەبرد، ئەم

بەشەی بەیانەکەیان بە دۆزینـەوەی گـەورەترین و سـەردەمترین و پێشکەوتوو تـرین دۆزی چەپێتی لە قەڵەم دەدا.

من دەپرسم، جووتیارێك سەر پشك بکرێ ، لە دابەشـکردنی زەوی بەسـەریدا ، بـەڵام بە ڕاگوازراوی و دەرکراوی لە زێدی باپیرانی خۆی و لە ئاوارەییـدا، یـان ژیـان لەسـەر زێدی خۆی و دابەش نەکردنی زەوی بە سەریدا، کامیـان هەڵدەبـژێرێ ؟ دابەشـکردنی زەوی بەسەر کام جوتیار دا؟ ئەوانەی بەزۆر ڕاگوێزران و لە ئۆردوگای زۆرەملێدا بەنـد و تەڵبەندکران؟.

کام زەوی دابەش بکرێ ؟ ئەو زەویانەی کە پلانی سوتماك کردنی بە درێژایی سـنوری باشوری کوردستان و بە قوڵایی پتر لە ٢٠ کیلۆمەتر بۆ داڕێژرا بوو ، بڕیاری کردنی بە ناوچەی قەدەغەکراو بۆ درابوو؟

لە کاتێکدا کە ئەندامانی کۆمیتەی هەرێمەکان و داڕێژەری مانیفێـستی ٨ ی شـوبات ، پاش ئاگاداری ئەو بڕیارەی ڕژێم و ئەو پلانەی بەعسیەکان بوون ، کە پاش ئاشبەتاڵ دا بوو یان بۆ ڕاگواستنی زۆرترین ژمارەی گوندیەکان و هەموو شار و شارۆچکەکانی ناوچە سنوریەکان.

ئایا ڕاستر وانـەبوو ، کـە دروشـمـی بـەرگری لـە ڕاگواسـتن و دژی بەعـەرەبکردن و بـە بەعسیکردن بەرزکەنەوە و بیکەنە دروشمی قوناغی خەبات؟

بەشی سێهەمی : بەیانەکە تەرخانکرا بوو بۆ لێدوان لە ناوی کۆمەڵە و ڕێبازی کۆمەڵـە و پرۆگرام و پەیڕەوی ناوخۆی کۆمەڵە و ڕەخنـەلێگرتنیان و زەمینەسـازی کردنـی بۆ دەسکاری کردنیان و گۆڕین و لابردن و دانانی بەش و بەند و خاڵـەکانی پـەیڕەوی کۆمەڵە.

ئەم بەشە هێندەی لە ڕووکەشدا بوو ، گوایە سازدانەوەی ڕێکخـستنەکان بـوو ، زۆری لەوە پتر لە ناوەڕۆك و گەوهەردا بۆ لادانی کۆمەڵە بوو، لە ڕێبـازە کوردسـتانیەکەی و

خۆسازدان و ئامادەکردن بۆ گۆڕینی رەوتی کۆمەڵە ، بەو ئاقارەی ، کە شاسوار بەر لە ساڵێك لەسەری وازی لە کۆمەڵە هێنا بوو ، و نەجمەدینیش لەسەری سڕکرا بوو.

گەر هاوڕێیانی کۆمیتەی شارەکان بە پەرۆشی کۆمەڵەوە نەبوونایە و هیوای شۆڕش و داهاتووشیان بە کۆمەڵە نەبوایە و ولانی کەمی رەوشتی سیاسی و بەرژەوەندی نەتەوەییان نەبوایە ، و وەك کۆمیتەی هەرێمەکان هەڵوێستیان لە بەرامبەر وەربگرتایە، چ کارەساتێك رووی دەدا؟.

لە خوێنەر دەپرسم ، گەر کۆمیتەی شارەکان وەك کۆمیتەی هەرێمەکان رەفتاریان بکردایە ، ئایا ئەوەی لە کۆنفرانسی یەك و دوو و سێ و پاشان لە ساڵی ١٩٨٦ دا لەلایەن ئاشەوە رووی دا، هەر ئەو کاتە رووی نە دەدا؟

ئاش لە ساڵی ١٩٨٦ سەبارەت بە هەڵوێست وەرگرتنی سەرکردایەتی کۆمەڵە و یەکێتیی بەرامبەریان ، تاوانی لە رێ لادان و هەڵفریواندن و کردنە جاش و پیاوی رژێمی دەیان پێشمەرگەی قارەمان و خۆنەویستیان گرتەئەستۆ و بە ئاشکرا و بێ پەروا بۆ لاوازکردنی ریزەکانی کۆمەڵە و یەکێتیی دەیان کادری سیاسی و پێشمەرگانەو پێشمەرگە و ئەندامی کۆمەڵەیان هاندەدا بۆ تەسلیمبوونەوە بە رژێم و چۆڵکردنی سەنگەری شەرەف و تەنانەت چەك پێ هەڵگرتنیان لای رژێم بەو هیوایەی کودەتایەك بەسەر یەکێتییدا. دەرکەوت و جارێکی تر ئەو جاشانە بە چەکەوە دەبەنەوە لای خۆیان.

گەر کۆمیتەی شارەکانیش وەك هەرێمەکان رەفتاریان بکردایە و کاردانەوەیەکی هەست بە بەرپرسیاری نەکردنیان بنواندایە ، هێندەی تر ریزەکانی کۆمەڵە دەلاقەی تێنەدەکەوت و نەدەکەوتنە بەر شاڵاوی رژێم و تەفروتونا بوون ؟.

بەندە لە ١٩٨٦ دا لێکۆڵینەوەم لەگەڵ حیکمەت (مەلا بەختیار) کردووە و ئەوسا دەمووت : هەزارجار ئۆخەی کە لە ٧٦ دا نەکەوتە بەر دەستی رژێم و بەشێکی تری بەیانەکە تەرخانکرا بوو ، بۆ لێکدانەوە لە خەباتی پرۆلیتاریا و سوود وەرگرتن لە

ئـەزموونی خـەباتی پرۆلیتاریـای جیهـانی و شۆڕشـی گـەلانی ژێردەسـتە . بـۆ زیـاتر ڕونکردنەوەی ئەو بابەتەش نوسەرەکانی بەیانەکە ئـەزموونی شۆڕشـەکانی ئـەمریکای لاتینیان بە نموونە هێنابوە بەر باس و خواس.

کۆمیتەی هەرێمەکان بە کاریگەری شاسوار بڕوایان بە هەڵگیرساندنی شۆڕشێکی نـوێ هەبوو، بەڵام شۆڕشێکی توندڕەوی چەپ دژ بە داگیرکەر ، کە ڕژێمی عیراقـە و لـە هەمانکاتدا دژی دەرەبەگایەتی کوردستان.

بڕوایـان بـەپێکهێنانی نـاوکی شۆڕشـگێڕی ( البـؤرة الثوریـە ) هـەبوو، نـەك شۆڕشـێکی جەماوەری . بڕوایان بە پێکهێنانی بنکەی سوور هەبوو ، نەك مەیدانێکی شۆڕشـگێڕی فراوانی جەماوەری ، کە هەموو چین و توێـژە شۆڕشـگێڕەکانی کوردسـتان بەشـداری بکەن . هەر بۆیەش لە هەڵگیرساندنی شۆڕشی نوێدا ، کۆمیتـەی هەرێمـەکان بوونـە دوو بەش.

أ- شاسوار جەلال لە ٧-٨ دێی دەوروبەری قەرەداغ سەرپەرشتی بـەڕێوەبردنی چـەند دەستەیەکی چەکداری دەکرد و بە بنکەی سـوور نـاو دەبـرا و هیوایـان وا بـوو ،لـەو دێوە شۆڕش پەل بهاوێ بە ڕابەری کۆمیتەی هەرێمەکان.

ب - بەشێکی تریان لـە ناوچـەی قەنـدیل لەگـەڵ سـەرکردایەتی بزوتنـەوە ، بـەڵام بـە دابڕاوی لە یەکتر بە هیوای ئـەوەی ئـەم بەشـەی هەرێمـەکان ، بتـوانن لـە ناوچـەکانی شاربازێڕ و دۆڵەڕوتیش و بگرە لە ناوچـەی قەنـدیلیش ڕابـەری بگرنـە دەسـت ، کـە لەکاتی خۆیدا دێمە سەر باسکردنی.

سەیر لەوە دایە کۆمیتەی هەرێمەکان ، باشوری کوردستان پاش ئاشبەتاڵ و کێشەی نەتەوایەتی و قۆناغی ڕزگاری نیـشتمانیان بـە وڵاتێکـی وا دەچـواند ، کـە نەتەوەکـە خۆی خاوەن دەوڵەت و یاسا و ئاڵایە و زۆر لە مێـژە کێشەی نەتـەوەیی و قۆنـاغی ڕزگـاری نیـشتمانی تێـدا نـەماوە ، و کەوتۆتـە قۆنـاغی شۆڕشـی چـینایەتی و هەڵتەکاندنی ڕژێمێکی بۆرژوازی نۆکەری ئیمپریالیزمی ئەمریکیەوە.

نیسان له خوێنەری بەڕێز دەپرسم: ئایا لە شۆڕشی قۆناغی رزگاری نیشتمانیدا و چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوەیدا ، دەکرێ تەنیا و تەنیا پشت بە ئەزموونی قۆناغی خەباتی چینایەتی و شۆڕشی پرۆلیتاری و أصلاحی زراعی و دژایەتیکردنی بۆرژوازی نیشتمانی ببەستێ ؟

بەیانی ٨ی شوباتی ١٩٧٦ ی بەناو کۆمیتەی هەرێمەکان ، سەرەتای دەسپێکردنی ئەو گەردەلولەی نایەوە کە دەقاودەق (١٠) دە ساڵی خایاند . واتە تا ناوەڕاستی ساڵی ١٩٨٦ درێژەی کێشا . دوای بەیانی ٨ ی شوبات دوو ژمارەی ئالای شۆڕش (ئاش) دەرچوو ، کە بوو بە پەیرە و پرۆگرامی ئەو هێڵە عیراقچیەی لە ژێر پەردەی کۆمیتەی هەرێمەکاندا کاریان دەکرد و پاشانیش بوونە ، بەناو لایەنە زۆر چەپەکەی ناو کۆمەڵە و دواتریش ئاستی هەڵتەکێنەری کۆمەڵە و یەکێتیی (بە بۆچوونی خۆیان) .

ئەندامانی کۆمیتەی هەرێمەکان گەرچی تەمەنی بە زۆر خۆداسەپاندن لەناو کۆمەڵەدا، تەنیا تا گەڕانەوەی هەڤاڵان مام جەلال و نەوشیروانی خایاند و ئیتر پاش ئەوە بوونە ،پاشکۆ و هاوبەشی ناو کۆمەڵە لە سەرکردایەتیدا، بەڵام هەوڵ و تەقەلایان بۆ خۆداسەپاندن و.رابەرایەتیکردنی کۆمەڵە و یەکێتیی بەردەوام بوو، زیان بەخشترین رێگەیان دەگرت بۆ مەبەستی تاکی خۆیان ، هەر لە دووبەرەکی ناو کۆمەڵە و ناو یەکێتیی لە نێوان کۆمەڵە و بزوتنەوە تا دەگاتە سەرهەوڵدان بۆ شەق و پەقکردن و پارچە پارچەکردنی شۆڕشی نوێ ، کە هەموویان لە کاتی خۆیدا دێمە سەر باسکردنیان.

کۆمیتەی هەرێمەکان و ئەندامەکانی ، دژایەتیکردنی کۆمەڵە و یەکێتیان گەیاندە ئەو رادەیەی ، کە هەر پێشمەرگە و ئەندامێکی کۆمەڵە بە یەکێتیی رەفتارێکی ناشۆڕشگێڕانە و ناسیاسیانەیان بکردایە و بانگبکرانایە بۆ لێپرسینەوە با سزابدرانایە. ئەوان دەیان گرتنەخۆ و بەرگریان لێ دەکردن و تەنانەت چەك و پارەشیان دەدانێ.

گەر بڵێم گەردەلولی بەیانی شوبات و کۆمیتەی هەرێمەکان و نەگرتنی کۆنگرەی دووهەمی یەکێتیی هەر شوێنەواری خۆی هەبوو ، لە ڕاستی بە دەر نابێ.
تەنانەت تا کۆنگرەی یەکی یەکێتیی لە ١٩٩٢ دا و بێ هیوابوونی ئاش لە هەموو دەرفەتێك پەنایان بردە بەر پەککەوتن و لێك جیابوونەوەی بە ناو لایەنە سیاسیە جیاجیاکان و ئەوانیش بە ناوی ئاشەوە جارێکی تر ، بەڵام لە ژێر پەردەی باڵی چەپی حزبی زەحمەتکێشان هاتنەوە ناو یەکێتیی.

# بەشی سێهەم

## ١.٣ کۆمەڵە ناوکی شۆڕشی نوێیە.

لە گەرمەی ناکۆکی نێوان هەردوو کۆمیتەی شارەکان و کۆمیتەی هەرێمەکان ، سەبارەت بەو جیاوازی راو بۆچوونانەی کە لەمەوبەر ئاماژەم پێکرد، کۆمیتەی شارەکان هەوڵی دروستکردنی هێڵێکی پەیوەندی بە دەرەوەی وڵاتەوەدا ، تا بتوانێ لەگەڵ هەڤاڵانی سەرکردایەتی یەکێتیدا جۆرە پەیوەندیەك پێکبێنێ، ئەمەش لەسەر داوا و خواستی هەڤاڵانی ناو بەندیخانە و بە تایبەت لەسەر ئامۆژگاری هەڤاڵ شەهید شەهاب بوو ، لە نامەیەکی شەهید شەهابدا ، کە بۆ کۆمیتەی شارەکانی نارد بوو لە مانگی ١٩٧٦/٤ دا ، داوای جێبەجێکردن یا هەوڵی جێبەجێکردنی چەند ئەرکێکی گرنگی ئەو قۆناغەی لە کۆمیتەی شارەکان کرد.

١- سەبارەت بە مەترسی زۆر گەورەی پلانەکانی رژێم لە مەڕ ئایندەی کوردستان و بە تایبەت پاش ئاشبەتاڵ سەبارەت بە گۆڕینی سیمای شارستانیەتی کوردی هەر لە تعریب و تهجیر و بنچینەوە تا کاولکردن و سوتماککردن ، دەبێ هەرچی زووترە کۆمەڵە کە تاکە رێکخراوی

ئەلتەرناتیڤی پارتی پاش ئاشبەتاڵە ریزەکانی خۆی رێکخاتەوە ناکۆکیەکانی خۆی وەلانێ و هەردوو کۆمیتەی شارەکان و هەرێمەکان ببنەوە یەك.

٢- پێویستە هەر دوولا ئەرکی ئەم قۆناغە بە گرنگ وەربگرن و تەقەلای ئەوە بدەن ، ریزەکانی کۆمەڵە لە گرتن و راونانی بپارێزن.

٣ـ هەوڵدەن پەیوەندی لەگەڵ هەڤاڵانی دەرەوەی وڵات دروستکەن ، مەبەست (یەکێتیی) یە، تا بتوانن بە راوێژ لەگەڵ ئەوان ، لە ناوەوەی وڵات دەست بە پێکهێنانی مەفرەزەی چەکداری بکەن.

کۆمیتەی شارەکان لە رێگەی ئیحسان نەجم (ئەبو شەهاب) ەوە نامەیەکی نارد بۆ هەڤاڵان لە دەرەوە بە تایبەت هەڤاڵ مام جەلال و لە نامەکەدا ئیشارەی بە

سەفەرەکەی ساڵی ١٩٧٥ ی فەریدون عبدولقادر دابوو ، بۆ لای مام جەلال ، کە پەیوەند هەبوو، بە پێکهێنانی مەفرەزەی سەرەتایی چەکداریی.
هەر لە مانگی ١٩٧٦/٥ دا وەڵامی هەڤاڵ مام جەلال گەڕایەوە بۆ کۆمیتەی شارەکان ، کە کورتەی وەڵامەکە خۆی لەم خاڵانەدا کۆکردەوە.
١- هەرچی زووترە ریزەکانی کۆمەڵە یەك پێ بگرنەوە و ناکۆکی نێوان هەردوو کۆمیتەکە وەلابنێن و بکرێتە یەك کۆمیتە.
٢- لە رێگەی ئەبو شەهابەوە نامەمان بۆ هەڤاڵ عەلی عەسکەری ناردوە ، کە ئەندامی سەرکردایەتی بزوتنەوەی سوسیالیستی و دیموکراتیە ، تا تەنسیق لەگەڵ یەکدا بکەن.
٣- بە راوێژی هەردوولا (کۆمەڵە، بزوتنەوە) هەوڵدەن رێکخستنەکانی یەکێتیی لە شارەکان دروستکەن.
٤- هەوڵدەن وەك کارێکی سەرەتایی چەند مەفرەزەیەکی ژمارە کەمی پرۆپاگەندەی چەکداری (دعائی مسلح) پێکبێنن ، بە مەرجێك کاریان بە هیچ جۆرێك لێدانی رژێم نەبێ و خۆیان تووشی شەڕی لابەلا نەکەن و تەنیا کاریان لە سەرەتاوە بڵاوکردنەوەی دەنگوباسی هەڵگیرساندنەوەی شۆڕش و ناساندنی شۆڕشی نوێ و یەکێتیی و کۆمەڵە بێ بە خەڵکی.
٥- هەوڵی کۆکردنەوەی چەکە شاردراوە و پاشماوەکانی ئاشبەتاڵ بدەن ، بەتایبەت ئەو چەکانەی کە کۆن برایانی کۆمەڵە لە ئاشبەتاڵدا شاردویانەتەوە و لە شوێنی جیاجیا بیانشارنەوە بۆ کاتی پێویست.
لە ناوەڕۆکی نامەکەی مام جەلالدا دەردەکەوت ، کە نامەی بۆ کۆمیتەی هەرێمەکانیش ناردبوو ، لە رێگەی (ئەنور شاکەلی) یەوە ، کە کۆمیتەی هەرێمەکان خۆیان نامەیەکیان بۆ مام جەلال پێدا نارد بووە سوریا.

هەر لە مانگی ٥/١٩٧٦ ەوە ، لەگەڵ بەردەوامی مشتومڕی نێوان هەر دوولا، هەر دوو کۆمیتەکە یەکیانگرتەوە و پەیوەندیش بە هەڤاڵ شەهید عەلی عەسکەریەوە کرا، بەڵام لەسەر داواو سووربوونی هەڤالانی کۆمیتەی شارەکان.

لە هەمانکاتیشا کۆمەڵە کەوتە پێکهێنانی ڕێکخستنەکانی یەکێتیی لە شارەکانی ڕانیە ، قەلادزە، پێنجوێن ، هەڵەبجە ، سلێمانی ، هەولێر ، کۆیە ، لە کەسەکانی نێو ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە و کەسایەتی شۆڕشگێڕی بێ لایەن و نیشتمانپەروەر و پاشان لە هەڤالانی بزوتنەوەش.

هەر لە مانگی ٥/١٩٧٦ ەوە ، کۆمەڵە کەوتە تەقەلای پێکهێنانی دەستەی چەکداری لەو هەڤالانەی ، کە مەترسی گرتن و ڕاونانیان دەکەوتە سەر ، یان خۆیان بەو پەڕی لێبوردەییەوە ئارەزووی هەڵگیرساندنەوەی شۆڕشیان دەکرد.

## ٢.٣ کۆمەڵە و پێکهێنانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لەناو وولات.

هەر لە ساڵی ١٩٧٨ بە دواوە ، هەموو ساڵێ لە یادی ساڵڕۆژی لە دایکبوونی یەکێتییدا چەندین وتاری لەسەر خوێندراوەتەوە ، چەندین وتار و ڕیپۆرتاژی لەسەر نوسراوە ، هەتا ساڵی ١٩٩١ یەکەم و بە زۆر ئاماژە بۆ ڕۆڵی کۆمەڵە کراوە ، لە ڕۆڵی زۆر گرنگی دا بۆ گەشەکردن و بەرەو پێشەوەچوون و فراوانبوون و پەرەسەندنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان هەر لە لە دایکبوونیەوە تا ڕۆژی ساڵیادی.

بەلام پاش ساڵی ١٩٩٢ واتە پاش لە باربردن و هەڵوەشاندن و هەڵتەکاندنی کۆمەڵەوە لە کۆنگرەی یەکەمی یەکێتیدا، وەك پاداشتی چاکەدانەوەی کۆمەڵە (کورد گوتەنی مەگەر بتکوژم چاکەت بدەمەوە) ئیتر ناوی کۆمەڵە لە ڕابردووی یەکێتیی و داهاتوویدا بوو ، بە (تەیری ئەنقا) و نەگیرا.

کۆمەڵە بۆ یەکێتیی بوو ، بەو دایکە میهرەبانە بە بەزەیی و بەو ویژدانەی ، کە هەر لە ڕۆژی لە دایکبوونی یەکێتیەوە ، بە خوێنی ڕۆڵەکانی یەکێتیی پەروەردە کرد و

گۆشـی کـردن و بـەردەوام بـوو ، لـە خـوێن و گیـان و بـیری پـاك پـێ بەخـشینی ، یەکێتییش وەك ئەو رۆڵە بێ ئەمەکە ، بێ وەفایە ، سپڵە بـێ ویژدانـە ، وابـوو کـە لـە ئاهەنگی یەکەم کۆنگرەی خۆیدا لە بانی شەربەتی شادی پەرداخێك زەهـری دەروونـی خۆی ، بۆ کۆمەڵە کرد بە دیاری پاداشت و پاش بە دەسـتهێنانی تـاجی سـەرکەوتنی خەبات و رزگاربوونی ووڵات و ووڵات بە دەرکردنـی دوژمـن، کـاری بـە کۆمەڵـە نـەما و بگرە بە ئەلتەرناتیڤی خۆشی زانی و لەوەش ترسا ، کە کۆمەڵە بێتە ئەو حزبەی کە بتوانێ رۆڵی پێشرەوی و هاوکاری و هاوخەباتی بگێرێ.

ناشیا و نا راستترین وتار و پیاهەڵگوتن ئەو وتارانە بوون ، کـە لـە سـاڵی ٢٠٠٠ دا لـە یادی ٢٥ ساڵەی یەکێتیدا لەسەر رۆژنامـەکانی یـەکێتیی و لـە ئیزگـە و تەلـەفزیۆنی کەناڵی ئاسمانی سەتەلایتی (کوردسات) ەوە بڵاوکرانەوە.

بە درێژایی ساڵانی خەباتی شاخ یادی ساڵ ڕۆژی دامەزراندنی یـەکێتیی یـە ٦/١ دەستنیـشان دەکـران . لـە کتێبـی (لـە کـەناری دانوبـەوە بـۆ خـری نـاوزەنگ) ی نەوشیروان مـستەفا ، رۆژی دامەزرانـدنی یـەکێتیی دەگەڕێتـەوە بـۆ ١٩٧٥/٥/٢٢ کـە یەکەمین بەیاننامەی بە بۆنەی دامەزراندنیەوە لە شامدا دەرچوو.* کە مـام جـەلال بـە عەرەبی نوسیبووی.

بەڵام د. فواد مەعسوم لە یادی ٢٠ ساڵەی دامەزراندنی یەکێتییدا ، رۆژی دامەزرانـدنی یـەکێتیی دەگەڕێنێتـەوە بـۆ رۆژی ١٩٧٥/٥/٢٥ کـە رۆژی نوسـینی یەکـەم بـەیانی یەکێتییە لە دەستی دا لەلایەن فواد مەعسوم خۆیەوە نوسراوە بە عەرەبیی، کە لـە کوردستانی نوێ رۆژی ٢٠٠٠/٥/٢٥ دا بڵاوکرایەوە.

و لـە هـەمان یـادی ٢٥ سـاڵ رۆژدا و لـە ٢٠٠١/٦/١ دا د. کـەمال فـواد لـە رۆژنامـەی کوردسـتانی نـوێ رۆژی ٢٠٠١/٦/١ دا بڵاوکـردەوە کـە رۆژی دامەزرانـدنی یـەکێتیی

---

*ـ لەکەناری داتوبەوە لاپەرە ـ ٧١ ـ نەوشیروان مستەفا.

دەگەڕێتەوە بۆ ١٩٧٥/٦/١ کە کەمال فواد بەیانەکەی یەکیەتی بە دەستکاریەوە و بە زمانی ئەڵمانی لە ئەڵمانیا بڵاوکردەوە.

پاشان نەوشیروان مستەفا لە (لە کەناری دانوبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ) لاپەڕ ٧١ دا دەنوسێ: (ئەم بەیانە لە ڕادیۆی دیمەشقەوە خوێندرا بۆوە، لە کوردستاندا بە چاکی دەنگی دابۆوە ، پێش ئەوەی هیچ ئەندام و کادرێ لە کوردستان کار بۆ دروستکردنی ڕێکخستنی یەکێتیی بکات ، ئەم بەیانە دۆست و لایەنگری بۆ پەیداکرد بوو).

گرنگ لێرەدا ئەوە نیە کە جیاوازی لە ڕۆژەکانی دامەزراندنی یەکێتییدا هەیە؟ گرنگ لەوە دایە کە هەر یەك لەو شەش کەسە (جەلال تاڵەبانی ، نەوشیروان مستەفا ، فواد مەعسوم، کمال فواد، عادل موراد) وەك دەستەی دامەزرێنەری یەکێتیی نیشتمانی کوردستان سەروەری و سەربەرزی دامەزراندنی یەکێتیی دەگەڕێنێتەوە بۆ دەستەی دامەزرێنەر ، کە جگە لەو چوار زاتە بەڕێزان (عومەر شێخ موس ، عبدولرەزاق فەیلیش) بەشداربوون. لەوەش پتر ئەو هەڤاڵانەی دەستەی دامەزرێنەر ، پێیان وایە کە بە کۆبونەوەی شەش کەسو لە (کافتیریایەکی دمشق)دا، بەسحری ساحران و بەیانێکی ڕاگەیاندنی دامەزراندنی یەکێتیی بێ هاوکاری و هیچ ئەندام و کادری لە کوردستان بۆ دروستکردنی ڕێکخستنی یەکێتیی کوردستاندا، ئەم بەیانە دۆست و لایەنگری بۆ یەکێتیی پەیداکردووە. ڕاستە ئەو هەڤاڵانە دەستپێکەربوون لە دامەزراندنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و بە تایبەتی و لەسەر و هەمووشیانەوە هەڤاڵ مام جەلال، بەڵام هەرگیز ئەو بەیانە سحراویە بە بڵاوکردنەوەی لە ڕادیۆی دیمەشقەوە نەبووە هۆی پەیداکردنی دۆست و لایەنگر بۆ یەکێتیی، ئەوەی کە دۆست و لایەنگری بۆ یەکێتیی دروستکرد ، تەنیا کۆمەڵە بوو ، بەڵگەشم ئەوەیە کە ئەو بەیانە بە ووتەی نەوشیروان لە ١٩٧٥/٥/٢٢ و بە ووتەی فواد مەعسوم لە ١٩٧٥/٥/٢٥ بە ووتەی کەمال فواد لە ١٩٧٥/٦/١ دا بڵاوکراوەتەوە، بەڵام یەکێتیی

لەپاش مانگی ١٩٧٦/٢ وە لە کوردستاندا دۆست و لایەنگری بۆ پەیدا بوو ، کە بە هەوڵ و کار و تەقەلا و هیمەتی کۆمیتەی شارەکان و کۆمیتەی هەرێمەکانی کۆمەڵ کرا ، نەك بە سحری خوێندنەوەی بەیانێك لە ڕادیۆی دیمەشق پایتەختی وڵاتی داگیرکەری پارچەیەکی کوردستانەوە.

## لێرەوە چەند پرسیارێك دێتە پێشەوە کە :

١ـ ئایا یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لەلایەن د. کەمال فوادەوە لە باشوری کوردستان دامەزرا ، کە هەتا ساڵی ١٩٧٩ کە بۆ سەردانێکی کاتی هاتە ناوزەنگ و پاش دوو مانگ گەڕایەوە بۆ ئەڵمانیا و تا ساڵی ١٩٩١و پاش ڕاپەڕین چاوی بە کوردستان نەکەوتەوە..)

٢ـ یان لەلایەن د. فواد مەعسومەوە لە باشوری کوردستان دامەزرا، کە ئەویش تا ساڵی ١٩٧٩ چاوی بە کوردستان نەکەوت ، لە ١٩٧٩ دا هاتەوە سەر حازری و بارەگای ئامادەکرا و بەو حاڵەش نەیتوانی لە ژیانی پێشمەرگایەتی ناو بارەگاکانی سەرکردایەتیدا هەڵبکا و بە بیانوی نوێنەری یەکێتیی خۆی گەیاندە تاران...)

٣ـ یان بە نەوشیروان مستەفا یەکێتیی لە باشوری کوردستان و دامەزراوە، کە هەتا مانگی ١٩٧٧/٥ لە باشوری کوردستاندا نەبوە و ئەوکاتەی گەڕایەوە کوردستان ، کاتێ کە گەڕایەوە کوردستان ، چەندین مەفرەزەی چەکدار و بگرە هێزێکی چەکداری پێشمەرگەی ڕێکخراو و ئامادەی خرایە بەردەست ، کە چەندین ڕێکخستنی یەکێتیی نیشتمانیی لە باشوری کوردستان دامەزرا بوو)

٤ـ یان مام جەلال ، کە بە گەڕانەوەی ڕووبەڕووی سەرکردایەتی ناوخۆی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بۆوە و ڕێکخستنەکانی یەکێتیی پەلوپۆی هاویشت بوو.

تەنانەت لە هاوکاری و هاوخەباتی کۆمەڵە و بزوتنەوە لەناو یەکێتییدا، هەمیشەو بە ئیعترافی خودی مام جەلال هەر کۆمەڵەی بە ناوکی یەکێتیی و شۆڕشی نوێ دەناسی

و هەمیشە کۆمەڵە و یەکێتیی و بزوتنەوەی بە هێلکە دەچواند ، کە زەردێنەکەی کە ناوکی هێلکەکە بوو بە کۆمەڵەی ناو دەبرد و یەکێتیش بە سپێنەکە و تویکڵەکەی ناو دەبرد. کە بۆ پاراستنی کۆمەڵە کە بەناوکی یەکێتیی و پارتی پێشڕەوی ئایندەی ناوزەد دەکرد.

نەوشیروان لە (کەناری دانوبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ) وا باس دەکا ، کە لەگەڵ ناردنەوەی دەستە چەکدارەکانی یەکێتیی لە سوریاوە کە ژمارەیان ٣٧ کەس بووە، لە ١٩٧٦/٦/١، ئەوسا کۆمەڵە و شەهیدان عەلی عەسکەری ودکتۆر خالیدیش بە نامەی مام جەلال دەستیان کردووە بە ناردنی مەفرەزەی چەکدار بۆ شار. (لاپەڕە ٩٢).

لە کاتێکدا کە مەفرەزەی سەرەتایی چەکداری کۆمەڵە ، پتر لە مانگێك پێش ئەو ڕێکەوتە ، واتە لە ناوەڕاستی مانگی ١٩٧٦/٥ و سەرەتای مانگی ٧٦/٦ وە چووبونە شاخ لە چەندین ناوچەی جیاجیا لەوانە:

– لە دۆڵی قەرەداغ شەهید سیروان "فەیسەل تاڵەبانی" ، گۆڕان، ئەنوەری مەجید سوڵتان و چەندانی تر.

– لە دۆڵی جافەتی فەقێ سمایل، عبدولقادر هەڵەدنی جەمالی عەلی باپیر.

–لە ناوچەی هەڵەبجە خولە کەشکۆڵ (شیخ عەلی) شێخ برایم خەلیل و چەندانی تر.

– لە ناوچەی پشدەر شەهید خەلیل جەلال، فەقێ حەسەن، مام عەولا ئەبو بەکرەیی، حەسەنی برایم شوانی قەلاتوکانی.

– لە دۆڵی باڵەیی قادر خەیات، برایمی حاجی کوێخا.

– لە دەشتی هەولێر چەند هاوڕێیەکی تر.

کە ئەمانە دەستە سەرەتاییەکانی شۆڕشی نوی بوون و پاش ئەمان لە مانگی ٧٦/٨ شەهید عەلی عەسکەری و د. خالیدو سەعدی گچکە و عەلی کۆ ، و بایز عەباس ئاغا و عەلی حەسەن ئاغا ، گەیشتنە ناوچەی پشدەرو دۆڵی قەلاتوکان. کە لە ڕۆژی ٧٦/٨/١٥ گەیشتبوونە شاخ.

بۆیە بە بێ ویژدانیم زانی و ناکرێش لە مێژودا رۆڵی ئەو کەسانەی کە بە ڕاستی هەر لە مانگی ٣و٤ ەوە چاکی چالاکی دامەزراندنی رێکخستنەکانی یەکێتییان کرد وکەوتنە دروستکردنی لیژنەی ناوچە و رێکخراوەکانی یەکێتیی لە هەڵەبجە، پێنجوێن، سلێمانی ، رانیە، قەڵادزە. ئەوانەش بۆیە کەرکوك، هەولێر مەلا بەختیار (حیکمەت محەمەد سالار عەزیز (نەجمەدین))، شیخ عەلی (خولە کەشکۆڵ)، بەکر حاجی سەفەر ، شەهید ئازاد هەورامی ، ئیحسان نەجم"ئەبو شەهاب"، شەهید عبدولرەزاق ، شەهید ئارام، و بەندە ، لە شار و لەناو گوندەکانیشدا مەفرەزە سەرەتاییەکانی کۆمەڵە بوون خۆیان بە ناوی یەکێتییەوە بە جەماوەری جوتیاران ناساند و ناو وناوبانگ و رێکخستنی یەکێتییان راگەیاند.

لەگەڵ ئەوەی ، کە دوو جۆر بیرو بۆچوونی جیاواز لەناو کۆمەڵەدا لەسەر پێکهاتەی یەکێتیی و ئایندەی شۆڕشی نوێ و جۆری بەرپاکردنی شۆڕش و رابەرایەتی و سەرکردایەتی کردن و چۆنایەتی و چەندایەتی هەبوو ،کە پاشان دێمە سەر باسکردنی . بەڵام بە گشتی ئەوە پەسەند کرا بوو ، کە ئەرکی هەڵگیرساندنەوەی شۆڕش زۆر پیرۆز و پێویست بوو ، کۆمەڵە بیگرێتە ئەستۆ، بە ناو نیشان و مۆرکی یەکێتییەوە راپەڕێنێ و خۆشی ببێتە هەڵسوڕێنەر لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە:

١ـ کۆمەڵە ناوەکەی (کۆمەڵەی مارکسی ـ لینینی کوردستانی ـ بیری ماوتسی تونگ) بوو، لە هەلومەرجی ئەوسای کوردستان و بەتایبەتی پاش ئاشبەتاڵ و تەسلیمبوونی حزبی شیوعی عیراقی بە رژێمی بەعس و بوونی بەبەشێکی جێبەێ کەری پیلانی تعریبو تهجیرو پاشان بەشێکی هێزی چەکداری سەرکوتکەر، نەی دەتوانی بەوناوەو، بێتە مەیدانی خەباتی چەکداری قۆناغی رزگاری نیشتمانی و زۆربەی هەرە زۆری چین و توێژەکانی جەماوەر لە خۆی کۆکاتەوە.

٢ ـ لەبەر ئەوەی کۆمەڵە رێکخراوێکی تازە ئاشکرابووی ناو کۆمەڵ بوو، هێشتا ناو و ناوبانگی پەیدا نەکردبوو کەسی وایان تێدا نەبوو ، کە رابوردویەکی سیاسی ناسراوی

هەبێ و خەڵك متمانەی پێ بکەن، پێویستیان بە ناوی مام جەلال و ناوی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بوو، بۆ کارکردن لە سەرەتاوە لە ژێر ئەو چەترەدا.
٣ ـ بۆ ئەوەی لە چوارچێوەی کاری نیمچەبەرەیی یا شێوە بەرەییدا کۆمەڵە بتوانێ ، لەگەڵ بزوتنەوەی سوسیالیست دیموکراتی کوردستان کە ساڵی ١٩٧٥ دروستبوو ، شەهیدان عەلی عەسکەری و د. خالید و رەسول مامەند و چەندانی تر لەناو وولات و لە دەرەوەش عومەر دەبابە رابەرایەتیان دەکرد، پێویست بوو، هەر دوو رێکخراوەکە لە چوارچێوەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستاندا. وەك بەرەیەکی یەکگرتوو ، بەلام بەپاراستنی سەربەخۆیی سیاسی و فیکری خۆیانەوە کار بکەن.

## ٢.٣ کۆمەڵەو بۆچوونی لەسەر شۆڕشی نوێ و مەفرەزەی چەکداری.

لە ئەنجامی هاتنی نامەکانی مام جەلال و بە تایبەتی ئەو نامەیەی ، کە سەبارەت بە جۆری دەسپێکردنی خەباتی چەکداری بوو لە مانگی ٩٧٦/٦ دا کە ناوەرۆکەکەی خۆی لە:
١ـ هەڵگیرساندنی شۆڕشێکی نوێ لە کوردستاندا ، کە ببێتە ناوکی (شۆڕشی عیراقی) لە ئایندەدا لە پێناوی دیموکراتیەت بۆ عیراق و ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان.
أـ مەفرەزەی چەکداری بچووك و گە
ڕۆك لە باشترین کەسە شۆڕشگێڕ و ئازاو شیاوەکان پێکبهێنرێ ، کە ئەرکیان تەنیا پروپاگەندەی سیاسی کردن و هوشیارکردنەوە و رێکخستنی خەڵکی بێ.
ب ـ چەند بکرێ ئەو مەفرەزانە خۆیان لە شەڕ لەگەڵ دوژمن بپارێزن.
٢ـ بۆ سەرپەرشتی کردنی ئەو مەفرەزانە و جڵەوگرتنی شۆڕشەکە، پێویستە سەرکردایەتیەکی ناوخۆ کە لامەرکەزیەتی هەبێ لە کارکردندا پێکبهێنرێ.
کۆمەڵە ئەم بەشەی نامەکەی مام جەلالی هێندە پێ پەسەند بوو، کە کردیە بەرنامەی کاری خۆی، وەك لەپێشەوە ئاماژەم پێ کردووە . کۆمەڵە زۆر پێش ئەو نامەیە

مەفرەزەی چەکداری پێکهێنا بوو، بەڵام بۆچوونی کۆمەڵەش ئەوە بوو ، کە پێویستە ناوکی شۆڕشی ئەم جارە هێزێکی پوخت و هوشیار و شۆڕشگێڕ بی.

لەناو کۆمەڵەشدا دوو جۆر بۆچوون لەسەر چۆنیەتی کۆکردنەوەی خەڵك ، لە دەوری شۆڕش و پێك هێنانی هێزی پێشمەرگە یا مەفرەزەی چەکدار هەبوو.

رایەکیان کە هی شەهید ئارام و سالار عەزیز بوو، لە دوایش مەلا بەختیاریش چوە پاڵ ئەو رایە کە پێویستە ئەم جارە شۆڕشی چینی کرێکاران و جوتیاران شۆڕشگێڕ بێ، دەبێ هەوڵ بدرێ بنکەی سوور (البؤرة الثوریە) دابمەزرێنرێ و لەناوچەی رزگارکرا و خەباتی چینایەتی بەرپا بکرێ و کۆمەڵە بە تەنیا سەرکردایەتی بکات.

ئەو هەڤاڵانە بە هیچ جۆرێ رابەری و سەرکردایەتیەکی تریان پەسەند نەدەکرد ، جگە لە شەخسی مام جەلال کە کاریان پێی بوو.

رایان وا بوو ، کە نابێ هاوکاری لەگەڵ (عەلی عەسکەری، عومەر دەبابە، د. خالید، رەسول مامەند و کەسانی تری ناسراوی شۆڕشی ئەیلولدا بکرن. بڕوایان وابوو، کە دەبێ لەگەڵ گەشەکردنی هێزی پێشمەرگەدا و لە بەردەوامی خەباتی چەکداری دەست بە کاربن بۆ لێدانی دەرەبەگایەتی و دابەشکردنی زەوی و زار.

بەڵام هەندێکی تر لە هاوڕێیانی کۆمەڵە لەوانە شەهید عبدولرەزاق ، شازاد سائیب ، شەهید جەمال تایەر فەیسەڵ تاڵەبانی، ئیحسان نەجم"ئەبو شەهاب" و بەندە، رامان وابوو ، کە چاکە پارێزگاری چۆنایەتی لەپێکهێنانی هێزی پێشمەرگەدا بکرێ، بەڵام:

١- ئەم قۆناغە قۆناغی رزگاری نیشتمانیە ، نەك خەباتی چینایەتی.

٢- شۆڕشی نوێ بە پێی بەشداریی هەموو چین و توێژەکانی شۆڕشگێڕی کۆمەڵ مەحاڵە بێتەدی.

٣- لەم بارودۆخەی ئێستا کە سەرەتای دەسپێکردنی خەباتی چەکداریە و هەڵسانەوەیەکی لەرزۆکی پاش شکستێکی گەورەیە ، و رژێم لەوپەڕی دەسەڵاتیدایە، ناکرێ کۆمەڵە ناوچەیەك پاوان بکا و خۆی تیا قەتیس کات و بیکاتە (بنکەی سوور) ی رابەرایەتیکردنی خەباتی چەکداری و سیاسی.

٤ـ گەر بمانەوێ شۆڕشی جەماوەریمان هەبێ ، دەبێ بڕواشمان بە بەرەیەکی شۆڕشگێر هەبێ و کاریشی تێدا بکەین ، هەر بۆیەش هاوکاری و کارکردن لەگەڵ برایانی بزوتنەوە ئەرکێکی مێژوویی ئەم قۆناغەی سەرشانی کۆمەڵەیە.
٥ـ بمانەوێ و نەمانەوێ ، کەسایەتی وەك عەلی عەسکەری و د. خالید و عومەر دەبابە هێندە ناسراو ناوداری ناو کوردن ، کە بە هاتنە دەرەوەی ئەوان و بەشداریکردنیان لە بەڕێوەبردنی سەرکردایەتی ناوخۆی شۆڕشدا، هێز و گوڕوتین و توانایەکی زۆر دەدا بە جەماوەر.
ئەم کێشانەی ناو خۆمان بەو جۆرە ڕۆیشت و پاش هاتنە دەرەوەی کاك عەلی عەسکەری و کاك عومەر دەبابە و د. خالید و سەعدی گچکە. ئیتر کاك سالار رووە و شاربازێڕ و مەلا بەختیار ، پێیەکی لەشار و پێیەکی لە شاخ و کاك ئارام لە دۆڵی قەرەداغ دەست بەکار بوون ، کاك ئارام هەر لە یەکەم ڕۆژی چوونە دەرەوەی لە شارەوە، چووە دۆڵی قەرەداغ و خۆی لە سنوری ٨ـ٩ دێ یەکدا قەتیس کرد و کەوتە سەرپەرشتیکردنی مەفرەزەکانی ئەو ناوچەیە ، کە فەرماندەی مەفرەزەکان شەهید فەیسەڵ تاڵەبانی، ئاوات قارەمانی، شەهید گۆران، ڕۆستەم بوون.
کاتێ کە بڕیاری پێکهێنانی سەرکردایەتی یەکێتیی ناوخۆ دەرچوو ، نە شەهید عەلی عەسکەری بەوە قایل بوو ، کە ئارام ڕۆڵی سکرتێری بگێڕێ و نە ئارامیش بە عەلی عەسکەری، بۆیە لەسەر ئەوە پێکهاتن کە لە هەر ناوچەیەك دوو لێپرسراو دابنرێ (یەکێك لە کۆمەڵە) (یەکێکیش لە بزوتنەوە) ، بۆیە بڕیار درا کە ئارام و ڕەسول مامەند لێپرسراوی سیاسی بن و عەلی عەسکەری ـ سالار عەزیز ، تالیب ڕۆستەم ، د. خالید ، ملازم عومەر عەبدوڵڵا، ملازم تایەر عەلی والی لێپرسراوی عەسکەری ناوچەکان بن.
لە سەرەتاوە سەبارەت بە باڵادەستی کۆمەڵە لەناو مەفرەزە سەرەتاییەکان لە ناوچەکاندا ، بە تایبەت لە ناوچەی قەرەداغ و هەڵەبجە و شاربازێڕ، برادەرانی کۆمەڵە کە کرابوونە ئەندامانی سەرکردایەتی ناوخۆی یەکێتی (ئارام ـ سالار ـ مەلا بەختیار ـ

عومەر عەبدوڵلاّ ـ تالیب رۆستەم) نەك هەر ئیلتزامیان بە بڕیاری کاری هاوبەشی و بەرەیی نە دەکرد، بەڵکو دانیان بە رابەری سەرکردایەتی نوێنەرانی بزوتنەوەدا (عەلی عەسکەری ـ د. خالید سەعید ـ رەسول مامەند ـ تایەر عەلی والی ـ سەعدی گچکە) نەدەنا.

تەنانەت تا شەهیدبوونی ئارام لە قەرەداغ بەشداری یەك کۆبونەوەی سەرکردایەتی ناوخۆی یەکێتیی نەکرد.

ئەو جۆرە پرۆسەی کارکردنە ، واتە (دوو لێپرسراوی) بووە سەرەتای سەرهەڵدانی چەند دیاردەیەك کە رەگ و ریشەیەکی خراپی داکوتا و ئەنجامی خراپیشی دا بە دەستەوە.

١ـ پەیڕەو نەکردنی کاری بە کۆمەڵی و سەرهەڵدانی سەرەتای تاکرەوی و توندڕەویش.

٢ـ نەبوونی یەکێتیی و ئیش وکار و بڕیار و جێبەجێکردن. بە پێچەوانەوە پاشاگەردانی و خۆنەبەستنەوەی ئەم لا بە بڕیاری ئەو لاو هەروەها بە پێچەوانەوە.

٣ـ فرە ناوەندێتی لە بڕیاردان و دەسەڵاتدا و هەروەها فرە سەرکردایەتی لە رابەریکردن و هەڵسوڕانی شۆڕشدا.

٤ـ نەهێشتنی متمانە بە یەکتری لەناو کۆمەڵە و بزوتنەوە و بگرە بە چاوی گومانەوە سەیری یەکتر کردن و تەنانەت دژایەتی کردنی یەکتریش لە زۆر شوێن و ناوچە و لە نێوان زۆر پێشمەرگە و کادری هەر دوولادا.

٥ـ پەیڕەو نەکردنی سەرەتای باشی چەندایەتی لەپێکهێنانی مەفرەزە و کەرت و هەرێم و هێزی پێشمەرگەدا، ئەوەش بۆ راستکردنەوەی تای تەرازووی هێزی هەردوولا بەرامبەر یەکتری ، تا کار گەیشتە ئەوەی کە بزوتنەوە کەوتنە کۆکردنەوەی عەشایەر و ئاغا و کوێخا و هەمەجۆرە ، لەو لاشەوە کۆمەڵەش کەوتنە هەمان هەڵەوە ، بە کۆکردنەوەی کەسانی ناشایستەی نێو شارەکان لە کۆنە پێشمەرگە یا دەسوەشێنەکانی ناو شارەکان.

سەبارەت بەوەی کە شەهیدان عەلی عەسکەری و د. خالید و تایەری عەلی والی لە شۆڕشی ئەیلولدا هەم بەشدار و هەم لێپرسراو لە ئاستی سەرکردە و دەسەلاتی سیاسی دا بوون و لەناو خەلکدا ناسراو و بە شۆڕشگێڕ و قارەمانیش ناویان دەرکرد بوو، بەلام هاوڕێیانی کۆمەلە شەهید شاسوار (ئارام)، و نەجمەدین عەزیز (سالار)، و حیکمەت محەمەد (مەلا بەختیار) و ئازاد عبدولمەجید (عادل) ئەمانە جگە لەوەی کە نە ناسرا و خاوەنی رابردویەکی سیاسی ، پێشمەرگانە نەبوون ، و هەمووشیان ناوی خۆیان گۆڕی بوو، جگە لەوەش لەبەر ئەوەی خاوەن پروسەیەکی کەم و زۆری کاری پێشمەرگانە و لێپرسراوی و رابەری نەبوون، سەرەڕای ئەوەش سەبارەت بە پێکهێنانی مەفرەزە سەرەتاییەکان خۆشیان ، بە تاکە دەسەلات و خاوەنی شۆڕشی نوێ دەزانی ، لە هەلسوکەوت و مامەلەش لەتەك خەلك و تەنانەت هەندێ لە پێشمەرگەو کادرەکانیشدا خۆپارێز بوون.

ئارام لە قەرەداغ جگە لە (٩ـ٨ گوند) بەولاوە لە یەکەم رۆژی چوونە دەرەوەیەوە تا شەهید بوونی لەو جوغزە نەچووە دەرەوە و جگە لەو کادر و پێشمەرگە و خەلکانەش کە لەو سنورەدا بوون ، هیچ پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی لەگەل ناوچەکانی تردا نەکرد، پەیوەندی ئارام بە شار و ڕێکخستنەکانیشەوە تەنیا لە ڕێگەی نامەوە بوو.

سالار لە دۆلی جافەتی و شاربازێڕ پەیوەندی بەخەلك و جەماوەرەوە لە هی ئارام باشتر نەبوو، تەنانەت هاوڕێکانی کۆمەلەش و ئەوانەی کە لە سەرەتاشەوە لەگەل کۆمیتەی هەرێمەکاندا بوون، لە هەلسوکەوتی بێزار بوون، بەشێکیان لە ناوچەکە رۆیشتن بۆ ناوچەیەکی تر و هەندێکیان تەسلیم بە ڕژێم بوونەوە ، لەوانە سوارە ئەحمەد عارف ،تەها باراوی و چەندانی تر.

مەلا بەختیار، نەك هەر لە ناوچەیەك گیری نە دەخواردەوە ، بەلکو هەفتەیەك لە شاخ و دوو مانگ لە شار بووە ، وای لێهاتبوو هەموو ڕێکخستنەکانی ناو شار

مەترسیان لێنیشتبوو ، بە پێچەوانەوە سەرانی بزوتنەوە هەموویان لەجموجۆڵدا بوون بەردەوام لە جەولە و گەڕاندا بوون ، لەم ناوچەوە بۆ ئەو ناوچە لەو دێوە بۆ دێیەکی تر، لە کۆبونەوەیەکی جەماوەرییەوە بۆ یەکێکی تر . کار گەیشتە ئەو ڕادەیەی کە تا گەڕانەوەی مام جەلال لە ئەورووپاوە بە ڕێگای تورکیا نەوشیروان لە سوریاوە لە مانگی ٧ /١٩٧٧ بزووتنەوە بوونە هێزی سەرەکی و کەوتنە دامەزراندنی بنکە و بارەگای پێشمەرگانە.

## ٤.٣ شەهابی شێخ نوری و هاوڕێکانی .

## کەم بژی و کەڵ بژی.

### - ڕۆژی ١٩٧٦/١١/٢٧ ڕۆژی بەخودان وکەڵ ژیان

دوای دەسگیربوونی ئەو هەڤاڵانە لە ئێران و تەسلیمکردنەوەیان بە عێراق و بردنیان بۆ بەندیخانەی (ئەبوغریب) و گرتنی دوو سێ پۆلی تری ئەندام و لایەنگرانی کۆمەڵە، و کەم کەم هێوربوونەوەی بارودۆخەکە، هەڤاڵەکانی ناو بەندیخانە ، کە زۆربەی هەرە زۆری ئەندامانی سەرکردایەتی و ئەندامە هەرە چالاك و پێشکەوتووەکانی کۆمەڵەی تێدا کۆبووبۆوە ، کەوتنەوە خۆ ڕێکخستنەوە و پەیوەندیکردنەوە بە دەرەوەی بەندیخانە، واتە ڕێکخستنەکانی شارەکان و کۆمیتەی شارەکان ، کە پێشتر ئاماژەم بۆ جۆر و چۆنیەتی پەیوەندیەکان کردووە.

ئەگەر چی زۆر کەم ،لاوازی بە تاك و تەرای ئەندامانی کۆمەڵەوە هەبوو، بەڵام بۆ مێژوو هەموو ئەو هەڤاڵانە سەلماندیان کە تاکە ڕێکخستن و ڕێکخراوی ئۆپۆزسیۆنی عێراقین لە بەندیخانەکانی فاشی بەعسدا کە ببوونە سەر مەشقی خۆڕاگری و ورەبەرزی و بە گژداچوونەوەی دەزگا تۆقێنەر و داپڵۆسێنەرەکانی بەعس و بەرپەرچدانەوەی داوا و بڕیارەکانی دەسەڵاتە یاسایی و تەنفیزی و ئاسایشەکانی ڕژێم ، بە دان پێدانان و دەربڕینی هەموو ئەو حزب و ڕێکخراوانەی کە لەسەر

دژایەتیکردنی بەعس ، یان بیروڕای جیا لە زیندانەکانی بەعس دا لەگەڵ هاوڕێیانی کۆمەڵەدا پێکەو بوون . ئەو ڕاستیەیان سەلماندووە ، کە تا ئەو کاتە مێژووی زیندان و حوکمی قەرەمۆشی عیراقی و بە تایبەتی بەعسیەکان ، خۆڕاگری و بە وورەیی و قارەمانێتی وەك هاوڕێیانی کۆمەڵەی بە خۆوە نەدیوە.

سەر مەشقی ئەو نەریت و داهێنانە بۆ وێنەیەی ئەوسای زیندانیش (شەهابی شێخ نوری) بوو . کە بە خۆڕاگری و وورەبەرزی و ڕابەرێتی خۆی چۆکی بە ترس ولەرز و پیاوانی ڕژێمدا دابوو، هەر لەو کاتەوە و تا شەهیدکردنی کۆمەڵەش لە ۱۹۹۱ دا، دار و دەستەکانی ڕژێم و سەرانی بەعس هێندە لە ئەندامانی کۆمەڵە دەترسان ،کە پاش شەهیدکردنیشیان نەیان دەوێرا تەرمەکانیان بدەنەوە خاوەنەکانیان.

رستەی (کەم بژی و کەڵ بژی) بوو بە فەلسەفەی ژیان و مەرگ لە پێناو ژیاندا. شەهید شەهاب بە داهێنانی ئەو رستەیە و کردنی بە ڕێچکەی پەیڕەوکردنی لە زیندانندا، بووە سەر مەشقی وورەبەرزی و خۆڕاگری و دوژمن تەزێنی ناو زیندانەکانی بەعس . شەهید شەهاب لە زیندانەوە ڕابەرایەتی خەباتی کۆمەڵەی دەکرد . لەناو زیندان و لە دەرەوەی زینداندا، لەناو زیندانەوە و لە بەردەم پەتی سێدارە و چەقۆی بەعسیەکاندا لە بیرو پەژارەی کەرت و پەرت نە بوونی کۆمەڵەدا بوو، هەموو هیوا و تەقەلای بۆ یەکێتی ریزەکانی کۆمەڵە و پاراستنی کۆمەڵە لە شالاوی بەعسیەکان بوو شەهید شەهاب لەکاتی دادگایکردنیدا لە دادگا گاڵتەجاڕییەکی بەعسیەکاندا سەلماندی ، کە چەند خۆنەویست بوو. کە هەموو ئۆباڵێکی کاری کۆمەڵەی خستە ئەستۆی خۆی و بۆ پاراستنی هاوڕێکانی لە پەتی سێدارە خۆی کردە بەرپرسی یەکەم و دووایینی هەموو ئەو تاوانانەی کە بەعس دابوویە پاڵیان.

شەهید شەهاب لە ڕۆژی جێبەجێکردنی لە سێدارەدانی خۆی و هاوڕێکانی (جەعفەر، ئەنوەر) داوای لێکردن کە دەبێ لە پێشەوە و یەکەم کەس بێ لە سێدارەداندا ، بەو بۆنەیەی کە لێپرسراویانە.

شەهید شەهاب نەك هەر لەگەڵ هاوڕێکانی لە زینداندا ڕابەر و ئامۆژگاریکەری هاوڕێکانی و بەندیەکانی تریش بوو، بەڵکو لە بەرامبەر پیاوانی ڕژێم و بەرپرسانیش

خاوەن بیر و دەربڕی بۆچوونەکانی بوو ، کە لە ناو زیندانـدا وەك دادوەرێـك دادگـایی پیاوانی رژێمی دەکرد و لە کار و کردەوە دزێوەکانیانی بە ئاگا دێنانەوە. ئەو کاتەی کە شەهید شەهاب لە زیندانـدا بوو، نازەنین خانی هاوسەری بێ قایل بوون و ئاگاداری شەهید شەهاب ، تەقەلای ئەوەی دابوو، کە لە رێگەی (خیراللـه طلفـاح) ی خـەزوور و خاڵی سەدامەوە شتی بۆ کاك شەهاب بکات ، کاتێ کە شەهید شەهاب پێی زانـی ، هێندە دڵتەنگ بوو، کە بە نامەیەکی زۆر کورت ئاگاداری نازەنین خـانی کـرد کـە . (دەبـێ سـەدام و رژێمەکـەیان داوای لێبـوردن لـە گـەل و ئێمـەش بکـەن ،لەسـەر تاوانەکانیان ، نەك لێبوردن بۆ ئێمەی بێ تـاوان دەرکـەن ، و ئـیتر نامـەوێ بێیـت بـۆ بینینم ، کە دەزانم ئەو کارەت گوایە لەبەر مـن و بـۆ مـن کـردوە) .ئەوەنـدەی بەنـدە ئاگادار بوو ، دووجار (مواجهه) نازەنین خانی نەبینی ، تـا لـە سێهەمجاردا نـازەنین خان پۆزشی بۆ هێنایەوە و بە زۆرەملێی هاورێکانی رێگەی (مواجهه) ی دا.

هەر لە پـاش دەرچـوونی بڕیـاری لـە سێدارەدانی ، ئـەو کاتـە (جـۆرج حەبـەش) ی لێپرسـراوی یەکـەمی بـەرەی گـەل بـۆ رزگـاری فەلەسـتین (الجبهـه الـشعبیة لتحریـر فلسطین) بە سەردان هاتە بەغدا لە مانگی ٩٧٦/٨ داو داوای لە سەدام کرد بـوو ، کـە بتوانێ (شەهاب شێخ نوری) لە بەندیخانە ببینێ و هەوڵیش بدرێ ، حوکمەکەی کـەم و سوك بکرێ.

پاش ئەوەی لە رێگەی بەڕێوەبەرایەتی گشتی ئەمنی بەعسەوە بـە هـۆی پیاوەکـانی ناو بەندیخانەوە ئاگاداری (شەهاب) دەکرێ کە ئامادە بێ جۆرج حەبەش دەیـەوێ ببیینێ و لای (بەرێز جێگری سەرۆکیش) داوای دڵنەرمی بۆ کـراوە ، شـەهید شـەهاب پێیان دەڵێ : "لەبە رئەوەی کە جـۆرج حەبـەش بـۆ سـەردانی چـۆتە لای سـەدام و لەوەش خراپتر داوای لـێ بوردنی بۆ من لە سەدام کردوە ، ئامادەنیم و ناشمەوێ بـی بینم لە کاتێکدا چەندین سەران و خۆ بە سەرکردەزانی کـوردی و نـا کـوردی لـەکاتی تەنگانەدا خوا خوای تروسکاییەکیانە لێیانەوە دەرکەوێ ، نامەوێ لێرەدا بە بەڵگـەوە

ناوی چەندین خۆ بەسەرکردە و لێپرسراوی کورد زانی ناو پارتەکانی کورد و ناو یەکێتیش ببەم. لە ڕۆژی ٩٧٦/١١/٢١ دا کە ئەو سێ هەڤاڵە تێکۆشەرەی کۆمەڵە (شەهابی شێخ نوری سەرکردە ، جەعفەر عەبدولواحیدی ئەندامی سەرکردایەتی ، و ئەنوەر زۆرابی تێکۆشەریان بەرەو مەیدانی لە سێدارەدانیان برد . شەهاب پێشیان کەوتو پێی وتن : (هەر وەك چۆن لە کۆمەڵەدا لێپرسراوتانم ، ئاواش دەبێ لێرەدا لە پێشتانەوەبم و یەکەم کەس بم بۆ مەرگ)، لەوێدا پەندە کوردیە ڕەسەنەکەی لە چوارچێوەی پەندی پێشینان هێنایە دەرێ و کردیە زاراوەیەکی سیاسی کە بوو بە نموونەی هەرە بەرزی هەموو هاوڕێیانی کۆمەڵە لە خەباتی شاخ و شار و زیندانیدا، زاراوەی "کەم بژێ و کەڵ بژێ"

شەهابی شێخ نوری هەمیشە لەگەڵ هاوڕێکانی دا و لەناو کۆمەڵە و جەماوەریشدا ڕابەرێکی بێ کینە و ڕق بوو، هەرگیز نەم دی ، یەك جاریش گرژی بەرامبەر هاوڕێکانی بنوێنێ . تەنانەت لەناو زینداندا هەمیشە ئامۆژگاری هاوڕێکانی کۆمەڵەی ناو زیندانی دەکرد ، کە بە هیچ جۆرێك ڕووگرژی و لالوتی بەرامبەر بە زمان لیدەرەکانیش نەکەن ، واتە ئەو (معترف) کە زمانیان لە خۆی دابوو ، (کەمال عەلی ، ئەنوەر زۆراب ، عوسمان نانەوا) . تەنانەت لە کاتی بردنیان بەرەو سێدارە وەك سەرکردەیەك پیرۆزبایی لە ئەنوەر زۆراب کرد. کە ئەویش شەرەفی ئەوەی پێ برا کە یەکێك بێ لە یەکەم پۆلی شەهیدانی کۆمەڵە لە زیندانی فاشیەکانی بەعس دا.

لە سێدارەدانی شەهابی سەرکردە و هاوڕێکانی (جەعفەر و ئەنوەر) بوو، بە وەرچەرخانێکی گەورە لە خەباتی ڕەوای گەلی کورددا لە پاش ئاشبەتاڵەوە تا ئەو کاتە دائەنرێت .هەر لەدوای هەرەسی شۆڕشی ئەیلول و ئاشبەتاڵی سەرکردەکانی پارتی و بنەماڵەی بارزانی ، ڕژێمی بەغدای فاشی ، کەوتە هەنگاونان بۆ جێبەجێ کردنی نەخشە و پیلانەکانی بۆ لەباربردنی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد و هەڵتەکاندنی ماکی شۆڕش، کەوتە لێدان و ڕاونان و پەلاماردان و تۆقاندن و

تیرۆرکردنی خەڵکی سیاسی و نا سیاسی بە ئاگاو بێ ئاگا و سوتاندنی تەڕ و ووشك پێکەوە . کەوتە دەسپێکردنی نەخشەی کاولکردن و چۆڵکردن و سوتماککردنی شار و شارۆچکە و گوندی کوردستان و دروستکردنی ئۆردوگای زۆرەملێ و قەتیسکردنی دانیشتوانی لادێکانی کوردستان لەناو تەڵبەندی ئۆردوگاکاندا.

هەرەسی شۆڕشی ئەیلول و ئاشبەتاڵی پارتی دیموکراتی کوردستان و بنەماڵەی بەرزانی و زەبروزەنگی بەعسیەکان و نەمانی پشت وپەنای شاخ و لادێ، ترس و لەرزێکی ئەوتۆی لە دڵی خەڵکی کوردستاندا تۆو کردبوو ، کە باڵی نائومێدی بەسەر سەرجەمی خەڵکیدا کێشا بوو ، رژێم ببووە قەڵایەکی سەختی زلی تۆقێنەر و درندەیەکی پەلاماردەر، لەم لاشەوە جەماوەریش ببووە ماستی مەییوو کۆمەڵی بێ وورەیی و بێ هیوایی.

بەڵام بە شەهیدکردنی شەهاب و هاوڕێکانی و هێنانەوەی تەرمەکانیان ، شەهاب و جەعفەر بۆ کۆیە و ئەنوەر بۆ کەرکوك ، وەرچەرخانێکی گەورە لەناو هەناوی بزوتنەوەی کوردیدا ، لە رووی جەماوەر بە ئاگاهاتەوە، بە هەزاران چوونە پێشوازی تەرمەکانیان و بە هەزاران بە خۆپیشاندانێك ، تا ئەوکاتە بێ وێنە بووە ، تەرمی شەهیدەکانیان بە دوا ئارامەگەیان سپارد. تا ئەو رۆژەش رژێم پێی وابوو ، بۆ هەتاهەتایە بزوتنەوەی کوردی لە بار بردووە . بەڵام ئەویش لەو رۆژەدا بە ئاگاهاتەوە ، کە گیانی بەرەنگاری و هیوای سەرکەوتن لەناو کوردا نەمردوە و لەبارچووە.

## بزوتنەوەی سوسیالیستی دیموکراتی کوردستان.

دوای هەرەسی شۆڕشی ئەیلول و ئاشبەتاڵی سەرکردایەتی پارتی و بارزانی ، وەك لە بەشی دووەهەم (شۆڕشی ئەیلول) دا باسم کردووە، ئەندامانی سەرکردایەتی پارتی و کادر و لێپرسراوە سیاسی و پێشمەرگایەتیەکانی پارتی ، یان گەڕانەوە بۆ عیراق و ژێر دەسەڵاتی رژێم یان لە ئێراندا مانەوە و بوونە بەشێك لە بنەماڵەی بارزانی و هەندێکیشیان بەرەو هەندەران و ئەوروپا رۆیشتن.

لەو بارودۆخە سەختەی ئاشبەتاڵ و پەرش و بڵاوبوونەوەی پێشمەرگە و بێ هیوایی جەماوەر و هێرش و پەلاماری رژێمی فاشی ، دەستەیەك لە کادر و لێپرسراوانی ناو پارتی و چەند پیاوێکی شۆرشگێڕ و ناسراو و لێپرسراوی سیاسی و پێشمەرگانەی باڵە کۆنەکەی جەلالی لە ئێراندا یەکدەگرنەوە لە (ورمێ)[٢] رەزاییە و دەکەونە ئاڵوگۆرکردنی بیروڕا و لەسەر ئەوەی ، کە لەگەڵ بەشێك لەو خەڵکە سیاسیانەی کە پارتی نەبوون و لەناو شۆرشدا بوون و کەسایەتی نیشتمانپەروەری ناسراون (کۆمەڵە) ، هەروا بە ئاسانی دەست بەرداری شۆرش نەبن و هەوڵدەن هەندێ لەو چەکدارانەی ، کە بروایانە بە خۆ تەسلیمبونەوە نەبووە کۆ کەنەوە و بە شێوەیەکی رابەرایەتی شۆرش بکەن.

سەر ئەنجامی رووخانی وورەی جەماوەری شۆرش و خۆ بەدەستەوەدانی سەرانی پارتی و بنەماڵەی بارزانی، چ بە عیراق و چ بە ئێران و ئەو پاشاگەردانیەی ، کە بارودۆخەکەی تێکەوت بوو . ئەو کەسایەتیانە هەوڵەکەیان سەر ناگری و ئەوانیش لەگەڵ لافاوی خەڵکی دا دەگرێنەوە ژێر دەسەلاتی رژێمی عیراق و رژێمیش هەر

---

*لە مانگی ١٩٧٥/٤ لە ورمێ لە ماڵی (عومەر دەبابە)ئەم زاتانە کۆدەبنەوە "عەلی عەسکەری،د.خالید ، عەلی هەژار ، کاردۆ گەڵاڵی ، جەمال حەکیم ، رسول مامەند، مەلا ناسح ، عومەر دەبابە، عبدولرحمان گومەشینی ، ملازم تایەر عەلی والی ، سەلیم ئاغۆك ، کەمال محێدین ، ئیبراهیم ئەحمەد) و بریاردەدەن کە پێکەوە کار بکەن بۆ:

١-لە چوارچێوەی خەباتی سیاسی دژ بە رژێم کار بکەن.

٢-دەبێ بە زووترین کات حیزبێك لە کوردستان دورست بکەن.

تێبینی:

أ- سەروەر عبد الرحمن لە کتێبی"یەکیەتی نیشمانی کوردستان"لاپەرە ٩٨دا.دەڵێ: یەکەم بەیانی دورستبوونی بزوتنەوە لە مانگی ١٩٧٦/٨ دابووە، بە پێی دوکۆمەنتی ژمارە "٧"ی کتێبەکە.

ب- بەلام صلاح خرسان لە (التيارات السياسيه)لاپەرە٤٨٦ دا دەڵێ: بەیانی دامەزراندنی بزوتنەوە لە مانگی ١٩٧٦/٥ دا بووە.

یەکەیان بۆ شارێك یان شارۆچکەیەکی عێراق لە خوارووتا ناوەڕاست دوور دەخاتەوە . جارێکی تر ئەو کەسایەتیانە (عەلی عەسکەری ، سالح یوسفی) یەکتر دەبینەوە و دەکەونە تاوتۆی کردنی مەسەلەی دامەزراندنی حزبێك و بیرکردنەوە لە چونە شاخ و شۆرش بەرپاکردنەوە ، بە تایبەت کە تازە هەواڵی دامەزراندنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانیان پێ دەگات.

سەبارەت بە هەندێ بیروڕای ناویان دەربارەی هەڵوێست لە رژێم و شۆرش و ووتوێژ و یەکێتیی، بیرۆکەی دامەزراندنی رێکخراوێك دوا دەخەن تا لە مانگی ٤/١٩٧٦ دا لە کۆبونەوەیەکی ناوخۆیان لە بەغدا پێك دێن لەسەر دامەزراندنی (بزوتنەوەی سوسیالیستی دیموکراتی کوردستان) و سەرکردایەتیەکەشی پێکدێت لە:

(سالح یوسفی ، عەلی عەسکەری ، رسول مامەند ، کاردۆ گەلالی ، عەلی هەژار ، مەلا ناسح)

پاشان دوای چەند هەفتەیەك (سەعدی گچکە ، خالید سەعید ، کاك عومەر مستەفا "دەبابە") ش ، دەبنە ئەندامی سەرکردایەتی و رێکخستنەوەکە.

دوای دروستبوونی رێکخراوەکەش و پاشان پەیوەندیان لە رێگەی عەلی عەسکەری و عومەر دەبابەوە بە دەستەی دامەزرێنەری یەکێتیی بە هۆی ئالۆگۆری نامە و چوونی عومەر دەبابە بۆ سوریا ، دیسان دوو جۆر بۆچوونی جیاوازیان تێدا دروست دەبێ.

## أ- باڵی یەکەم:

١- سالح یوسفی ، کاردۆ گەلالی ، عەلی هەژار ، پاشان رسول مەماندیش رایان وا دەبێ ، کە دوای ئاشبەتاڵ شەڕ نەکرێتەوە ، بەو بیانوەی جارێ هەلومەرجی شۆرش لە ئارادا نیە.

٢ـ لەگەڵ یەکێتیدا تێکەڵ نەبن و نەبنە باڵێکی یەکێتیی ، بەڵکو سەربەستی و سەربەخۆی خۆیان بپارێزن.

٣ ـ هەوڵدەن لەگەڵ رژێم دا بکەونە گفتوگۆ بۆ ئەوەی ئەو جۆرە ئۆتۆنۆمیەی ، کە بەعس لە ١٩٧٤ دا ، یەك لایەنی رایگەیاند ، لە رێگەی ئەمانەوە ، واتە(بزوتنەوە)وە ـ بەرێوە ببرێ لەگەڵ هەندێ گۆرانکاری بچوکدا.

٤ـ گەر بەعس بەوە قایل نەبوو ، ئەوسا هەندێ لەو هەڤاڵانەی ، کە ناتوانن لە شارەکاندا بمێننەوە هەلومەرجی شاخ رەخسا بچنە شاخ بەڵام بە سەربەخۆیی.

**ب ـ باڵی دووەم : ( عەلی عەسکەری ، د. خالید سەعید، سەعدی گچکە، مەلا ناسح، عومەر دەبابە، وپاشان سەید کاکەش بە پێچەوانەوە رایان وادەبێ کە :**

١ـ رژێم کاتی گوێ لەوان دەگرێ ، کە لە شۆرشدا بن جەماوەریان هەبێ لە کاتی بەهێزیدا بن ، نەك لەو کاتەی کە فەرمانبەرێکی بچوك و بێ توانای بەر دەستی خۆی بن.

٢ـ هەل‌ومەرجی شۆرش هەڵگیرساندن و شۆرشی نوێ پاش ئاشبەتاڵ لە بارترە ، وەك لە چاوەروانی تا چەند ساتێکی تر ، کە رژێم هەموو نەخشەکانی خۆی جێبەجێ دەکا لە پلانی (راگواستن و بە بەعسیکردن و بە بە عەربکردن).

٣ـ شۆرشێك گەر بە رابەری چەند رێکخراوێکی هاوپەیمان و نیمچە بەرەی وەك خۆیان و یەکێتیی و کۆمەڵە بێ، زۆر باشترە لە رابەری تاك حزبی، کە نمونەکەی پارتی دیارە.

٤ـ ئەمانە پێیان باش بوو ، کە هەرچی زووتر دەکرێ هەوڵدەن ، بگەنەوە شارەکانی کوردستان و خۆسازدان بۆ چوونە شاخ بە تایبەتی ، کە گوێبیستی پێکهاتنی مەفرەزەی سەرەتایی کۆمەڵە ببوون ، لە چەند ناوچەیەکی وەك دۆڵی جافەتی ، شارەزوور ، قەرەداغ و دۆڵی قەلاتوکان و باڵەکایەتی و باڵەییان.

رۆژی ١٩٧٦/٧/١٥ لە کۆبوونەوەیەکی سەرکردایەتیان لە ئوتێل (ئەبو نەواس) لە بەغدا بریاری چوونە دەرەوە و شۆرشکردن دەدەن لەگەڵ کۆمەڵەدا.

له ١٩٧٦/٨/١٥ واته یەك مانگ پاش بریاردان (عەلی عەسکەری، د. خالید سەعید ، عومەر دەبابە، سەعدی گچکە، سەید کاکە) لە رێگەی کۆیە- رانیەو سەنگەسەر ، دەگەنە یەکەم مەفرەزەی چەکدار "خەلیل جەلال" پاشان "عەلی کۆ"لە دەشتێو. بە چوونە دەرەوەی ئەو کەسایەتیانە و رەسول مامەند ، بنکە و بارەگای کاتی خۆیان سەرەتا لە ناوچەی پشدەردا دادەنێن و دەکەونە کاری پێشمەرگانە و لێرەوە ناکۆکی نێوان برایانی سەرکردایەتی بزوتنەوە لەناو خۆیانەوە لە نێوان هەمویان و لە ناو کۆمەڵەش دەست پێ دەکا.

١- کێشەی نێوان خۆیان پتر لەسەر پاراستنی سەربەخۆیی بزوتنەوە و پابەند نە بوونی بە سیاسەتی یەکێتیی نیشتمانیەوە بوو.

سالح یوسف و عەلی هەژار ، کاردۆ گەلالی کە لە هەولێر و بەغدا بوون ،و لە شاخیش رەسول مامەند لایەنگر و خاوەنی ئەو بیروڕایەی سەرەوە بوون و زیاتریش پێیان لەسەر داواکردنی گفتوگۆ لەگەڵ رژێمی بەعس دا وەرگرت ، وەك لە بەردەوامبوونی شۆرش. بەڵام (عەلی عەسکەری، د. خالید سەعید، سەعدی گچکە) خاوەنی بیروڕای پەرەسەندن بە شۆرش و کۆکردنەوەی هێز و بەردەوامی لە خەباتی شاخ و کارکردن لە چوارچێوەی یەکێتیی نیشتمانیدا بوون و لە سەنگەری هێزەوە لەگەڵ رژێمدا بکەونە گفتوگۆ.*

ئەم کێشەیە هەروا مایەوە، تا پاش کارەساتی هەکاری کە بووە ، هۆی شەهید کردنی عەلی عەسکەری و دکتور خالید سەعید و حسێن بابەشێخ و چەندانی تر ، لە لێپرسراو و کاد رو پێشمەرگەی بزوتنەوەو کۆمەڵە و خەتی پان.

بە شەهیدبوونی ئەو سەرکردانەی بزوتنەوە ، کێشەی ناوخۆی بزوتنەوە ، یەکلایی بۆوە و ئیتر سەرکردایەتی بزوتنەوە چ لەناوەوە چ لەدەرەوە کەوتنە تەقەلای

---

* بەرای مام جەلال هەر لەسەردەمی لینینەوە((سوسیال دیموکرات)) تیرۆرکراوەو بە حزبێکی لادەرو نوێنەری بورژوازی دژە کۆمۆنیستیو سوسیالیت دادەنرێ.

دەرچوون لە جوغزی یەکێتیی نیشتمانیی و بڕوبیانو گرتن بە یەکێتی و کۆمەڵە تا لە١٩٧٩/٣/٢١دا لەگەڵ د. مەحمود عوسمان لە یەکێتیی چوونە دەرێ.

بزوتنەوەی سوشیالیستی دیموکراتی کوردستان، هەر پاش گەڕانەوەی مام جەلال لە سوریاوە بۆ وڵات و لە یەکەم دانیشتنیان لەگەڵ سەرانی بزوتنەوە، دیموکراتەکەیان بە ئامۆژگاری مام جەلال لابرد و بوو بە (بزوتنەوەی سوشیالیستی کوردستان)*، پاشان لە مانگی ١٩٧٩/٨ دا بە یەکگرتنەوەیان لەگەڵ (پارتی دیموکراتی کوردستان

---

* بۆ راستی ئەو رایە سەیری(بەیانی دووهەمی بزوتنەوە لە ١٩٧٧/٣/١ بکە کە هەم بەمرۆز گەلالی لەکتێبەکەی دوای جیابونەوەی حسك لەیەکێتی لە ١٩٧٩/٣/٢١

١ـ لە٣/٢٢ کۆنفراسێکیان بە بەشداری لیژنەی ئامادەکردنی د. مەحمود عوسمان بەستو سەرکردایەتی هاوبەشیان پێك هات لە(رسول مەمەند، قادر عەزیز، سید کاکە، حاجی حاجی برایم، أحمد فقی رەش، وملازم تایەر، د. مەحمود عوسمان، قادر جەباری، عدنان مفتی) لەژێر ناوی پارتی سوسیالیستی کوردستانی یەکگرتوو.

٢ـ لە٨/٨/ ١٩٧٩ دوبارە سەرکردایەتیەکی تریان هەڵبژاردو بەهەمان کەسایەتیو زیادبوونی(شوکت حاجی مشیر، أنور مجید سلطان، شیروان شیروەندی، قادر شۆرش، ملازم تایەر، فۆاد عومەر، لەناو شارەکانیش لە بەغدا صالح یوسفی، لەهەولێر عەلی هەژارو کاردۆ گەلالی(عارەب عبدالقهار)و شێخ محمد شاکەلی.

٣ـ لەمانگی ١٩٧٩/٩ کەوتنە ووتوێژ لەگەڵ رژێمو لە ١٩٧٩/٢/٢٤ ووتووێژ پچرا.

٤ـ کۆنگرەیەکیان لە ١٩٨١/٥/١٢ گرت. سەرکردایەتیەکەیان عادل مراد، رسول مەمەند، ملازم تایەر، أحمد فقی رەش، قادر عزیز، سید کاکە، حەمە رەحیم(هەڤال جوجەڵە) مەلا ناصح، عزیز عقراوی، قادر جەباری، محمد فاتح، شێرکۆ شێخ عەلی، شیروان شیروەندی، سعد عبدالله، عبدالخالق زەنگنە، کەدوا دەنگی هەبوو.

٥ـ لە ١٩٨٠/٨/١٥ چونە ناو بەرەی نیشتمانی دیموکراتی(جود)

٦ـ لە ١٩٨٨ چونە بەرەی کوردستانیەوە

٧ـ لەساڵی ١٩٩٢ حسكو پاسۆكو پارتی گەل یەکیان گرت لەژێر ناوی پارتی یەکگرتن.

"٥٠" سال تەمەن و ٣٢ سال خەباتدا بلاوکرای کردۆتەوە لە لاپەرە" ١٤ "دەدا، حەمەی حاجی مەحمود لە ڕۆژمێری پێشمەرگەیەك بەرگی یەکەم لاپەرە" ٥٧٣"دا بلاوی کردۆتەوە.

لجنەی ئامادەکردن کە بریتی بوون لە" د. مەحمود عوسمان و چوار پێنج کەسی تر) ناوەکەیان گۆڕا بۆ حیزبی سوشیالیستی یەکگرتووی کوردستان(حسك). و یەکەم دەستە گوڵیان کردنەوەی دەرگای گفتوگۆ بوو لەگەڵ رژێمی سەدام حسێن دا لە سەرەتای مانگی ۹/۱۹۷۹ دا.

بزوتنەوە هەر لە ساڵی ۱۹۷٦وە باڵێکی گرنگ و کاریگەری ناو یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بوون، رۆڵێکی گرنگیان لە گەشەپێدانی شۆرشی نوێ شان بە شانی کۆمەڵە گێرا، رابردووی خەباتی دوور و درێژی و ناسراوی شەهیدان عەلی عەسکەری ، د. خالید و خوالێخۆشبوو عومەر دەبابە لەناو بزوتنەوە و شۆرش و جەماوەردا هۆیەکی گرنگی خربونەوەی جەماوەرێکی زۆر بوو لە دەوری بزوتنەوە و شۆرشی نوێشدا لە ماوەیەکی زۆر کورتی تەمەنی بزوتنەوە و شۆرش نوێشدا ، گەرچی ئەو گەشەکردنی پتر لە رووی چەندایەتیەوە بوو.

بزوتنەوە بە لە دەستدانی شەهیدان عەلی عەسکەری ، د. خالید سەعید ، وەك سەرکردە و چەندین کادری سیاسی و پێشمەرگانە و پێشمەرگەی لێهاتوویان لە کارەساتی هەکاری و بە دەست و بریار و پیلانی پر شۆرەیی کوڕانی بارزانی و سامی عبدولرحمان نۆکەریان ، توشی سەرگەردانی و پشێوی رێکخراوەیی و لاوازی دەسەڵاتی چەکداری بوون، هەر نەشیانتوانی جارێکی تر بگەنەوە ئەو ئاستە دەسەلاتداریەی سیاسی و پێشمەرگانەی پێشوویان لەلایەك و لەلایەکی ترەوە بە شەهیدبوونی ئەو سەرکردانە رێگەخۆش بوو بۆ توندوتیژبوونی ململانێی نێوان کۆمەڵە و بزوتنەوە و تا کار گەیشتە بەرپابوونی شەڕی چەکداری نێوان بزوتنەوە و یەکێتیی هەر لە ساڵی ۱۹۷۹وە تا ساڵی ۱۹۸۸ ساڵی دروستبوونی بەرەی کوردستانی . لە ناوەراستی ساڵی ۱۹۹۲ دا لەگەڵ " پاسوك و پارتی گەل " یەکیانگرت و پارتی یەکگرتنیان پێك هێنا.پاشان لەسەرەتای ساڵی ۱۹۹۳دا پارتی یەکگرتن بوو ، بە سێ بەشەوە بەشێکیان بە ناوی پارتی یەکگرتنەوە چوونە ناو

ـرتیەوە و بەشەکەی تریان بە ناوی حزبی سوشیالیستی کوردستانەوە بە رابەری ـمسول مامەند لە١٠/٢/١٩٩٣ چوونە ناو یەکێتییەوە . بەشی سێیەم بە ناو حسکەوە ـتەوە بە رابەری حەمەی حاجی مەحمود.*

## پارتی دیموکراتی کوردستان

**لیژنەی ئامادەکردن ( اللجنة التنظمية ) .**

ـە دوای هەرەسی شۆرشی ئەیلول و ئاشبەتاڵی سەرکردایەتی پارتی و بارزانی ، ـالێك لە پارتی دیموکراتی کوردستان بە عەمەلی هەڵوەشاوە ، جیابۆوە بە ناوی پارتی دیموکراتی کوردستان لیژنەی ئامادەکردن.

ـابەرانی ئەو باڵە پێك هاتبوون لە:

١ـ د. مەحمود عوسمان ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی و وەزیری وەزارەتەکی مەلا مستەفا و لێپرسراوی کاروباری دەرەوەی ناوچەی پێش هەرەس.

٢ـ قادر جەباری کە ئەندامی سەرکردایەتی و لێپرسراوی لقی کەرکوك و پاراستنی ناوچەی کەرکوك بوو.

٣ـ شەمسەدین مفتی ئەندامی سەرکردایەتی پارتی پێش ئاشبەتاڵ لەگەل چەند پێشمەرگەیەك دا.

٤ـ عەدنان موفتی ، کادری پێشکەوتوی ناو پارتی.

ئەم باڵەی پارتی نیازیان وابوو ،لە سوریا ئەوانەی کە پاش ئاشبەتاڵ چووبوونە ئەوێ ، لە خۆیان خڕکردنەوە و هەوڵدەن جارێکی تر پارتی دیموکراتی کوردستان ، لەسەر شێوەیەکی نوێ و هاوچەرخ رێکخەنەوە.

بەڵام سەبارەت لە دابەشبوونی ئەو خەڵکە لە سوریا بەسەر یەکێتیی و قیادە موەقتەدا، کەسی وایان لە دەور کۆنەبۆوە.

---

* مع تقييم مسيرة الثورة الكردية وأنهيارها والمدروس والصبر المستخلصة منها.

* لــه كۆتــایی ســاڵی ١٩٧٥ دا بــه بــه‌یانێك ، بــوونی خۆیــان راگه‌یانــد و پاشــان نامیلكه‌یه‌كیان ده‌ركرد له‌سه‌ر شۆرشی ئه‌یلول و گفتوگۆی ئـادار و پاشـاگه‌ردانی نـاو پارتی و تونا و ده‌سه‌ڵاتی پاره و چه‌ك و چه‌كداری پارتی كاتی ئاشبه‌تاڵ و پاشـان تـاك سـه‌ركرده‌یی و تـاك ده‌سـه‌ڵاتی بـارزانی. بـه‌ناوی (تقیـیم سـیرة الثـورة الكردیـه وأنهيارها والدروس والعبر المستخلص منها) له راستیدا له سه‌رانی شۆرشی ئه‌یلولـدا ، ته‌نیا كه‌سێ كه چمكێكی له‌سه‌ر نهێنیه‌كانی ئه‌و شۆرشه نوسیبێ د. مه‌حمود بـووه ، كـه بـه‌وه‌ش خزمـه‌تێكی گـه‌وره‌ی بـه مێـژووی كـورد و مێـژووی شۆرشـی ئـه‌یلول گه‌یاندووه.

لیژنه‌ی ئاماده‌كردن له سوریا له ناوه‌راستی ساڵی ١٩٧٧ بریاریاندا ، ئه‌وانیش له‌گه‌ڵ مام جه‌لال بگه‌رێنه‌وه كوردستان ، به‌ڵكو بتـوانن قه‌باره‌یـه‌ك بـۆ حزبه‌كـه‌یان *پێك بێنن .پێیان وابـوو زه‌مینـه‌ی گه‌شـه‌كردن و په‌ره‌سـه‌ندنیان لـه كوردسـتاندا لـه‌بارتر ده‌بێ ، وه‌ك له‌ناو كورده‌كانی ئاواره‌ی سوریا . بۆیه له ته‌مموزی ١٩٧٧ د. مـه‌حمود عوسمــان و قــادر جــه‌باری گه‌رانــه‌وه كوردســتان و تــا ١٩٧٩/٣/٢١ هــه‌ر له‌گــه‌ڵ سه‌ركردایه‌تی یه‌كێتیدا بوون و پرس‌و راشیان پێ ده‌كرا، بـه‌ڵام هـه‌ر ئـه‌و دووانـه و یه‌ك پێشمه‌رگه‌شیان هه‌بو ، ژماره‌یان رۆژێ له رۆژان نه‌گه‌یشته ٥ كه‌س.

ئـه‌مانیش لـه١٩٧٩/٣/٢١ له‌گـه‌ڵ بزوتنـه‌وه‌ی سوسیالیـستدا باره‌گـا و بنـه‌ی خۆیـان پێچایه‌وه له (ناو زه‌نگ)وه كه باره‌گای سـه‌ركردایه‌تی گـشتی یـه‌كێتیی و كۆمه‌ڵـه و بزوتنه‌وه‌شی لـێ بوو ، ره‌ویانكرد بۆ گوندی (گۆره شێر) له‌سه‌ر سنوری دیـوی ئێـران و پاشــان لــه١٩٧٩/٨ دا له‌گــه‌ڵ بزوتنــه‌وه یــه‌كیان گــرت و حزبــی سوشیالیــستی یه‌كگرتووی كوردستان(حسك) یان پێك هێنا.

---

* سه‌باره‌ت به بلاوكردنه‌وه‌ی ئه‌و به‌یانانه‌ی ، كه له‌سه‌ر ئه‌م حزبانه ده‌رچون ، به پێویستم نه‌زانی بیان نوسمه‌وه وه‌ك دۆكۆمێنت ، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی له زۆر له‌و كتێبانه‌ی كه له‌مه‌وپێش چاپكراون هه‌ن.

## پارتی سوشیالیستی کورد( پاسۆك )

ئەم حزبە میراتگری و درێژە پێدەری بیری (کاژیك)ی کۆنە، (کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد) . بەلام بە شێوەیەکی پێشکەوتوتر.

لە ساڵی ١٩٧٢ دا سەرئەنجامی ناکۆکی نێوان سەرکردایەتی کاژیك و ئەندامەکانی خولرەوەیان تووشی گێژا و گیروگرفتێکی فیکری و سیاسی بوون، لە ئەنجامدا رێکخستنەکانی کاژیك توانیان سەرکردایەتیە تەقلیدیەکەیان بگۆرن و هەندێ ئالوگۆریش لە بیرو تیوری حزبەکەیاندا بکەن و بیکەن بە پەیرەوی کاری سیاسیان.

بیرو تیوری کۆنی کاژیك بریتی بووە لە (ئاریزم و زەردەشتیزم) و گەرانەوەی نەتەوەی کورد و شارستانیەتیەکەی و مێژوو و کلتورەکەی بۆ رەگەزی ئاری و ئاینەکەشی بۆ زەردەشتی.

لە رووی بیرەوە لەسەر بناغەی دژایەتی کردنی(عەرەب، تورك، فارس) کاریان کردوە و بە ئەرکی مێژوویی کوردیشیان زانیوە ، کە دژایەتی بیرە چەپ و شیوعیەت و مارکسیزم ـ لینینزم و دەولەتە بەناو سوشیالیستەکانیش بکەن.

دواکەوتوویی گەلی کوردیان وەك هۆیەك گێراوەتەوە بۆ ئیسلام و ئیسلامبوونی کورد .

دابەشکردنی کوردستانیان گێراوەتەوە بۆ داگیرکەرانی عەرەب و تورك و فارس و ئیمپریالیزم ، جگە لە کوردی پاك و کوردایەتی بێ غەلو غەش ، کە خۆیان بروایان پێ‌ی بوو، دژی هەموو دنیا بوون.

لە ساڵی ١٩٧٣ـ ١٩٧٤ ئەو ستافە رۆشنبیرانەی ناو کاژیك، بەو جۆرە ئایدیۆلۆژ هەلانەدا چوونەوە و کەوتنە گۆرانکاری لە ئاستی سەرەوەدا نەك لە بناغەوە.

لە١٩٧٥/٩/١١ دا ناو و ناوەرۆك و پەیرە و فەلسفەی کاژیك ، لەسەر دەستی ئەو ستافە و کۆمەلێ رۆشنبیری نوێ‌ی ناو کاژیك گۆردرا و کاژیك بوو، بە پارتی سوشیالیستی نەتەوەیی کورد بە بەرنامەو پەیرەو و فەلسفەیەکی نوێیەوە.

پاش یەك ساڵ واتە لە١٩٧٦/٩/١١ جارێکی تر ناوەکەی گۆردرا بۆ پارتی سۆشیالیستی کورد (پاسۆك)، ناوی سوشیالیست لای پاسۆك مەبەست

(سوشیالیستی نەتەوەیی کورد) بوو، نەك سوشیالیستی زانستی. (الأشتراكية العلمية).

هەر لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٦وە ، پاسۆك رایان وابوو ، کە دەبێ لە شۆرشی نوێدا ، هاوکاری لەگەڵ یەکێتیی نیشتمانیی کوردستاندا بکەن . بۆیە بەشداریان لە پێکهێنانی لیژنەی پێشمەرگەی ناو شاردا کرد ، بە بەشداربوونی لەو لیژنەدا کە لەسێ کەس پێك هاتبوون: " مامۆستا سەلام عەبدوڵلا ، عەریف تالیب مۆریاس، بەندە.

لە ساڵی ١٩٧٧وە هەندێ لە ئەندامانی پاسۆك ، وەك پێشمەرگە و فەرماندەی مەفرەزەش بەشداریان لە شۆرشی نوێ لەگەڵ یەکێتییدا کرد.

لە ساڵی ١٩٧٨ بە دواوە وەك سەرکردایەتی و حزبەکەیان بەشداری شۆرش بوون و بنکە و بارەگاکان خۆیان نزیك بارەگاکانی سەرکردایەتی یەکێتیی و کۆمەڵە و بزوتنەوە دانا.

ساڵی ١٩٧٩ بارەگای سەرەکی و سەرکردایەتیان لە گوندی (شێنی) دانا ، کە بەشێکی بارەگاکانی سەرکردایەتیشی لێ بوو . گەرچی بە قەبارەی چەکداری ژمارەیان لە سێ – چوار مەفرەزە ، جگە لە سەرکردایەتیان پتر نەبوون ، بەڵام بە کردەوە و چالاکی نواندن بەردەوام یەك – دوو مەفرەزەیان لە ناوچەکانی دۆڵەرووت و شاربازێر و جافەتی و ناو شاری سلێمانیش لە نواندنی چالاکیدا بوون.

لە سەرەتاوە پەیوەندیان لەگەڵ یەکێتییدا و بە تایبەت لەگەڵ کۆمەڵەدا هێندە پتەو بوو ، تا ئەو رادەیەیی ، کە شوێنی حەوانەوە و بنکە و بارەگا و کەلوپەلی ناو بارەگا و چەك و تەقەمەنی و ئازوقە و یارمەتی پێشمەرگەکانیشیان لەلایەن یەکێتییەوە بۆ دابین دەکرا.

لەدوا نیوەی ساڵی ١٩٨١ دا سەرەنجامی هەست نەکردن ، بە لێپرسراویەتی بەرامبەر مێژوو و دوارۆژ و هەڵەیەك لە رابەرە سیاسیەکانی یەکێتیی و پاشان

چارەسەرکردنی هەڵەش بە هەڵە ، لەلایەن پاسۆکەوە نەك هەر گرژی کەوتە پەیوەندی نێوانیان ، بەڵکو هەر لەو کاتەوە تا ساڵی ١٩٨٨ کە سەرەتای هەنگاونان بو و، بۆ پێکهێنانی بەرەیەکی کوردستانی، لەسەنگەر دابوون دژی یەك.

ڕووداوەکە بریتی بوو ، لە کوشتنی چەکدارێکی پاسۆك بە ناوی (مام ئاراس) (یاسە هەتیو) لەلایەن ڕابەر سیاسی هەرێمی قەرەداغ ، کە لە شارەوە ڕاپۆرتی بۆ هاتبوو ، لەسەر (مام ئاراس) کە سەر بە ڕژێمەو لە ناوچەکەدا جاسوسی بەسەر یەکێتییەوە دەکا.

لە ڕاستیدا کوشتنی (مام ئاراس) نەك هەر کارێکی هەڵە بوو، بەڵکو لە ڕووی شۆڕشگێڕی و مافی مرۆڤ و یاسایشەوە نا ڕەوا و ناڕاست بوو،و دژی هەموو سەرەتایەکی کاری سیاسی و خەباتی دیموکراتی بوو. دەبوایە لێپرسینەوە و سزادانەکەی ڕووبەڕووی حزبەکەی خۆی بکرایەتەوە ، نەك ڕابەری سیاسی یەکێتیی خۆی بکردایەتە پۆلیس و حاکم و جێبەجێکەری بڕیارەکەش ، بێ ئەوەی بە شەرعی تاوانبار کرابێ.

هەر ئەو ڕۆژە ، کە هەواڵەکە دەگاتە مەفرەزەیەکی پاسۆك لە گوندی گەڕەدێ ، دەچنە مزگەوتەکە و کە پۆلێ پێشمەرگەی یەکێتیی لەوێ دەبن ، بێ سێ و دوو دەستڕێژیان لێ دەکەن ، کادرێك و فەرماندەیەکی کەرت و پێشمەرگە دەکوژن، هەر ئەو ڕۆژە و پێش چەند سەعاتێ ئەو مەفرەزەیەی پاسۆك و ئەو پێشمەرگانەی یەکێتیی پێکەوە دەبن و زۆر دۆست و تێکەڵاوی یەکتری دەبن و هێندە لە یەك دڵنیا دەبن ، کە مەفرەزەکەی پاسۆك دەگەڕێنەوە دێکە و مزگەوتەکە، پێشمەرگەکانی یەکێتیی بەخێرهاتنەوەیان دەکەن.

ئەمانیش واتە(پاسۆك) لە باتی گەیاندنی ڕوداوەکە بە سەرکردایەتی یەکێتیی و شکات کردنی لەو ڕابەر سیاسیە و داوای سزادانی ، و چارەسەر کردنی کێشەکە بە شێوەیەکی تەبایی و هاوکاری و هاوخەباتی و چاوەڕێ کردنی سەرئەنجام، هەڵەیان

بـه هەڵەیـەکی زۆر خـراپتر و گـەورەتر، بگـرە بـێ گوێدانـه هـیچ پرەنـسیپێکی شۆرشگێڕی و هاوخـەباتی و هەسـت بـه لێپرسـراوێتی بەرامبـەر شـۆرش و مەسـەلەی کورد چارەسەرکرد.

هەر پاش ئـەو کارەساتە پاسـۆك بنـه و بارەگـای خۆیـان لـه ناوچـەکە و کوردسـتان پێچایەوە بەرەو سنوری ئێران و ئەودیو سنورویان کرد ، و کەوتنە دژایەتی کردنی یـەکێتیی و شـەڕی راگەیانـدن و پاشـانیش لەگـەڵ لایەنـەکانی تـری بـەرەی "جـودا" کەوتنە سەنگەر گرتن له یەکێتیی تا مانگی ١٩٨٧/٤.

پاسۆك له ساڵی ١٩٨٢دا بوو، به ئەندام له بەری جود (الجبهـة الوطنیـة الدیموقراطیـة) لەگەڵ پارتی و حسك، حزبی شیوعی عراقیدا. ئەو بەرە له مانگی ١٢/١٩٨٠دا پێکهات له پدك، حشع، حسك ، دژی بەرەی جوقد (الجبهة الوطنیة والقومیة الدیموقراطیـة) .

هەر لەو ساڵەدا پاسۆك ، لەسەر بانگەوازی یەکێتیی تەنیا لایەنی ناو جود بوو ، کـه ئامـادەی پێکهێنـانی بەرەیـەکی کوردسـتانی نیـشاندا . دیـسانەوە یەکـەم لایـەنی کوردی بوو ، که به رەسمی له ١٩٨٧/٤/٢٤ دا به پیر بانگەوازەکەی یەکێتییەوە چوو ، بۆ پێکهێنانی بەرەیەکی نیشتمانی له ١٩٨٧/٤/٢٢دا .

پاسۆك هەر له دامەزراندنی بەرەی کوردستانیەوە تا ساڵی ١٩٩٢ لایەنێکی ئەو بەرەیە بـوو ،لـه مـانگی ١٩٩٢/٦ دا لەگـەڵ حـسك و پـارتی گـەل یـەکیانگرت و بـه رەسمـی هەڵوەشانەوە.

## پارتی دیموکراتی گەلی کوردستان

ئـەم حزبـەش هــەر سـەر ئـەنجامی ژان و ئازارەکـانی پـاش ئاشـبەتاڵ و ئـەو بـێ سەروبەریەی ، پارتی دیموکراتی کوردسـتان و لـەناو پارتیـەوە لـه کۆنگرەی ٩/ ی پـارتی دا ، لـەپارتی جیابوونـەوەو لـه ١٩٨١/٧/٣٠ دا بـه بـەیانێك بـوونی خۆیـان راگەیاند.

له سالّی ١٩٨١ دا بوونه ئەندامی بەرەی نیشتمانی و نەتەوەیی دیموکراتی(جوقد) له سالّی ١٩٨٥ ، بوونه ئەندامی بەرەی نیشتمانی دیموکراتی (جود) . ئەم حزبە بە پلان و سەرپەرشتی و سەرۆکایەتی سامی شەنگاری (سامی عبدولرەحمان) دامەزرا .سامی له سالّی ١٩٦٧وه تا ئاشبەتالّ ئەندامی سەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو . له سالّی ١٩٧٠ بۆ ماوەیەك وەزیری پارتی بوو.

نوێنەری تایبەتی بارزانی بوو، بۆ پەیوەندیەکانی دەرەوە لەگەلّ ساواکی ئێران و سی ئای ئەی ئەمریکی و ئیسرائیلدا . جێگای باوەری زۆر و متمانەی بارزانی بوو ، تا کۆچ کردنی بارزانی پلاندانەر و دارێژەری بناغەی دامەزراندنی قیادە موقتە بوو، له ناوەوە و پاشان له دەرەوەی ولاتیش ، یەکێك بوو، لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی قیادە موەقتە . فەرماندەر و بریاردە و جێبەجێکەری بە دیلی شەهید کردنی عەلی عەسکەری و د. خالید سەعید و شێخ حسێن بابە شێخ بوو..

تۆبالّی تاوانی هەرەگەورەی نەتەوەیی گەلی کورد (کارەساتی هەکاری) لە زەمان و زەمینی خۆیدا، وەك پەڵەیەکی رەشە بە ناوچەوان و گەردنی سامیەوە و وەکو کورانی بارزانی هاوبەش و بەرپرسیارە.

پارتی فرۆش و خۆفرۆش و گەل فرۆش و حکومەتی فیدرالّ فرۆشی ٣١/٨ / ١٩٩٦ه.

ئەمانیش وەك لایەنەکانی تری بەرەی کوردستانی ، هەر لە دامەزراندنی بەرەو لە ١٩٨٨دا بوونە لایەنێکی بەرەی کوردستانی.

له ناوەراستی سالّی ١٩٩٢ دا لە کۆنگرەی یەکگرتندا لەگەلّ حسك و پاسۆك یەك حزبیان پێکهێنا بە ناوی (پارتی یەکگرتن)و پاشان لە سالّی ١٩٩٣ بوون بە چەند بەشەوە و بەشێکی پارتی یەکگرتن لە مانگی ١٩٩٣/٨ دا چوونە ناو پارتیەوە و بەشێکی له ١٩٩٣/٢/١٠ دا چوونە ناو یەکێتیەوە و بەشێکی بچوکیشیان بە ناوی حسکەوە مانەوە بە رابەری حەمەی حاجی مەحمود.

## پارتی دیموکراتی کوردستان( سەرکردایەتی کاتی ). "القيادة المؤقتة".

لە دوای دامەزراندنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و دەرچوونی بەیانی یەکەمی لە١٩٧٥/٦/١ دەرەوەی ولآت ، و بلآوبوونەوەی ئەو هەواڵە لەماوەیەکی کەمدا لە هەموو ئەوروپا و لە کوردستانیش . پاش چەند مانگێکی کەم لە دوای ئاشبەتاڵی سەرانی پارتی و بارزانی و هەرەسی شۆرشی ئەیلول ، دەنگ و هەڵایەکی گەورەی لەناو کوردەکانی سوریاو ئاوارەی ئێران و سوریا و ئەوروپاش، کە پاش هەرەس روویان تیَ کردبوو دایەوە:

أ- کوردەکان لە سوریا لەدەوری یەکێتیی کۆبوونەوە.

ب- بەشێکی کوردەکانی ئاوارەی ئێران ، یان بە ڕێگای فرۆکەوە یان بە ڕێگای ئێران - تورکیا خۆیان گەیاندە سوریا بۆ خڕبوونەوە لە یەکێتیی.

ج- کوردەکانی ئەوروپا کەوتنە خۆیان و کۆنگرەی خۆیان لە ژێر ناوی کۆنگرەی کۆمەڵەی خوێندکاران لە مانگی ١٩٧٥/٨دا بەست ، کە تا ئەو کاتە کۆمەڵەی خوێندکاران لە هەموو ئەوروپا هەر سەر بە پارتی بوو،لەوێوە کۆمەڵە بوو، بە دوو کۆمەڵەی خوێندکاری.

د- لەناو ووڵات لە رێگەی کۆمەڵەی مارکسی ـ لینینی کوردستانەوە ، بانگەوازی لە دایکبوونی یەکێتیی هەڵدرا بوو . لە مانگی ١٩٧٦/٤/٣ وە، دەستە چەکدارەکان پێکهێنرا بوون.

ئەمانە مەترسیەکی زۆری لە دڵی بارزانی و هەندێ لە سەرانی کۆنی پارتی و لەلای ساواکی ئێرانیش دروست کرد ، لەوە ئەترسان کە یەکێتیی بۆشایی پاش ئاشبەتاڵی پارتی پڕبکاتەوە و مەترسی لەسەر ئایندەی بارزانی و ئێرانیش دروست بکات.

بنەماڵەی بارزانی و لەسەرانی پارتی ، بە فەرمانی بارزانی و بریاری ئێران کەوتنە تەقەلای خۆ خڕکردنەوە بە مەبەستی پەیداکردنی هێزی چەکداری و جموجۆڵی سیاسی بۆ رێگرتن لەیەکێتیی . وەك ئیدریس ئاگاداری مام جەلالی کردبۆوە ، کە

جموجـۆڵ نەکـەن ، چـونکە: ( گـەر شۆرشـیان پـێ نـەکرێ ، شۆرشـیان پـێ تێـك دەدرێ).*

سەرەتای کار لـە لقـی ئەورووپایانـەوە دەسـتی پـێ کـرد.لـە مـانگی ۱۹۷٦/۸ دا تـارق عەقراوی ، جێ متمانەی تایبەتی بارزانی گەیشتە ئەورووپا و بەیانێکی بە نـاوی پـارتی دیموکراتی کوردستان (لقی ئەورووپا) بڵاوکردەوە.

لـە کۆتـایی مـانگی ۱۹۷٥/۱۱و بـە فـەرمانی مـاڵی بـارزانی ، محەمـەد مـەحمود عبـدولرەحمان (سـامی) جـارێکی تـر پـارتی دروسـت کـرەوە و بـە دروسـتکردنی سەرکردایەتیەکی کاتی بۆ پارتی ، پێکهاتوو لە:(ئیدرس بـارزانی، مەسـعود بـارزانی ، سـامی عەبـدولرەحمان ، جەوهـەر نـامیق ، عـارف تـەیفور، کـەریم سـنجاری ، غـازی زێباری، فازیل جەلال، ئـەورەحمان پێـداوی ، حەمـەی حەمـە رزار ، ئـازاد بـەرواری ، ئازاد خەفاف ، وریا سەعاتچی ، کەمال کەرکوکی).

وە لە ۱۹۷٥/۱۲/۱۰دا یەکەم بەیانی راگەیانـدنی دامەزراندنـەوەی پارتیـان دەرکـرد بە ناوی (الحزب الديمقراطي الكردستاني ـ القيادة المؤقتة).*

دوای ئەو بەیانە، لە بەهاری ساڵی ۱۹۷٦ دا سامی بـە بریـاری بـارزانی و رێگەپێـدانی ئێـران ، لـە ئێرانـەوە چـووە ئـەورووپا بـۆ سەرپەرشـتی رێکخستنەوەکانی پـارتی لـە دەرەوە . قیادەی موەقتەت لە سەرەتاوە ئەرکی هەرەسەرەکی خۆیان بـە لێـدان و لەناوبردن و لەباربردنی یەکێتیی نیشتمانیی دیاری کرد ..ئەمەش لەبـەر ئـەم هۆیانـە بوو:

١- پارتی لەوە ترسا ، کە تازە جڵەوی شۆرشەکەی لە دەستچوو بـێ و یـەکێتیی بـە هەڵگیرساندنی شۆرشێکی نوێ و بیرێکی نوێیـەوە مەیدانەکـەیان لـێ بگـرێ و ئـیتر پارتی ببێتە(خبر كان).

---

* لە کەناری دانووبەوەو نەوشیروان مستەفا لاپەرە ٩٤.

* نەشێروان مستەفا لەکەناری دانوبەوە لاپەرە ٤٣٨

٢- ئێران لەوە دەترسا ، کە کارتی کوردی عێراقی بە هۆی یەکێتییەوە لە دەست دەرچی . بۆیە کەوتەوە یارمەتی و هاندانی پارتی بۆ خۆ ڕێکخستنەوە.

٣- ئێران و ئێراقیش پێیان وابوو، بەربەرەکانی کردنی یەکێتیی و لاوازکردن و لێدان و ڕێگرتن لە گەشەکردنی، وەك هەنگاوی یەکەم، ئەوسا دەتوانن وەك هەنگاوی دووەهەم ، ببنەوە بە تاکە حزبی کوردستان و تاکە سوارەی ناو مەیدان. بۆ جێبەجێکردنی ئەو ئەرکە سەرەکیەش ، کەوتنە نەخشەدانان و جێبەجێ کردنیان بە هەنگا و بە قۆناغ.

سەرەتا بەیانێکیان بە بۆنەی تێپەڕبوونی سالێك بەسەر ئاشبەتاڵ دەرکرد و لە ١٩٧٦/٣/٦ و لە بەشێکی بەیانەکەدا (ئولتیماتێکیان) ئاراستەی یەکێتیی کرد. کە ئەوەی دەگەیاند هەم وەك هەرەشە لێکردنێك و هەم وەك ئامۆژگاریش بۆ گەڕانەوەی یەکێتیی بۆ باوەشی قیادە موەقەتە ، بەتایبەتی لەو کاتەدا هەم یەکێتیی لە هەوڵی پێکهێنانی دەستەی چەکدار و ناردنەوەیان بۆ کوردستان و هەم لەناو وڵاتیش کۆمەڵەش کەوتبووە پێکهێنانی دەستەی چەکدار لە ناوچەکاندا بەناوی دەستەی چەکداری نوێ و لە ژێر ئالای یەکێتیی نیشتمانیی کوردستاندا.

**ئەو بەشەی بەیانەکە دەڵێ:**

**" أن السعي لتفتيت القوى الكردية المخلصة ، وتظليل الجماهير ، وتغير الحقائق ، وتحريف نضالات حزبنا الديموقراطي الكردستاني العريق لايخدم الا العدو و العنصري و يساهم في تسهيل اقرار مخططات العدو الأجرامية لمحو كياننا و شخصيتنا الكردية ولا يجني اصحابها الا الفشل الذريع ، لأن وحدة شعبنا الكردي كانت دوماً رائد حزبنا عبر سيرته التأريخية الطويلة وهي سه وجوده ويمومته وتطوره وأنتصاره في الساحة النضالية، ويسظل حزبنا أميناً على هذه المسيرة... الخ"**

پاشـــان کەوتنـــە دابەشـــکردنی گێرانـــی ڕۆڵـــەکان ( توزیـــع الأدوار ) و ئەرکـــەکان.
لەسەرەتاوە بیریان لەوە کردەوە کە هەم ئێران و هـەم تورکیـا و هـەم کوردەکـانی تورکیاش بەهۆی عشیرەتەکانەوە هاندەن بۆ هاوکاریـان لـە لێدان و هەڵتەکانـدنی نەخشەکانی یەکێتیی.

- ناردنی سامی بۆ ئەورووپا و ڕێکخستنەوەی حزبەکەیان.
- ناردنی جەوهـەر نـامیق و کـەریم سـنجاری بـۆ نـاو عەشـیرەتە کوردەکـانی تورکیـا ،لەناوچە سنورییەکان بۆ هاندانیان دژی یەکێتیی و ڕێگـەگرتن لـە گەڕانـەوەی دەسـتە چەکدارەکانی یەکێتیی لە سوریاوە بۆ وڵات بەو ناوچانەدا.

دەسـتبەکاربوونی ئیـدریس بـە ناردنـەوەی کەسـانی وەك کـەمال کـەرکوکی و شـێخ عـەزیزی شـەدەڵەیی ، وفـازل جـەلال، وشـێرکۆ شـێخ عـەلی سـەرگەڵۆیی ، بـە چـەند چـەکدارێکەوە بـۆ ناوچـەکانی دۆڵـی جافــەتی و پـشدەرە ڕەقــە، شــاربازێر ، بەمەبەسـتی هەڵتەکانـدنی مـەفرەزەکانی یـەکێتیی و هەڵگەڕانـدەوەیان و پاشـان ناردنی باوەڕپێکراوەکانی پارتی بۆ ناو حکومەت و بوون بە سەرۆك جـاش و مخـابرات بۆ لێدانی دەستە چەکدارەکانی یەکێتیی و زماندان لە ڕێکخستنەکان، لەوان ە، قالە فەرەج ، تەحسین شاوێس ، عبدالملك عەلی عوسمـان، هـەمزەی هـەیاس بـاول ئاغـا و چەندانی تر.
لە١/٣/١٩٧٧ بـەیانێکی هاوبەشـیان لەگـەڵ یـەکێتیی و حزبـی بـەعس ئۆپۆزسـیۆنی عیراقی لە سوریا مۆر کرد.
پاش زانینی مەلا مستەفا لە ئەمەریکا و نا قایلبوونی بـەو ڕێکەوتنـە مەیدانیـە لەگـەڵ یەکێتیی ، قیادەی موەقتە لە ڕێکەوتنەکە پەشیمان بوونەوە.
لە ١٥/٧/١٩٧٦ وە تـا ٣٠/١٠/١٩٧٦ ، بـە بڕیـاری جەوهـەر نـامیق و کـەریم سـنجاری فەرماندەیەکی یەکێتیی ئیبراهیم عەزۆ و سێ فەرماندەی مەفرەزە و ٣٠ پێشمەرگەی یەکێتیان لە گوندەکانی تورکیای سەر سنوری عیراق شەهید کرد.

له مـانگی ۷/۱۹۸۰ دا لـەکۆنگرەی -۹- نـاوی قیـادە موەقتـەیان لـەخۆیان کـردەوە و کردیانەوە بە پارتی دیموکراتی کوردستان.

گـەورەترین چـالاکیش کـە ئـەم حزبـە لـە پـاش ۱۹۷٥/۳/٦ وە واتـە ئاشـبەتاڵ تـاکو ناوەندی هەشتاکان ئەو تاوانـە گەورەیـە بـوو ، کـە لـە مێـژووی کـوردا ناسـراوە بـە کارەساتی هەکاری کە لە ۱۹۷۸/٦/۱و تا ۱۹۷۸/٦/۱۹ بـە یارمـەتی عەشـیرەتەکانی" ژێرکی، مام خۆران، زیوکیان، کۆچەر، سپیرتی ، گێتە" و چەکدارەکانی ق. م بـوون ، بـەهۆی کوشـتن و گـرتن و کـەرت و پـەرتکردنی هێزێکـی یـەکێتیی پێکهـاتبوو لـە نزیکەی ٤٥٠- ٥٠٠ پێشمەرگەی چـەکدار و بـێ چـەك بـە هاوکـاری هێـرش و پـەلاماری حکومەتی عیراقی و بێ دەنگی حکومەتی تورکی لەناو خاکی تورکیادا.*

---

*یەکەم کۆبونەوەی هەندی لەبەرپرسان و کادرانی پارتی پاشماوەی ئاشبەتاڵ لە لـەمانگی ۱۹۷٥/٤ کرا و بریاریان دا سەرەتای خۆسازدانەوە لەئەوروپاوە دەست پـێ بکـەن بۆیـە بریاریـان دا کـە (نـوری شـاوێس، عادل مرا، عبدولرەزاق میرزا فەیلی، ئازاد مەحمود خەفاف، بە پارەیەکی زۆرەوە گە درابوە دەست نـوری شاوێس بنێرنە دەرەوە. نوری شاوێسو رەنجی کوری چونە بەیروتو عادل مرادو عبدولرەزاق چونە سوریا) کە لەوێ لەپارتی جیابوونەوەو بەشداریان لەپێکهێنانی یەکیەتیدا کرد. وئەم هەوڵەی کورانی بارزانی سەری نەگرت.

لـەمانگی ۱۹۷٥/۹ لـەنێران ناوەنـدێکی سـەرکردایەتیان بـەناوی(سـەرکردایەتی کـاتی)( القیـادە المؤقتـە) لەأدریس، مسعود، سامی، علی عبدالله، نوری شاویس، پێك هێنا.

یەکەم کۆنفرانسی ق. م پاش.ئاشبەتاڵ لـەمانگی ئـابی/۱۹۷٦ لەئـەڵمانیا لەبـەرلین گـرت، لـەو کۆنفرنـسەدا سەرکردایەتیان لە(۱٥) کەس بە هەڵبژاردن پێکهێنا.

یەکەم بەیانیان بەبۆنەی تێپەربوونی ساڵێك بەسەر ئاشبەتاڵ دەرکرد، کەلەو بەشەی ئامـاژەم پـێ کـردووە بە ئاشکرا هێرش دەباتە سەر یەکیەتی(نەوشیروان مستەفا ـ لەکەناری دانوب) ل ٤٤١.

لەراپۆرتی سیاسی مسعود بارزانی بـۆ کـۆنگرەی نـۆ(۹) لەبەشـێکیدا دەڵـێ(... وەلەبەرئـەوەی دوژمنـانو خائینان وایان دەزانی پارتی نەماوەو مەیدان بۆ ئەوان چۆڵ بـوە ومجـالی ئیـشکردنیان پـێ درابـوو لەلایـەن مخابراتی دەوڵەتانی منتیقة کەوتنە جموجۆڵو دیاربوو کە دوا ئیختیارمان لەپێشە ئەویش ئەوەیە کە پارتی بمێنێ یا نەمێنێ (حبیب محمد کریم ـ تأریخ الحزب الدیموقراطي الکردستانی ـ العراق. ل ۳۷٦.

# بەشی چوارەم
# یەکێتی نیشتمانیی کوردستان کۆمەڵە.

## شۆرشی نوێ و بارودۆخی ئەوسای عیراق.

گەر پرسیار لەهەر سیاسیەکی شارەزاو سەرکردەیەکی سوپایی شارەزا و قالبوو بکەی ، کە ئایا دەکرێ و دەشێ شۆرشێك لەلایەن چەند مەفرەزەیەکی چەکدار بە سادەترین چەك و کەمترین توانای ماددی و بگرە لە ئاستی نەبواندا بەرپابکرێ لە بەرامبەر دەوڵەتێکی دەسەڵاتداری بەهێزترین دەوڵەتی ناوچەکە لە رووی ژمارەی چەکدار و تفاق و کەرەسەی جەنگی و خاوەن تازەترین جۆری هێزی ئاسمانی و زەمینی؟

لەوەلامدا رەنگە یا بڵێ مەحاڵە ! یا بڵێ ، بەلام خۆکوژیە !

واتە کۆمەڵە و یەکێتیی یا لە مەحاڵەوە یەکەم هەنگاوی ناو ، یا لە گیانی لە خۆبوردنیەوە تا رادەی خۆکوژی.

حکومەتی عیراقی لەو پەری ووره بەرزی و لووت بەرزی مەستی سەرکەوتنەکەی بەسەر شۆرشی ئەیلولو خەباتی چەکداری گەلی کورد دابوو، سەبارەت بەو لەبەر داهێنانەی (تنازل)یە ، بەرامبەر شای ئێران لە رێکەوتنەکەی جەزائیردا لەپێناو هەڵتەکاندنی شۆرشی کورد، لە هەنگاوناندا بوو ، بۆ پتر خۆ بەهێزکردن و پڕ چەك کردن بەو هیوایەی ، کە لە ئایندە لەو پەیمانەش پاشگەز بێتەوە و ئەو ناوچانەی لە رێکەوتنەکەدا دابووی بە ئێران داگیری کاتەوە.

بۆ بەرگریکردن و رێگرتن لەسەر هەڵدانەوەی بزوتنەوەی چەکداری لە کوردستاندا ، جارێکی تر کەوتە پەرش و بڵاوکردنەوەی سوپایەکی زۆر لە کوردستاندا و دانان و

---

یەکەم کۆنگرەیان پاش کۆنگرەی ٩ بوو لە ١١/٤ تا ١٩٧٩/١١/١٠( تأريخ الحزب الديموقراطي الكردستاني - العراق).ل ١٥٨

دامەزراندنی بنکە و رەبایەی قایم لە هەموو شار و شارۆچکە و گوند و گرد و شاخ و شوێنە گرنگەکانی ، بە تایبەتی سەر سنورەکانی نێوان عێراق ـ ئێران.

بۆ جێبەجێکردنی نەخشە ستراتیژیە پەیوندارەکەی ،بە شێواندنی مۆرکی نەتەوەیی گەلی کورد لەعێراقدا، هەر لەپاش ئاشبەتاڵ رژێمی بەعس ، کەوتە جێبەجێکردنی نەخشەی (تعریب، ترحیل، تبعیس) لە کوردستاندا.

لە١٩٧٦/٩/٢١دا سەدام حسێن لە کۆشکی (ئەنجومەنی نیشتمانی) دا، لە کۆبوونەوەی لیژنەی بالآی بەرەی نیشتمانی و نەتەوەیی پێشکەوتنخواز و هەموو لیژنەکانی بەرەی پارێزگاکان)دا ، ئەو پیلانەی خۆیانی بەرامبەر بە کورد نیشاندا، کە لەبەشێکی دا دەڵێ:

**( أن ما يلغي الفرص العمل المضاد هو المبادىء والتدابير المتصلة بالمبادىء التي حل بشعبنا في منطقة الحكم الذاتي يؤمن بأن الناس والقيادة في بغداد، انما هم جزء منه،... اضافة الى ذلك ، لابد من استكمال بعض المستلزمات الأخرى مثل ضبط الحدود، والرحيل من الحدود بعمق عشرين كيلومتر، لكي لايحدث التسلل، وايجاد اجهزة لتقص الحقائق والمعلومات والنزاعات الشديدة، وابقاء جيش في المنطقة و توزيعه على شكل معسكرات معينة وشق الطرق...الخ)**

لەگەڵ بوونی یەك فەیلەق سەربازی پێکهاتوو لە(١٠) فرقە سەرباز لە پارێزگاکانی دهۆك و هەولێر و سلێمانی و کەرکوك و دابەشبونیان بەسەر ناوچە جیاجیاکاندا، هێشتا رژێمی عێراقی بۆ پتر کردنی سوپایەکەی لە کوردستان و حکومکردنی هێزە چەکدارەکەی ، ژمارەکەی دەگەیشتە ١١٠ هەزار سەرباز . جگە لە چەکدارەکانی پۆلیس و ئەمن و مخابەرات ، لە مانگی ١٩٧٧/٣دا، ئیسماعیل تایە ئەلنعێمی ، دەکرێ بە سەرۆکی ئەو فەیلەقە.

رژێم هەر لەگەڵ سەرهەڵدانی سەرەتای مەفرەزە چەکدارەکان ، کەوتە دانانی ئەم نەخشەو پلانانە.:

أ ـ دەستگرتن بەسەر سنورەکان  و قایم کردنیان.

ب ـ کردنەوەی رێگاوبان لە هەمو ناوچە کوردیەکان بە تایبەتی عاسیێ و شاخاویەکان.

ج ـ راکێشانی خەڵکی ناوچەکە بەلای رژێمدا.

د ـ راگوێزانی گوندەکانی سنور و دروستکردنی ئۆردوگای زۆرەملێ ، بە مەبەستی بێکارکردنی جوتیاران.

هـ ـ نەهێشتنی بێ کاری لەناو جوتیاراندا ، بەهۆی دۆزینەوەی کار بۆیان لە ناوەراست و خوارەوەی عیراق ،  کە دەبێتە هەنگاوی دووهەمی راگواستن.

ز ـ بەکارهێنانی هێزی کەم لەپانتایی زۆردا، واتە پێکهێنانی رەبایە لە ژمارەیەکی کەمی چەکدار و دابەشکردنیان بەسەر هەموو ناوچە دەشتی و پێ دەشتی و شاخاویەکاندا لە قوڵترین خاڵەوە تا سەر سنورەکان.

ح ـ کەمکردنەوە  یان  بچوککردنەوەی سەربازگەکان و زۆرکردنی هێزە ئەرکەکان.

گ ـ بەکارهێنانی  فرۆکەی کۆپتەری باری و جەنگی بۆ گوێزانەوەی هێز و لێدانی دەستەی  چەکداری  کوردی.

ی ـ دروستکردنی چاو  واتە (چڵکاوخۆر)ی ، خۆیان لە هەموو گوندێك و ناوچەیەکی سەر بە هەر رەبیەك بۆ دانی دەنگوباس  رۆژانە، پتر لە رێگەی موختارەکانەوە.

ك  ـ چاندنی (مین) لەسەر هەموو باریکە رێگاکان و کانیاوەکان و دەوروبەری رەبیەکان و سەرجەم  کێڵگەو باخ و دەشت و شاخاویە قەدەغەکراوەکان.

رژێمی عیراقی لە رووی سوپاییەوە ، خاوەن سوپایەکی یەجگار زۆر رووپۆشتە و تەیار بە چەك و تەقەمەنی و خاوەن ئەزموونی چەند ساڵەی شەڕی کورد بوو.

خاوەنی پتر لە ٢٠٠ کۆپتەر و ٤٥٠ فرۆکەی جەنگی بوو، خاوەنی پتر لە٢٠٠٠ تانك ١٠٠٠ تۆپی جۆرا و جۆر بوو.خاوەنی پتر لە٢٥٠٠ لۆری نەفەربەر بوو. خاوەنی دەیان دەستە و تاقمی چەکداری  خۆفرۆش  لە کۆنە پێشمەرگە و سەرپەل و  فەرماندەی هێزە  تەسلیمبووەکانی پاش ئاشبەتاڵ بوو ،  کە  زۆربەیان  پیاوی بەکار و ئازا و

لێـزان و لێهـاتو بـوون لـه شـهڕد او سـهر بـه پـارتی بـوون. ئـهم بـارودۆخی ڕژێمـی ئەوسای عیراقی بوو ، لە ڕووی باری خۆییەوە ، و لە ڕووی باری بابەتیشەوە:

١ـ شۆڕشـی کـورد بـەو قـەبارە گەورەیـەی نـەما بـوو ، سـەبارەت بـە تێـشکان و ئاشبەتاڵی سەرکردایەتی پارتی و بارزانی پاش ڕێکەوتنی جەزائیر ، ئەمەش کەش و هەوایەکی هێمن و ئـارامی بـۆ ڕژێمـی عیراقـی ڕەخـساند بـوو ، بـۆ بیرکردنـەوە و پرژانە سەر جێبەجێکردنی نەخشەکانیان.

٢ـ پەیوەندی ڕژێمی عیراقی لەگەڵ دەر و دراوسێکانیدا (جگە لە سوریا) بـاش ببـوو ، هیچ ئاڵۆزی و سەرئێشەکیان بۆ دروست نەدەکرد، بەتایبەت لەگەڵ ئێران و تورکیا.

٣ـ پەیوەنـدی لەگـەڵ هـەردوو بـەرەی شـەڕی سـارد، واتـە سـۆڤیەت و ئـەمریکا و هاوپەیمانەکانیان باش بوو.

لە ڕووی باری ئابوری و توانای داراییەوە.

لە پاش ئاشبەتاڵ ڕژێمی عیراقی ڕێژەی هـەڵێنجانی نـەوتی پـتر کـرد، داهـاتی نـەوت گەیشتە دە بەرامبـەری سـاڵی ١٩٧٠، خـەرجی ڕۆژانـەی شـەڕی کـوردیش بـەهۆی ئاشـبەتاڵەوە نـەما . بۆیـە ڕژێـم کەوتـە تـەرخانکردنی (٥/١)ی داهـاتی نـەوت بـۆ خۆپڕچەککردن و بەهێزکردنی سوپاکەی ، لـە ڕووی چـەندایەتی و چۆنایەتیـشەوە و خۆقایمکردنی لە سەرتاسەری کوردستاندا.

## بارودۆخی کوردستان لە دەستپێکردنی شۆڕشی نوێدا.

**بارودۆخی کوردستان پاش ئاشبەتاڵ، دەتوانرێ لە دوو ڕووەوە ئاماژەی بۆ بکرێ.**

١ـ باری خۆیی.

٢ـ باری بابەتی

هەر یەك لەم دووانە لە ماوەیەکی زۆر کەم و بە پەلەش ، گەر بـە پێـودانگی ئـەو دەم هەڵبسەنگێندرێ ، لـە ڕووی سیاسـی و ئـابوری و چـەکداری و سـایکۆلۆژییەوە چـەند گۆڕانی گەورەیان بەسەر داهاتووە:

**ا ـ باری خۆیی:**

أ ـ سەبارەت بە ئاشبەتاڵ و نەمانی پارتی وەك حزبێکی سیاسی کوردی لە مەیدانەکەدا.

ب ـ تازە لە دایکبوونی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و بزوتنەوەی سوشیالیستی دیموکراتی کوردستان و ئاشکرا نەبوونی کۆمەڵە لە ناو جەماوەر و لە مەیدانی خەباتی چەکداریدا تا ئەو کاتە.

ج ـ هاوپەیمانی حزبی شیوعی عیراقی لەگەڵ بەعسیەکان لە بەرەیەکدا.

د ـ پەرش و بڵاوبوونی هێزی چەکدار پاش ئاشبەتاڵ و تەسلیمکردنەوەی پتر لە (١٥٠,٠٠٠) سەد و پەنجا هەزار چەك بە رژێمی بەعس، واتە نەبوونی هێزی چەکداری پۆشتە.

ئەمانە هەموی گەر بەراورد بکرێ لەگەڵ رژێمی عیراقی ، واتە پارتی بەعس و بەرەی یەکگرتوویان لەگەڵ حزبی شیوعی و چەند پارتێکی کارتۆنی تری کورد و سوپایەکی چەند سەد هەزاری پڕ لە چەك و تفاقی جەنگی، ئەوە دەگەیەنێ کە باری خۆی ئەوسا بۆ هەڵگیرساندنی شۆرشێکی چەکداری رزگاری نیشتمانی بە هیچ جۆرێك لەبار نەبوو. گەر ووردتر بکەوینە لێکۆڵینەوە لەسەر سێکوچکەکەی پێویست لە بارەی باری خۆیی. پارتی پێشرە و، بەرەی یەکگرتووی گەل، هێزی چەکداری شۆرش، یان شۆرشی چەکداری، ئەوە دەبێ باس لە یەکە یەکەیان بکەین.

## پارتی پێشڕەو.

لەپێشدا ئەوەمان روونکردەوە ، کە نەك هەر پارتێکی پێشڕەو لە کوردستاندا نەبووە ، بەڵکو هەموو ئەو پارت و رێکخراوە سیاسیانەی ، کە لەپێش ئاشبەتاڵ (جگە لە پارتی) و پاش ئاشبەتاڵیش بە پارتیشەوە ، نەك هەر هیچ مەرجێکی پارتی پێشڕەویان تێدا نەبوو ، بەڵکو مەرجەکانی پارتێکی سیاسیشیان تێدا نەبوو .

### أ ـ قیادەی موەقتە.

پارتی دیموکراتی کوردستان (قیادە موەقتە)، سەبارەت بە ئاشبەتاڵ کردنی پارتی و بارزانی ، ئەمانە لەناو هێزە سیاسیەکاندا سوك ببوون و ناویان بە خراپ زڕا بوو ، نەك هەر توانای رابەری کردن و راپەڕاندنی شۆڕشیان نەبوو ، بەڵکو لەوکاتەدا هەموو توانایەکی خۆیان تەرخان کردبوو، بۆ سەر هەڵنەدانەوەی شۆڕش، ئەمانە لەپاش ئاشبەتاڵ دروشمی ( گەر شۆڕشمان پێ نەکرێ ، شۆڕشمان پێ تێکدەرێ)*یان هەڵگرتبوو. بنەماڵەی بارزانی ئەرکەکانیان وا دابەش کردبوو ، کە بتوانن کاریگەریەکی زۆریان لەسەر دروستکردنی کۆسپ لەبەردەم هەڵگیرساندنەوەی شۆڕشدا هەبێ.

هەر لە سەرەتاوە دژی شۆڕش و یەکێتیی جوڵانەوە، جەوهەر نامیق و کەریم سنجاریان دانا بوو ، بۆ کارکردن لەناو ئیل و عەشیرەتەکانی کوردی سەر سنور و لەناو تورکیادا ، بۆ هاندانیان دژی یەکێتیی و بڵاوکردنەوەی پروپاگەندەی ئاراستەکراو. گوایە" یەکێتیی جاشی حکومەتی عیراقە و لە سوریاوە چەك و خەڵك دەنێرێتەوە کوردستان بۆ دژایەتیکردنی پارتی تا ئەتوانن شۆڕش هەڵگیرسێننەوە". کە بە ئاگاداری و چاوپۆشی حکومەتی تورکی ئەو پەیوەندیەیان دەکرد.

ئیدریس بارزانی لەشاری "کەرەج"ەوە ، بە ئاگاداری ساواکی ئێرانی و رژێمی شاە کەوتە ناردنەوەی چەند دەستەیەکی چەکدار و چەند لێپرسراوێکی خۆیان بۆ ناو کوردستانی خواروو، وەك شێخ عەزیزی شەدەڵە، شێرکۆ شێخ عەلی سەرگەلۆیی ، کەمال کەرکوکی، قالە هەورامی، عەبدوڵلا ی برای فەتاح ئاغا، بۆ چوونە ناوچەکانی خۆیان و هەوڵدان بۆ هەڵگێڕانەوەی مەفرەزەکانی یەکێتیی لەو ناوچانەدا.

---

* ئەم گوتەی(ئیدریس) بووە، کە چەندجار بە هەواڵ بۆ مام جەلالی ناردووە ، لەکەناری دانوبەوە ـ نەوشێروان مستەفا لا( ٩٤٠).

هێنانە دەرەوەی کەسانی سەربەخۆیان لە شارەکانی کوردستان، بۆ ناوچەکانی یەکێتیی و دروستکردنی دەستەی چەکدار بۆیان، بە مەبەستی فشار خستنە سەر خەڵکی دێهاتەکان و روتاندنەوەیان و ئازاردانی خەڵکی بەناوی پێشمەرگە و لەژێر بەرگی پێشمەرگەدا بۆ سوککردنی ناوی یەکێتیی و شۆرش و پاشان تەسلیم بوونەوە بە حکومەت بۆ روخاندنی وورەی خەڵکی، بۆ نمونە،

عبدولمەلیك عەلی عوسمان، سالە خەیات، تەحسین شاوێس، حەمە مۆریاسی، هەباسی بایزی باویل ئاغا،... هتد.

راسپاردەی کادرە عەسکەریەکانیان کە لە ئاشبەتاڵدا تەسلیم بە رژێمی بەعس بووبوونەوە ، بۆ پێکهێنانی مەفرەزەی تایبەتی سەر بە ئیستخباراتی عەسکەری عیراقی بۆ راوی پێشمەرگەکانی سەر بە یەکێتیی ، وەك قالە فەرەج و چەندانی تر.

## ب ـ یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان.

ئەمانیش سەرەرای ناکۆکیان لەگەڵ قیادە موەقتەدا، لەناوخۆشیاندا لەگەڵ یەك ناتەواو بوون ، یەکێتیی لە سێ لایەن، سێ باڵ، سێ رێکخراوی جیا لە یەکتری لە هەموو روویەکەوە پێك هاتبوو.

(کۆمەڵە، بزوتنەوە، هێڵی گشتی) سێ رێکخراو، سێ ناوەندی بریار، سێ سەرکردایەتی ، سێ جۆر پرەنسیپ و کاری رێکخراوەیی، تەنانەت سێ جۆری پێشمەرگە و کادری سیاسی و پێشمەرگایەتی.

ئەو جۆرە پێکهاتەیەی یەکێتیی لەسەرەتاوە تارسکانی بە تەواوی و دەتوانم بڵێم تا کۆنگرەی یەکی یەکێتییش کەند و کۆسپێکی زۆری خستبووە بەردەم تەقەلای پاك و پوختەکردن و بژارکردنی هەم رێکخستنەکانی یەکێتیی و هەم هێزە چەکدارەکەشی .لایەك یا باڵێك دەیەویست هێزێکی چەکداری بە چۆنایەتی باش لە چین و توێژەکانی رەنجدەران پێکبێنی و بیکاتە ناوکی سوپایەکی رزگاری گەلی.

لایەکی تر دەیەویست بێ گوێدانە چۆنایەتی، لە کەمترین کاتدا گەورەترین هێزی چەکدار لە هەموو چین و توێژەکان پێکبێنێ و بیکاتە ئامێرێکی فشار بۆ سەر رژێم بۆ گفتوگۆ کردن.

لایەك دروشمی رزگاری کوردستان و مافی چارەنوس و هەڵگیرساندنی شۆرشی دیموکراسی عیراقی هەلایساو لە کوردستانەوەی بەرز دەکردەوە و هەر لە هەمانکاتدا ، لایەکی تر دروشمی خەبات لەپێناوی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان لە چوارچێوەی عیراقدا بەرزکردەوە.

سەبارەت بەوەی ، کە ئەندامانی سەرکردایەتی باڵەکان ، لە سەرەتاوە خۆیان بە ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتیش دەزانی، هەر یەکێك لەوانە خۆی بە بەرپرسی هەموو پێشمەرگەکان و جەماوەر و رێکخستنەکانی یەکێتیی دەزانی لەهەر ناوچەیەك بوایە.

ئەگەر چی لە سەرکردایەتی یەکێتییدا ژمارەیەکی زۆرکەم کەسانی لێهاتوو و قالبوی کاری رابەری و فەرماندەیی بۆتەی خەباتی چەندین ساڵەی شۆرشی ئەیلول و ناو پارتی بوون، بەڵام لەهەر سێ باڵەکە ژمارەیەکی زۆر لە ئەندامانی سەرکردایەتیان سەرەتای کاری رابەری و ئەو بەرپرسیاریە مێژووییە بوون و تازە پێگەیشتوو و لە ئاستی بەرێوەبردنی کەرتێ پێشمەرگەشدا نەبوون . بەڵام (هەوی ساری) دەبوایە لە دەستەیەك پێشمەرگەوە لە شانەیەکی یەکێتیی تا سەرکردایەتی سێ بەگایی بوایە.

لەمانەش خراپتر دووبەرەکی و ناکۆکی ناوەکی ، ناو هەریەك لە باڵەکانی ناو یەکێتیی ناکۆکی نێوان هێڵی عراقچێتی ناو کۆمەڵە و کوردستانی ناو کۆمەڵە . ناکۆکی نێوان هێڵی لایەنگری سەربەخۆیی ناو بزوتنەوەو هێڵی مانەوە و کارکردن لەگەڵ یەکێتیی لەناو بزوتنەوەدا. ئەمانە بە کورتی بارودۆخی دەروونی رێکخراوەیی باڵەکانی یەکێتیی و ناو یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان خۆشی بوو ، کە تەنیا مەرجێکی پارتێکی پێشرەویش تیا بەدی نەدەکرا.

سەبارەت بە بەرەی یەکگرتووی گەلیش، لەگەڵ دروستبوونی دەستە چەکدارە سەرەتاییەکانی شۆڕشی نوێ و بڵاوبونەوەی دەنگی هەڵگیرساندنەوەی شۆڕشی نوێ بە ناوی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە ، یەکسەر برینە قوڵەکەی ساڵانی ١٩٦٤ـ ١٩٧٠ی شەڕی براکوژی و خۆکوژی ، قەتماغەکەی هەڵدرایەوە و کەوتەوە ژان و سۆی ، کۆمەڵێك کەڵەپیاوی تێکۆشەر و شۆڕشگێر و دڵسۆز و نیشتمانپەروەری کورد بوونەوە سوتەمەنی ئەو دوژمنایەتیە کۆنە و قوربانی ئەو شەڕە بە کۆنە قین کردنە. حسابە کۆنەکان وەك دەفتەری کۆنی بازرگانی بۆ قەرزی کۆن گەڕان و لاپەڕە هەڵدرانەوە لێهات . پاش نزیکەی ساڵ و نیوێك سرپبوون لەقەبێکی شەرمەزاری ئاشبەتاڵ، لە خەوی بێ دەسەڵاتی و بودەڵەی بە نێزەی سیا و قینی راپەڕین ، یەکەم دەستە گوڵیان بە لێدانی ٣٧ پێشمەرگەی قارەمانی تازە نەفەسی بادینی بە لێپرسراوی (ئیبراهیم عەزۆ) لە مانگی ١٩٧٦/٦ دا شەهید کردنیان بوو . واتە نەك هەر مەرجی پێکهاتنی بەرەیەکی لە ئارادا نەبوو، بەڵکو بەرە کرابووە قوربانی کۆنەقین و ئارەزووە تاکیەکان.

**٢ـ لە رووی بابەتیەوە.**

**دەکرێ باری بابەتی ئەوسای کوردستانی پاش ئاشبەتاڵ لە چەند روویەکەوە تاوتوێ بکرێ:**

**١ـ باری سایکۆلۆژی و رادەی بێ هیوای خەڵك** : ئاشبەتاڵ لە سەرەتاوە وورەی خەڵکی رووخاند بوو، پێیان وابوو ، شۆڕشێکی ١٤ ساڵ تەمەن و خاوەن ٢٠٠ دووسەد هەزار چەکدار و چەك ، ئاوا بە ئاسانی بە بریارێکی جەزائیر بڕووخێ و هەرەس بێنێ و پارتێکی ٣٠ ساڵ تەمەن ئاشبەتاڵ بکا ، زۆر ستەمە جارێکی تر سەرهەڵداتەوە.

**٢ـ نەبوونی چەك و نەمانی چەك بە دەستی خەڵكی كوردستانەوە :** بەهۆی ئەو چەكچنەی كە رژێم پاش ئاشبەتاڵ كردی ، پتر لە ١٥٠ سەدو پەنجا هەزار چەكی لە كوردستان كۆكردەوە ، یەكێك بوو ، لە گرفتە گەورەكانی بەردەم سەرهەڵدانەوەی شۆرشێكی نوێ.

**٣ـ بێ توانایی و كزی باری دەرامەتی بەرێوەبردنی شۆرشی نوێ :** خەڵكی رایان وابوو ، كە شۆرشی ئەیلول ، كە خاوەنی پتر لە ٢٠٠ دوو سەد ملیۆن دینار بوو ، هەرەسی هێنا و خۆی لە بەرامبەر رێكەوتنێكی نێوان ئێران و عیراق لەسەر پێ رانەرگرت . چۆن سەركردایەتیەكی نوێی شۆرشێكی نوێ بە گیرفانی بە تاڵەوە شۆرشی پێ دەكرێ؟.

**٤ـ باری نالەباری هەڵكەوتی كوردستان :** تەنیا لایەنێك ، كە بە ئاشكرا دەرگای سنوری خۆی بە رووی شۆرشی ئەیلولدا كرد بۆوە، ئێران بوو، توركیاش بە دزی و لە ژێرەوە لەگەڵ بارزانی رێكبوو ، و دژایەتی نەدەكرد.
بەڵام پاش هەرەس هەموو دەرگاكان داخران، سنورەكان لەلایەن هەر سێ لاوە ئێران، توركیا، عیراق قایم كران، رێگاو دەرگای پەیوەندی ناوەوە بە دەرەوەو بە پێچەوانەوە، لە سەرەتاوە تەنیا لە رێگەی تاكە كەس سەفەركەرەوە بوو، پاشان هەوڵی ناردنەوەی دەستەی پێشمەرگە لە سوریاوە بەچەكەوە.
شۆرشی نوێ نەك هەر لەلایەن داگیركەرانی ئێرانی و توركی و عیراقیەوە سنورەكانی لێ داخراو بوو ، بەڵكو كەوتبووە بەردەم پلانی هێزی ناوخۆش بۆ تێكدانی ، كە قیادە موەقتە بوو.

**٥ـ باری ژیان و دەرامەتی خەڵكی لە كوردستاندا :** زۆرجار تێكچوونی باری ئابوری وڵاتێك و تەنگوچەڵەمە ئابوریەكانی رێگرن لە بەردەم فەراهەم كردنی كار بۆ بێكاران و دانی موچە و دابین كردنی خانوبەرە و بەرزكردنەوەی ئاستی ژیانی خەڵكی و كەم

کردنەوەی بێکاری، دەبێتە هۆی تەقینەوەی ناکۆکی نێوان جەماوەر و دەوڵەتەکە، دەبێتە زەمینەسازکەری بەرپابوونی نارەزایی و پاشان خۆپیشاندان و مانگرتن و دواجار راپەڕین یا شۆڕش بەرپاکردن.

بەڵام سەبارەت بە داهاتی زۆر و زەبەندی نەوت و پترکردنی هەڵهێنجانی نەوت و نەمانی خەرجی شەڕی رژێم و کورد، ئەمانە کارێکی وایکرد ، کە رژێم هەم کار و هەم موچە و هەم خانوبەرەش دابین بکات و ئاستی ژیانی خەڵکی لە کرێکارەوە تا سەرباز و موچەخۆر و فەرمانبەر چەند قات لە چاو ساڵانی پێش ئاشبەتاڵ بەرز کاتەوە.

واتە گەر بە پێودانگی ناکۆکی سەرەکی نێوان داگیرکەر و داگیرکراو، نێوان کار و سەرمایە ، نێوان هێزی بەرهەمهێنان و پەیوەندیەکانی بەرهەمهێنان ، باری ئەوسای کوردستان هەڵسەنگێنین ، لەم رووەشەوە زەمینەی باری بابەتی لەبار نەبوو ، بۆ هەڵگیرساندنی شۆڕشی نوێ.

گەر بە کێش و تەرازوی باری خۆیی و ئەوسای عیراق و کوردستان لە رووە باوەکەیەوە ، باری لەبار و رەخساو یا نەرخساوی شۆڕشی نوێ لێکبدرێتەوە یا لێک نەدرێتەوە، دەبوایە شۆڕش بەرپانەکرایە.

ئەی ئەو کارانە چی بوون ؟ کە راستەوخۆ کاریان کردە سەر جەماوەری کوردستان یان شۆڕشگێڕەکانی کورد بۆ هەڵگیرساندنەوەی شۆڕش.

### ١ـ لە رووی سیاسیەوە.

گەلی کورد لەهەر پارچەیەکی کوردستاندا، بە شێوەیەکی بابەتی لە رووی سیاسیەوە خاوەنی کێشەیەکی رەوا و دیموکراسیانەی خۆیەتی ، ئەویش مافی چارەی خۆنوسین، ئەم کێشە قوڵ و لە مێژینە و مێژووکردەی گەلی کورد، و مانەوەی بە چارەسەر نەکراوی، وای لێ کردووە ، کە کورد ئەو مافە بە خۆی بدا ، بە هەموو جۆر

و شێوە کار بکات بۆ بەدەست هێنانی. بۆ بە دەستهێنانی، گرتنەبەری هەموو ڕێبازێکیش بە حەلالی بزانی لە مانگرتنەوە تا شۆڕشی چەکداری، لەپشت بەخۆ بەستنەوە تا پەنابردنە بەر وڵاتانی بێگانە و تەنانەت هەندێجار بۆ داگیرکەری بەشێکی کوردستانیش.

**٢ـ لە ڕووی نەتەوایەتیەوە.**

گەرچی هەر لە هاتنە سەر حوکمی بەعسیەکانەوە لە ١٩٦٨دا تاوەکو ئاشبەتاڵ ، ڕژێمی بەعس بە پلانی ستراتیژی خۆیان بەرامبەر گەلی کورد ، وا دارشتبوو ، کە بوونی نەتەوەیی و خەسڵەتەکانی نەتەوەیی و کلتور و شارستانیەت و تەنانەت جوگرافیای کوردیش بە جۆرێك بشوێنن ، کە مەترسی بخاتە تەواوی ، بوونی نەتەوایەتی.

بەلام هەر پاش پیلانەکەی جەزائیر و ئاشبەتاڵی سەرانی پارتی و بارزانی، ڕژێمی بەعس بە ئاسانی دەستیان واڵا بوو ، بۆ دەستپێکردنەوەی پلانەکەیان، بە ڕاگواستنی گوند و شارۆچکەکانی کورد . سەرەتا لەسەر سنورەکان و پاشان بە قولایی ٢٠٠ کیلومەتر و دواتر زیاتر لەو قولاییە. دیسان ڕاگواستنی کوردەکان لە زێدی خۆیان لە ناوچە نەوتیەکان و نزیکە نەوتیەکان وەك " کەرکوك، خانەقین، موسل، دووز " کە دواتر بە درێژایی سنوری سروشتی نێوان کوردستان و عیراقی عەرەبی تا پەنای " زاخۆ، دهۆك، مەخمور، پردێ، چەمچەماڵ، کفری "ڕاگوێزران و عەرەب نشینکران.

ئەم خەسڵەتە تایبەتیەی کوردستان ، هۆیەکی زۆر سەرەکی پەلەکردنی سیاسیانی کورد و شۆشگێڕانی کورد بوو ، لە هەڵگیرساندنەوەی شۆڕش و پەلەکردن لەبەر پێ گرتنی ئەو سیاسەتە شۆفێنیانەی بەعسیەکان.

**٢- لە رووی دەروونی ( سایکۆلۆژی ) یەوە:**

جگە لەوەی هەرەسی شۆڕشی ئەیلول و ئاشبەتالّی پارتی و بارزانی ، نا ئومێدیـەکی یەجگار زۆری لە دلّی خەلّکی کوردستاندا دروستکرد، بەرامبەر بە شۆڕشی کورد و سەرهەلّدانەوەی و سەرکەوتنی ، بەلاّم ترس و لەرزێکی زۆریش لە دەروونی خەلّکیدا تۆو کرد. سەبارەت بە چارەنووسی نادیاریان لە بەردەم گورگی بەعسیەکاندا.

کورد، دوژمنەکەی باش دەناسی و دەیزانی ، گەر دەستی والاّ بێ ، چ درندەیەکی داخ لە دلّ و زەبروەشێنە. دەشیزانی کە لە بەردەم سێکوچکەی راگواستن و بەعەرەبکردن و بە بەعسیکردندایە.

شالاّوی بەردەوامی دەزگا سەرکوتکەرەکانی رژێم بۆ سەر کەسە سیاسیەکان و گرتنیان و لە زیندان هاویشتینان، قۆلّ بەستکردنی کەسایەتیە ناسراوەکانی شۆڕشی ئەیلول و دوورخستنەوەیان لە کوردستان و چاودێری کردنیان، هەرەشەو گورەشەی پیاوانی رژێم لە دانیشتوان و شەڕ پێ فرۆشتنیان، ئەمانەو گەلێ هۆی سایکۆلۆژی تر ، لەگەلّ ترس و لەرزدا تۆوی رق و کینەو تۆلّەش لە دەروونـدا رواندبوون، و بۆ هەلّێك دەگەران بیقۆزنەوە و چلّە پوشێك دەستی پێوە بگرن. ئەمەش هۆیەکی تری تایبەت بە کوردبوو ، بۆ هەلگیرساندنەوەی بە ناکاملی شۆڕشی نوێ.

## گوندی هاوچەرخ یا ئۆردوگای زۆرەملێ

## پاراستنی ئاسایش نەتەوەیی عێراق یا "راگواستنی کوردو کاولکردنی کوردستان"

یەکێك لە بنەما ستراتیژیەکانی بیروبۆچوون و ئایدیای سیاسی و بنچینەیی رێکخراوەیی بەعس . وەك خەسڵەتێکی سیاسی و فکری پارتی بۆرژوای دەسەڵات بەدەست و شۆڤینی نەتەوەپەرست، بریتی بووە لە شێواندنی چوارچێوە و قەبارەی نەتەوەیی کورد و سروشتی خاکی کوردستان.

بۆ جێبەجێکردن و بە ئەنجام گەیاندنی ئەو ستراتیژەش ، هەر لە ساڵی ۱۹٦۳و ۱۹٦۸ رێچکەی راگواستن و بەعەرەبکردن و بەبەعسکردنی کوردیان گرتەبەر. سێکوچکەی (راگواستن و بەعەرەبکردن و بە بەعس کردنی) کورد بوو، بە خەسڵەتێکی جیانەبووەنەوە ودوا نەهاتوی بەعسیەکان و بنەمایەکی سەرەکی کاریان.

هەر لە ساڵی ۱۹٦۳وە ، رەگەزپەرستە بەعسیەکان کە بۆ ماوەی تەنیا نزیکەی (۸) مانگ و بۆ یەکەمجار دەسەڵات و حوکمیان لە عیراقدا گرتەدەست، بە کۆمەڵێك بیانووی نا بەجێ کەوتنە جێبەجێکردنی نەخشە ستراتیژیەکەیان لە ناوچە نەوتیەکانی کوردستان (کەرکوك، خانەقین) . بەناوی پاراستنی ئاسایشی کەرکوك و بیرە نەوتەکانی و خانەقین و بیرە نەوتەکانی . سەرەتا دەستیان کرد بە کاولکردنی دەیان گوندی دەروبەری کەرکوك و خانەقین و راگواستنی دانیشتوانەکانیان .

پاش دوو- سێ مانگ دەستیان کرد ،بە پاکتاوی نەژادی کورد لەناو شاری کەرکوك و خانەقین و چەندین گەرەکی کوردیان کاولکرد ، بە بیانووی(تجاوزی بلدیە).لە هەمانکاتدا گەرەکی نوێ عەرەبنشینیان لە شوێنەکانیدا دروستکرد و ناوی عەرەبیان لێنان . رەگەزپەرستە بەعسیەکان لە نەخشەکانیاندا هەر بە کوردەوە، نەوەستان، بە تایبەتی لە ساڵی ۱۹٦۸دا ، کە بۆ دووهەمجار حوکمیان گرتەدەست، بەڵکە ئەلقەی نەخشەکەیان تورکمان و ئاشوریەکانیشی گرتەوە.

سالّی ١٩٦٨ به ئەزمونێکی نوێ و شارەزاییەکی پترەوە لە سیاسەت و حکومرانی کردندا، بەعسیە رەگەزپەرستەکان کەوتنە راگواستنی کوردە فەیلیەکان لەناو شاری بەغدا و کوردەکانی شارەکانی " خانەقین، شەنگار ، تەلەعفەر، زممار"، پاشان جێبەجێکردنی نەخشەی نەهێشتنی شوێنەواری کورد لە شاری کەرکوکدا.

لەگەڵ رێکوتنەکەی نێوان بەعسیەکان و پارتی دیموکراتی کوردستان "باڵی جەلالی" لە ١٩٦٨ تا ١٩٧٠و لە رێکەوتنی ئاداری ساڵی ١٩٧٠ وە ، تا ئاشبەتاڵی ساڵی ١٩٧٥ ، بەعسیەکان دەسهەڵگر و دەستبەرداری بە عەربکردنی کەرکوك و خانەقین و ئەو شار و شارۆچکانەی تر نەبوون . دەستبەرداری راگواستنی فەیلیەکان و داگیرکردنی موڵك وماڵیان نەبوون، دەستبەرداری دەرکردنی تورکمانەکان لە کەرکوك و سڕینەوەی شوێنەواریان نەبوون.

لە گەرمەی باشی پەیوەندی نێوان بەعسیەکان و جەلالی لە ساڵی ١٩٦٨دا، بەعسیەکان ویستیان گەرەکی ئیمام قاسم لە کەرکوك "تعریب "کەن ، کە ئەو کاتە شەهید عەلی عەسکەری لێپرسراوی کەرکوك بوو ، گەر جەربەزەیی و راپەڕینی عەلی عەسکەری نەبوایە ،بەعسیەکان هەر ئەوکات، ئەو گەرەکە تەعریب دەکرا و نەدەمایەوە تا ساڵی ١٩٧٦ تەعریب بکرێ.

لە دوای ئاشبەتاڵی پارتی بە شۆرش و هەرەسی شۆرشی ئەیلولیش لە ساڵی ١٩٧٥ بەدواوە، ئیتر بەعسیە فاشستە رەگەزپەرستەکان هەلێکی لەبار و زەمینەیەکی باشیان بۆ رەخسا بۆ جێبەجێکردنی هەرچی زووتری پلان و نەخشە بەعسیانەیان ، سەبارەت بە گۆڕینی روخسار و خەسڵەتی نەتەوەیی خاکی کوردستان و سیمای نەتەوەیی کوردیش لەناوچە جیاجیاکانی کوردستاندا.

ئەم جارەیان، واتە لەساڵی ١٩٧٥ دوای ئاشبەتاڵ، بەناوی پاراستنی ئاسایشی نەتەوەییەوە کە سەدام حسێن لە ووتاری (خندق ام خندقان) دا، بە راشکاوی باسی کرد (باسی پێویستی دروستکردنی پشتێنیەیەکی ئاسایشی نەتەوەیی لەسەر

سنوری نێوان عیراق– تورکیا، عیراق – ئێران، عیراق – سوریا) کرد و رای گەیاند ، کە دەبێ بە قووڵایی ١٥ـ ٢٠ کیلومەتر لە سنورەکانەوە ،لە گوند و خەڵك و زیندەور و چۆڵ کرێ. بۆیە لە ١٩٧٥ وە تا کۆتایی ساڵی ١٩٧٧ سەرتاسەری سنوری عیراق تا سوریا بە قوڵایی ٢٠ کیلومەتر چۆڵ کران. زۆربەی گوند و شوێنەکان کاولکران و گوندنشینەکانیان راگواست و زۆربەی هەرە زۆری ناوچە سنوریەکانی نێوان عیراق – ئێرانیشیان بەو جۆرە راگواست و زۆربەی هەرە زۆری ناوچە سنوریەکانی نێوان عیراق – تورکیاشیان راگواست.

لە سەرەتاوە لەگەڵ سوتاندن و کاولکردنی گوندەکان و چۆڵکردن و راگواستنی دانیشتوانی ، رێگەیان دەدا ، کە راگوێزراوان بە ئارەزووی خۆیان ،بەرەو قوڵایی بۆ شار و شارۆچکە و گوندەکانی تر برۆن . بەڵام پاش دراسەیەکی فاشیانە و فرانکۆیانە، بریاریاندا راگوێزراوانی چەند گوندێك لەیەك گوندی گەورەی دروستکراوی ژێر دەسەڵاتی سەربازی و حوکمی فاشیانەی خۆیاندا کۆکەنەوە ، تا لە هەموو کاتێکدا بتوانن کۆنترۆڵی تەواوی راگوێزراوان بکەن.

بۆیە هەر لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٦وە ،کەوتنە جێبەجێکردنی پلانی دروستکردنی ئۆردوگای زۆرەملێ لە ژێر ناوی (القری العصریه)؟ لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٨دا ، زۆر بەفراوانی دەستیان دایە راگوێزانی زۆربەی گوند و شار و شارۆچکەکانی کوردستان لە سنورەکانی عیراق– تورکیا– سوریا– ئێرانەوە تا قوڵایی ٢٠ کیلو مەتر و لە هەندێ ناوچە تا ٢٥ ـ ٣٠ کیلومەتر ، لەگەڵ دروستکردنی دەیان ئۆردوگای زۆرەملێ (القری العصریه) . ئەم هەنگاوەش پاش راگەیاندنێکی سەدام حسێن بە راشکاوی لە ١٩٧٨/٧/١٨دا ، لە کۆنگرەیەکی رۆژنامەوانیدا سەبارەت بە راگواستنی کوردەکان رایگەیاند.

سەدام ئەمجارەیان هۆی راگوێزانی کوردی نەگێرایەوە ، بۆ دروستکردنی پشتینەی ئاسایشی سنور و پاراستنی ئاسایشی نەتەوەیی، بەڵکو ئەمجارەیان بە بەرگێکی "

زۆر شارستانیانه" پلانەکەی خستەڕوو . ئەمجارە سەدام ووتی: (هەندێجار گوێتان لە هەواڵی راگواستنی کوردەکان دەبێ...؟!. بەلام با بزانی راستی راگواستنی کوردەکان چۆنە؟!.. کاتێ کە دەچینە ئەوێ ، ناوچە کوردیەکان خۆمان دەیانبینین.. بەلام ئەوەی من لێرەدا دەمەوێ پێتان بڵێم : ئەو هێڵە سنوریەی نێوان عیراق ـ ئێران ـ تورکیا ـ عیراقە.. کە بریاردراوە راگوێزرێن، ئەو گوندانەی کە بە راستی لەگوند ناچن ،بەڵکو بە زۆری پێکهاتوون لە چەند خانوویەکی دوور لە هەموو شێوەیەکی پێشکەوتن و شارستانیەتەوە . هەرگیز لە توانای دەوڵەتدا نیە شارستانیەت بگەیەنێنە ئەو جۆرە شوێنانە و هیچ خزمەتگوزاریەکی کۆمەلایەتی و ئابوریان بۆ دابین بکا؟!).

بۆیە بریاردرا کە هەموو ئەوانەی لەسەر هێڵی سنورەوە نزیکن ، بە قولایی ١٠ـ ٢٠ کیلۆمەتر . واتە مەبەست لە سنوری نێوان عیراق – ئێران و عیراق– تورکیایە رابگوێزرێن بۆ قولایی ، بۆ ناو ئەو گوندە هاوچەرخانەییانەی ، کە هەموو پێداویستیەکی خزمەتگوزاری سەرەکیان تێدایە. بە جۆرێك تەنانەت تا ئێستاش لە زۆربەی گوندەکانی دەوربەری بەغداشدا نیە و بگرە ئەو پێداویستیە خزمەتگوزاریانەی کە لەو گوندە هاوچەرخانەدا هەیە لە زۆر شاری تری عیراقیشدا نیە؟!.. ئەوەیە راگواستن.. و لە سەریش دەنوسی راگوێزان.. کوردەکانیان راگواست.)

کاتێ کە سپی پێستە ئەوروپاییە سەرمایەدارە چاوچنۆکەکان ، دەیان ویست ناوچەیەکی وڵاتێکی ئەفریقی یا ئەمەریکای لاتینی یا ئاسیا داگیر بکەن و خێر و بێر و سامانەکەی تالانکەن و نەتەوەکانی ژێر دەستکەن، خۆیان دەکردە پەیامبەری شارستانیەتی و لەش ساغ و پێشکەوتن و ئاوادەنکەری ، بەو ناوە و لەژێر ئەو پەردانەدا ، دەیان ساڵ دەیان وڵاتی ئەفریقایی و ئاسیایی و ئەمەریکای لاتینیان داگیرکرد و لەهەندێ شوێندا سیمای نەتەوەیشییان گۆڕین.

سەدام و بەعسیە رەگەزپەرستە فاشیەکانیش ، ئەمجارە بە ناوی پێشخستنی کوردستان و هاوچەرخکردنی گوندەکانی ،بەو ناوە کەوتنە تەقەلای گۆڕینی سیمای نەتەوەیی کورد و شارستانیەتی کوردستان.

لێرەدا جێگای وەبیرهێنانەوەیە کە یەکێك لە کێشە فکریەکانی سەرەتای ساڵی ۱۹۷٦ لە نێوان کۆمیتەی شارەکانی کۆمەڵە و کۆمیتەی هەرێمەکاندا ، ئەو دروشمە بریقەدارە و نا بەجێیەی کۆمیتەی هەرێمەکان بوو، لەمەر چارەسەری کشتوکاڵی (أصلاح الزراعی) بوو، کە لەبەیانەکەی شوباتی ۱۹۷٦یاندا بەرزیان کرد بۆوە.

کۆمیتەی شارەکان پێیان وابوو، کە گەر لە هەر جوتیار و وەرزێرکی گوندنشینی کورد بپرسیایە (دەتەوێ لە گوندەکەی خۆت بمێنێتەوە و رانەگوێزرێت، یان دەتەوێ لە رێگەی زەوی پێدانەوە لە گوند و زێدی باپیرانت دووربخرێیتەوە؟) .بێگومان مانەوەی لەسەر زەوی و زار و گوندی خۆی و ناو دۆڵ و رەقەن و بەردەلانی پەسەند دەکرد . نەك دابەشکردنی زەوی بەسەریاندا و لە ناوەراست و خوارووی عیراقدا.

بۆیە کۆمیتەی شارەکان بەرزکردنەوەی دروشمی دژە راگواستن و بەعەرەبکردن و بە بەعسکردنی پێ راستتر و بەجێ تر بوو، وەك لە (أصلاح الزراعی).

بەعسیە فاشیە رەگەزپەرستەکان ، کە بریاری دروستکردنی پشتینەی ئاسایشی سنوری نێوان عیراق ـ ئێرانیاندا؟!. مەبەستیان تەنیا ئابلۆقەدانی کوردستانی عیراق بوو، لە سنورەکانەوە ، نەك پاراستنی ئاسایشی نەتەوەیی لە رێگەی دروستکردنی پشتێنەی ئاسایشی سنورەوە، چونکە سنوری نێوان ئێران و عیراق هەر لە کوردستاندا نیە، بەڵکو سەدان کیلومەتر سنوری هاوبەشی ئێران– عیراق لە خوارووی عیراقیش ، کە لەسەر شاری عەمارەوە تاکو شاری سەفوان لەهەرە خوارووی عیراق سنوریان لە وشکایی و ئاویش پێکەوە هەیە و تا شەڕی ئێران عیراقیش دەستکاری تاکە گوندێکیش نەکرا.

سیاسەتی راگواستن و پشتینەی ئاسایش و ئۆردوگای زۆرەملێ و گوندی هاوچەرخ ، بووە هۆی راگوێزانی دانیشتوانی پتر لە ٤٠٠٠ چوار هەزار گوند و ۲۲ بیست و دوو

شـــار و شارۆچـــکه و کـــاولکردن و چـــۆلکردنی پانتـــای نزیکـــەی ٣٠٠٠٠ ســـی هـــەزار کیلومەتری چوارگۆشەی خاکی کوردستانی عـێراق لـه زینـدەور ، کـه یـەك لەسـەر سێی هەموو ڕووبەرەکەیەتی . واتـه بـه بیابـان کردنـی ولاتێکـی زۆر گـەورەتر لـه پانتایی ولاتی لوبنـان و فەلەسـتین و ڕاگواسـتن و بـێ کـارکردنی نزیکـەی ٢ چارەکە ملیۆن کەس و قەتیس کردنیان لەنێو تەلبەندی ئۆردوگا زۆرەملێیەکان.

ماوەتەوە بپرسین : ڕژێمی بەعس له پێناوی چیدا سەدان ملیۆن دیناری عێراقـی لـه داهات و بودجەی عێراقدا خـەرجکرد؟ لـه دروسـتکردنی ئۆردوگاکـان لـه تێچوونی تێکدانی گوند و شار و شارۆچکەکان له بژاردنی ژیانی ماڵی ڕاگوێزراوەکان لەلایـەك و لەلایەکی تریش له ناودانی بایی سەدان ملیۆن دیناری عێراقی تر، لـه لەناوچـوونی زەوی و زاری کـشتوکاڵی و ئـاژەڵ و ڕەشـەوولاخ و ڕەز و بـاغ و گەیانـدنی زیـانێکی زۆر گـەورەی کەمەرشـکێنی ئـابوری کـشتوکاڵی عێراقـی بـه گشتی؟ دیـارە لـەلای بەعـسیەکان جێبـەجێکردنی ئـەو پلانـه و بەدەسـتهێنانی ئامانجـەکانی ، گـەلێ گرنگتره لەو چەند ملیار دینارەی ، که خەرجی کردوه و له دەستی داوه.

لەو کاتەی کە بەعسیەکان دروشمی ( أمة عربية واحدة ـ ذاة رسالة خالدة) یان بـەرز دەکردەوە و هات و هاواری (الوحده العربيه) و (توحيد الوطن العربي مـن المحـيط الى الخليج) و(النفط العرب للعرب) یان دەکرد ، بـه جێبـەجێکردنی نەخـشەی ڕاگواسـتنی کورد له سنورەکان پلانی لێکترازان و گۆڕینی خەسلەتی نەتـەوەیی کوردیـان دا دەڕشت . بەعسیەکان پێیان وابوو، یا بلێین لەوە گەیشتبوون ، به دانانی چەند بەردو و مەخفـەر و دەبابـەو کێشانی هێڵـی سـنور و تخـوب لێـك جیاکردنـەوە ، گـەر بـه ڕووکەش و یاسـای نێودەوڵـەتیش بتـوانن کـورد و کوردسـتان پارچـه پارچـەکەن ؟ ناتوانن به پراکتیك ئەو کارە جێبەجێکەن؟. پەیوەندی نێـوان پارچـەکانی کـورد لـه دیوەکانی به ناو عێراق و ئێران و تورکیا و سوریا ، گەلـی لـەوە دەیـرینترو مێـژوویی

تر و نەتەوەیی تر و خۆرسکی ترە ، وەك لەو بستووكەی دوژمنانی كورد ناویان لێناوە سنور.
لەوەش گەیشتوون ، كە قوڵایی ستراتیژی هەر پارچەیەكی كوردستان پارچەكەی تریەتی ، بە تایبەتی لە كاتی پێویستدا. بۆیە بەعسیەكان دەیانویست ئەو پەیوەندیە نەتەوەییە خۆرسكیەی كورد بە راگواستنی هەڵتەكێنن . ئەگەر بۆشیان بچوایەتە سەر، ئەوە دەسكەوتێكی ئەوەندە گەورە بوو ، بۆ بەعسیەكان دەیهێنا، ئامادەبوون دەیان و بگرە سەدان ملیار، نەك دینار، دۆلاریشی تێدا خەرجكەن.

## ئامانجەكانی بەعس لە راگواستن و دروستكردنی گوندی هاوچەرخ.

١ـ تێكدانی یەكێتی نەتەوەیی كورد و دابڕینی كوردەكانی خواروو لە كوردەكانی ژوور و رۆهەلات . واتە دابڕینی كوردەكانی بەناو (كوردستانی عیراق ـ لە كوردەكانی كوردستانی ئێران و توركیا و سوریا).

٢ـ قەتیسكردنی پتر لە نیو ملیۆن كورد لەناو تەڵبەندی زیندانی ئۆردوگا زۆرەملێیەكان و بێ كاركردنی پتر لە ٦٠ ـ ٨٠ هەزار كورد.

٣ـ لەگەڵ بێكاركردنی كوردەكان لە ئۆردوگاكاندا، بانگەشەی پێویستی كارگە و كۆمپانیاكانی ناوەراست و خوارووی عیراق بە ٤٠ ـ ٥٠ هەزار كرێكاریان دەكرد، تا كوردە بێكارەكان ناچار بن برۆنە ناوەراست و خوارووی عیراق بۆ كار و پاشان ناچاری بردنی ماڵ و مناڵیشیان بن . ئەوە هەنگاوی یەكەمی بەعەرەبكردنی كوردەكان بوو.

ئەگەر شۆرشی نوێ و دەستپێشكەری كۆمەڵە، بۆ هەڵگیرساندنەوەی شۆرش نەبوایە ، پێم وایە ئەو هەنگاوە زۆر بە سانایی جێبەجێ دەكرا.

٤ـ سەبارەت بەبێ كاری ئەو كوردانە و هەڵگیرساندنەوەی شۆرش ، بەعسیەكان توانیان بێكارەكان بە شێوەیەكی تر بەكاربێنن ، ئەوەندەی بكرێ چەكداریانكەن.

٥- بێکاری و بێ دەرامەتی و قەتیسبوونی کوردەکان لە ئۆردوگا زۆرەملێیەکاندا، ژمارەیەکی زۆری لێ ناچار کرد ، چەك بۆ رژێم هەڵگرن، یا کار لە دەزگا جاسوسیەکانی (ئەمن، ئیستخبارات ،مخابەرات، منزومە) بکەن ،ببنە پێکهێنەری تابووری بنچینەیی بەعس.

٦ـ تێکدان و هەڵتەکاندنی شیرازەی پەیوەندییە کۆمەلایەتیەکانی کۆمەڵی کوردەواری.

دیارە بە زۆر پێکەوەلکاندنی چەندین گوند و بەرەباب و تایەفە و عەشیرەتی جیاجیا لە یەکتری و خڕکردنەوەیان لەناو سنوری ئۆردوگایەکی زۆرەملێی تەڵبەندکراودا . ناکرێ پەیوەندی کۆمەڵایەتی هەموویان لە ئاستی پێویستی بەرز و بە نرخ راگرتنی نەریتی کوردەواریدا بێ ، بە تایبەت لە ناو گوندی کوردەواری و چینی جوتیارانی کوردا ، دەیان ململانێ و کێشەی جیاجیا هەیە، هەر لە نێوان ئاغا و میر و دەمراستی گوند و عەشیرەت و نێوان جوتیار و وەرزێر و سەپان و توتنەوان و چێنەردا، تا دەگاتە کێشەی تری زەوی و کۆمەلایەتی و خێزانی . ئەو کێشانە دوژمنایەتی لە نێواندا دروست کردوون ، هەرگیز نە دەکرا لە مەودای چەند کیلۆمەترێکی چوارگۆشەدا ، ئەو هەموو ناکۆکیانە پێکەوە تەبابن و نە کەونە دژایەتیکردنی یەکتری .

رژێم سودێکی زۆری لەو پلانەش وەرگرت ، دژەکان دەکەوتنە لە یەکتر خوێندن و زمان لە یەکتری دان، دام و دەزگا جاسوسی و داپلۆسێنەرەکانی بەعس ، بەکاریان دەهێنان و سودیان لێ وەردەگرتن بۆ چاودێرکردن و راوکردنی کەسانی نیشتمانپەرەوەر و خۆنەفرۆش.

٧- شێواندن و لە کەدارکردنی رەوشتی بەرزی کۆمەڵایەتی کوردی.

ئەگەر چی ئەمە راستیەکی تاڵە، بەڵام هەموو شێواندنێك ، کە بە نەخشە و پلان و زۆرداری و ستەمی دوژمن و داگیرکردنی ناچاریەکی راستە و راستیش نابێ لە

مێـژوو شـاردراوە بـێ، بـێ کـاری ، ململانـێی نـاوخۆی ئۆردوگاکـان ، تەقـەلای بـێ ڕەوشت و دوور لە مرۆڤانەی بەعس و دارودەستەکانیان ، بـووە هـۆی بڵاوبونـەوەی دیاردەی ڕەفتاری بێ ڕەوشتی . بەعسیە ڕەگەزپەرستەکان تەنیا بەوە نە دەوەستان ، کە پیاوە خۆ فرۆشەکان بۆ بەرژەوەندی زانیاری خۆیان بەکاربێنن، بگرە هەندێ جار ژنە لاواز و بێ دەرامەت و لەشفرۆشەکانیشیان بۆ ئەم مەبەستە بەکاردەهێنا.

٨ـ دابڕینی جەماوەری کورد لە هەر جولانەوە و شۆڕشێکی تری ڕزگاریخوازانە کـە لـە کوردستاندا بەرپا بکرێ، یان دابڕینی پێشمەرگە و جەماوەر لە یەکتری.

ڕژێمی فاشـی بـە ئـەزموونی چـەند سـاڵەی خـۆی ، ئـەو ڕاسـتیەی بـاش دەزانـی کـە جولانـەوە و شۆڕشـی کـورد خۆرسـکی و پێویـستیەکی بابـەتی و مێـژوویی و سەرچاوەی سەرهەڵدان و بەهێزبوون و ژیانەوەشی جەماوەری گەلی کورد خۆیـەتی . بۆیە ئەو ڕاستیەشی لەبەر چاو بـوو ، کـە هـەر چـەندە ڕژێـم لـە ڕووی چـەندایەتیو چۆنایەتی هێزی چەکدار و کەرەسەی شەڕ ، دەیان و بگرە سـەدان قـات بارتـەقای هێزی شۆڕشگێڕەکان بێ و دەیان پلان و نەخشە و هێرشی فاشیانەیان بۆ بکێشێ ، تەنانەت هەموو چەکە کۆکوژەکانیـشیان لەگەڵدا بـەکاربێنێ ، نـاتوانی لـە ناویـان بەرێ.

بۆ کـەمترکردنی خـەرجی شـەر ، بـۆ پاراسـتنی هێزەکـانی خـۆی ، بـۆ کـۆنترۆڵکردنی هەموو شار و شارۆچکەی کوردسـتان، بـۆ ووشـککردنی ئـەو سەرچـاوە جەماوەریـەی شۆڕش و جولانەوەی کورد و بۆ قەتیس کردنی شۆڕش لـە ناوچـەیەکی شـاخاوی و چۆڵ و بێ نـوا . بـۆ زیـاتر ڕوونکردنـەوەی بەرچـاوی خـۆی ، بـە مەبەسـتی جەرزیـە گەیاندن و سەرکوتکردن و لە ناوبردن ، دورستکردنی ئۆردوگای زۆرەملـێیان داڕێشت ، وەك باشترین نەخشە و پلان بۆ ئەو مەبەستەیان . لەگەڵ ئەوەش شاخ و دۆل گوند و گوندیەکان و پێشمەرگە ، هاورێ و هاریکار بکەرێکی لە دابـران نـەهاتووی یـەکتری بوون.

حەواندنـەوە، داڵـدەدان، ژیانـدنی، حەشـاردان، سـەنگەر لەگـەڵ گرتنـی پێـشمەرگە، خەسڵەتەکانی بەردەوامی گوندو گوندیە کوردەکـان بـووە بـۆ شـۆرش وشۆرشـگێرانی کورد . دابڕان و قەتیس کردنی پتر لە نیو ملیۆن کـورد لـە ئۆردوگـای تەڵبەنـدکراوی زۆرەملـێدا، دابڕینی سەرچاوەیەکی مرۆڤی زۆر گەورە بوو ، لە جوڵانـەوەی کـورد. (دیارە بە بۆچوونی بەعسیەکان).

٩ــ بەمەبەسـتی بـەکارهێنانی مرۆڤـی کـورد . وەك قـەلغان بـۆ پاراسـتنی هێـزە چەکدارەکانی بەعس و دامودەزگا سەرکوتکەرەکانیان ئۆردوگا زۆرملێەکان کران ، بـە سوپاگایەکی شاردراوە لەناو خەڵکی بێ چەکی کوردی نـاو ئۆردوگاکـان و چـەندین فەوجی جاشی کوردیان لـێ پێك هێنان ، بۆ کردنیان بـە شـورە بـە دەوری خۆیانـدا و بـەکارهێنان لـەپێش خۆیانـەوە لـەکاتی پێویـستدا . لـە رووی سـەربازی و یاسـایی سەربازیەوە ، سەربازگای دیار و ئاشکراو دوورە ئاوەدانی ، ئاسانتر دەبێتە نیشانەی لێدان و تێ سرەواندن لە هەموو شەڕ و پێدادانێکدا بـە تایبـەتی لـە شـەڕی گـەورەی نێوانی دوو زلهێز و دەسەڵاتدا، بەڵام سەربازگەی شاردراوە ، لەناو خەڵکی بێ چەك و سڤیلدا پارێزاوتر دەبـێ ، گەرچـی ئـەو کـارە پێـچەوانەی یاسـاکانی نێودەوڵـەتی و مافەکانی مرۆڤە.

١٠ـ بە مەبەستی پەروەردەکردن و پێگەیاندنی نەوەیەك ، یان چەند نەوەیـەکی کـورد لـە قوتابخانـەی ئۆردوگـا و شارۆچـکەکاندا، بـە بـیری بـەعس و کـەلتوری بـەعس و رەوشتی بەعسیانە ، واتە هەم راگواستن و هەم بە بەعـسکردنی نـەوەکانی ئاینـدەی کورد و پاشان بە عەرەبکردنیشیان لەمەودای دووردا.

١١ـ بـۆ شـێواندنو هەڵتەکانـدنی داهـاتی نەتـەوەیی کـورد. نـەمانی گونـد و ئـاژەڵ و سـوتماککردن و چـۆڵکردنی زەوی و زاری کـشتوکاڵی ، واتـە ئیفلیجکـردن و لـە

ناوبردنی بەرووبوومی کشتوکاڵ و ئاژەڵدارییە . لەناوچوونی ئەو دوو سەرچاوەی داهاتی نەتەوەش ، دەبێتە هۆی تێکدان و لاوازکردنی هاوکێشەی ئابوری بازرگانی.
دیارە خواروی کوردستان سەبارەت بە سیاسەتی شۆڤێنیانە و فاشیانەی حوکمدارانی عێراق، ناوچەیەکی پیشەسازی نەبوە ، ئەگەر یەک – دوو کارگەی پیشەسازی تیا بنیاتنرا بێ ، هەر پشتی بە سەرچاوە کشتوکاڵیەکە بەستووە یان بە بەروبومە ئاژەڵیەکە . وەك کارگەی توتن ، جگەرە ، چنینی فەرش.
داهاتی نەتەوەیی خەڵکی کورد . جگە لە بەرووبومی کشتوکاڵی و ئاژەڵداری ، زیاتر بازرگانی بووە ، وەك لەوەی پیشەسازی بوو بێ . بازرگانیش لە کوردستان کە پێکدێ لە (بردە و هاوردە)، دیارە بەشی بردەکە "صادرات" هەر بەرهەمە کشتوکاڵیەکە و ئاژەڵیەکە، وەك گەنم و جۆ و توتن و لۆکەو خوری و ماز و کەتیرەو.... هتد ، بووە.
ئەو بەرهەمانە لەناوبران ، ئیتر دووتای تەرازووی بازرگانیش تێك دەچێ و تای (بردە) دەچێتە خانەی نەمان و تای هاوردە ، وەك شەکر و چا و رۆن و گۆشتەمەنی و دەیان شتی تر بە تای ئارد و نەوت و گاز و.... هتد بە تەنیا بێ هاوکێشە دەمێنێتەوە.
بەو جۆرە داهاتی نەتەوەیی تووشی ئیفلیجی و لاسەنگی دەبێ و جەماوەری کورد ، ناچاری کاسەلێسیو مشەخۆری و خۆفرۆشی بەردەم رەحمەتی رژێم دەکا.
من پێموایە کە شۆرشی کورد و بەرەی کوردستانی وەك هۆیەك ، و شەڕی عێراق – ئێران وەك هاوکار بۆ درێژە کێشانی ئەم نەخشەیە و نەپەرژانی رژێمی بەعس بۆیە لەجێبەجێکردنی، پاشان شەڕی کوێت کە بە شەڕی دووەمی کەنداو ناسرا، وەك گەورەترین هۆ و ئامرازی لە یەك و بۆ خستن دەسەڵات و سیاسەت و نەخشە و پلانەکان رژێمی عیراقی بەعسی بوو . پاشان بە راپەڕینی جەماوەر و کوردستان بە دەرکردنی پاشماودی دەسەڵاتە لەرزۆکەکە نەبوایە، و رژێمی عیراقی وەك ئەو دوو

ساڵەی ١٩٨٨، ١٩٨٩ کە لەگەڵ ئێران رێککەوت و پەرژایە سەر پیادەکردنی نەخشەی (جینۆساید) بە کیمیاوی بارانکردنی کوردستان و ئەنفالکردنی کورد، بەردەوام بوایە، لە ماوەی چەند ساڵێکی کەمدا ، بەلای کەمەوە لە رێژەی ٦٠٪و بگرە پتری ئامانج و نەخشەکانی خۆی لەمەڕ کوردستان جێبەجێ دەکرد.

## کێشەی نێوان کۆمەڵە و بزوتنەوە.

کۆمەڵە و بزوتنەوە ، کە دوو باڵی سەرەکی و خاوەن بڕیاربوون، لەناو یەکێتیی نیشتمانیی کوردستاندا و هەردووکیشیان خۆیان بە میراتگری شۆڕشی پاش ئاشبەتاڵ دەزانی . دوو رێکخراوی جیا لە یەکتربوون کە جگە لە بارودۆخی ئەوسای پاش ئاشبەتاڵ و دڕندەیی دەسەڵاتی رژێم و بە پەرۆشی بۆ شۆڕشی کورد ، هیچ خاڵێکی تری ناو کۆیی کاری هاوبەشیان تێدا نەبوو.

جیاوازی ئەو دوو رێکخراوە ، تەنیا جیاوازی سیاسی نەبوو ، بەڵکو جیاوازی فکری (أیدیولوجی)، چینایەتی ، سیاسی، چەکداری و پاشان جیاوازی تێگەیشتن بوو لە کاری بەرەیی.

ئەو جیاوازیانە بنەمایەکی بەهێز بوون ، بۆ خۆشکردنی زەمینەی گەشەکردنی ناکۆکی نێوان و پاشان هەلاوسانی تا رادەی لێکترازن و پاشان سەنگەر لە یەك گرتنیش . دیارە رۆڵی هێڵی گشتی (واتە سەرکردایەتی دەرەوەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان) بە تایبەتی سکرتێری گشتی (مام جەلال) فاکتەرێکی بەهێزی تەقینەوەی ناکۆکیەکان بوو ، لە باتی ئەوەی کە فاکتەری خاوکردنەوە و بە ئاشتی چارەسەرکردنی ناکۆکیەکان بێ ، لە چوارچێوەی سیاسەتی گشتی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و ، وەك نیمچە بەرەیەکی پێکهاتوو لە هەر سێ هێڵەکە (بزوتنەوە ـ کۆمەڵە ـ خەتی گشتی یا خەتی پان).

## أ- له رووی فکری و ئایدیولوژییه‌وه:

١- کۆمه‌ڵه‌ی م . ل کوردستان ، رێکخراوێکی سیاسی چه‌پ و په‌یره‌وکه‌ری تیوری م ، ل و بیری ماوتسی تۆنگ و خۆی به هه‌ڵگری ئالای بیری چینی کرێکاران و ره‌نجده‌رانی کوردستان ده‌زانی . چینی کرێکارانیش به رابه‌رو پیشڕه‌وی خه‌بات ، حزبه‌که‌شی به پارتی پێشڕه‌و ده‌زانی.

کۆمه‌ڵه‌ش له ناوخۆیدا دوو جۆر بۆچوونی جیاوازی هه‌بوو ، له رووی پێکهاته‌ی رێکخراوه‌یی و مه‌ودای کاری حزبی ، که بۆچوونێکیان کوردستانی و بروابوون به له دایکبوونی پارتی پێشڕه‌وی کرێکاران و ره‌نجده‌رانی کوردستان و رابه‌ری شۆڕشی رزگاری نیشتمانی.

بۆچوونی دووهه‌میشیان: براوبوون ، به‌وه‌ی که کۆمه‌ڵه ببێته ئاڵته‌رنایڤی حزبی شیوعی عیراقی و له کوردستانه‌وه، پارتی پێشڕه‌وی چینی کرێکاری عیراقی پێکبێت و شۆڕشی چینایه‌تی عیراق له کوردستانه‌وه رابه‌ری بکات . بۆ نمونه په‌ره‌گرافێکی وتارێکی شاسوار جه‌لال (ئارام) که له ژماره‌(یه‌ك) ی ، رۆژنامه‌ی ئالای شۆڕشدا نووسیبوی و له سه‌رانی هه‌ڵگری بیری عیراقچیتی ناو کۆمه‌ڵه بوو ، ده‌ڵێ: (سه‌باره‌ت به‌وه‌ی که شۆڕشه‌که‌مان بریتی نیه له بزوتنه‌وه‌یه‌کی ته‌سکی نه‌ته‌وه‌یی گه‌لی کورد ، به‌ڵکو شۆڕشی دیموکراتی گه‌لی عیراقه* ، و له کوردستانه‌وه به‌هۆی ته‌قینه‌وه‌ی ناکۆکیه‌کانه‌وه و هه‌روه‌ها له سایه‌ی باش هه‌ڵکه‌وتنی خاکی کوردستانه‌وه ده‌ستی پێ کردووه !).

٢- به‌ڵام بزوتنه‌وه له‌سه‌ر ئاستی لێکتر نزیکبوونه‌وه‌ی چه‌ند که‌سایه‌تیه‌کی کوردپه‌روه‌ر و شۆڕشگێڕ و خاوه‌ن ئه‌زمونی خه‌باتی چه‌کداری و سیاسی په‌روه‌رده‌ی ناو هه‌ردوو کۆنه باسکه‌که‌ی پارتی دیموکراتی کوردستان (جه‌لالی، مه‌لایی) دامه‌زرا

---

* له‌یادی دووهه‌م ساڵ رۆژی شه‌هیدبوونی ئارام (به‌شێك له نوسینه‌کانی ئارام) ناوه‌ندی کۆمه‌ڵه‌ی ره‌نجده‌رانی کوردستان. ١٩٨٠/١/٣١

بـوو، کـه تـاك و تـەرا ، کەسـانی چـەپی تێکـەوتبوو ، هـەر هەمووشـیان لـە رووی ئایدیولۆژییەوە پابەندی تیوری (دیموکراتی بۆ عێراق و حوکمی زاتی بۆ کوردسـتان)* بوون و بڕواشیان بە هەڵگێرسانەوەی شـۆڕش پـاش ئاشـبەتاڵ ، هـەر لەسـەر شـێوە کۆنەکـە و شۆڕشـی جـەماوەری گـەل هـەموو چـین و توێژەکانیـەوە هـەبوو ، بـە مەبەستی هەرچی زووتر بە دەستهێنانی دەسکەوت بۆ گەلی کورد.

بە نمونە ، کۆپلەیەك لەوتاری رەسول مامەند کە لە کۆنگرەی یەکەمی (حسك) دا لـە ساڵی ۱۹۸۱دا دەهێنینەوە. دەڵێ: (بزوتنەوەی سوشیالیستی کوردستان ، هـەر لـە سەرەتاوە رووبەرووی زۆر ئـەرکی مێـژوویی و نیشتمانی نەتەوەایـەتی و دووچـاری گەلـێ کۆسـپ و رووداو و بەسـەرهاتی گـرنگ بـوو،.......... ئـا ئەمـەش نیـشانەی رەسـەنی و جـەماوەری و دروشمـی رێبـاز و واقعیـەتی ئامانجـەکانی بزوتنـەوە بوو،........ تا مەسەلەی دیموکراسی لە وڵاتێکی وەك عێراق و وڵاتـی عێراقمـان کـە رژێمێکی دکتاتۆری فاشی لە سەرەتاوە ، مەسەلەی هەموو جەماوەری گەلـە، لەبـەر ئەوە مەوزوعی بـەرەی نیشتمانی گونجاوترین چوارچێوەی خـەباتی هـەموو چینە شۆڕشـگێڕەکانە.......... تـا بـە شـێوەیەکی قاطعانـة( **مبـدأ الحـزب الواحـد** ) رەتدەکەینـەوە و بـەردەوام خواسـتیاری دیموکراسـی سیاسـی و ئـازادی فکـری و تەنزیمی بووە).*

## ب ـ لەرووی سیاسیەوە:

۱ـ کۆمەڵە لە رووی سیاسیەوە ، پایەکانی شۆڕشێکی شێوە نوێ لە ( پـارتی پێـشڕەو ، یەکگرتنی هێزە شۆڕشگێڕەکانی گـەل ، سـوپای شۆڕشـگێڕ) دیـاری دەکـرد، وئـەم لێکدانەوەش بۆ هەریەکەیان ، سەبارەت بە پـارتی پێـشڕەو، کۆمیتـەی هەرێمـەکانی

---

* ئارام دەڵێ:(شۆڕشی دیموکراتی گەلی عێراق) نەك گەلانی عێراق.

* رەسول مامەند ۵۰ ساڵ تەمەن و ۲۳ ساڵ خەبات(بەهرۆز گەڵاڵی ۱۹۹۸) لاپەرە ۴۲ـ ٤٤

کۆمەڵە لە سەرەتای تەممووزی ساڵی ۱۹۷٦دا لە بەیانی (باری ئێستای کوردستان ) کە بە ناوی لیژنەی سەرکردایەتی دەستە چەکدارەکانەوە نوسیویە و هەر هەمان کۆمیتەی هەرێمەکان دەڵێ: (پارتی پێشڕەو، ئەوەی بیستومانە و لە تاقی کردنەوەدا دیومانە، ئەو حزبانە نین ، کە خۆیان بە پێشڕەو ئەزانن ، ئەو حزبەی کە ئەمڕۆ گەلی کوردستان ئەیەوێ ببێتە رابەری ، پیشاندەی ئەو حزبەیە کە خاوەنی "نظریة"ی شۆڕشگێڕانە بێت). دیارە مەبەستی لە تیوری مارکسی لینینی ، (واتە بوونی ئەو بیروباوەرە و روانینە دونیاییەی ، کە رێگای شۆڕش رووناك دەکاتەوە............ تا حزبێك کە لەسەر بنچینەی ئەو بیروباوەرە دامەزرا بێت، دەبێ ئەندامەکانی هەڵبژاردەی ئەو کەسانە بن ، کە هۆشیارترین و پێشکەوتوترین و بە تواناترین و دڵسۆزترین و پاکترین ، کەسانی چینە شۆڕشگێڕەکانی گەل بن).

واتە پارتی پێشڕە و رابەر و سەرکردەی شۆڕش لای کۆمەڵە ، حزبی نوخبە بوو . چونکە دەڵێ لەناو چینە شۆڕشگێڕەکانی گەلدا ، هەرە (هوشیار و پێشکەوتوو بە توانا و دڵسۆز و پاك) ترینەکان و لەناو ئەوانیشدا ئەبێ ئەندامەکانی خۆی بە هەڵبژاردە کۆکاتەوە و رێکخا.

سەبارەت بە بەرەی یەککرتوو (یەککرتنی هێزە شۆڕشگێڕەکانی گەل) دەڵێ: ( ئەمڕۆ گەلی کوردستان وەك نەتەوەیەك دوارۆژی لە مەترسیدایە و لەناوبردنی بۆ دانراوە . ئەرکی سەرشانی هەموو چین و دەستە و کەسە شۆڕشگێڕەکانە یەککرتن و قوڵ بکەن بە قوڵی یەکتردا و ناکۆکی ناوخۆیان بخەنە لاوە........، تەنیا رێگای شەرفمەندانە و دڵسۆزانەی راست ئەوەیە ، کە هەموو لە دەوری (ئاڵای شۆڕش) ی نوێمان کۆببنەوە ، هەر لێرەوە هەموو ئەو رێکخراوە و تەیارە سیاسیە نیشتمانپەروەرە شۆڕشگێڕانەی هەن ، یەککرن لەسەر بەرنامەیەکی سیاسی گونجاو.. هتد ).

سەبارەت بە سوپای شۆڕشگێڕ دەڵێ: (لەشکری شۆڕشگێڕ ئەبێ رێکخستن و زەبت و رەبت و وریایی و کارامەیی و دڵسۆزیەکەی گونجاو بێت ، لەگەڵ رێبازی

نوێی شۆرش و گرانی ئەو ئەرکە مێژووییەی لە ئەستۆیەتی ، لەشکری شۆڕشگێڕ ڕۆڵەیەکی پەروەرەکراوی باوەشی حزبی پێشڕەو و هێزە شۆڕشگێڕەکانی گەل و لێی جیا نابێت.*ببێتە ئەو حیزبە جەماوەرییە).

**کۆمەڵە:** شۆرشی نوێ بە شۆرشی هەموو عێراق دەزانی ، کە لە کوردستانەوە کلپە بستێنێ و بۆ روخاندنی رژێم و هاتنەکایەی رژێمێکی دیموکراسی پەرلەمانی ، تیایدا گەلی کوردیش بە مافی رەوای خۆی بگات.

**بزوتنەوە:** شۆرشی نوێ بە درێژەپێدانی شۆرشی ئەیلول و بە دیهێنانی هەمان ئامانج و دروشمەکانی ١١ ئادار دەزانی ، کە خۆی لە چوارچێوەی (دیموکراتیەت بۆ عێراق و حوکمی زاتیش بۆ کوردستان دەبینیەوە . و هەرگیز بڕوای بە بەرزکردنەوەی دروشمی روخاندنی رژێمی عێراق نەبوو)*

## ج ـ لە رووی چەکدارییەوە:

سەبارەت بەوەی کە کۆمەڵە ، لەرووی بیر و سیاسەت و دروشم و شێوەی کارەوە شۆرشەکەی بە نوێ دەزانی ، هەروەها ئامرازی شۆرشەکەشی کە (هێزی چەکدارە) دەیەویست لەسەر بناغەی چۆنایەتی باش و چەندایەتیەکی پەروەرەکراو پێکبهێنێ . لە بەیانی (لیژنەی سەرکردایەتی دەستەی چەکدارەکان) سەرەتای تەمموزی ١٩٧٦ لەمەر لەشکری شۆرشگێڕ ، کۆمیتەی هەرێمەکان دەڵێ: (لەشکرێکی شۆرشگێڕ ئەبێ رێکخستن و زەبت و رەبت و وریایی و کارامەیی و دڵسۆزیەکەی گونجاو بێت، لەگەڵ رێبازی نوێی شۆرش و گرانی ئەو ئەرکە مێژووییەی لە ئەستۆیەتی . لەشکری شۆرشگێڕ، رۆڵەیەکی پەروەرەکراوی باوەشی حزبی پێشڕەو ، هێزە شۆرشگێڕەکانی گەلە و لێی جیانابێتەوە).

---

* هەمان سەرچاوەی پێشوو.

* ٥٠ ساڵ تەمەن و ٣٢ساڵ خەبات ـ بەهرۆز گەلاڵی ـ لاپەرە((٥٥)) ململانێ لەناو بزتنەوەدا

هەر لە روانگەی ئەو بۆچوونەی کۆمیتـەی هەرێمـەکانی کۆمەڵـەوە ، شاسـوار جـەلال (ئارام) هەتا شەهید بوونیشی ، نە بەو سەرکرادیەتیەی یەکێتیی قایلبوو ، کە پـێش هاتنـەوەی مـام جـەلال لەسـەری رێککـەوتبوون لەگـەڵ بزووتنـەوەدا ، و پـاش هاتنەوەی مام جەلالیش و هەڵبژاردنی سەرکردایەتیە نوێیەی یـەکێتیی ، تەنانـەت بـۆ یەکجاریش بەشداری کۆبونەوەی م. س یەکێتیی نەکرد . لە ناوچەی قەرەداغ و لە سـنوری ٨ــ ٩ گونـدی ناوچـەکە دوور نەکەوتـەوە ، بـەو هیوایـەی نـاوکی لەشـکری شۆڕشگێر لەوێ دروست بکات.

بەڵام بزوتنەوە ، لەبەر ئەوەی، کە شۆڕشی نوێیان بە درێژەپێدانی شۆڕشی ئەیلول و بەدی هێنەری هەمان دروشمەکانی شۆڕشـی ئـەیلول دەزانـی ، پێیـان وابـوو ، کـە پاش ئاشبەتاڵی سەرکردایەتی پارتی ، پێویستە هەرچی زووتر هێزێکی چـەکداری بـە قـەبارە زۆر و گـەورەی ئـەوتۆ پێکبێـت ، کـە بتـوانرێ بـەو سـۆنگە و قـەبارە گەورەیـەوە زەمینـەی وتوویـژ لەگـەڵ رژێمـی سـەدام خۆشـبکرێ ، سـەدام حسابێکیان بۆ بکات لە دانوساندن و توویژدا . بۆیە پێشیان وابوو ، کە چوونە شـاخ و چەك هەڵگرتن و جەولەی پێشمەرگانەی کەسانی ناودیار و ناسراو زۆر پێویستە بـۆ کۆکردنەوەی ئەو هێزە چەکدارە . هەر بۆیەش ناسراو و ناودارانی بزوتنەوە ، یەکەم دەستەی چونە شاخ و چەك هەڵگر و پێشمەرگەی ناو ریزەکانی بزوتنەوە بـوون ، لـە شۆڕشی نوێدا . وەك شەهیدان ( عەلی عەسکەری د. خالید سەعید ، عومـەر دەبابـە، سەید کاکە ، عەلی کۆ، تایەری عەلی والی بەگ ، بایز عەباس ئاغـا، سـەعدی گـچکە، رسول مامەند)، کە لە ماوەیەکی زۆر کەمدا دەکرێ بە چەند مانگێك دیاری بکرێ ، سەدان چەکداریان لە دەور کۆبۆوە و مەفرەزەکانی کۆمەڵە ، لە ناویدا شاردراونەوە و باڵا دەستیەکی گەورەیان لە رووی هێزێکی چەکدارەوە پەیدا کرد.

لە بەیاننامـەی بزوتنـەوە کـە لـە ١٩٧٧/٣/١ دا بـە زمـانی عـەرەبی نوسـیویانە ، کـە بانگەوازێکــە بــۆ جــەماوەری گــەل و هێــزە نیــشتمانپەروەرەکان ، هێــزە پێـشکەوتووخوازەکانی عـەرەبی و جیهـانی ، بـۆ سـەرباز و فەرمانـدەی هێـزی چەکدار.

و لەناو ناوەرۆکەکەشیدا پەیامێکە بۆ سەرانی رژێمی عیراقی بۆ زەمینە خۆشکردن بۆ گفتوگۆ (مفاوضة).

دەڵێ : ( أنّ ممارسة مثل هذه السياسة بحقنا وبحق شعبنا هى التي أدت الى أضطراب مناضليه الحركة في جبالنا مع جماهير غفيرة، من المناضلين و البيشمةركة الذين عادوا الى الوطن دفاعاً عن حقوق شعبنا..... ونكرر دعوتنا للسلطة للعودة الى روح آذار ١٩٧٠ وألتزاماتها لتعزيز التحالف المصيري.... وأنقاذ العراق في لهيب التمزق والأستئنزاف وتآمر الرجعية في المنطقة.... ونؤكد على الأيفاء بكل الألتزامات بما يتعلق الأمر بنا أذا ما اقدمت السلطة على التمهيد لخلق أجواء وذلك بقيامها ببعض الخطوات العملية الكفيلة لذلك.. الخ ).

ئەم جیاوازی و ناکۆکیانەی نێوان کۆمەڵە و بزوتنەوە ، هەر لە سەرکردایەتی هەردوولا و تا ناو ئەندام و لایەنگر و پێشمەرگەی هەردوولا رەنگی دابۆوە . سەرانی هیچ لایەک ، بایەخیان بە راوبۆچوونی لاکەی تر نە دەدا.

هەر لە سەرەتاوە ، کە بەنامەیەکی مام جەلال کۆمیتەی هەرێمەکان لە چوونە شاخی سەرانی بزوتنەوە ئاگادار کران ، جۆرە کاردانەوەیەکی لە ناخی سەرانی کۆمیتەی هەرێمەکانی کۆمەڵەدا سەری هەڵدا و هەرگیز بە چوونە شاخی عەلی عەسکەری و د. خالید سەعید و عومەر دەبابە و تایەر عەلی والی و سید کاکە و... هتد ، قایل نەبوون و ئەوانەیان بە سەرکردەیەکی سەرنەکەوتوو و تقلیدی و پاشماوەی پارتی بارزانی لە قەڵەم دەدا.

تەنانەت لە دانیشتنێکی نێوان من و حیکمەت (مەلا بەختیار) لەماڵی شەهید سیروان (فەیسەڵ تاڵەبانی ) لە ١٩٧٦/٧/١٢دا، و بە بەشداری ئیحسان نەجم (ئەبو شەهاب) ، مەلا بەختیار را و بریاری کۆمیتەی هەرێمەکانی سەبارەت بە سەرانی بزوتنەوە دەربڕی ، کە ئەوان (کۆمیتەی هەرێمەکان) رێگە نادەن سەرانی بزوتنەوە وەک سەرکردایەتی شۆرش و پێشمەرگە بە شداری لە شۆرشی نوێدا بکەن.

داوامان لێکرد ، کە لە ڕێگەی خۆیەوە بە کۆمیتە ڕابگەیەنێ ، ئەو بۆچوونە تەنیا هی ئەندامانی کۆمیتەیە ، نەک کۆمەڵەیە. هەوڵماندا کە لەوە بگەن ، شۆرشی کورد بە تەنیا بە وان و بە کۆمەڵەش سەرکەتوو نابێ ، گەر لە خەو و خەیاڵی پاوانکردنی مەیدانی شۆرش و خەبات و تێکۆشاندابن ، پێمان ڕاگەیاند کە پارتی و سەرکردایەتیێ بارزان و شۆرشی ئەیلول بەو هەموو توانایە و سەبارەت بە عەقلی عەشایەری و پاوانکاری و تاکرەوی و باوکسالاریە روخان و ناشبەتاڵیان کرد . لە کاتێکدا کە کۆمیتەی هەرێمەکان لەم کاتە لە ژمارەی پەنجەکانی دەس پتر ، خەڵك و جەماوەر نایانناسێ و هیچ ڕابردویەکی باش و خراپیان لەگەڵ جەماوەردا نەبووە ، کە بە پێچەوانەوە کەسایەتی وەك عەلی عەسکەری و عومەر دەبابە و د. خالید سەعید و....، سەبارەت بە ڕابوودوویان لەناو پارتی و پاشان باسکی جەلالی و شۆرشی ئەیلول و ڕۆڵی سەرکردانەتیان لە سەرتاسەری کوردستاندا ناسراون و جەماوەر بە پیریانەوە دەچێ . چاکتر وایە لەسەر شێوەیەك لە کاری هاوبەشی خەباتی نیمچە بەرەیی هەنگاو بۆ هاوکاری و هاو خەباتی بنێین.
ململانێ و ناکۆکی نێوان کۆمەڵە و بزوتنەوە ، پێموایە گەلێ کەس و نوسەر ، بە تایبەت لەوانەی کە لە ئاستی سەرکردایەتی یا کادری پێشکەوتووی پارت و ڕێکخراوەکانی ئەوسای حەفتاکان و هەشتاکان بوون شتیان لەناو یاداشتەکان خۆیان یان بیرەوەرییەکانیان لە بارەیەوە نووسیوە و هەر یەك بە جۆرێك لێکیان داوەتەوە ، بەڵام من پێموایە کە دەردەدار لە هەموو کەس باشتر ، دەتوانی پەنجە لەسەر شوێنێ ئازارەکانی خۆیدا بنێ . بۆیە لەم بابەتەدا ئاماژە بە دوو جۆر بۆچون دەکەم کە یەکیان بۆچوونی (بەهرۆز گەلالی) کادری پێشکەوتووی سەرەتای دروستبونی بزوتنەوەیە کە لە کتێبی (ڕەسول مامەند - ٥٠ساڵ تەمەن و ٣٢ ساڵ خەبات - بزوتنەوە و گرفتەکان) لاپەرە" ٥٧ - ٦١" باس کردووە.
دووهەم بۆچونی نەوشیروان مستەفایە کە لە کتێبی (لە کەناری دانوبەوە بۆ خری ناوزەنگ ، ١٩٧٥- ١٩٧٨ ) لاپەڕە" ١٦٧- ١٦٨ " گێروگرفتی سیاسی) و

کتێبی پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن لە ١٩٧٩ـ ١٩٨٠ لاپەڕە "٢٢ـ ٢٣ " جیابوونەوەی بزوتنەوە) ەیە.

## بەهرۆز گەلالی دەنوسێ:

١- وەك بزوتنەوە پێمان وابوو، پێویستە سکرتێری گشتی هی هەردوولابی و بە یەك چاو تەماشای هەمووان بکا، بە تایبەتی لە چەك دابەشکردن و لەگەڵ بەڕێوەبردنی هەردوو ڕێکخراو لە هەموو ڕوویەکەوە.

٢- هاوڕێیانی کۆمەڵە، هەندێکیان زۆر توند بوون و پێشیان وابوو هەر دەبێ خۆیان هەبن و ئەو ڕێکخراوانەی تر بایەخیان نییە و دەبێ هەر ئەوان پێشەنگی شۆڕش بن.

٣ـ هەڤاڵانی بزوتنەوە هەندێکیان لەوانەی ڕێکخستنەکانی ناو شارەکان هێشتا تەئسیرات و بیروبۆچوونی پارتی کۆنیان لە مێشکدا بوو، بەتایبەتی هی سەردەمی کۆن.

٤ـ هەندێکیش لەو هەڤاڵانەی دەرەوە ئەزمونی سەرکردایەتی کردنی ، ڕێکخراوێکی سیاسی گەورەی وەکو بزتنەوەیان نەبوو ، بە تایبەت دوای شەڕی هەکاری.

٥ـ ململانێ تا دەهات توندتر دەبوو ، بە تایبەت کاتێ ، کە پارتی دیموکراتی کوردستان لیژنەی ئامادەکردن* لە سەکردایەتی بزوتنەوە نزیکبوونەوە و کاریگەری

---

*١- مام جەلال سکرتێری هەردوولا نەبوو، بەڵکو سکرتێری یەکێتیی نیشتمانیی بوو، بە تەنیا واتە سکرتێری نیمچە بەرەکە وە نەوشیروان مستەفا سکرتێری کۆمەڵە بوو. وسالح یوسفیش سکرتێری بزوتنەوە بوو.

٢ ـ لیژنەی ئامادەکردن بە قیادە و قواعیدەوە بریتی بوون: لە" ٥"کەس ، "٤ "سەرکردایەتی و یەك پێشمەرگە. د. مەحمود عوسمان ، قادر جەباری ، عەدنان مفتی ، شەمسەدین مفتی ، تەنانەت بە پێشمەرگەکەیان دەووت:( تاقاناکەی د. مەحمود)

خسته سەر سەرکردایەتی بزوتنەوە بۆ ئەوەی بزوتنەوە لە یەکێتیی نیشتمانیی جیابێتەوە ، چونکە لیژنەی ئامادەکردن دەیەویست لەسەر حسابی بزتنەوە خۆی بەهێز بکات.

بە تایبەتی دوای شەڕی هەکاری کە گەورەترین زیان بە بزوتنەوە کەوت ، چەند ئەندامی سەرکردایەتی و کوادری سیاسی و عەسکەری بزوتنەوە بە دەستی قیادەی موەقەت شەهید کران........... تا دوایی.

٦ـ هەندێ لە هەڤاڵانمان لەناو بزوتنەوە ، کاریگەری پارتیان هێشتا لەسەر مابوو، تەنانەت نەیان دەویست بزوتنەوە وەکو ئەندام لەناو یەکێتیی نیشتمانییدا بمێنێتەوە . بۆیە هەوڵیاندا بزوتنەوە لەیەکێتیی دووربکەوێتەوە و ئەم بۆچوونەش لە دواییدا بە قازانجی زیندبوونەوەی قیادەی موەقتە تەواو بوو.

٧ـ جیابوونەوەکەی بزوتنەوە و ململانێکەی لەگەڵ کۆمەڵەدا ، هیچ ئەساسێکی فکری و مەوزعی نەبوو. بەڵکو بەشی زۆری کێشە و گرفتەکان لەسەر ئەساسی زاتی بوون . کێشەیەك نەبوو ، کە ئەساسێکی فکری ، چینایەتی بێت ، بەڵکو هەر هەمووی لەسەر فراونکردنی سنوری دەسەڵات و زیادکردنی ژمارەی ئەندامان و گوێ نەگرتن لە یەکتری بوو.

بەڵام با بزانین رەسول مامەند ، کە لە وتاری یەکگرتنی بزوتنەوە ،لیژنەی تەحزیری دا لە ١٩٧٩/٨/٨ کە حسکی لێ پێکهات ، هەر لەسەر زاری نوسەری کتێب (بەهرۆز گەلالی) چۆن باسی ململانێ و جیابونەوەی خۆیان لە یەکێتیی نیشتمانیی دەکا.

دەلێ : " بزوتنەوە بە لەخۆبوردنەوە لە چالاکی و کاری خۆیدا، بە هیچ شێوەیەك درێغی نەکردوە ، لە پێناوی وەدیهێنانی ئەو ئامانجانە ، لە چوارچێوەی یەکێتیدا ، بە پێشکەشکردنی سەدان شەهید لە مەیدانی چەسپاندنی یەکێتیی و پەرەپێدانی

---

٢ـ بە رای نوسەر جیابونەوە و ململانێ بزوتنەوە ، هیچ ئەساسێکی فکری و چینایەتی نەبوە و مەوزعیش نەبووە.

بەو بڕوایەی ، کە تاقی کردنەوەیەکی تازەیە لە هاوکاری و هاوپەیمانی و بە یەکەوە ژیانی چەند تەیارێکی فیکری جیاواز لەسەر بناغەی صراع و وحدە ، بەڵام بە داخەوە وەکو ئێمە هیوامان بوو ، ئەو جۆرە نەبوو، چەندان ئەگەر هاتنە پێشەوە لە دروستکردنی چوارچێوەیەکی گونجاوی ئەوتۆ ، کە ڕێکخراوە سیاسیەکان بتوانن لەناویدا منافسە بکەن . بەڵکو ئەو چوارچێوەیە ورد ورده دەگۆڕا بۆ شێوەی تاکە حیزبی . جگە لەوەش یەکێتیی ستراتیژێکی دیاریکراوی نەبوو ، بەڵکو تاکێك بە شێوەیەکی فراوان باڵی بەسەر هەموو سیاسەتێکدا کێشا بوو.

دەوری پیرۆزی بزوتنەوەی سۆشیالیستی کوردستان دێتەوە یاد ، کە چۆن لەناو یەکێتیدا ، بە شێوەیەکی مبدئیانە لە دروشمی بەشداربوونی دەرەبەگەکان لە شۆڕشدا بەربەرەکانی دەکرد . هەرچی گەلێ کۆسپ و گیروگرفت و تەنگوچەڵەمە بوو، کە دژی ئارەزو و بیروباوەری بزوتنەوەی سۆشیالیستی کوردستان بوون، ئەوەش بە وەرگرتنی سەرۆك خێلە دەرەبەگەکان و کۆنەپەرستەکان لە ناوچەکانی شلێر و پشدەر و مەنگور و شارەزوور و ئاکۆیان لە ریزی پێشمەرگە و دانانیان لە ناوەندەکانی لێپرسینەوە لە ناوچە خێلەکانی ژێر دەستیان بە بیانوی جۆراوجۆر و هاندانیان بۆ کۆسپ دروستکردنی لە بەردەم بزوتنەوەی سۆشیالیستی کوردستان و پەکخستنی چالاکیەکانی.

ئەو گیروگرفتانە هی تریش ، کە بزوتنەوە هەستی پێ دەکرد ، وەکو دابەش نەکردنی چەك و یارمەتی و لێپرسراوی ناو هێزی پێشمەرگە و بەشێوەیەکی یەکسانی ، بە تایبەتی دوای ڕووداوەکانی دژی پێشمەرگەکانی بزوتنەوەی سۆشیالیستی کوردستان لە شێنێ و زەڵێ و ناوزەنگ و* پاش ئەوەی ڕێکخراوەکانی ناو شارەکان و ڕێکخراوەکانی ناو شۆڕش داوای سەربەخۆیان کرد ،

---

* هەمان سەرچاوە لاپەرە ٦٠- ٦١.

لەو کاتەدا لە رۆژی ١٩٧٩/٣/٢١ سەربەخۆیی بزوتنـەوەی سۆسیالیستی کوردستان راگەیانـدرا. دوای ئـەوە بـە دوو رۆژ دوو یاداشـت لەلایـەن بزوتنـەوە و لیژنـەی تەحزیرییەوە ئاراستەی "ی. ن. ك" کرا ، کەچی وەڵامی نـەبوو ، بـەم جۆرە لـە کۆبوونەوەیـەکی فراوانـی بزوتنـەوە و لیژنـە لـە٩٧٩/٨/٨ لـە دایکبـوونی حزبـی سۆشیالیستی یەکگرتوی کوردستان(حسك)راگەیەنرا.*

نەوشیروان مستەفا لە کتێبی (لـە کـەناری دانوبـەوە بـۆ خـڕی نـاوزەنگ) لـە بەشـی: برادۆست و یەکگرتنەوەی براکان لاپەڕە ١٦٦ـ ١٦٧دا دەڵێ:

---

* روداوەکانی دژی پێشمەرگەکانی بزوتنەوە بەم جۆرەی خوارەوەبوو.

شێنێ: لەمانگی ١٩٧٩/١ برایەکی شێرکۆ شێخ عەلی کە پێمەربوو لەبارەگاکەی شێرکۆ بەناوی(شێرزاد). وشێرکۆش کادرێکی پێشکەوتوی بزتنەوەبوو پالێوراوبوو بۆ ئەندامەتی سەرکردایەتی بزوتنەوە. یەك دوو تەقە لە باڵندەیەك دەکا. من و مەلا بەختیاریش ، کە بارەگاکەمان هەر لە شێنێ بوو، مەلا بەختیار چوار پێنج پێشمەرگەی بارەگاکەی نارده بۆ چەککردنی شێرزاد لەسەر تەقەکان . شێرزاد خۆی نەدا بەدەستەوە ، مەلا بەختیاریش جوابی بۆ من نارد ، بە پێشمەرگەکانی هەردوو بارەگاکەمان هەڵکوتینە سەر باەرگای شێرکۆ تا شێرزاد چەك کەین و بیگرین ، بەڵام من دژی وەستام و پێم ووت: تۆ لێپرسراوێکی کۆمەڵەی و بۆت نیە بچیتە سەر بارەگای رێکخراوێکی تر کە بزوتنەوەیە. مەلا بەختیار خۆی و پێشمەرگەکانی خۆیان بەستو چوونە سەر شێرکۆ ، بوو بەقرەقر و دەنگە دەنگ. پاش تۆزێ مەلا بەختیار گەرایەوە نە شێرزادی پێ گیرا و چەککرا و نە توانیشی هیچ بەرامبەر بارەگاکەی شێرکۆ بکات.

روداوی زەڵێ: کەرتێکی پێشمەرگەی ناوچەی باڵەییان کەسەر بەبزوتنەوە بوون ،لەمانگی ١٩٧٨/١١ هاتبونە سەرکردایەتی. دیسان مەلا بەختیار هەندێ فەرمانیان پێ دەدا بە شێوەی ئەمرو تورەییەوە ئەوانیش بە قسەی ناکەنو دەبێتە کێشە لە نێوانینان و پاشان دوان سیانێکیان لە کەرتەکە چەك دەکەن ، ئەمە بووە کێشەیەکی گەورە لە نێوان بزوتنەوە و مەلا بەختیار و تەنانەت مام جەلالیشی تێوەگلا و کەرتەکەش بەدڵگرانی گەرانەوە ناوچەکانی خۆیان و بۆ بزوتنەوەش بووە خاڵێك لەسەر کۆمەڵەو یەکێتی رووداوی ناوزەنگ.

(من ئەو چەند رۆژە چەند جارێ بە شاخی (نقیب) دا ئەم دیوو ، ئەو دیوم کرد بوو ، هەورازێکی رك و دوور و درێژ بوو، مام جەلال سواری ولاخ بوو، من پیادە بووم، لێی پرسیم : (وەزعی ولات چۆنە ؟) وتم: (ئێستا ماندوم و لەم هەورازەدا ناتوانم زۆر قسە بکەم ، بەلام هەر ئەوەندەت پێ دەلێم: ئێمە، ئەوانەی دەرەوە ، لەگەل ئەم برادەرانەی ئێرە ، هەر ناوەکەمان یەکە ، ئەگینا لە هەموو شتێکدا جیاوازن ، مام جەلال قسەکانمی پێ ناخۆش بوو ، بە تایبەتی هەموی چەند سەعاتێ بوو ، گەیشتبووە کوردستان ، چاوەڕوانی هەوالی خۆشتری ئەکرد ، بەلام زۆر زوو تێگەیشت لەم قسانەدا من ناهەقم نە بووم.
ئەندامانی سەرکردایەتی و کادرەکان و فەرمانـدەی پێشمەرگە بە دوای یەکدا ئەگەیشتنە برادۆست، بە تایبەتی دوای زانینی گەرانەوەی مام جەلال ، کاك خالید و شێخ حسێن و من هەر لەوێ بووین . عەلی عەسکەری ، تایەری عەلی والی ، سەعدی گچکە، سەید کاکە، سالار، عومەری عەبدوللا ، ئازاد هەورامی گەیشتن . هەروەها کادر و فەرمانـدەی کەرتەکانی پێشمەرگەش ئەهاتن . حاجی شێخەی بنزیـزی ، کوێخاکانی مەنگور ، ئەحمەد فەقێ رەش ، حاجی حاجی برایم و زۆر کەسی تر.)

## گێروگرفتی سیاسی.

پێکهاتەی یەکێتی لە شێوەی نیمچە بەرەدا، کەچەند رێکخراوێکی جیاواز تێدا کۆببێتەوە ، لە کوردستاندا تەجروبەیەکی تازە بوو ، ئەو بیروبۆچوونانەش ، کە بە ئاشکرا بلاوی ئەکردەوە ، ئەویش شتێکی تازە بوو. ئەم رێکخراوە تازەیە ، گیروگرفتی سیاسی سەخت و دژواری هەبوو.
لە ئاستی کوردستاندا: یەکێتیی لە ناو خۆیدا بالەکانی ناتەبابوون، لە هەندێ بیروبۆچوونی بنەڕەتیدا یەکیان نەدەگرتەوە . هەلوێست لە چینە کۆمەلایەتیەکان ، لە رووخاندنی رژێمی عیراق ، لە جۆری کۆکرنەوە و رێکخستنی پێشمەرگە... ناکۆکی لەناودا دروست ئەکردن).

دیسان لەلاپەڕە ١٧١ دا دەڵێ:

"ناکۆکی زۆر قوول لە نێوانی سەرانی کۆمەڵە و بزوتنەوەدا بوو. سەرانی کۆمەڵە گەنجی خوێن گەرم و توندرەوبوون ، خۆیان بە نوێنەری بیری پرۆلیتاریا و بزوتنەو ەیان بە نوێنەری بیری بورجوازی ئەزانی ، لە کتێبە مارکسیەکاندا خوێندبویانەوە، کە شۆرش بە سەرکردایەتی بورجوازی سەرناکەوێ لەبەر ئەوە ، ئەبێ پرولیتاریا سەرکردایەتی بکا. ئەیان دەشاردەوە ، کە دەبێ سەرکردایەتی شۆرشەکە بە دەست ئەوانەوە بێ.

کۆمەڵە وەکو ڕێکخراوێکی سیاسی هێشتا لەناو خەڵکدا خۆی ئاشکرا نەکرد بوو . بەشێکی سەرکردەکانی لە زینداندا بوون. ئەوانەش کە کۆمیتەی هەرێمەکانیان دروستکرد بوو ، لە ژیانی سیاسیدا کەم تەجروبە و لە ژیانی پێشمەرگایەتی دا بێ تەجروبە بوون . گەنجی نەناسراو بوون و هەموویان ناوی خۆیان گۆری بوو، هەریەکەیان مەفرەزەیەکی کەمیان لەگەڵ بوو زۆریان بێ چەك بوون.

بزوتنەوە تازە دامەزراوە بوو، بەڵام سەرکردەکانی هەموو کەسایەتی ناسراو بوون هەریەکەیان رابردوویەکی درێژی لەکاری سیاسی و لە ژیانی پێشمەرگایەتیدا هەبوو ، خەڵکی زۆریان لە شار و لادێ دا دەناسی، سەرانی خێڵەکان و گوندەکان ڕێزیان لێ ئەگرتن و بە قسەیان ئەکردن.........تا"

*راستیەکەشی ئەوە بوو، لێیان توشی" خیبە أمل" ببووم ، ئەمویست بێ ئەوەی دڵیان بشکێنم ، تێکەڵاوی کاری ناو کۆمەڵە نەبم، جگە لەوەش کەسانی وەکو کاك خالید و عەلی عەسکەری رەئیان وابوو بە هەمومان ڕێکخستنێکی تازە بە گوێرەی پێویستیەکانی شۆرشەکە دامەزرێنن، جێگەی بزوتنەوە و کۆمەڵە و خەتی گشتی بگرێتەوە).

ئەگەر خوێنەر بە وردی سەرنج بداتە بۆچوونەکانی بەهرۆز گەلالی و رەسول مامەند و نەوشیروان مستەفا، هەندێ خالی یەکانگیر و هەندێ خالی دژ بە یەکی بۆ دەردەکەوێ.

١ـ **خاڵە وێك نەچوو دژ بەیەكەیان.**

أـ بەهرۆز گەلالی دەڵێ: پێمان وابوو ، پێویستە سكرتێری گشتی هی هەردوولا بێ ، واتە هی بزوتنەوو كۆمەڵە . بەلام نەشیروان مستەفا دەڵێ : مام جەلال بە سكرتێری گشتی یەكێتیی بە هەر سێ باڵەكەیەوە بزوتنەوە و كۆمەڵە و خەتی گشتی هەڵبژێردرا.

ب - بەهرۆز گەلالی دەڵێ: جیابونەوەی بزوتنەوە هیچ ئەساسێكی فیكری و مەوزوعی نەبوو . بەڵكو بەشی زۆری كێشە و گرفتەكان لەسەر ئەساسی زاتی بوون.

كەچی رەسول مامەند دەڵێ: " بەڵكو چوارچێوەی یەكێتیی وردە وردە دەگۆڕا بۆ شێوەی تاكە حیزبی و ستراتیژێكی دیاری نەبوو... تا كتیك باڵی بەسەر هەموو شتێكدا كێشا بوو... وەرگرتنی سەرۆك خێڵەكان و كۆنەپەرستەكان لەناو شۆرشدا گرفتیان بۆ بزوتنەوە دروست دەكرد".

واتە هەم كێشەی سیاسی و هەم فكریش هەبووە ، و بە بڕوای رەسول مامەند ، بزوتنەوە نوێخواز و پێشكەوتوو بوو . مام جەلال سەرۆك خێل و كۆنەپەرستەكانی كۆكردۆتەوە.

بەلام نەوشیروان دەڵێ:

" كۆمەڵە و بزوتنەوە لەگەڵ یەك نا تەبابوون ، لەسەر هەڵوێست لە چینە كۆمەلایەتیەكان ، لە روخاندنی رژێمی عیراق، لە جۆری كۆكردنەوەی پێشمەرگە، لەگەڵ یەكدا ، یەكیان نەدەگرتەوە".

مەبەستی نەوشیروان بە پێچەوانەی رەسول مامەند ، پێی وایە ، كە بزوتنەوە نوێنەری خێڵ و عەشاریەر و بۆرژوازی بوون و كۆمەڵە نوێنەری پرۆلیتاریا.

**خاڵە وێكچوەكانی ناكۆكیو ململانێ نێوان كۆمەڵەو بزوتنەوە**

١ـ ناعەدالەتی لەچەك دابەش كردن و مسئولیەت دابەشكردن.

٢ـ ناكۆكی و نا تەبایی نێوان كۆمەڵە و بزوتنەوە.

٢ـ هەبوونی ئاغا و کوێخا لەشۆڕشەکەدا.

بەڵام بە رای رەسول مامەند ، ناعەدالەتی لە چەك و مسئولیەت دابەشکردندا لەلایەن مام جەلالەوە ، کە سکرتێری گشتی بوو ، نەك کۆمەڵە.

نا تەبایی نێوان کۆمەڵە و بزوتنەوە ، خەتای توندرەوی کۆمەڵە بووە و بزوتنەوە بێ خەتا بوون ئاغا و کوێخاکانیش لە شۆڕشدا بە دەستی مام جەلال و پەسەندی کۆمەڵە بووە . بە رای کۆمەڵە و نەوشیروانیش ئەوانە هەبوون ، بەڵام بە پێچەوانەوە.

راستیەکەی بەو جۆرەیە کە: بەشداربوونی ئاغاکان و کوێخاکان لە شۆڕشدا لە ناوچەکانی شلێر ، پشدەر، مەنگور ، شارەزوور، ئاکۆیان، بەشێکیان پێش گەرانەوەی مام جەلال و بەشێکیان دوای گەرانەوەی مام جەلال لەشۆڕشدا هەبوون، بەڵام جگە لە ئاغاکانی پشدەر ، کە تەنیا دوو کەسیان " قادر مامەند ئاغا، شێخ سەدرەدین" لایەنگری بزوتنەوە نەبوون و لەگەڵ رەسول مامەند وحاجی حاجی برایم ، کێشەی عەشایەریان هەبوو، ئەوانی تر هەموویان ئەندام و دۆست و لایەنگری بزوتنەوە بوون.

لە ناوچەی شلێر سەبارەت بە کوشتنی (بەختیاری مەجید خان) پاش تەسلیمبوونەوەی بە رژێم و بوونی بە جاش و کوشتنی لەلایەن مەفرەزەیەکی کۆمەڵە و هەموو خان و ئاغاکانی دەسەڵاتداری ناوچەی شلێر دژی کۆمەڵە بوون.

لە ناوچەی مەنگور، بەر لە هاتنەوەی مام جەلال و لەگەڵ بەشداری بزوتنەوە لە شۆڕشی نوێدا ، کوێخاکانی مەنگور " کوێخا مەلا شەریف ، کوێخا حەسەن، کوێخا عەلی قەلاوی" و لە سەرەتاشەوە بزوتنەوە و دۆست و لایەنگری بزوتنەوە بوون و بە هۆی ئەوانەشەوە هێزی چەکداری بزوتنەوە لە ناوچەی پشدەر و مەنگوردا دەیان قات پتر بوو ،لەچاو هی کۆمەڵە .

لە ناوچەی شارەزوور، " ئەنوەری خەلیفە یونس، شەوکەتی حاجی موشیر، حەمەی حاجی مەحمود " . کە بە حساب بە عەشایەر و خێلەکیەکانی شارەزووروە

ناسراون ، هەمویان ئەندامی بزوتنەوە و پاشان ئەندام سەرکردایەتی بزوتنەوە و حسك بوون.

لە ناوچەی دەربەندیخان . دەسەلاترین تایەفە ، تایەفەی بەگەکان بوو ، " تایەری عەلی والی بەگ، رەئوف مستەفا بەگ ، عوسمان و ئەنوری سەعید بەگ ، رۆستەمی مستەفا بەگ" بوون ، هەموویان ئەندامی سەرکردایەتی و کادری پێشکەوتوی بزوتنەوە بوون.

لە ناوچەی ئاکۆیان" بایزی عەباسی مامەند ئاغا" ، پێش هاتنەوەی مام جەلال بەشداری شۆرشی نوێ کرد و لەسەر میلاکی بزوتنەوەش لێپرسراوی ناوچەی ئاکۆیانی بوو، و دوای تەسلیمبوونەوەشی دیسان " سوارەی عەباسی مامەند ئاغا" کە لەسەر قسەی مام جەلال و بە پیرۆزی برادەرانی سەرکردایەتی بزوتنەوە نارەزایی برادەرانی سەرکردایەتی کۆمەڵە لە ئێرانەوە هێنرایەوە کوردستان و لێپرسراوی پێشمەرگایەتی پێ سپێردرا ، هەر لەسەر میلاکی بزوتنەوە بوو.

دەبوایە رەسول مامەند و هەموو سەرانی بزوتنەوەش وەك خۆی و راستیەکانیان لەسەر مەسەلەی چینە کۆمەلایەتیەکان باسکردایە و نەوشیروان مستەفاش یەجگار بەو جۆرە توندرەویانە ، باسی هەڤالانی کۆمەڵەی نەکردایە و ئەو راستیەی باسکردایە ، کە شۆرش سەرەتای دەسپێکردنی بە هیمەتی ئەو هەڤالانەی کۆمەڵە بووە ، نەك بە بلاوکردنەوەی ناوی یەکێتیی و دامەزراندنەکەی لە سوریاوە یان بە گەرانەوەی خۆی و مام جەلال، چونکە پێش گەرانەوەی نەوشیروان و مام جەلالیش شۆرش هەبوو.

کێشەی نێوان کۆمەڵە و بزوتنەوە ، پاش شەری هەکاری و شەهیدبوونی عەلی عەسکەری و دکتۆر خالید سەعید و سەفەری عومەر دەبابە بۆ سوریا ، وەك سێ سەرکردەی بە توانا و بە دەسەلات و راگری بزوتنەوە شارەزای بەرێوەبردنی

ناکۆکیەکان و کێشەی نێوان کۆمەڵە و بزوتنەوە ، هێندەی تر قوڵ بۆوە و گەیشتە ئەو رادەیەی ، کە جەلال تاڵەبانی تێوە بگلێ.

هەر پاش تێشکانی هێزەکانی یەکێتیی لە هەکاری ، کە دوا بەشی لە ۱۹۷۸/٦/۷دا تووشی شکست و هات و ۱۷۲ کەس لەگەڵ تاڵب رۆستەم (ئەندامی کۆمەڵە) و شێخ جەواد بێدەری "ئەندامی بزوتنەوە" . تاڵب رۆستەم فەرماندەی هەرێمی پشدەر بوو ، یەکێك بوو، لە فەرماندەکانی بەشی عەسکەری ، بە چەکەکانیانەوە تەسلیمی رژێمی عیراق بوونەوە. تەنیا ۸ کەس لەو هێزە و لە هەموو هێزەکانی یەکێتیی بە سەلامەتی و بێ تەسلیمبوون بە عیراق یا تورکیا یا ئێران یا قیادە موەقتە ، گەرانەوە ناوچەکانی سەرکردایەتی یەکێتیی ، کە حەوتیان ئەوکاتە ئەندامانی کۆمەڵە بوون، بریتی بوون، لە: (جەمال عەلی باپیر، تایەر حاجی عەزیز، حەمەی حاجی مەحمود، مەحمود زەردووینی ، حەمەرەش گرێزەیی ، بەکرەسور، ئاوات مەحمود، رەفیق).

دوای دەرکەوتنی هەواڵی کارەسات ، ئیتر بزوتنەوە و سەرانی بزوتنەوە ، بە بریاری رەسول مامەند ، کە بەکردەوە پاش شەهیدبوونی عەلی عەسکەری و د. خالید سەعید ، ئەو بووە لێپرسراوی یەکەم ، بارەگای خۆی لە سەرکردایەتی یەکێتیی و کۆمەڵە دوورخستەوە . ئەوکات سەرکردایەتی یەکێتیی و کۆمەڵە لە قەندیل و پاشان دۆڵەنی و دواتر گوێزێ و پاشان لە مانگی ۱۹۷۸/۱۰ چوونە ناوەزەنگ.

پاش بەر بوونی سەید کاکە و عەلی والی لای قیادە موەقتە و چوونی شیرکۆ شێخ عەلی سەرگەلویی لە قیادەوە بۆ لای بزوتنەوە ، ئینجا بزوتنەوە بارەگای خۆیان هێنایە نزیك بارەگاکانی یەکێتیی و کۆمەڵە لە گوندی شێنێ، بەڵام هەر بە نا تەبایی و بر وبیانو گرتن و گلەیی کردن لە مام جەلال و کۆمەڵە ، بەشداری تاکە تاکەی کۆبوونەوەکان سەرکردایەتی یەکێتیان دەکرد.

بزوتنەوە خۆیان زۆر بە غەدر لێکراو دەزانی ، بە تایبەت پاش کارەساتی هەکاری ، کە گورزی هەرە سەخت و کەمەرشکێن بە وان کەوت . لە لە دەستدانی ۳ سەرکردە و دەیان فەرماندەی پێشمەرگانە و کادری سیاسی و سەدان پێشمەرگە.

لە کردنەوەی " دەوری کادران " دا ، دەورەی یەکەمی لە مانگی ۱۹۷۸/۸دا کرایەوە منیان بە لێپرسراوی دەورەکە دیاری کرد . لە ١٤ کادر تەنیا یەك کادری بزوتنەوەی تێدا نەبوو، لە دروستکردنەوەی هەرێمەکان پاش کارەساتی هەکاری ، لە (۸) هەرێم تەنیا (۲) هەرێم ، لێپرسراوەکەیان بزوتنەوە بوو، کە هەرێمەکانی پشدەر بە لێپرسراوی "حاجی حاجی برایم " و هەرێمی هەشتی هەولێر بە لێپرسراویەتی "سید کاکە اسماعیل "بوو. لە دابەشکردنی چەکدا ، کە لە کۆتایی مانگی ۱۹۷۸/۱۰ نزیکەی چەند سەد چەکێکی گەیشت ، دیسان زۆربەی درا بە پێشمەرگەکانی کۆمەڵە.

لە دروستکردنی رێکخرا و لقە رێکخستنەکانی یەکێتیدا ، لە لقی کەرکوك و سلێمانی و لێپرسراوەکانی کۆمەڵە و ئەندام لقیش ، یەکێك کۆمەڵە و یەکێك خەتی گشتی بوو ، کە لە راستی ئەویش هەر کۆمەڵە بوون،و بە ناوی خەتی گشتیەوە کاریان دەکرد.

ئەمانە و هەڵسوکەوتی مام جەلال لەگەڵ ئەندامانی سەرکردایەتی کۆمەڵە و بە تایبەت لەگەڵ نەوشیروان مستەفا ، کە بە کردەوە ، وەك جێگری مام جەلال کاری دەکرد و پەیوەندی نێوانیان زۆر بەهێزتر بوو ، وەك لە پەیوەندی نێوان مام جەلال و سەرانی بزوتنەوە، لەلایەك و رۆڵی خراپی د. مەحمود عوسمان ، کە لێپرسراوی یەکەمی لیژنەی ئامادەکردن بوو لە تێکدان و چاندنی تۆوی گومان لە نێوان بزوتنەوە و کۆمەڵە و مام جەلالدا ، وای لە بزوتنەوە کرد، کە تەنانەت لە نێوان بارەگاکانی سەرکردایەتیشدا بەشك و گومان و جۆری لە خۆپارستنەوە هاتوچۆ بکەن و گومان لە هەموو و شەو هەڵسووکەوتێکی کۆمەڵە و مام جەلال بەرامبەر بە خۆیان بکەن.

پاڵەپەستۆی ئەندامانی سەرکردایەتی ناوخۆی بزوتنەوەش ، لەسەر سەرکردایەتی دەرەوەیان ، بۆ خۆ دووره پەرێزگرتن و پاراستنی ، گوایە سەربەخۆیی سیاسی و رێکخراوەیی و پێشمەرگانە و بریاردانی بزوتنەوەیە.

له مانگی ١٩٧٩/١ جۆرێك له ناكۆكی و درۆ دۆنگی له نێوان مام جەلال و شێروان شێروەندی و مام جەلال و قادر عەزیز ، كه هەردووكیان ئەوكاته پالێوراو بوون ، بۆ ئەندامی سەركردایەتی بزوتنەوه له نزیكترین كۆبوونەوەی فراوان یان كۆنفرانسیشدا روویدا، مام جەلال كه زۆر به دەگمەن لەكاتی تورەبووندا ، خۆی بۆ كۆنترۆڵ دەكرێ و وەك هەموو جارێك هێرشی باوكسالاریانەی كردە سەر هەردووكیان و تەنانەت دەستی له شێروان شێروەندی وەشاند.

له مانگی ١٩٧٩/٢دا حیكمەت محەمەد كەریم (مەلا بەختیار) كه بارەگاكەی له گوندی شێنێ بوو، و به ناهەق و به بیانووی تەقەكردن له كۆترێ لەلایەن پێشمەرگەیەكی بزوتنەوه ، وەكو برای شێركۆ شێخ عەلی بوو، شێركۆش پالێوراوی ئەندامی سەركردایەتی بزوتنەوه بوو . ئەویش هەر بارەگاكەی له شێنێ بوو، هێرش و پەلاماری چەكدارانەی بردە سەر بارەگاكەی بزوتنەو و سوور بوو ، لەسەر گرتنی پێشمەرگەكەی بزوتنەوه ، كه له راستیدا به هیچ جۆرێك ئەو مافەی نەبوو . بەندە ئەو كاته بارەگاكەم له شێنێ بوو ، نەك هەر لایەنگری مەلا بەختیار نەبووم ، بەڵكو دەشمویست تێی بگەیەنم ، كه ئەو لێپرسراوی ناوچەكه و پێشمەرگەكانی بزوتنەوه نییە.

ئەو فاكتەرانەی سەرەوه ، كه باسمكردن هێندە به قووڵی كاری كردە سەر سەرانی بزوتنەوه كه له ١٩٧٩/٢/٢١دا هەموو سەره داوێكی پەیوەندی خۆیان لەگەڵ یەكێتیدا ببچڕن و لەگەڵ د. مەحمود عوسماندا ناوچەی بارەگاكانه سەركردایەتی یەكێتیی بەجێبێڵن.

## گەڕانەوەی مام جەلال و نەوشیروان مستەفا.
## کێشەی نێوان کۆمەڵە و کۆمەڵە و بزوتنەوە.

هەروەك نەوشیروان مستەفا لە کتێبەکەی خۆیدا " لە کەناری دانوبەوە بۆ خڕی نازەنگ" لاپەڕە ١٢٤) ئاماژە دەکا کە لە دوا هەفتەی مانگی ١٩٧٦/١١دا لەگەڵ کۆمەڵێك پێشمەرگە ، کە وەجبەی سێهەمی کۆمەڵە ئامادەکراوەکانی گەڕانەوە بوون بۆ کوردستانی عیراق دەڤەری بادینان . بەڵام سەرکەتوو نەبوون و بە مەیئوسی گەڕانەوە بۆ سوریا.

بەڵام جاری دووەهەم لە مانگی ١٩٧٧/٤دا جارێکی تر گەڕاوەتەوە بەرەو بادینان و لە برادۆست کاك دکتۆر خالید سەعیدی دیوە و بنکەی یەکەمی پێشمەرگەیان لە گوندی هەدەن لە دۆڵێك دامەزراندوە ، لەلاپەڕە ١٦١دا باسی گەیشتنی هەندێ لەپێشمەرگەو کادرە سۆرانیەکان دەکا لە سوریاوە بۆیان لایان ، لەوانە حەسەن خۆشناو ، سەید کەریم ،خدر مەعسوم ، سامان گەرمیانی، عادل شوکر، بەڵام باسی ئەوە ناکات ، کە هەموویان لایەنگر و ئەندامی کۆمەڵە بوون ، تەنانەت خدر مەعسوم ، کە پاشان لە ناوزەنگ بووە خەتی گشتی، سەبارەت بە هەڵسوکەوتی سالار عزیز و مەلا بەختیار وازی لە کۆمەڵە هێنا.

هەر لەو لاپەڕەیە باسی گەیشتنی زیرۆ عەبدوڵڵا و حەمید باتاسی و ئیحسان نەجم (ئەبو شەهاب) دەکا. بەڵام باسی "هاوار جەلال " ناکات لەگەڵ ئەبو شەهاب و زیرۆدا بوون و باسی ئەوەش ناکات ، کە ئەوانیش جگە لە شەهید حەمید باتاسی هەموویان کۆمەڵە بوون.

پاشان لە لاپەڕە ١٦٥دا باس دەکا ، کە چەند کەسێك لە سەرانی یەکێتیی لە گوندی ماسی ڕۆ بوون و لەگەڵ نەوشیروان یەکیان دیوە ، نەوشیروان لە لاپەڕە ١٦٦دا بەم جۆرەی نوسیوە: (لە گوندەکە هەواڵیان دامێ ، کە تاقمی بەرپرسانی یەکێتیی دەیانەوێ بپەڕنەوە بچنە سوریا ، من ئەم هەواڵەم بەلاوە سەیر بوو، تاقمی

بەرپرسی یەکێتیی بەبێ ئاگاداری ئێمە، بەسەر ئێمەدا بازیەن و بیانەوێ بچنە سوریا... بەخێرهاتنم کردن و لێم پرسین" ئێوە کێن؟"" زۆریان پێ ناخۆش بوو، بە تووڕییەوە ئەوانیش لەمنیان پرسی: " تۆ کێی؟"

ووتم: "من فلانم . بەڵام ئێوە کێن؟ و بۆچی هاتوونەتە ئێرە بەبێ ئاگاداری ئێمە؟.

مەلا بەختیار هەڵی دایە و ووتی:" من مەلا بەختیارم نوێنەری کۆمەڵەم ، ئەوە کاک رەسول مامەندە نوێنەری بزوتنەوەیە، ئەوە کاک عەلی کۆیە بێ لایەنە ، ئەوەش فازیل جەلالە و نوێنەری ق. م..... ئەچین بۆ سوریا مام جەلال ئەبینین و کێشەی ئێوە و ق. م چارەسەر ئەکەین". ئەگەر هەر کەسی ئەو چەند دێرەی یەکەم ببینێ ئەندامانی سەرکردایەتی دەرەوە و سەرکردایەتی ناوەوە*[٢] بە وردی بخوێنێتەوە ، تێدەگا کە هەر لە یەکەم چاوپێکەوتنی یەکتریان ماکی ناکۆکی نێوانیان سەریهەڵداوە.

هەر وەك نەوشیروان بە راشکاویەوە لە کتێبی لە کەناری دانوبەوە.... لاپەرە (١٦٧)دا، بە مام جەلال دەڵێ : "ئێستا ماندوم لەم هەورازە دا ناتوانم زۆر قسە بکەم، بەڵام هەر ئەوەندەت پێ ئەڵێم : ئێمە: ئەوانەی دەرەوە، لەگەڵ ئەم

---

* سەرکردایەتی دەرەوە خۆیان بە دامەزرێنەر و رابەر و لێپرسراوی یەکەم و دروستکەرەوەی شۆرشی نوێ یەکێتیی نیشتمانیش دەزانی.

– خۆیان بەسەرکردەی لێهاتوو خاوەنی ئەزمونی کۆنی شۆرشی ئەیلول دەزانیو سەرکردایەتی ناوەوەشیان ، جگە لە کاك عەلی عەسکەری و د. خالیدو رەسول مامەند لەساتی گەنجو خوێن گەرمو هەڵەشەو بێ ئەزموون دەزانی و وەك ئۆرگانێکی ناوەوەی خۆشیان سەیریان دەکردن.

بەڵام سەرکردایەتی ناوەوەش، خۆیان بە هەڵگیرسێنەرەوەی شۆرش و دروستکەری ی. ن. ك لەناو وڵاتو دامەزرێنەری مەفرەزە سەرەتاییەکان دەزانی.

– سەرکردایەتی ناوەوە، پێیان وابوو ، رۆڵی ئەو سەرکردە تەقلیدیانە بەسەرچوە و توانای سەرکردایەتی و رابەرایەتی کردنی شۆرشێکی نوێ و پیادەکردنی سیاسەتێکی نوێیان نییە.

برادەرانەی ئێرە، هەر ناوەکەمان یەکە ، ئەگینا لە هەموو شتێکدا جیاوازین،.....
بەجێ هێشتنیان لەم کاتەدا عەیبە، ئەگینا هەر لێرەدا پێشنیارم بۆ ئەکردی بە کام رێگادا هاتووی بە هەمان رێگادا بگەرێتەوە بۆ دەرەوە".

– سەرکردایەتی ناوەوە پێیان وابوو، کە ئەوان دەسپێشکەر و دامەزرێنەری شۆرش و ئەوانەی دەرەوە (دخیلن) و لە باشترین حاڵدا ، دەبێ سەرانی دەرەوە گوێرایەڵ و پرسکەربن بە سەرانی ناوەوە ،سەبارەت بە هەر نەخشە و پلانێك بۆ گەشەکردنی شۆرش و باری سیاسی ناوچەکە و دابرێژرێ.

*سەرانی دەرەوەش خۆیان ، بە سەرچاوەی دەسەڵاتی شۆرشی نوێ و خاوەن پارە و چەك و تەقەمەنی و پشتگیری دۆستانی ئەوسای کورد دەزانی ، پێیان وابوو ، دەبێ دەم راست و ریش سپی و خاوەن بریاری هەموو لایەك بن ، بە تایبەتی کە لە ناویاندا مام جەلال و عومەر دەبابە خاوەن ناو و ناوبانگێکی گەورەی شۆرشگێری و سیاسی ناوخۆ و دەرەوەش بوون.

ئەمانە و گەلێ هۆی تریش ، دوایی باسیان دەکەم ، بوونە هۆی دروستبوونی گەورەترین ناکۆکی لە نێوان کۆمەڵە و کۆمەڵە و کۆمەڵە و بزوتنەوەش ، کە لە راستیدا چ مام جەلال و چ نەوشیروان لە سەرانی دەرەوە ، شاسوار جەلال و نەجمەدین عەزیز و حیکمەت محەمەد لە سەرانی ناوەوە هەر لە یەکەم پێکگەیشتنیان کێشە ناوخۆییەکانی کۆمەڵەیان قوڵتر و سەختتر کرد.

مام جەلال لە مانگی٧/١٩٧٧دا گەرایەوە کوردستان بە رێگەی تورکیادا ، بەڵام لە بارودۆخێکی زۆر خراپدا.

لە رووی پێکهاتەی شۆرشی نوێ و خودی یەکێتییەوە ،لە چەند رێکخراوێکی جیاواز لە بیروبۆچون و مەبەست لەبارەی هەڵگیرسانی شۆرش ، لە هەڵوێستیان لەسەر حکومەتی عێراق ، لەسەر دروشمی شۆرش ، لە هەڵوێستیان لەسەر چینە کۆمەلایەتیەکان ، لە کۆکردنەوە و شێوەی رێکخستنی پێشمەرگە.

له گۆرەپانی خوارووی کوردستاندا ، له بارێکی ناهەموار و ناکۆك لەگەل ق. م دا، که هیچ لایەکیان واته "ی. ن. ك "و "ق. م " دانیان به یەکتری دا نەدەنا ، لەوەی کە دەسپێشکەری بن بۆ هەڵسانەوەی باری گلاوی بزوتنەوەکەی پاش ئاشبەتاڵ و بە توندیش رێگریان له گەشەسەندنی یەکتری دەکرد ، لە ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی خۆیاندا. به تایبەتی ق.م.

**لەبەر چەند هۆیەك:**

١ـ خۆیان به میراتگری شۆرشی ئەیلول و درێژه پێدەری ئەو شۆرشه دەزانی .

٢ـ خۆیان به درێژەپێدەر و خاوەن سەروەری پارتی (پارتی بارزانی) دەزانی.

٣ـ "مام جەلال" یان بە دروستکەری یەکێتیی ، وەك بەدیل بۆ پارتی دەزانی و ناکۆکیەکی قول و درێژخایەنیان لەگەڵی هەبوو.

٤ـ شادەماری رێگای گەیشتنی چەك و پێشمەرگه و هەواڵ و کەرەسەی چاپ و بلاوکردنەوە و پارەی یەکێتیی له سوریاوه بەدەست ئەوانه بوو، بۆیه ئامادەی هیچ جۆره رێکەوتنێك نەبوون لەگەڵ یەکێتییدا.

له رووی پێداویستی شۆرشەوه . هەم ژمارەی پ. م کەم و هەم ژمارەی چەکیش له رووی جۆر و ژمارەوه زۆر کەم بوو. تەنانەت ژمارەیەکی زۆر پێشمەرگەی بێ چەك هەبوو، دیهاتی سەرسنورەکانی زۆریان راگوێزرا بوون یان هێزی حکومەتی بەعسی تێدا بوو ، پارە نەبوو ، بۆ مەعاشی پێشمەرگه ، پێشمەرگەکان و لێپرسراوەکانیشیان به یارمەتی کەس و کاریان دەژیان.

لەرووی پەیوەندییەوه قیادەی موەقت ، رێگەی پەیوەندی به دەرەوەی ولات لە تورکیاوەی بری بوو، ئێرانیش هەموو دەروەکانی له خوارووی کوردستان بری بوو ، لەسەر رێکەوتنەکەی جەزائیر، لەناو ولاتیشدا بەعس هەموو رێگای پەیوەندی به شارەکانەوه بری بوو . هیچ دەزگایەکی پەیوەندی و راگەیاندنی وەك جیهاز و رادیو و ئامێری چاپ و بلاوکردنەوه نەبوو.

یەکێتیی تا ئەوکاتەش ئۆرگانیزە نەکرا بوو، واتە نە سکرتێر و نە سەرکردایەتی و نە ئۆرگانەکانی تری، وەك بەرە یا نیمچە بەرەیەکی یەکگرتوی نەبوو، کە بە شێوەیەکی ناوەندی سەرکردایەتی شۆڕش و یەکێتیی بکات، ئەویش سەبارەت بە قایل نەبونی هیچ کام لە دوو باڵەکەی کۆمەڵە و بزوتنەوە بەرپرسی یەکتری.

تا گەرانەوەی مام جەلال و بە جۆرێك لە تەنسیق کردن، کۆمەڵە (شاسوار جەلال) و بزوتنەوەش (رەسول مامەند) یان، بۆ لێپرسراوی سیاسی ناوخۆیان دیاری کرد بوو، بۆ کاروباری پێشمەرگانەش لە کۆمەڵە "نەجمەدین عەزیز، تالیب رۆستەم، مەلازم عومەر". لە بزوتنەوە " عەلی عەسکەری، د. خالید، مەلازم تایەر " دیاری کرا بوون. لە ناوچەکانی تریش، لە هەر ناوچەیەك کادرێکی کۆمەڵە و یەکێکی بزوتنەوە هەبوو، کە هیچیان بە بریاری ئەوی تریان کاری نە دەکرد.

مام جەلال بە گەرانەوەی ویستی یەکێتیی و شۆڕش لەو پاشا گەردانیە دەربازکات و لە سەرکردایەتیەکی یەکگرتوو لەهەر سێ باڵەکەی یەکێتی "کۆمەڵە، بزوتنەوە، خەتی گشتی" پێکبێنێ، بۆیە کۆبونەوەیەکی لە سەرانی کۆمەڵە و یەکێتیی و خەتی گشتی پێکهێنا. کە ماوەی (١٣) رۆژی خایاند لە١٩٧٧/٨/٣١ تا ١٩٧٧/٩/١٢.

نوێنەرانی کۆمەڵە لەو کۆبونەوەیە بریتی بوون لە: (نەشیروان مستەفا، کە بە زۆرەملێ و سوربوونی مام جەلال لە کۆمەڵە دانرا بوو، شاسوار جەلال، کە بروای بە کۆبونەوەکە نەبوو، بەشداریشی تێدا نەکرد و لەبەری قەرەداغ نەجولا، نەجمەدین عەزیز، حیکمەت محەمەد کەریم، ئازاد هەورامی، ملازم عومەر عەبدوڵلا).

نوێنەرانی بزوتنەوەش پێکهاتبوون لە: (عەلی عەسکەری، رەسول مامەند، د. خالید سەعید، ملازم تایەر، عەلی والی، سەعدی گچکە "سەعدی عەزیز"، عومەر دەبابە لە کۆبونەوەکەدا نەبوو).

نوێنەرانی خەتی گشتی: شێخ حسێن بابە شێخ ود. فواد مەعسوم، د. کەمال فواد، د. عومەر شێخ موس، عادل مراد، کە جگە لە شێخ حسێن کەسیان بەشداری

کۆبونەوە نەبوون و هەموویان لە دەرەوەی ولآت بوون. لەو کۆبوونەوە(٢) ئەرکی سەرەکی بڕیاری لەسەردرا. ئەوانیش:

١ـ دیاریکردنی سکرتێری گشتی ، کە بە گشتی دەنگ مام جەلال درا، لەگەڵ دانانی "م. س" بە توافق لە نێوان کۆمەڵە و بزوتنەوە بۆ "٤" کەس، شاسوار و نەجمەدین لە کۆمەڵە، عەلی عەسکەری و ڕەسول مامەند لە بزوتنەوە ، خەتی گشتی کەسیان نەبوو، چونکە هەموویان لە دەرەوە بوون.

٢ـ دانانی سەرکردایەتی لەو کەسانەی ، کە بەشداری کۆبونەوەکەیان کرد بوو لەهەر" ٣ " خەتەکە.

٣ـ ڕێکخستنی هێزی پێشمەرگە بە سەرپەرشتی ئەندامانی سەرکردایەتی یەکێتیی بە شێوەی هەرێم ، کە هەموو ناوچەکانیان کردە"٨" هەرێم.

**هەرێمەکان:**

أـ هەرێمی بادینان.

ب ـ هەرێمی پێنجوێن و هەورامان.

ج ـ هەرێمی شارباژێر.

د ـ هەرێمی پشدەرو بیتوێن.

هـ ـ هەرێمی خۆشناوەتی.

و ـ هەرێمی دەشتی هەولێر.

ز ـ هەرێمی کەرکوك.

ح ـ هەرێمی قەرەداغ .

بۆ هەر هەرێمێك فەرماندەیەك و جێگرەکەی دانرا، فەرماندەی هەر هەرێمێك کۆمەڵە بوایە، جێگرەکەی بزوتنەوە دەبوو ، و بەپێچەوانەوە. هەرێم لە کەرت و مەفرەزە پێکهێنرا . واتە بە چەند مەفرەزەیەك لە ١٠ـ ١٥ پێشمەرگە ، یەك کەرتی لە ٣٠ـ ٥٠ پێشمەرگەی پێکدەهێنا و لە ٣ـ ٥ کەرتیش هەرێمیان پێك دەهێنا.

٤ـ ڕێکخستنی ڕێکخراوەکانی یەکێتیی لەسەر شێوەی (لق ـ لیژنەی ناوچە ـ ڕێکخراو) دامەزرایەوە و هەمو ناوچەکانیان کرد ، بە(٤) لق لەسەر یەکەی جوگرافی پارێزگاکان. لقی سلێمانی، لقی هەولێر،لقی کەرکوك، لقی بادینان. بۆ هەر قەزایەکیش ، کە خەڵکی سەر بە یەکێتیی تیا بووایە ، یان دەستی مەفرەزە و رابەر سیاسی بگەیشتایەتی لیژنەی ناوچەیان بۆ دانا.

لە راستیدا ڕێکخستنەکانی یەکێتیی بە کردەوە زیاتر لە دەرەوەی شارەکان ، واتە دێهاتەکانی ناوچەکان دەکرا، لەپێشا خەڵکیان بە ناوی یەکێتیەوە ڕێکدەخست و پاشان هەر با لە هەوڵی دەدا بۆ خۆی رابکێشێ.

لە ناو شارەکان ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە و بزوتنەوە جیا بوون، کۆمەڵە ئامادە نەبوو ڕێکخستنەکانی خۆی لەگەڵ بزوتنەوە تێکەڵاوکا و وەك یەکێتیی کار بکەن . جیابونەوەی خەتێك بە ناوی کۆمەڵە ئەو هەموو گورزە گەورانەی بەری کەوت ، هەر لە باڵی عراقچێتی و گرتنی چەندین کادر و خەتێك بە ناوی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان لە ١٩٧٦و گرتنی خاڵە شەهاب و هاورێکانی و گرتنی چەندین کادر و لێپرسراوی شارەکان، پاشان کێشەی نێوان کۆمیتەی شارەکان و کۆمیتەی هەرێمەکان . چوونە شاخی زۆربەی کادرە ئەساسیەکانی لە ١٩٧٦، بەڵام هێشتا ڕێکخستنی کۆمەڵە لە شارەکاندا بەهێز ڕێکخراو بوو . هێشتا چەندانی وەك جەمال تایەر ، شازاد سائیب ، حەمە چاوشین و بەندە لە سلێمانی و عەبدەلرەزاق لە هەولێر و ئەحمەد کرێکار و حەمیدی پۆلیس لە کەرکوکدا مابوونەوە ، بۆ کاری ژێر زەمینی ، کە پاش ئەو کۆبونەوەیە ئەوانە کرانە سەرکردایەتی ناوخۆ.

## کۆمەڵە و مەفرەزە سەرەتاییەکان.

دوای پەیوەندی کردن بە کاك شەهاب و جەعفەر عبدولواحید لە زینداندا ، کە پێشتر باسم کردوون و هاتنی نامەی مام جەلال بۆ کۆمیتەی شارەکان و هەرێمەکان و

پاشان بۆ کاك عومەر دەبابە و عەلی عەسکەری و چوونی کاك عومەر بۆ سوریا .
کۆمەڵە لە بڕیاریدا ، کە دەست بکات بە ناردنە دەرەوەی ئەو هەڤاڵانەی کە ئامادەییان تیا نیە یان مەترسی گرتن و ڕاونانیان لەسەرە.
لە سوریاشەوە سەرکردایەتی یەکێتیی بڕیاری دابوو، یەکەم دەستەی چەکدار لە سوریاوە بەبۆنەی تێپەڕبوونی ساڵێك بەسەر دامەزراندنی یەکێتییدا واتە لە ١٩٧٦/٦/١ دا بنێرێتەوە کوردستان ، هەمویان ٣٧پێشمەرگە بوون ، بە فەرماندەیی نەقیبی قرۆکەوان (ئیبراهیم عەزۆ) .کۆمەڵەش بڕیاریدا لای خۆی لە یادی یەك ساڵەی دامەزراندنە یەکێتیدا ، دەستە چەکدارەکانی خۆی بنێرێتە دەرەوەو، بەڵام بە هۆی نە گونجانی بارودۆخ لە هەندی ناوچە دواکەوت.
دەستەی یەکەمی پێشمەرگەکانی شۆڕشی نوێ لە کاتی جیاجیا لە مانگی ٦، ٧، ١٩٧٦/٨ ناوکی شۆڕشی نوێیان پێکهێنا. بەم جۆرە:
١ـ لە ناوچەی حاجی ئۆمەران: دەستەیەك پێشمەرگەی شۆڕشی نوێ پاش ئەوەی لە ١٩٧٥/٨/٣٠ پەیوەندی بە کاك عومەر دەبابەوە دەکەن، لە ٢٥، ١٩٧٦/٥/٢٦ دا ڕوودەکەنە شاخ بە ڕابەری مەلا شیمەی حاجی ئۆمەرانی و حاجی شێخەی بنبێرە. ئەمانە سەرەتا سە ر بە یەکێتیی بوون . بەڵام پاش ماوەیەك ، کە نە عومەر دەبابە و نە کەسی تری یەکێتیی و کۆمەڵە دەبینن پەیوەندی بە پارتیەوە دەکەن . جگە لە حاجی شێخە و چەند پێشمەرگەیەك کە تا مانگی ١٩٧٨/٧ لێپرسراوی دەستەیەك بوو، لە هەرێمی پارێزگاری.
٢ــ لە ١٩٧٦/٦/٧دا خەلیل جەلال و فەقێ حەسەن حەمەد ئاغای کانیسکان پەیوەندی پێکەوە دەکەن و پاشان لەگەڵ قادر خەبات و مەحمود سەیدە مام عەبدوڵڵا و ئەبو بەکر ، یەك دەگرنەوە و یەکەم دەستەی چەکداری لە ناوچەی باڵەکایەتی و قەڵاتوکان و سەنگەسەر پێکدێنن.*

---

* خەلیل جەلال لە ١٩٧٦/٦/٣دا نامەیەکی کۆمەڵەمان پێدا ناردو بۆ فەقێ حسنی حمد ئاغی کاسکانو حمدی زارگەلی تا لەرێگەی بەو چەکانەی شارد بۆیانەوە لەئاشبەتاڵ دەستەی چەکدارو دروست کەن. بەڵام خەلیل جلال لەخوار قەلادزەوە دەگیریو نامەکە قوت دەداو پاشان لە ٦/٦ لەسجنی قەلادزە ڕادەکا.

٣ـ له ١٩٧٦/٦/٢٦و لەگەڵ دەستەکەی عەلی کۆ یەك دەگرنەوە . مەفرەزەیەك لە ناوچەی هەڵەبجەو شارەزوور ، مەحمود عەبدولرەحمان"شێخ عەلی" ، شەکەوتی حاجی موشیر، عەلی شیمە، حامید حاجی غالی، توفیق رەحیم ، حەمە سەعید حەمەمین و حەمەی حاجی محمود، دەچنە شاخی سورێن.

٤ــ مەفرەزەکەی (کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان) ، باڵێك بوون ، رێبازی عراقچێتیان لەناو کۆمەڵەدا هەبوو، بە خەت مائل کاریان دەکرد بەسەرپەرشتی ئیبراهیم خەلیل و ئیبراهیم حەسەن ، کە ئەوانیش لە مانگی ١٩٧٦/٦دا لە ناوچەی هەڵەبجە بە سەرپەرشتی ئیبرایم خەلیل دەستەیەکی چەکداریان پێکهێنا.

٥ـ له مانگی ١٩٧٦/٧ دا ، دوو مەفرەزەی چەکداری لە شارباژێر بە سەرپەرشتی نەجمەدین عەزیز (سالار) و مەفرەزەیەکیش لە دۆڵی جافەتی بە سەرپەرشتی جەمال عەلی باپیر و بە هاوکاری عەبدولقادر هەلەدنی . باوکی شەهید غەریب هەلەدەنی پێکهات .

٦ـ هەر لە مانگی ٧/ ١٩٧٦مەفرەزەیەکی چەکدار بە سەرپەرشتی فەیسەل تاڵەبانی "شەهید سیروان" لە بەری قەرەداغ و لە ١٩٧٦/٧/٢٩دا لە شارباژێر مەفرەزەیەکی تر بە سەرپەرشتی ملازم جوامێر سیامیر پێك هات.

٧ـ پاشان لە نیوەی مانگی ١٩٧٦/٨دا عەلی عەسکەری و د. خالید و سەید کاکە و سەعدی گچکە و عومەر دەبابە، چەند کەسێکی تر ، کە خەلیل جەلال لە رێگەی سەنگەسەر دۆڵی شەهیدانەوە دەیانگەیەنێتە گوندی ئینزە ، لەوی لەگەل عەلی کۆ دا یەکدەگرنەوە.

٨ـ لە مانگەکانی ٩، ١٠، ١١ مەفرەزەکانی کۆمەڵە و بزوتنەوە لە ناوچەکانی کۆیە و خۆشناوەتی و دۆڵی ئاکۆ و زرارەتی پێکدەهێنرێ.

لە داوی پێکهێنانی ئەو مەفرەزە سەرەتاییانە ، کە لە ماوەی (٥) مانگدا ، لە زۆربەی ناوچەکانی بەشی سۆراندا سەریهەڵدا، بە خێراییەکی چاوەروان نەکرا و ژمارە و

قەبارەی هێزی پێشمەرگە پتر و پتر دەبوو. چالاکی پێشمەرگانە لە قۆناغی گەران و پروپاگەندەی چەکدارانەوە گوێزرایەوە بۆ دەسوەشاندن لە دوژمن و بڵاوبوونەوەی چالاکی شۆرش بە ناو هەمو کوردستاندا دەنگدانەوەی لە ناو جەماوەردا و داچڵەکاندنی رژێمی بەعس.

بەڵام پاش قەبە بوونی و تێکچژانی جۆرا وجۆر تاقم و کەسانی سەر بە هەموو جۆرە چین و توێژەکانی کۆمەڵ و پێکهاتەکەی چەندین بیروبۆچوونی جیاجیا، یەکێتیی و کۆمەڵەش نەیانتوانی جڵەوی شۆرشەکە بەو جۆرە بگرنە دەست ، کە هەم مەرکەزییەت و هەم دیسپلین و هەم پابەندبوون بە بەرنامە و پەیرەو و ئامانجی تیا بێ . دیارە ئەم دیادەیەش گەلێ هۆکاری سەردەمی خۆی هەبووە.

١- بارودۆخی پاش ئاشبەتاڵ و چۆڵ بوونی مەیدانی خەباتی چەکداری ، زەمینەیەکی وای خولقاند ،کە خەڵکی بە هەموو جیاوازیەکی بیرورا و چینایەتیەوە ، خوازیاری پرکردنەوەی ئەو بۆشاییە بوون . هەر رێکخراو وحزب و گروپێك لەوکاتەدا چەکی خەباتی شۆرشگێری بەرزکرایەتەوە ،خەڵکی لە دەوری کۆدەبوونەوە و پشتیوانیان لێ دەکرد.

٢- زوری ستەم و شاڵاوی دراندانەی رژێمیش پاش هەرەس ، بۆ سەر خەڵکی لە شار و لادێکان و گرتنە بەری سیاسەتی تۆقاندن و راوەدونان و پاشان بڵاوکردنەوەی سوپا چەکدارەکەی بەسەر هەموو ناوچەکانی کوردستاندا، وای لە خەڵکی کردبوو ، چاوەرێ تروسکەیەکی هیوای بەرگری بن.

٣- تەقەڵای رژێم بۆ جێبەجێکردنی سیاسەتی دابرینی لادێکان لە شارەکان و چۆڵکردنی هەموو ناوچە سنوریەکانی خوارووی کوردستان لە شارۆچکە و لادێکاندا بە قوڵایی ٢٠م پاشان سوتاندن و کاولکردنیان و وشککردنی سەرچاوەکانی ئاو و راگواستنی دانیشتوانەکانیان بۆ ناو ئۆرگا زۆرملیچیەکان، وای لە زۆربەی دانیشتوانی ئەو شارۆچکە و لادێیانە کرد. کە لەهەرلایەکە و تروسکەیەکی خەباتی چەکداری دەرکەوی پەنای بۆ بەرن و لەگەڵیاندا بەرگری لە زێدی خۆیان بکەن.

یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان ، کە لە سێ باڵی لە یەکتر جیای (کۆمەڵە، بزوتنەوە، هێڵی گشتی) پێك هاتبوو، دیارە لە سەرەتاوە سێ ناوەندی بڕیار و سێ سەرکردایەتی و سێ جۆر دیسپلین و پرەنسیپ و کاری ڕێکخراوەیی جیاواز لە یەکتریشی تێدا بوو، ئەم جۆرە پێکهاتەیەی یەکێتیی لە سەرەتاوە تا رسکانی ، کەند و کۆسپێکی زۆری خستبووە بەردەم تەقەڵای پاك و پوختەکردن و بژارکردنی هەم ڕێکخستنەکانی یەکێتیی و هەم هێزە چەکدارەکەشی . گری و گۆڵی زۆری لە ڕێگەی پەروەردەکردن و هوشیارکردنەوە و سازدانی ڕێکخستنەکانی و هێزە چەکدارەکەیدا قوت کردبۆوە و نەیدەتوانی پەیڕەوی تەواوی دروشمەکەی بکا .
که بریتی بوو لە (شۆرشی نوی ، سوپای رزگاری نوێ، دەست ودەم و داوین پاك).

جگە لەوەش پەیدابوونی سەرکردەی تازە و کەم ئەزمون ، هەم لە خەباتی سیاسی و هەم لە خەباتی پێشمەرگانە و پێك هاتوو لە جۆراوجۆر بیرورا و تیۆر لە هەر سێ باڵەکە، ئەمەش کۆسپێکی تری لە بەردەم کاری بە کۆمەڵی سیاسی و ڕێکخراوەیی و خەباتی چەکداریدا قوت کردووە . هەر یەك لە ئەندامانی سەرکردایەتی باڵەکان خۆیان بە ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتیی و بڕیاردەر و خاوەن فەرمانی بڕە و بکوژی هەموو هێزە چەکدارەکە دەزانی و هەموو دێ و ناوچەیەکی ژێر دەسەڵاتی شۆرشی نوێشیان بە ناوەندی کار و دەسەڵات و جێبەجێکەری بڕیارەکانی بێ چەند و چۆنی خۆیان دەزانی، دەیانویست بیر و بۆچوونەکانی خۆیان بە داسەپاندن ، بەسەر پێشمەرگە و لایەنگرەکانی باڵەکانی تردا بسەپێنن.

ئەم لێکتر تێنەگەیشتن و یەکتر نە ناسین و هەڵسوکەوتە پاوانخوازی و باوکسالاریە، کۆسپێکی تر بوو، لە بەردەم یەکێتییدا . هەردەم لەبەر مەترسی لێکترازان و قوڵ بوونەوەی ناکۆکیە لاوەکیەکاندا بوو ، لە لایەکی تر نەپەرژانە سەر خۆرێکخستنەوە و بە خۆداچوونەوە و خۆ بەهێزکردنی ، سەبارەت بە خەریك بوون و ململانێ لاوەکیانە.

لەناو یەکێتییدا دروشمی شۆڕشی نوێ و ئامانج و لە خەباتی چەکداری بەشێوەیە ڕوون و ئاشکرا دیاری نەبوو، لەلایەکەوە دروشمی مافی چارەنووس و بنیاتنانی کوردستانێکی دیموکراتی، لەلایەکی ترەوە خەبات بۆ بەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمی (ڕاستەقینە) و عیراقێکی دیموکرات و لەلای سێیەمیشەوە دروشمی ناچارکردنی ڕژێم بۆ چاو داگرتنێك کە وتووێژ و ڕێکەوتنی لێ بکەوێتەوە.

لەلایەکەوە ناوزەدکردنی شۆڕشی نوێ ، بە شۆڕشی گەلی کوردستان و پەیرەو کردنی کوردستانیەت ، لەلایەکی ترەوە بیر و بۆچوونی شۆڕشی کلپەسەندوی عیراق لە کوردستانەوە و پێکهێنانی ناوکی بەرەیەکی عیراقی پێشکەوتوخوازی نوێنەری کرێکاران و ڕەنجدەرانی عیراق ، کەوا هەم دژ بە بەرەی ئیمپریالیزمی و سەرمایەداری ئەوروپی و هەم دژ بە دار و دەستەکانیان بێ ، کە خۆی لە ڕژێمی دکتاتۆری شۆڤێنی عیراقی و کۆنەپەرست و دەرەبەگەکانی ناوخۆدا دەنوێنێ.

لەلایەکەوە کار کردن بۆ دروستکردنی بنکەی فراوانی شۆڕش و کۆکردنەوەی هەموو چین و توێژەکانی کۆمەل و ئاراستەکردنینان بە ئاقاری خەباتێکی هاوبەش ، بەلاَم لەلایەکی ترەوە کارکردن بە ئاقاری پێکهێنانی (بؤرة ثوری) و بنیاتنانی بنکەی سوور و بەرپاکردنی شۆڕشی چینایەتی بە ڕابەری کرێکاران و هاوکاری جوتیاران بۆ بەرگری لە کوردستان دژی ڕژێم و هەلتەکاندنی دەرەبەگایەتی ناوخۆ و بە هیوای دابەشکردنی زەوی و زاری دەرەبەگایەتی.

ئەو هەلو مەرجەی ، کە شۆڕشی نوێ تیا لە دایکبوو ، هێندە سەخت و دژوار بوو، کە تەنیا تروسکاییەك نەبوو ، بۆ دروستکردنی هیوای گەشەسەندن و پەرەپێدان و هەنگاونانی بەرەو سەرکەوتن و بە دەستهێنانی دەسکەوتی سیاسی.

ئەوە حالی ناو یەکێتیی و شۆڕش بوو. کە پێشتر باسم کرد. لە هەناوی خۆیدا چەند ئالۆز بوو.

**فاکتەرە دەرەکیەکانی تری ڕێگر لە بەردەم شۆڕش دا.**

١ـ بە خۆداهاتنەوەی ڕژێم پاش ئاشبەتاڵ و سازدانەوەی سوپاکەی ، هەم لە رووی چۆنایەتی و هەم چەندایەتیەوە، پڕ چەك كردنیان، بڵاوكردنەوەیان بە كوردستاندا و گرتنی هەموو شار و شارۆچكە و شاخ و گرد و دۆڵ و ڕێگا و بانەكان بە دامەزراندنی سەربازگە و رەبایە لە سەرتاسەری سنوری عێراق ـ ئێران ـ توركیا ـ عێراق.

٢ـ راگواستنی دێهاتەكانی سەر سنورەكان و نەهێشتنی شوێنێكی حەسانەوە بۆ پێشمەرگە و شۆڕش.

٣ـ گرتنی سەر سنورەكانی ئێران ـ عێراق لەلایەن رژێمی ئێرانیەوە بەپێی ڕێكەوتنەكەی جەزائیر.

٤ـ چەككردنی كوردستان پاش ئاشبەتاڵ و نەهێشتنی چەك لە ناوچەكاندا(مەگەر بە دەگمەن).

٥ـ بەستنی سنوری توركیا و هەرەشەی عەشیرەتە كوردەكانی ئەو سنورە لەیەكێتیی بە ڤیتو پڕوپاگەندەی قیادە موەقتە.

٦ـ كولانەوەی برینە كۆنەكەی (مەلایی ـ جەلالی) و قوت بونەوەی قیادە موەقتە لە بەردەم یەكێتیی و كاركردنیان بە هەموو جۆرێ بۆ لێدان و لاواز كردن و پاشان ئاشبەتاڵ پێ كردنی شۆڕشی نوێ ، چ لەناو ئێران و چ لەناو توركیا و چ لەسەر ڕێگاكانی هاتوچۆی یەكێتیی لە بادینان.

یەكێتیی جگە لە سەرچاوەی لە بران نەهاتوی گەل، تەنیا سەرچاوە و یارمەتدەرێك لەوكاتەدا ، كە بوو بێتی ، سوریا و لیبیا و یەك– دوو ڕێكخراوی فەلەستینی بوون، یەكێتیی هیچ درویەكی پەیوەندی پێوە كردنیانی نەبوو.

دیارە لەو هەلومەرجەی ئەوسادا، سروشتی بوو ، كە سوریا بە تایبەتی یارمەتی هەموو گروپ و تاقم و حزب و ڕێكخراوێك بدا ، چ لە كوردستان و چ لە عێراق ، كە دژی شۆڕش یا چالاكی چەكدارانە بكەن لەبەر دوو هۆی سەرەكی:

١ـ بەعسی سوریا و بەعسی عیراق دوو باڵی بەعسی دژ یەك و نا تەبا بوون و هەر باڵێك لە هەوڵی ئەوەدا بوو، باڵەکەی تر لەسەر حوکم لابەرێ و لایەنگرانی خۆی بخاتە سەر حوکم ، چ لە عیراق و چ لە سوریا.
٢ـ سوریا لەوە گەیشتبوو کە ئەمەریکا هێندەی پێویستی بە عیراقە و لایەنگری دەکا ، ئەوەندەش کار بۆ روخانی رژێمی بەعسی سوریا دەکا، لە رێگەی عیراقیشەوە دەیەوێ حوکم لە سوریا بروخێنێ . چونکە ئەو کاتە سوریا سەر سەختترین دەوڵەتی عەرەبی بوو، لە بەرانبەر ئیسرائیل و ملی بۆ گفتوگۆ نەدەدا. ئەم بەشەی راپۆرتی پایك لەمەر رێکوتنەکەی جەزائیر بەڵگەی ئەوا راستیەیە دەڵێ : " کیسنجەر، ووتی : ئێمە پشتی کوردەکان بەر دەدەین، بۆ ئەوەی عیراق مەودای ئەوەی توانای هەبێ ، کە بپەرژێتە سەر پەلاماردانی سوریا، چونکە تا ئێستاش سوریەکان دژی گفتوگۆن."
و دەڵێ :" سیاسەتی ئێمە بەرامبەر کوردەکان بێ رەوشتانە بوو، چونکە نەپاش جەزائیر یارمەتیمان دان، ونە وازیشمان لێ هێنان ، خۆیان چارەسەری کێشەی خۆیان بکەن ،لە گفتوگۆیان لەگەڵ عیراقدا، ئێمە هانماندان گفتوگۆ واز لێ بێنن و بیانو بگرن و شەڕ بکەنەوە و هەر ئێمەش پشتمان تێ کردن"*
یەکێتیی لەو کاتەدا جگە لەوەی هەموو دەرگایەکی یارمەتی و هاوکاری و فەراهەمکردنی پێداویستیەکانی لە چەك و تەقەمەنی و ئازووقە و پارە و کەلوپەلی تر لێ داخرا بوو، دەنگیشی بە هیچ لایەکدا نە دەگەیشت، چونکە ئێزگە و دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی نەبوو.
چارەسەرکردنی کێشەکان و نەخشەو پلاندانان بۆ دەرچون لە قەیران و بارودۆخە کاتێکی زۆر و تەقەلایەکی زۆر و لێبڕانی تەواوی دەویست بە هەست و مێشکێکی حەساوەوە بۆ شکاندنی ئەلقە ئەلقەی ئەو گەمارۆ و ئاستەنگیانە ، ئەمەش پتر لە(٣) ساڵی سەبارەت بە لێدانی مەفرەزەکان و داگیرکردنی چەکەکان لەلایەن قیادە موەقت و پاشان هێرشی دوو قۆڵی ئێران و عیراق بۆ سەر یەکێتیی لە پاییزی ١٩٧٧، و دوای ئەوە کارەساتی هەکاری و دواتر جیابونەوەی بزوتنەوە.

---

* الغد ديموقراطي وحرمان شعب حتى من حق الحكم ـ جلال الطالباني ص ٦٠

# بەشی پێنجەم
# کارەساتی هەکاری و کۆمەڵە.

## ٤-١ کارەساتی هەکاری و کۆمەڵە.

لەم بەشەدا لەسەر چۆنیەتی روداوەکە و رێپێوانەکە و درێژەی ئەنجامەکانی نانوسم ، لەبەر ئەوەی:

أ- خۆم لەگەڵیان نەبووم لەو رێپێوانە، بەڵکو من دوای دوومانگ لە رووداوەکە گەیشتمە سەرکردایەتی لە قەندیل .

ب - لەبەر ئەوەی زۆری لەسەر نوسراوە . لەلایەن سەرکردەکان و کادرە سیاسی و پێشمەرگەکانی بەشداربوی رووداوەکە و هیچ لایەنێکی شاردراوە و باس نەکراوی ئەو کارەساتە نەماوە ، باس نەکرا بێ و نە نوسرابێتەوە، چ بە بەیانی سەردەمی خۆی و چ بە نوسینی یادەوەریەکان ، لەلایەن بەشداربوەکانی کارەساتەکە و لەلایەن هەردوو لایەنی بەشداربوی کارەساتەکە (قیادەی موەقتە و یەکێتیی).

ئەوەی من دەمەوێ لێرەدا باسی بکەم:

أ- رۆڵی کۆمەڵە لە بڕیاردان لەسەر ئەو رێپێوانە.

ب - هەڵسەنگاندنی بڕیارەکەو هۆکانی ئەو بڕیارە.

ج - تاوتوێکردنی بۆچوونەکانی نەوشیروان مستەفا ، هەم لە کاتی بڕیاردان و هەم لە هەڵسەنگاندنی ئەنجامگیریەکەی کارەساتەکە. لە کتێبی (لە کەناری دانوبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ) لەو روەوەی ، کە ئەو هەم ئەندامێکی سەرکردایەتی کۆمەڵە و هەم یەکێتییش بووە.

نەوشیروان لەلاپەڕە (٢٦٤)دا باس لەوە دەکا کە یەکێتیی ، بۆ جاری دووهەم دوای گەرانەوەی مام جەلال خولی کۆبوونەوەکانی خۆی دەست پێکردوە و چەندین مەسەلەی گرنگی تیا باس کراوە . لەوانە دووبارە پێکهێنانەوەی م. س و کۆمیتەی

سەرکردایەتی ، چەند مەسەلەیەکی گرنگی سیاسی ، پێشمەرگەیی ، ئیعلامی، ڕێکخراوەیی، دارایی.

سەبارەت بە دووبارە هەڵبژاردنەوەی سەرکردایەتی م. س بریتی بووە لە ئازاد هەورامی ، نەجمەدین عەزیز کە نەجمەدین لەو کاتە لە دەرەوەی وڵات بووە و هیچ ئاگاداریەکی لەو بڕیارِ و نەخشانە نەبوو، و دیارە ئازاد هەورامیش ئەو کاتە لە تەمەنێکدا بووە ، کە ڕەنگە حساب بۆ بیروراکانی هێندە نەکرا بێ . لە بزوتنەوەش بریتی بووە لە عەلی عەسکەری ، تایەری عەلی والی ، کە هەردووکیان هەم نوسراو و خاوەن بیرورا و هەم بە هەق دوو سەرکردەی عەسکەری خاوەن ئەزمون بوون ، لەو کۆبوونەوەیەدا، گەورەترین حساب بۆ ڕاکانیان کراوە

لە سەرکردایەتیش دەڵێ : لە کۆمەڵە ( مەلا بەختیار، عومەر عەبدوڵڵا ، تاڵیب ڕۆستەم ، من "نەوشیروان") لە بزوتنەوەش" د.خالید سەعید ، سید کاکە ، حاجی حاجی برایم ، عومەر دەبابە ـ کە لە دەرەوە بووە. لە "هێڵی گشتیش" حسێن بابە شێخ و دەستەی دامەزرێنەر ـ کە کەسیان لەوێ نەبوون).

لێرەدا گەر وورد سەرنج بدەین ، دەتوانین بە ئاسانی کەسایەتیە خاوەن بڕیارەکان دەستیشانکەین:

أـ جەلال تاڵەبانی وەك سکرتێری گشتی و خاوەن بڕیار.

ب ـ عەلی عەسکەری وەك لە پێشەوە باسمکرد و فەرماندەی گشتی هێزی پێشمەرگەش، د.خالید سەعید.

ج ـ نەوشیروان مستەفا، وەك ئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵە و گوێ لێگیراوی لای مام جەلال و عەلی عەسکەری.

د ـ تایەر عەلی والی و عومەر عەبدوڵڵا ، بە پلەی دووەهەمی گوێلێگیراو.

واتە لەناو بریاردەرەکان بە پلەی یەکەم جەلال تاڵەبانی ، عەلی عەسکەری، نەوشیروان مستەفا ،د. خالید سەعید، و بە پلەی دووەم عومەر عەبدوڵلا و تایەر عەلی

والی دێ . واتـه نەوشـێروان ئـەو کاتـه گـەر شەخسی دووهـەم نـەبوو ، بـێ شەخسی سێهەم بووه.

پاشان لەلاپەڕە ٢٦٥دا واپیشان دەدا ، کە "م. س "لەو کاتەدا لە تۆکان بـووه ، کـه دێیەکی ئێران بووه و ئێران هەرەشەی چۆڵکردنی لێکردون ، دەبوایە چۆڵی بکەن و باشترین شوێنیش کە هەڵیانبژاردوه ناوچەی برادۆست بووه ، کەوتۆتە ناوچەی سـێ سنوری عیراق ـ ئێران ـ تورکیاوه ، کە پێشووتر بنکەکانیان لەناوه بـووه . هەڵبـژاردنی ئـەویش گوایـه" لەبـەر زۆر ئیعتبـاریی نەتـەوەیی ـ سیاسـی ـ جـەنگی ـ تاکتیکی" بووه.گرنگیەکانی ناوچەکە بەم جۆرە باس دەکا:

أـ سێ"٣ " دەوڵەتی عیراق ، ئێران ، تورکیا و ٣ پارچەی کوردسـتان پێکـەوه گـرێ دەدا.

ب ـ ناوچەکانی بادینان عیراق و سۆرانی عیراق بە یەکەوه دەبەسـتێ.

ج ـ توانای هێنانی ئازوقه و کەلوپەلی پێویست لەو ٣ دەوڵەتەوه هەبووه.

د. ناوچـەکە شـاخاوی و سـەخت و عاسـێ بـووه و دوژمـن نـەی ئـەتوانی لـه هـەموو لایەکەوه ئابلوقەی سوپایی بدات و بە ئاسانی بیگاتێ و بوێری بچێتە ناویەوه.

هـ ـ لەبەر ئەوەی لە بەهار و هاوین و پاییزی ساڵی ١٩٧٧ بارەگاکانی سەرکردایەتی لـەو ناوچـەیە بـووه "واتـه ناوچـەی برادۆسـت" و هێـزی پێـشمەرگەی لـێ بـووه ، ژمارەیـەکی زۆر شـارەزایی باشـیان لـه هـەر ٣ دیـوی ناوچـەکە هـەبوه و ناسـیاوی و ئاشنایەتیان لەگەڵ خەڵکی هەر ٣ دیوەکەدا هەبوه .

واتە ئەمانە هەمووی ئیجابیـاتی هەڵبـژاردنی ناوچـەی برادۆسـت بـووه و دیـاره بـه ووردیش ، ئەم ئیجابیاتانە هەڵسەنگێندراون.

و لەناو ئەندامەکانی سەرکرادیەتیشدا، هاورێیاتی کۆمەڵە ، تەنها نەوشیروان مستەفا و لە ئەندامانی بزوتنەوەش عەلی عەسکەری ، د. خالید سـەعید زۆر شـارەزای ناوچـەکە بوون.

بەڵگەش بۆ قسە رۆیشتویی و دەسەڵاتی نەوشیروان ، وەك نوێنەری كۆمەڵە لەناو سەركردایەتیدا ، ئەو رستەیەكە خۆی لەلاپەڕە(١٧٢) ی هەمان كتێبدا نوسیویەتی:

" سەرانی كۆمەڵە كە لە برادۆست بوون ، سالار، مەلا بەختیار، ئازاد هەورامی، و ملازم عومەر لە كۆبونەوەیەك كە منیشیان بانگكرد بۆ كۆبونەوەكە، داوایان لێكردم ، كە منیش یەكێ بم لە نوێنەرانی كۆمەڵە ".

واتە تا ئەو رۆژە نەوشیروان نە ئەندامی كۆمەڵە و نە سەركردایەتی كۆمەڵەش بووە ، و بە یەك كۆبونەوەی ئەو هاوڕێیانە لەو رۆژەوە یەكسەر بۆتە ئەندامی سەركردایەتی كۆمەڵە؟!.

پاشان دەنوسێ: " من خۆم پێم خۆش نەبوو....... راستیەكەش ئەوە بوو، توشی "خیبە أمل" ببووم لێیان و بڕواشم بە كۆمۆنیزم نەبوو..... و جگە لەوەش رەئی عەلی عەسكەری و د. خالید وابوو ، كە بە هەموومان رێكخستنێكی تازە بە گوێرەی پێویستیەكانی شۆڕشەكە دابمەزرێنین ، كە جێگەی كۆمەڵە و بزوتنەوە و خەتی گشتیش بگرێتەوە".

واتە هەم بڕوای بە كاركردن لە كۆمەڵەدا نەبووە و هەم لەگەڵ سەرانی كۆمەڵەشدا بێ هیوا بووە ، هەم ئەویش لەگەڵ پێكهێنانی حزبێك بووە ، كە جێگەی هەر سێ باڵەكە بگرێتەوە.

پاشان دەنوسێ: "قسەكانی من هیچ سودی نەبوو ، ئەو برادەرانە سووربوون لەسەر ئەوەی بۆ راستكردنەوەی نا بەرامبەری لەگەڵ بزوتنەوە ، من یەكێ بم ، لە نوێنەرانی كۆمەڵە لە سەركردایەتی یەكێتییدا".

واتە تای تەرازوی كۆمەڵە ئەو كاتە زۆر نا بەرامبەر بووە ، لەگەڵ بزوتنەوەدا و سەنگی هاوڕێیانی كۆمەڵە لەناو یەكێتییدا زۆر كەمتر بووە ، لە بزوتنەوە و بە بوونی نەوشیروان سەنگەكەیان راستكردۆتەوە . دیسان دەنوسێ:" مام جەلالیش هەمان رەئی هەبوو . لای وابوو، كە پێویستە من لەناو كۆمەڵەدا بم بۆ ئەوەی بە باری باشەدا كاریان تێ بكەم و زۆر بە نا بە دڵی ووتم :باشە؟".

واته نەوشیروان هەم سەنگی کۆمەڵەی قورس کردووە ، هەم راوێژکەری کۆمەڵە بووە ، بۆ کارتێکردنیان بە باری باشەدا و هەم هەڵبژاردە و متمانەی پێکراوی مام جەلال بووە.

مەبەستم لەم رونکردنەوەیە ئەوەیە ، کە نەوشیروان بە قەدەر مام جەلال و عەلی عەسکەری و د. خالید سەعید دەسترۆیشتوو خاوەن بریار بووە ، لە کۆبونەوەکەی تۆکانی مانگی نیسانی ساڵی ١٩٧٨.

نەوشیروان لە لاپەڕە ٢٦٦دا لە هەمان سەرچاوە ، باس لە ئامانجەکانی بردنی بارەگا بۆ برادۆست دەکا کە بریتی بوون لە:

١ـ بارەگای دەزگا سەرکردەییەکان لە شوێنێکی ئەمیندا جێگیرببێ و بپەرژێتە سەر جێبەجێکردنی ئەرك و فەرمانەکان.

٢ـ پێش ١٩٧٨/٦/١ واتە پێش کاتی جێبەجێکردنی بڕیاری حکومەتی عێراق لەمەر راگوێزانی دێهاتەکانی سنور ، رێگەی پەیوەندی لەگەڵ دنیای دەرەوە و رێگەی هێنانی تفاقی جەنگ و یارمەتی وپێویستیەکانی شۆرش بکاتەوە.

٣ـ پاککردنەوەی ناوچەکە لە چەکدارەکانی قیادەی موەقتە ، ئەگەر بونە رێگری پلانەکانی یەکێتی.

٤ـ جێبەجێکردنی داوای یەك لەسەر یەکی دۆستەکانی یەکێتیی لە تورکیا ، بە تایبەتی (D.D.K.D) دا بۆ نزیکبونەوەی هێزەکانی یەکێتی لە سنورەکانی تورکیا.

کەواتە ئامانج لەو چونە بۆ دەڤەری برادۆست ، جگە لە تەئمینکردنی شوێنی ئەمین بۆ سەرکردایەتی ، و کردنەوەی رێگە پەیوەندی بە دەرەوە بۆ چەکدارەکردنی پێشمەرگە و بەهێزکردنی شۆرش ، پێش ١٩٧٨/٦/١ کە رۆژی جێبەجێکردنی بڕیاری کاولکردنی دێهاتەکانی سنور بووە ، ئامانجێکی گرنگی تریش هەبووە ، کە تەنیا لە برادۆستەوە دەکرا بەدی بێ ، ئەویش "پاکردنەوەی ناوچەکە بووە ، لە چەکدارەکانی قیادە موەقتە".

دیاره ئەم ئامانجەیان و ئەوانی تریش نە لە نۆکان و نە لە هیچ ناوچەیەکی تری خوارووی کوردستان دورە دەست لە سنوری تورکیا و سوریا جێبەجێ نە دەکرا.
ئەوەی لێرەدا من بە گرنگی دەزانم، ئەوەیە کە هەموو سەرکردایەتی یەکێتی بە تایبەت مام جەلال و نەوشیروان سوربوون لەسەر جێگیربوون لە برادۆست . بۆ جێگیربوونیش لە برادۆست ، دەبێ هەموو کۆسپەکانی سێ سنورکەرییان لێ بگری لەپەیوەندی بە سوریا و زامنکردنی رێگای پەیوەندیەکەش لابەرن.
قیادەی موەقتەش هەموو تەواجدیان ، چ لە ئێران و چ لە تورکیا هەر لە ناوچەکانی ۳ سنور بووە ، کەواتە گەورەترین کۆسپی بەردەم یەکێتی بە قیادە موەقتە دیاری کراوە و دەبێ لێیان دەن و ئەو ناوچانەشیان لێ پاککەنەوە . واتە رۆیشتن و پێش ئەوەی بزانن ، کە تووشی شەر دەبن ، یەکێتی بڕیاری لێدانی قیادەی موەقتەی داوە.
ئێستا با باس لە پیلان و نەخشەی چۆنیەتی جێبەجێکردنی ئامانجەکانی یەکێتی بکەین لەو رێپێیوان و رۆیشتنەدا.
١ـ کۆکردنەوەی زانیاری تەواو لەسەر ناوچەکە ، بە تایبەتی ئەو گۆرانانەی ، کە بەسەر هێزەکانی دوژمن داهاتوون لە ١٩٧٧ه ، بۆ مانگی ١٩٧٨/٥.
٢ـ هێزێکی ئەوتۆ ساز بکەن کە هەم بە ژمارەی پێشمەرگە و هەم ژمارەی چەکیش ،کە بەشی جێبەجێکردنی پیلانەکانی یەکێتی بکا.
بۆ خاڵی یەکەم بە پێ نوسینەکەی نەوشیروان مستەفا، سەرەتا کەوتونەتە کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر قیادە موەقتە لەم سەرچاوانەوە:
١ـ رێکخراوی دە.دە قە دە "D.D.K.D".
٢ـ لەوانەی کە لەلای ق. م رایان کردبوو بۆ ناو یەکێتی.
٣ـ لەو کادر و دۆستانەی یەکێتی ، کە لە ناوچەکانی ق. م دابوون.

٤ـ ئەو پێشمەرگانەی یەکێتی کەلای ق .م گیرابوون و پاش بەربونیان ، گەرابونەوە ناو یەکێتی. هەمان سەرچاوە لاپەرە ٢٦٦.

(زانیاریەکانیش لەسەر ق.م بریتی بوون، لە ژمارەیان جۆری چەکەکانیان ، لێپرسراوەکانیان ، وورەیان لە شەڕدا، توانای سیاسیان ، پشتیوانەکانیان لەناو عەشیرەتەکانی تورکیا و شوێنی بارەگاکانیان.

زانیاریەکانی کە لەسەر هێزی عیراق و ئێران و تورکیاش کۆکرابوونەوە. بریتی بوون لە: شوێنی سەربازگەکانیان و رەبیەکان، سەبارەت بە عیراق گوایە هیچ گۆڕانیان بەسەردا نەهاتبوو.

سەبارەت بە تورکیا قەرەقۆڵەکانی سەر سنور چ دائمیەکان و چ کاتیەکان هەر لەو شوێنی کۆنی خۆیان بوون و هێزەکانی هاوینەشیان هێشتا نەچووبونەوە شوێنەکانی خۆیان . سەبارەت بە ئێرانیش پاسگا و پایەگا و پادگانەکانیان هەر لە ناوچەکانی سەردەشت و خانە و شنۆ لە شوێنەکانی کۆنی خۆیاندا بوون و ئالوگۆڕێکی ئەوتۆیان بەسەردا نەهاتبوو.

سەبارەت بە قیادە موەقتە ژمارەی هێزەکانیان لە ٢٥٠ بۆ ٣٠٠ چەکدار بووە و لە چەندین بنکەی دوور لە یەك و لێك دابراو دابەش بوون.و هیچ بارەگایەکیان لە ٣٠ بۆ ٥٠ کەس پتر نەبووە ، لە رووی سیاسیەوە نەگونجاو و لە رووی عەسکەریەوە نا ڕیك و نە شارەزای کاری پێشمەرگانە بوون ، لەبەر ئەوەی زۆربەیان لە ئەوروپاوە گەرابونەوە * .

تا ئێرە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە هەڵبژاردنی برادۆست بە نەخشە و پلان و بۆ ئامانجی دیاریکراو لێکدانەوەی تەواوی هەر چوار لایەنە دژەکە (ق .م ـ عیراق ـ ئێران ـ تورکیا) و کۆکردنەوەی زانیاری تەواو لەسەریان و ناسینی و زانینی توانا و

---

* هەمان سەرچاوە لاپەرە ٢٦٧.

قەبارەشیان، ئەوسا بریاریان لەسەر رۆیشتن و دارشتنی پلانی رۆیشتنەکەش دراوە، هەروا بە هەرەمەکی و لیَ نەزانانە ملی ریَگایان نەگرتوە و هەموو سەریَکی سەرکەوتن و سەرنەکەوتنیان لیَکداوەتەوە و مسۆگەر بوون لە سەرکەوتن ، بۆیە بریاری رۆیشتنیان داوە بەم جۆرە:

١ـ بەشی یەکەمی هیَزەکە بریتی بیَ لە ٣٢٠ پیَشمەرگە کە ١٥٠یان چەکدار بیَ بە لیَپرسراویەتی د. خالید سەعید و یارمەتیدەری حسیَن بابە شیَخ" ف. هـ. بادینان" و شیَخ عەلی" ف. هـ. شاربازیَر "، رەووف مستەفا "ف. هـ. پیَنجوین" و حامید حاجی غالی یاریدەدەری" ف. هـ. هەورامان" و چەند شارەزایەکی ریَگاکان و ناوچەکە . لە رۆژی ١٩٧٨/٤/١٩ وا کەوتونەتە ریَ بەرەو برادۆست و بیَ کیَشە و شەرِ گەیشتونەتە شویَنی خۆیان.*

بەشی دووهەمی هیَزەکە بریتی بووە لە نزیکەی ٥٠٠ پیَشمەرگە نزیکەی ٣٥٠ یان چەکدار بوون بە لیَپرسراویەتی عەلی عەسکەری فەرماندەی هیَزی پیَشمەرگە و تایەر عەلی والی ئەندامی "م. س" ، "م. ع" سید کاکە" ف. هـ. ٨ هەولیَر"، تالیب رۆستەم ، کە ئەو کاتە ئیستقالەی لە سەرکردایەتی کۆمەڵەو کۆمەڵە کرد بوو "ف. هـ. ٦ پشدەر"، شیَخ جواد بیَدەری جیَگری" ف. هـ. چەمی ریَزان" . کە دەبوایە ئەمانیش لە ١٩٧٨/٤/٢١دا بکەوتنایە ریَ، بەڵام ئەم هیَزە لەکاتی خۆیدا دواکەوت لەبەر :

أ ـ گۆرینی ئەو ریَگایەی د. خالید سەعید پیارۆیشتبوو ، هەوڵدان بۆ رۆیشتن بە ناو ئیَراندا بە ئۆتۆمبیل بۆ زووتر گەیشتنەوە بە هیَزی یەکەم لە برادۆست.

ب ـ توشبوونی شەرِ و گرتنی ئەو ریَگایە لەلایەن ئیَران و ناچارکردنیان بە چەندین جار ئەم دیو و ئەودیو کردنی سنوری ئیَران و عیراق.

---

* هەمان سەرچاوە لاپەرە ٢٧٢

ج - بەشی سێهەمی هێزەکە کە ١٥٠ چەکدار بوون مام جەلال و نەوشیروان و باقی ئەندامانی م. س لەگەڵدا بووە . دەبوایە ئەمانیش لە١٩٧٨/٤/٢٧ بە رێ بکەون ، بەڵام لەبەر دواکەوتنی بەشی دووەم ، بەشی سێهەم و دووەم بە یەکەوە لە نۆکانەوە بەرەو گۆرەشێر بە رێکەوتن*. پاشان هەردوو هێزەکە دەگەنە (دوڵەنێ) لەوێ دووبارە دەبنەوە دوو بەش . بەشی هەرە زۆر و لاو و بەتوانا و پڕ چەکەکان لەگەڵ عەلی عەسکەری ، تایەر عەلی والی ، ملازم عومەر، سید کاکە، تالب رۆستەم، ئازاد هەورامی، قادر مامەند ئاغا، ئەنور مەجید سولتان ، ملازم فوئاد عومەر، لە گوندی "دۆڵەنێ" وە ، بەرەو برادوست دەرۆن . بەشە کەمەکەش کە نەخۆش و پیر و زۆربەی ، بەبێ چەك بوون بەرەو رووی مام جەلال و نەوشیروان کراونەتەوە.*

بەشی دوەهەمی هێزەکە بە رابەری عەلی عەسکەری لە رۆژی ١٩٧٨/٥/١٢ دەگەنەوە بە د. خالید سەعید. جێگای تێبینیە، نەوشیروان لەلاپەرە(٢٧٣)دا دەنوسێ:" من لەگەڵ ئەو رەتلەدا دانرا بووم ، کە لەگەڵ مام جەلال بوون، بەڵام لەناو ئەو رەتلەدا هیچ ئەرکێکی دیاری کراوم نەبوو".

بەڵام لەلاپەرە(٢٧٦) دەنوسێ :" لە گوندی دۆڵەنێ ، بەشی سێهەمی رەتلەکە بەرەو رووی مام جەلال و من کرانەوە"؟.

ئەوەی من دەمەوێ لێرەدا بەراوردی بکەم دوو بەشە، بەشی یەکەم ئەو خاڵانەیە ، کە هەر لە سەرەتای بڕیاردانی رۆیشتنەکەوە لە نۆکانەوە بەرەو برادۆست نوسراوە لە نەخشە و بڕیار و هەڵسەنگاندنی بارودۆخی سیاسیەکە و جزگرافیەکە و لایەنی دوژمنان و پاشان ئامانج لە رۆیشتن ، دواجار دانانی نەخشەی عەسکەریانە ، کە هەر بیانخوێنێتەوە ، وای بۆ دەچی ، کە هێندە مەحکەم لە هەموو روویەکەوە بیری لێکراوەتەوە مەگەر گۆڕانی کتوپڕ روویدات دەنا سەرکەوتنی مسۆگەر بووە

---

* هەمان سەرچاوە لاپەرە ٢٧٣ لاپەرە ٢٧٦

، و ئەگەر گۆڕانی کوت وپڕ روویدا ، ئەوە هیچ پەیوەندیەکی بە هەڵە کردنەوە نەبووە ، لەو هەموو لێکدانەوە و تاتۆی کردنانە و نەخشە و پلانانەی ، کە زۆر سیاسیانە و عەسکەریانەش بیری لێ کراوەتەوە.

بەشی دووەهەمی بریتیە لەو هەڵە کوشندانەی کە نەوشیروان لە لاپەڕە ۲۷۸، ۲۷۹ تا ۲۸۲ باسی دەکا کە بە راستی جێی سەرسوڕمانە بۆ من و رەنگە خوێنەریش . نەوشیروان نوسەری کتێبەکە ، خۆی بەشدار و خاوەن را بووە ، لە هەموو نەخشە و بڕیارەکان ، کەوا داڕێژراوە سەرکەوتنی مسۆگەر بەردەست بێ . بەڵام لەپاش تێشکان و کارەسات هەر نەوشیروان خۆی وەك کەسێکی بێ لایەن و سەیرکەر کۆمەڵێ هەڵەی کوشندە دەستنیشانکات ، کە بۆتە هۆی کارەسات ، کە دەبوایە پێشتر وەك فەرماندە و سەرکردە ، درکی پێ بکردایە و بەربەستی روونەدانی بۆ دارشتایە، هەڵە کوشندەکان دەگەرێنێتەوە بۆ:

١ـ گوێنەدانە پلانی هاوبەشی دەوڵەتە کۆنەپەرستەکانی ناوچەکە و باس لەوە دەکا ، کە لەوکاتەی لەسەر بەرژەوەندیەکانی خۆیان زۆر ناکۆك و نا تەواو و دژ بەیەك بن، مەترسیەکی ناو کۆییان وەك مەترسی شۆرشی کوردستان یەکگرتوو و هاوکاری یەك دەبن، بە تایبەتی پاش رێکەوتنی جەزائیری نێوان عیراق ـ ئێران، و رێکەوتننامەی نێوان عیراق ـ تورکیا لە ساڵی ۱۹۷۷ بۆ پاراستنی ئاسایشی و ئارامی هەردوو سنور.

من پێموا نیە ئەم هەڵەیە بەر لە روودانی هەستی پێ نەکرا بێ ، چونکە بە ئاشکرا لە بەشی وەرگرتنی زانیاری لەسەر دوژمنەکان ، ئەو راستیە باسکراوە و باشیشیان هەڵسەنگاندوە . وەك لەپێشەوە نوسراوە رێکەوتنی جەزائیری ۱۹۷۵و رێکەوتنی تورکیا عیراقیش لە۱۹۷۷دا پێش ئەو سەفەرەی هەکاری بووە و هەموشیان راستی ، رێکەوتنی ئەو سێ دەوڵەتەیان لە بەرامبەر مەسەلەی کورد زانیوە.

مـن لام وایـه ئـەم بـە ملـدا دانیـه بەشـێکی ئـەو شکـستیە بەسـەر هـەمو هـەڤاڵانی ڕەتلەکاندا و سەرکردایەتیش . جگە لـە (مـام جـەلال و نەوشـیروان) کـە لـە ڕاسـتیدا ئەوانیش بەشێکی بەرپرسیاری ئەو شکستەیان بەردەکەوێ، هـەر وەك گـەر سـەریش بکەوتنایـە ڕەنگـە گـەورەترین پـشك و سـەروەری سـەرکەوتنەکە بـۆ ئـەمان بگەڕایەتەوە.

٢ـ باش ڕێك خستنی هێزەکە و باش ناردنی بۆ شـوێنی دیـاری کـراو، نەوشـیروان ڕای وایە ، کە هێزەکە باش ڕێکنەخراوە بە پێ هەلومەرجی ئەوسای و پارتیزانانـە ، بـیری لـێ نەکراوەتەوە و بیر لە سەختی ڕێگاکە و تەسکی ئەو ناوچانەی پێدارۆیشتوون و بـەو قەلەبالغیـە زۆرە ، یـەکێك لـە هۆیـەکانی مانـدبوون و زیـان لـێ کـەوتن ، بـێ سەروبەری کارەکە بووە.

خۆیان بیانەوێ یان نەیانەوێ (سەرکردایەتی) بە نەوشیروانیشەوە ، گەرچـی پاسـا و بەوە دەدا ، کە ئـەو هـیچ ئـەرکێکی لـە ئەسـتۆ نـەبووە ، بـەڵام پێکـەوە داڕێـژەری نەخـشە و پلانـی ڕۆیـشتنەکە بـوون و مـن دڵنیـام ئەوکاتـە پـاش مـام جـەلال، نەوشـیروان و عـەلی عەسـکەری و د. خالیـد سـەعید بڕیـاردەری سـەرەکی بـوون ،کـە هێزەکەیان کردووە بە سێ ڕەتڵ ، و پێم وایە ، کە نەیان کردووە بە چـەند ڕەتڵێکـی کەم کەم هەر لەبەر هەمان بارودۆخی سیاسی و جوگرافی ئەو کاتە بووە، کە:

١ـ هێزی کەم و پـچڕ پـچڕ هـەم سـەنگ قورسـایی چـەکدارانەی کـەم دەبـێ و هـەم مەترسـی دابـڕان و پـەرش و بڵاوبـونی دەبـێ، هـەم بەرگـەی هێـرش و پـەلاماری سەربازیانەی عیراق و ئێران و ق. م ناگرن.

٢ـ بۆ کەم کردنەوەی مەترسی بووە ، کە کراوە بە ٣ ڕەتڵی گەورەوە ، چونکە هێـزی گـەورە مەترسـی لێـدانی کـەمتر بـووە ، لـەو کاتـەدا تـەئمین نـەکردنی ئازوقـە و خواردەمـەنی ئـەوە کـاری لوجـستیك و نەوشـیروان دەبوایـە هـەم سـەبارەت بـەم مەسـەلەیە و هـەم دەربـارەی بـەش بەشـکردنی ڕەتڵـەکان بـە ژمـارەی کـەمتر لـە

کۆبونەوەکەدا باس کرایە و گەر بە گوێیـان نەکردایـە ئەوسـا ، ئۆبـاڵی ئـەو هەولانـەی بخستایەتە ئەستۆی سەرکردایەتی.

٣ـ گوێنەدانە باری مەناخ و تۆبۆگرافی ناوچەکە، سەیر لەوەدایە نەوشیروان لە هـەموو ئەندامانی سەرکردایەتی پتر شارەزایی هەبووە . دەربـارەی مـەناخ و کـەش و هـەوای ئەو ناوچانە ، هەر لە برادۆستەوە تا نۆکان، چونکە ئەو هەر بە هاتنەوەی لە سوریاوە لە برادۆست بارەگای داناوە، پاشان وەك خۆی ووتەنی ئەوەندە بەو شاخانەدا ئـەم دیو ئەو دیوی کـردووە ، تەنانـەت باریکـە ڕێگاکـانیش شـارەزا بـووە، جگـە لـەوەش شارەزای باری سەختی جوگرافی ناوچەکان بووە و خۆی دیویەتی ، کە زۆربەی ئـەو ناوچانە کوێستان بوون و ئەگەری گرتنی ڕێگاکان بە بـەفر تـا نزیـك کۆتـایی مـانگی (٥) هەبووە.

دەبوایە لە کۆبونەوەکەدا هەموو ئەم هۆکارانەی باسکردایە و ڕەنگە کە بـەلای منـەوە هۆکـاری سـەرەکی جـولان بـەو پەلـە پەلـە و لـەو کـەش و هەوایـەدا و بـەو ڕێگـا پـڕ مەترسیەدا دەگەڕێتەوە بۆ:

أ ـ ئینزارکردنیان لەلایەن ئێرانەوە بۆ چۆڵکردنی نۆکان و خاکی ئێران.

ب ـ گەیشتن بە چەکەکان و پڕچەك کردنی هێزەکـانی و خـەڵکیش پـێش ١٩٧٦/٦/١ کە ڕۆژی جێبەجێ کردنی چۆڵ کردن و سوتاندنی دێکانی سەر سنورەکان بووە.

من پێموایە ئەو ٣ هەڵەیەی کە نەوشیروان باسی کردووە ، گەر هەڵە بووبن ، هەڵـەی هەموو سەرکردایەتی بووە و نەوشیروانیشی لـێ بەدەر نیە ، دەشبوایە لە سەرەتایی کارەوە ئەوانەی بخستبایە بەردەم سەرکردایەتی.

بەڵام لەلاپەڕە ٢٨١ کە باسـی هەڵـەی کوشـندە دەکـا، کـە بـریتی بـووە، لـە گـۆڕینی بنەڕەتی بڕیاری جێگیربوون لە ٣ سنور . ئەمەیان زۆر ڕاستە و من پێموایـە، هـەر ئەم هەڵەیەش بووە ، کە بووە هۆی کارەسات و تێشکانەی یەکێتی لە هەکاری.

ئەو گۆڕینە بنەڕدتیـەش ، کـە کـراوە بـە بڕیـاری سـەرکردەی ڕەتلـەکان واتـە عـەلی عەسکەری و د. خالید سەعید کراوە. کە لە باتی ئەوەی بەپێ بڕیاری سـەرکردایەتی

گەیشتنە شوێن مەبەست ، بە دامەزراندنی بنکە و بارەگا و خۆ قایمکردن و تەئمینکردنی ئازوقەوە خەریك بن و پاشان جواب بنێرن بۆ رەتلی سێهەم کە بگەنە لایان و ئەوسا نەخشە و پیلانەکانی تر دارێژنەوە بە پێ هەلومەرجی برادۆست.

## رۆلی کۆمەلە و رێپێوان و کارەساتەدا.

وەك لە سەرەتاوە باسمکرد ئەوکاتە " سالار" لە دەرەوە بووە ، هاورێیانی تری ناو سەرکردایەتی یەکێتی لە بالی (کۆمەلە) ، جگە لە نەوشیروان هەموویان لاو و کەم ئەزمون لە رابەرایەتی و لە سیاسەت و لە کاری پێشمەرگانەدا ، گەر بەراورد بکرێن لەگەل کەسایەتی وەك مام جەلال و عەلی عەسکەری و د. خالید سەعید و شێخ حسێن و تەنانەت تایەری عەلی والی بەگیش . بۆیە من دلنیام لەوەی ، کە هەر لە سەرەتای دەستپێکردنی کۆبونەوەکە، جگە لە نەوشیروان ، رۆلی پلە دوویان هەبووە ، لە رادەربرین و بریاردان ، و لە رێپێوانەکەشدا و پاش لەگۆرینی بنەرەتی بریاری سەرکردایەتیش لە برادۆست هیچ رۆلێکی نەبووە ، بەو پێیەی ، کە لە هەردوو رەتلەکەدا عەلی عەسکەری و دکتۆر خالید سەعید بەرپرسی بوون و ئەو هاورێیانەی کۆمەلە بوو ، حساب راستکردنەوە لەگەلیان بوون. بەلگەش دواندنەکانی خۆیان پاش بەربوونیان لای ق. م. بەرێزان (ملازم عومەر، ئازاد هەورامی، شێخ عەلی)، لەوار میوانی لە مانگی ٩/٧٨ کە لە دەمی خۆیانم بیست.

واتە سەرکردایەتی کردنی رێپێوان بەرەو برادۆست و هەلە کوشندەکە، کە بریتی بووە لە:

أ- گۆرینی بەرنامە و دانەنانی بارەگای جێگیر بوونی سەرکردایەتی لە برادۆست.

ب - تێپەربوونی پیلانی ئیدریس بە سەریاندا کە گوایە(جوابی بۆ ناردوون) کە ق. م. ناچەنە سەر رێگایان بۆ هێنانی چەك.

ج– نەمانەوە لە برادۆست تا گەیشتنی رەتلی سێهەم و یەکسەر چوونە نا قوڵایی تورکیا و ناوچەی عەشیرەتەکانی سەر بە ق. م.

د– حساب نەکردن بۆ ئەگەری توشبوونی شەڕ لەگەڵ ق. م و خۆئامادەنەکردنی.

بەشێوەیەکی گشتی هاورێیانی کۆمەڵە کاریگەریەکی ئەوتۆیان نەبووە لە بڕیاردان ، باشترین بەڵگەش ئەو نامەیە ، کە عەلی عەسکەری، د. خالید سعید، تایەری عەلی والی لە ١٩٧٨/٥/١٦دا ناردوویانە بۆ مام جەلال و نەوشیروان : (ئێمە بۆ چەکەکانمان و بۆ راپەڕاندنی خەڵکی ناوچەکە ، بەرەو بادینان ئەچین، جارێ بڕیارماندا و بێ چەکەکان پڕ چەککەین و خۆمان سازدەین . نامەمان ناردووە بۆ برایانی (D.D.K.D) و سوریا ( بنکەی یەکێتی لە سوریا) کە بە پەلە جێگا و شوێنی چەکەکانمان بۆ بنێرن و یەکێکی "D.D.K.D" خۆی بێ و چاومان پێ بکەوێ بۆ تەنسیق کردنی ئیش و کارەکانمان . هەروەها د. کەمال خۆشناوی ، خۆشمان بێت و بۆ هەمان مەبەست. بە تێکرایی وەزعی ناوچەکە و ئێمە زۆر زۆر باشە و دڵتان نارەحەت نەبێ و گوێ مەدەنە پروپاگەندەی دوژمن ، ئومێدمان وایە بە سەرکەوتوانە هەموو کارەکانی خۆمان ئەنجام بدەین و ئاگاداریشتان ئەکەینەوە. تکایە ئێوەش زوو زوو پەیوەندیمان پێوە بکەن بەهۆی کاك نوعمان و برایانی ترەوە)*

لەم نامەیەدا کە ئیمزای هیچ کام لە هاورێیانی سەرکردایەتی کۆمەڵەی ناو دوو رەتڵەکەی پێوە نەبووە، دەردەکەوێ ، کە هەموو بڕیار و جێبەجێکردنەکانیش لە دەست برایانی بزوتنەوە دابووە و هەر ئەوانیش رابەریەتیان کردووە تا روودانی کارەساتەکەی ، کە ئەنجامەکانی بەم جۆرە بووە:

١ـ لە ١٩٧٨/٦/١ تووشی یەکەم پەلاماری ق. م دەبن و لە گازی و پاش دوو رۆژ شەڕکردن ، ئەوسا درك بە سێ راستی دەکەن.

أـ بوونیان لە قولایی تورکیا و لەناو عەشیرەتە کوردەکانی لایەنگرانی قیادەی موەقتە.

---

* لەکەناری دانوبەوە.......... نەشیروان ل ٢٨٢

ب ـ بەسەردا تێپەڕینی وەعدە درۆزنامەکەی ئیدریس و پیلانەکەی ق. م و رادەی دوژمنکاری ق .م بەرامبەر یەکێتی.

ج ـ نا ڕێکوپێکی هێزەکەی خۆیان و ماندوویی ڕێگا و بێ ئازوقەیی و نە شارەزاییات لە ناوچەکان.

٢ـ بریاری کشانەوە دەدەن بە نا شارەزایی ، بۆ ڕێکخستنەوەی هێزەکە دەبن بە ٣ بەشەوە:

أـ بەشی یەکەم: بە رابەری د. خالید سەعید بەرەو ئیتجاهی کشانەوە ، کە دەڕۆن و لەناو تەقەکان دەرباز دەبن و دوور دەکەونەوە و چاوەڕێ گەیشتنی دوو بەشەکەی تر دەکەن.

ب ـ بەشی دووهەم: بە رابەری تاڵیب ڕۆستەم و فەرماندەی کەرتەکان وەك شێخ جەواد بێدەری ، عەولا سوری ئاکۆ و کوێخا قادری زودی و محەمەد بایز و بەکر پیروت ، لەباتی ئەوەی بەرەو شوێنی دیاری کرا بڕۆن و لەگەڵ بەشی یەکەم یەکبگرنەوە، بە تەگبیری فەرماندەکان بەرەو سنوری عیراق دەڕۆن ، کە ژمارەیان ١٧٦ پێشمەرگە و ١١٧ چەکیان پێ دەبێ و خۆیان تەسلیم بە عیراق دەکەن.

ج ـ بەشی سێهەم: کە بۆ سەر لێشێواندن لە ق.م و داپۆشینی کشانەوەکە و پاراستنی پشتەوەی ڕەتلەکان دەمێنێنەوە ، تا ئەوانیش لە کاتی دیاریکراودا بکشێنەوە . هەر دوای ڕۆیشتنی ڕەتلی دووهەم بە رابەری عەلی عەسکەری، تایەر عەلی والی، سید کاکە، قادر ئاغا و فەرماندەی کەرت و مەفرەزەکان دەکەونە ناو داوی عەشیرەتەکان و چەکدارەکانی قیادەی موەقتە بە پچر پچری هەموویان دەگیرێن و چەك دەکرێن و لێپرسراوەکان زیندانی دەکرێن وپێشمەرگەکانیش هەندێکیان دەبنە چەکداری ق.م ، هێندێکیشیان بەرەلا دەکرێن و ڕێگەیان دەدەن تاك تاك بەرەو دوا بگەڕێنەوە.

لەناو بەشی یەکەمدا ، کە بە رابەری دکتۆر خالید دەبێ و لە شەڕی گازی دەربازدەبن و دەگەنە ناوچەی (گۆیی) نزیکەی ١٧٠ کەسی چەکدار و بێ چەکی تێدا دەبێ و

لەوانە : " حسێن بابە شێخ و ملازم عومەر عەبدوڵلا ، ئازاد هەورامی ، شێخ عەلی حامیدی حاجی غالی، عەلی شیعە، رەئوفی مستەفا بەگ"، ئەم بەشە لە ناوچەی عەشیرەتی گۆیی لە رێگەی "D.D.K.D"ەوە "د. کەمال خۆشناو و نەجمەدین عەزیز" یان ، پێ دەگا ، کە لە سوریا هاتبوونەوە و هەندێ چەك و ئازوقەو پارەیان بۆ هێنابوون. دوای گەرانەوە نەجمەدین و کەمال خۆشناو، هێزەکەش بەبێ ئاگا لە چارەنوسی رەتلی دووهەم و سێهەم و بە بڕواکردن بە لێپرسراوێکی"D.D.K.D" گوایە:

أ- هێزەکەی عەلی عەسکەری و هێزەکەی تاڵیب ڕۆستەم بە سەلامەتی گەیشتونەتە کوردستانی عیراق و لەسەر سنور بارەگایان داناوە.

ب - ئەم هێزەش واتە (د. خالید و ئەوان) لە شوێنی ئەمین دا و عەشرەتی گۆیی سەر بە "D.D.K.D" یەو هێزێکی گۆییشیان لەگەڵ دەنێرێ و لای ئەوان عەشیرەت شەڕێ عەشیرەت ناکا.

بەڵام بەر لە بەرێکەوتنی هێزەکە بەرەو بادینان ، ئەو چەند ڕۆژەی ئەمان حەسابونەوە بێ ئاگا لە چارەنوسی رەتلەکانی تر،قیادەی موەقتەش ، هەموو هێزی خۆی و عەشیرەتەکانی ناوچەکە تەیارکرد بوو هەموو رێگاکانیان گرتبوون . شەوی ٦/١٩ ئەم هێزەش لە کاتی تێپەڕبوونیان بە دەربەنێکدا دەکەونە ناو بۆسەی سەدان چەکداری عەشیرەتەکانی ناوچەکە ، کە شێخ موسی کەرەڤان لێپرسراویان دەبێ و بە بڕیاری ق. م و لەسەر بەلێنی (سەر بۆ ق. م و مال بۆ عەشیرەتەکان). دەبێتە شەر و پاش چەند سەعاتێك هەموو سەرانی رەتلەکە بە دیلی دەکەونە دەستیان و ئەوانیش تەسلیم بە ق. م یان دەکەن . لە گیراوەکان دکتۆر خالید سەعید ، ملازم عومەر ، حسێن بابە شێخ ، شێخ عەلی، ئازاد هەورامی، عەلی شیعە، حامید حاجی غالی، ملازم فوئاد و پاشان ئەمانیش دەبەنە لای عەلی عەسکەری و گیراوەکانی تر. و بە بڕیاری ئیدریس و مەسعود و مەلا مستەفا و بە جێبەجێکەری

سامی، لەناو گیراوەکاندا عەلی عەسکەری و د. خالید سەعید ، شێخ حسێن بابە شێخ بە بەندی شەهید دەکەن . بەم پێیە لە کارەساتی هەکاریدا لەناو هێزەکەی یەکێتیدا.* گورزی کوشندە و پشتشکێن بەر بزوتنەوەی سۆشیالیستی دەکەوێ بە شەهید بوونی دوو سەرکردەی ئەوان و ناوداری بزوتنەوە و کوردایەتی و شۆرشی ئەیلول و شۆرشی نوێ.

واتە کۆمەڵە هەر وەك لە یەکەم بریاردان و لە رابەری هێزەکەشدا رۆڵی دووهەمی هەبووە و بەشە کەمەکەی هێزەکەش بووە ، هەروەها لە کارەساتەکەشدا کەمترین زیان و لەناوچوونی بەرکەوتووە.

*تاکە سەرچاوە ئەم بەشە واتە(کارەساتی هەکاری و کۆمەڵە) کتێبی ( لە کەناری دانوبەوە بۆ خری ناوزەنگ )نەشیروان مستەفا ل ٢٦٣- ٢٩٦

# بەشی شەشەم
# سەرکردایەتی ڕێکخستنی ناوخۆ..

## سەرکردایەتی ڕێکخستنی ناوخۆ.

لە دوای چوونە دەرەوەی شاسوار جەلال و نجمەدین عەزیز و حیکمەت محەمەد کەریم و ئازاد عبد ولمەجید ، ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە هێڵەکانی سەر بە کۆمیتەی هەریمەکان و کۆمیتەی شارەکان روبەرووی چەند هاورێیەك کرانەوە ، لەوانە عبدولرەزاق لە هەولێر و ئەحمەد کرێکار و حەمیدی پۆلیس لە کەرکوك و شازاد سائیبو جەمال تایەر و بەندە لە سلێمانی.

لە راستیدا هێڵەکانی ڕێکخستن لە هەر سێ شارەکە ، بەهۆی چوونی سەرکردایەتی بۆ ئێران و گرتنیان و پاشان تەسلیمکردنەوەیان بە عێراق ، پاشان گرتنی هاورێیانی کۆمەڵە تاك تاك و بە کۆمەڵ لە هەولێر و کەرکوك و خانەقین و بەغداد و سلێمانی، کارێکی وای کردە سەر ڕێکخستنەکان ، کە پچڕ پچڕ و لێکدابڕانی تیا دروستبوو ، ئەو هاورێ و ئەلقانەی کە پەیوەندیان بە گیراوەکانەوە هەبوو، لە هەموو شارەکان تا ماوەیەکی زۆر پچڕان و نەدۆزرانەوە، هەندێ لەوانەش ، کە پەیوەندیان بەو هاورێیانەوە هەبوو ، کە نەگیرا بوون، لەبەر مەترسی بارودۆخەکە خۆیان سرکرد ، هەندێکیشیان زۆر قارەمانانە کەوتنەگەر بە چەند شێوەیەکی جیاجیا.

أ ـ بەشێکیان ئەرکەکانیان هاوکاریکردنی مەفرەزەکانی پێشمەرگە بوو، کە دەهاتنە ناوشار لە چاوساغی کردن و شاردنەوەیان و گوێزانەوەیان، لەوانەی کە من دەمناسین ، ئەحمەدی زێرنگر ، شێخ کەمالی زێرنگر، حەمە سەعید فەقێ عەلی.

ب ـ بەشێکی تریان سەرپەرشتی کاری ڕێکخستنی نهێنی شارەکانیان دەکرد، وەك شازاد سائیب ، جەمال تایەر، حەمە چاوشین ، وبەندە.

دیارە لەو بارودۆخ و هەلومەرجەدا ، جگە یەکتر بینی جاروبار ، کە بۆ کاری زۆر پێویست بووایە ، نە کۆبونەوە و نە پەیوەندی بەردەوامیشمان هەبوو.

له کۆتایی ساڵی ۱۹۷۷دا نامەیەکم له کاك نەوشیروان و مام جەلالەوە پێگەیشت . کـە بـارودۆخی پەیوەنـدی سـەرکردایەتی بـە نـاوەوە دژوارە و دەبـێ هـەوڵی دروستکردنی خەتێکی پەیوەندی بکەین.

بۆ ئەو مەبەستە هەوڵمدا له دوولاوە هێڵی پەیوەندی دروستکەم.

أ- له ڕێگەی" شاربازێر و دۆڵەرووت"ەوە، بەهۆی ناردنە دەرەوەی خاڵە شێخ سدیق بۆ دۆڵە رووت و لەو ڕێگەیەوە.

ب ـ له ڕێگەی ڕانیە ـ سەنگەسەر ـ قەلاتوکان و ئەبوبەکرەوە، بۆ ئـەو مەبەستە لـە ڕانیە پەیوەندیم بە خاڵم کرد (حەمە مستەفا محەمەد، حەمەی مەجید هاوار) ئەویش بردمی بۆلای سەید ئەحمەد ( ئەحمەد سەید زادە).

ئەحمەد سەید زادە لەگەڵ ئیستخباراتدا کاری دەکرد ، جێگای مەترسی نـەبوو، کـە داوام لـێکرد بۆ دروست کردنی ئەو هێڵە زۆر ئامـادەیی دەربـڕی ، لـەو کاتـەوە تـا مانگی ۱۹۷۸/۸ هەموو پەیوەندیەکی ناو شار و دەرەوە لـە ڕێگـەی ئـەو خەلیلـەوە بـوو ، ئـەو کاتـە خـەلیل جـەلالی بـرام ، بنکەیـەکی شـاردراوەیان لـە قـەڵاتوکان و ئەبوبەکر دانا بوو. ئەو بنکەیە بوو، بە سەرچاوەی گەیاندنی ئازوقە و پێویـستی تـر و هەم گەیاندنی بەریدی ڕێکخستنەکانی شار بە سەرکردایەتی له ڕێگەی ئـەو هێڵـەی کە بریتی بوو؛ له منەوە بۆ خاڵم و سەید ئەحمەد و لەوێشەوە بۆ بنکـەی قـەڵاتوکان و لەوێشەوە بۆ سەرکردایەتی و بە پێچەوانەوە.*

## هاتنەوەی تەها باراوی و فوئادی مەجید میسری له خواروی عیراقەوە بۆ سلێمانی.

تـازە خـەریکی پێکهێنـانی مـەفرەزەکان بـووین ، خواخوامـان بـوو، ئـەو ئەندامانـەی کۆمەڵە ، کە له ئاشبەتاڵ گەرابونەوە شارەکان و لەلایەن ڕژێمەوە دوورخرابونەوە بۆ

* لەکەناری دانوبەوە..... نەوشیروان لاپەڕە ۲۱۱.

شـارەکانی ناوەراسـت و خـوارووی عـێراق ، و بـە نهێنـی گەرابونـەوە سـلێمانی بیانبینین.

رۆژێ کاك ئەکرەم سەید محەمەد پێی ووتم: کە تەها باراوی و فوئادی مەجید میـسری لە سلێمانین ، با بچین بیان بینین؟، چویت بـۆ لایـان؟. کـە چـوومە لایـان و قـسەم لەگـەڵ کـردن ، تـەها بـاراوی داوای کـرد بینێرینـە دەرەوە بـۆ دۆڵـی رووت ، کـە ئەوکاتە نجمەدین عەزیز و برادەرانی تـر لـەوێ بـوون . تـەها بـاراوی رۆیـشتوو پـاش چەند مانگێك گەرایەوە و وازی لە پێشمەرگایەتی هێنا، لەگەڵ سوارەی کاك ئەحمـەد ، تەها بێ چەك گەرایەوە و سوارەش دەمانچەیەکی هێنابوو ، چومە لایـان ، سـوارە دەمانچەکەی دایەوە بە ریکخستن، هـەردووکیان گلـەییان لـە هەڵسوکەوتی نجمـەدین بوو، هەر لەبەر ئەویش تەسلیمبوونەوە.

بەلام فوئاد وەلامی تەواوی نە داینەوە، من فوئادم زۆر لە نزیکەوە نەدەناسی ، بەلام زیادی برای فوئادم دەناسی ، کـاتی خـۆی لـە هەمـەدان لەگـەڵمان بـوو ، پاشـان چووە ناو حزبە کارتۆنیەکەی شێخ ستار تایەرەوە.

فوئاد وەلامی ئەوە بوو ، کە بـیری لـێ دەکاتـەوە وەلامـان دەداتـەوە ،پـاش یـەك هەفتە بیستمان لە رێگەی زیادی برایەوە چۆتە لای شێخ ستار و ئەویش بردویـەتی بۆ لای تەها یاسـین رەمـەزان و تـەها یاسـین داوای لـە فوئـاد کـردووە ، کاریـان لەگەل بکا و رێکخراوێکی بەدیلی کۆمەڵەی سەر بە رژێم دروست بکـات ، هـەر بـە ناوی کۆمەڵەوە و، ئەویش گفتی دابوو بە تەها یاسین.

### خاڵە شێخ سەدیق و نامەکەی.

ئێمـە بیـستمان کـە لـە ناوچـەی دۆڵـەرووت مەفرەزەیـەك چـەکدار دروسـتبووە و فەرکاندەکەیان فەقێ سمایل ناوێکە، ئێمەش وەك هەنگمان لە دارا دۆزیبێتەوە ، کە بە راستیش بۆ ئـەو کاتـە مەفرەزەیـەك چـەکدار دەست کەوتایـە وەك هـەرێمێك وابوو.

خاڵە شێخ سدیق لە کۆمەڵەدا پەیوەندی بەمنەوە ، منیش رامسپارد بچێتە لای فەقێ سمایل و پەیوەندی پێوە بکا. نامەیەکیشم بۆ فەقێ سمایل و عبدولقادر هەڵەدەنی نوسی و بە خاڵە شێخ سدیقم ووت : کە لەگەڵیان بمێنێتەوە.

من عەبدولقادر هەڵەدەنی باوکی شەهید غەریبم دەمێ بوو دەناسی ، ناسیاویمان دەگەڕایەوە بۆ ساڵی ١٩٦٣- ١٩٦٤ کە ئەوسا لێپرسراوی سورداش بووم ، بارەگامان لە سەرگەڵو بوو ، خاڵە شێخ سدیق لەگەڵ فەقێ سمایلدا سەرکەوتوو نەبوو، چونکە فەقێ سمایل پێشتر ق. م لە رێگەی کەمالی کەرکوکی و شێخ عەزیزی شەدەڵەوە ،پەیوەندیان بە فەقێ سمایلەوە کردبوو ،

بەڵام لەگەڵ عبدولقادر لە دۆڵە رووت مایەوە ، پاش سێ – چوار مانگ نامەیەکی بۆ ناردم ، لە نامەکەدا نوسیبوی: " ئەرێ تۆ منت رەوان کرد و خۆت مایتەوە لە شارا، کەی دێیتە دەرەوە ؟. ئەگەر نەیەتە دەرەوە هەر لەبەر تۆ دێمەوە شار و ، کە گیراشم ئیعترافت لەسەر دەکەم . نوسیبوی: ئێوە هەر ئازان ماڵی خەڵك بە قور بگرن؟". دیارە نامەکەی هەر بۆ گاڵتە نوسیبوو . لەگەڵ خاڵە شێخ سدیق دا لە١٩٦٢وە و یەکترمان دەناسی و خزمایەتیەکیشمان هەیە، خاڵە شێخ سدیق پیاوێکی زۆر بە هیمەتی شۆرشی ئەیلول و شۆرشی نوێش بوو.

## گەڕانەوەی مام جەلال و بڵاوکردنەوەی هەواڵی کوژرانی و ئازادی مەلا.

لە مانگی ١٩٧٧/٧دا لە رێگەی یەك – دوو جەریدەی تورکیەوە دەنگۆی گەڕانەوەی مام جەلال و کوژرانی لەسەر سنوری تورکیا عیراق بڵاوبۆوە . تەنانەت ئێزگەی بەغداش بە کورتە هەواڵێك بڵاویکردەوە . هەر ئەو رۆژە شەهید ئازادی مەلا ، هاتە دائیرە و هەواڵەکەی دامێ زۆر پەشۆکا بوو . من بەش بەحاڵی خۆم ، بروام بە هەواڵەکە نەدەکرد، بەڵام ئەو هەواڵە لەو کاتەدا بە راستی جەرگبڕ بوو ، بۆ کۆمەڵە و بۆ یەکێتی و شۆرشی نوێ . چووم بۆ رانیە و لە وێوەوە لەگەڵ ئەحمەدی سەید زادەدا چووینە سەنگەسەر و شەو ئەحمەد گەڕایەوە و من چوومە قەڵاتوکان ،

هەواڵی ڕاستیم لە شەهید خەلیل جەلال و شەهید هاوار جەلال زانی کە مام جلال ۲ ڕۆژە بە سەلامەتی گەیشتۆتەوە لای برادەران. هەواڵە ڕاستیەکەم بە ئازادی مەلا و هاوڕێکانی تر گەیاند.

## حسێنی تاپۆ (شێرکۆ) و خۆشاردنەوەکەی.

کاتی کە هاوڕێیان عوسمانی نانەوا و عەلی مراد و حسێن رەزا و ئەو کۆمەڵە هاوڕێیە گیران ، حسێن پەیوەندی بە منەوە هەبوو، بەڵام پێشتر کە من لە کەرکوك بووم ، پەیوەندی بە عوسمانی نانەواوە هەبوو.

حسێن هاتە لام ، ووتی : ئەو برادەرانە هەموویان گیراون و هەموو خەتەکانی لای ئەوان پچڕان ، ئەوانەی من ئەیانناسم خۆیان شاردۆتەوە، با ئێمەش بۆ ماوەیەك خۆمان بشارینەوە ، من پێم باش بوو، تا یەك –دوو هەفتە بە شەو لە ماڵ نەبین و بە ڕۆژیش نەچینە دائیرە و ئیجازەی نەخۆشی بکەین و بیانو بدۆزینەوە ، لە یەك جیابوینەوە.

دوای دوو هەفتە نە لە دائیرە و نە لە هیچ شوێنێك دیار نەبوو ، چووم بۆ ماڵیان لە کارێزەوشك ، ماڵی حسێن ، ئەیان ناسیم . دایکی ووتی : بردیان، حسێن لێرە نیە؟. حسێن هەر یەکەم ڕۆژ چوو بووە شاربازێر و لە ماڵی خزمێکیان خۆی شاردبۆوە ، پاش دروستبوونی مەفرەزەکانی شاربازێر و دۆڵەڕووت ، ئینجا خۆی دەرخستبوو ، پەیوەندی پێوە کرد بوون . دوای ئەوە ئەوسا جوابی بۆ من نارد ، کە خەتەکەی فلان و فلانن.

## سەرژمێری ۱۹۷۷و فەیسەڵ تاڵەبانی (سیروان).

لە ساڵی ۱۹۷۲ وە، لەگەڵ فەیسەڵ لە کەرکوك یەکترمان ناسی و لە یەك دائیرە بووین و ماڵەکانیشمان لە یەك گەرەك و زۆر نزیکی یەکتر بووین.

فەیسەل لەناو ڕێکخستنەکانی ئەوسای پارتی دیموکراتی کاری دەکرد، بەهۆی نزیکی ماڵی ئێمە و فەرەیدون عبدولقادر و فەیسەڵ لە یەکەوە، جگە لەوەی ، کە دائیرە پێکەوە بووین و لە یەك ژووریشا بووین، شەوانە هاتوچۆی یەکترمان دەکرد . فەیسەڵ لە هەموو ڕوویەکەوە هەموو سفاتەکانی پیاوێکی وریا و بە وور ودڵسۆزی تیا بەدی دەکرا ، کە شایستەی بوونی بە کۆمەڵە بێ . هەم من لەگەڵیا لە دائیرە و ماڵەوە هەم فەرەیدون عبدولقادریش پەیوەندیمان پێوە کردبوو ، بە جیاجیا و دەمانویست بیخەینە بازنەی ڕۆشنبیریەوە ، تا لە مانگی ١٩٧٣/٥ دا من مفاتەحەم کرد بۆ کۆمەڵە ، لە وەڵامدا ووتی : فەرەیدون پێشت کەوت و مفاتەحەی کردوم.
ئەو ماوەیەی لە کەرکوك بووین و فەیسەڵ پیاوێکی زۆر چالاك و ئیشکەر بوو . چەندین حەلقەی سەقافی دروستکرد . لە ١٩٧٤ دا چوە ناو شۆرش و پاشان لە ئاشبەتاڵ گەڕایەوە ، منیش و فەیسەڵیش لە دائیرەی خانەنشینی کەرکوکەوە گوێزراینەوە بۆ سلێمانی . فەیسەڵ تایپێستێکی زۆر بە توانا و خێرا بوو . لە دائیرە بە تەنیا لە ژوورێکدا بوو . بە ڕاستی بە هیمەتی ئەو پیاوە ، هەر بەیان و بڵاوکراوەیەکی کۆمەڵە هەبوایە ئەو لە دائیرە تێکەڵ وەرەقەکانی دائیرەی دەکرد و پاشان بە چەندین وێنە تایپی دەکرد . فەیسەڵ لە سلێمانی ، پاش ڕۆیشتنی سەرکردایەتی بۆ ئێران گرتنی لیژنەی شارەکانو لەناو کۆمیتەکەدا بەرپرسی پەیوەندی کەرکوك بوو، تا ڕۆژی چوونە دەرەوەی بۆ شارەزوور و پاشان قەرەداغ و بوونی بە فەرماندەی مەفرەزە و زۆر بە خێرایی بوونی فەرماندەی کەرت و پاشان هەرێم.
ساڵی ١٩٧٧بە بڕیاری ڕژێم عیراق ، لە هەموو دائیرە و قوتابخانەکان ، فەرمانبەر و مامۆستا دانرا بوون ،بۆ ئەو سەرژمێریەی کە ئەو ساڵە ئەنجامدرا ، من بەر ئەو کەرتە کەوتبووم ، کە بۆ دەربەندیخان و ناوچەکە بوو، پێشەکی لە شارەوە جوابم بۆ نارد ، کە بەرەو ئەو ناوچەیە دێن ، نامەیەکی بۆ ناردم ناوی هاوڕێیەکی ئەو

مامۆستا و فەرمانبەرانەی ، کە بەر دەربەندیخان و کفری و کەلار کەوتبووین ،پێکەوە وا رێکەوتبووین ، کە ئەگەر حکومەت زۆری لێکردین بە سوپا و جاشەوە ، بچینە دێهاتەکان ، نە چین و هەولدەین ، چەند بکرێ بێ سوپا و گوایە حمایە برۆین . رژێم دەیویست بە بیانوی ئێمەوە بەهێز و دەبابە و مدرعەوە ،بچیتە دێهاتەکان و لە رێگەی جاشەکانی ناوچەکەوە ماڵە پێشمەرگەکان بگرن و باریانکەن ، و دەشیان ویست ، لەپەنای ئێمەدا خۆیان لە لێدانی پێشمەرگە و رزگارکەن.

لە باوەنور بە پرسیار ماڵی (کاك شێرزاد) م دۆزیەوە و لەگەڵی دانیشتم و پاشان نامەیەکەم بۆ نووسی کە ئێمە بەرەو ئەو دێهاتانە دەرۆین و نەخشەی چونی دێهاتاکانیشم بۆ نووسی، کە کوێیەوە دەست پێدەکەین و لە کەیدا و بەرەو چ لایەك دەرۆین؟.

ئێمە لەدێ " کوردەمیر" ی سەروو بووین ، دەمزانی کە فەیسەڵ و پێشمەرگەکان لەو ناوەن . بە فەرمانبەرکانم ووت: ئەگەر سەربازەکان و جاشەکان کەوتنە گرتنی ماڵە پێشمەرگەکان ، ئێمە ماندەگرین و بەرەو دەربەندیخان دەگەرێنەوە. هەرواشمان کرد.

دوای رۆیشتنی ئێمە بە چارەکێك پێشمەرگەکان کەوتنە لێدانی هێزەکەی حکومەت . لەناو هێزەکەی حکومەتدا ئەفسەرێکی گەنجی تیا بوو، زۆر داوامان لێکرد ، کە هەولێدا ژن و منالەکان بەردەن . ئەو ئەفسەرە کە ئیحتیات بوو ،پێی ووتین: کە هێندە ئێمەی پێ ناخۆشە . بەلام جاشە کوردەکان سورن لەسەر گرتنیان ، گەر بەریان بدا جاشەکان لای ئامر شکاتی لێ دەکەن.

لەو شەرەدا یەکی لە کوژراوەکان ئەو ئەفسەرە بوو ، لەگەڵ ئامر مەفرەزەیەکی جاش .لە دوایدا هەواڵمان زانی ، لەو شەرە هەموو پێشمەرگەکان کە فەیسەڵ ئامر کەرتیانە سەلامەت بوون ، هێزەکەی حکومەتیش بە شکاوی گەرانەوە و ژن و منالەکانیشیان پێ بەجێهێشت بوون.

## بەربوونی مامۆستا محەمەد عەتیە و دۆزینەوەی خەتەکەی.

مامۆستا محەمەد عەتیە زوتر لە هاورێیانی تری ناو زیندان، بەربوون، کە گەرایەوە سلێمانی چوم بۆ لای، هەواڵی خەتەکەیم پرسی ،پاش دۆزینەوەی دوان لە خەتەکەی ئەوانیشمان رێکخستەوە.

مامۆستا محەمەد هەم باری تەندروستی و هەم باری خێزانیشی خراپ بوو، زۆری حەز دەکرد بچێتە دەرەوە بۆ ناو شۆرش. بەلام لەبەر ئەو دوو هۆیە بۆی نە دەگونجا، ماوەیەك لە شاردا مایەوە بە هیوای چارەسەرکردنی هەردوو بارودۆخەکەی ، بەلام نەیتوانی تا سەر لە شاردا بمێنێتەوە . ئەوەیش لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٨دا رۆیشت بۆ شاربازێر. ئەو ماوەیە یەکێتی و بە تایبەتی کۆمەڵە لە شارەکاندا لە بارودۆخێکی زۆر سەختی دەرونیدا دەژیان ، لەلایەکەوە دەبوایە ئەرکی داڵدەدان و شاردنەوە و چاوساغی و پەیداکردنی پارە و ئازوقە و تەقەمەنی بۆ مەفرەزەکانی پێشمەرگە جێبەجێ بکەن، لەلایەکی ترەوە توندوتیژی رژێم و گرتن و راونان و گەران بە دوایاندا ، دەبوایە زۆر شارەزایانە لە خەباتی نهێنی کاربکەن و چەندی بتوانن نە یەڵن رژێم سەرەداوێکی دەستکەوێ و نەکەونە ناو تەپکەی رژێمەوە ، بۆیە ناچار بوون ،بە جۆری کار بکەن ، کە جگە لە ئەندامانی سەرکردایەتی رێکخستنی ناوخۆی کۆمەڵە ، کە ئەوانیش لەهەر شارێ ، یەکی دیاری کرابوو، بۆ پەیوەندی ناو شارەکان نەدەبوایە لە " ٢_٣ "پتر یەکتری بناسن . هەر بۆیە هێڵەکانی رێکخستنی کۆمەڵە زۆر فراوان و پچڕ پچڕ و لە یەك وون ببوون.

پێم وانیە ، هیچ کەس هەبێ ،لە دوای ئاشبەتاڵەوە تا وتووێژی ٨٣_ ٨٤ ، بتوانی بە شارەزایی و تەواوی ناو رێکخستنەکانی کۆمەڵەوە لەسەر کۆمەڵە بنوسێ.

هەر یەکە و لە هەموو شارە و لەناو هەر هێلێکدا لە بارودۆخی جیاجیادا ، دەتوانێ لەسەر چەمێکی بچوکی مێژوی کۆمەڵە بدوێ.

## ئەبو شەهاب (ئیحسان نەجم) و مۆرەکەی کۆمەڵە.

دوای دەست پێکردنەوەی شەڕ و نەمانی وتووێژ لە مانگی ١٩٧٤/٣دا. سەرکردایەتی کۆمەڵە بڕیاریدا ، کە بۆ هەر شارێك لیژنەیەکی شار دابنێ . لە کەرکوك بڕیاردرا ، ئەبو شەهاب و ئەحمەد کرێکار و بەندە بین. هەر لەگەڵ ڕۆیشتنی هاوڕێیانی کۆمەڵە لە کەرکوك بۆ ناو شۆڕش بە ماوەی ١٠ ڕۆژ لەپڕ ئەبو شەهابمان لێ وون بوو، بێ ئەوەی بە کەسمان بڵێ پاش زیاتر لە مانگێك ئەوسا هەواڵمان بۆ هاتەوە ،ئەبو شەهاب گەیشتۆتە پێنجوێن ، لە باتی ئەبو شەهاب ، کاك حەمیدی پۆلیسمان خستە لیژنەکەوە.

## تەسلیمبونەوەی تالیب ڕۆستەم و بینینی.

پاش ئەوەی تالیب ڕۆستەم و شێخ جەواد بێدەری و ١٧٢ پێشمەرگە و بە ١٥٠ چەکەوە لە ناچاری و لەبەر هێرش و پەلاماری ق. م و عەشیرەتە کوردەکانی ئەو ناوچە رووە و سنوری عێراق دەرۆن و خۆیان تەسلیم بە حکومەتی عێراق دەکەنەوە . حکومەتی عێراق گرنگیەکی زۆری ئیعلامی و پروپاگەندی بەو کارەساتەدا و کەوتە راگەیاندنی ، گوایە دووهەم ئاشبەتاڵی شۆڕشی کوردە.

تالیب ڕۆستەم هەم وەك ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی و هەم وەك نوێنەری کۆمەڵەش لەناو سەرکردایەتی یەکێتی و هەم وەك فەرماندەیەکی هەرێم بوو، کە بۆ ئەو کاتە ، ئەو بەرپرسیە چ لە ناو شۆڕش چ لەبەردەم رژێمیشدا زۆر گرنگ بوو، دائیرەکانی ئەمن و ئیستخبارات و مەنزومەی بەعس ، زۆریان تالیب ڕۆستەم هێنا و برد و داوای زانیاری زۆریان لێکرد بوو. تالیب هەندێ زانیاری نیوە راست و نیوە دۆری لەسەر یەکێتی و شۆڕش پێ ووتبون . بەڵام یەك وشەی دەربارەی رێکخستنەکانی شار نە درکاند بوو.

پاش تەسلیمبوونەوەی و هاتنەوەی بۆ سلێمانی، سەرکردایەتی رێکخستنی ناوخۆی کۆمەڵە داوایان لێکردم بچمە لای ، بەو هۆیەی کە تالیب هاوڕێی کۆنم بوو، لە

شەستەکاندا پێکەوە کارمان کرد بوو، لەناو پارتی باسکی م. س وە لە چونە دەرەوەشیدا ، بەندە ئاگاداری شەوی رۆیشتنەکەی بووم . جگە لەوەش لە ساڵی ١٩٧٤ من پەیوەندیم پێوە کردبوو، ببێ بە کۆمەڵە.

من چومە لای و تەواوی سەرگوزشتەی کارەساتەکەی لە ماڵی خۆیان بۆ گێرامەوە و پاشان ناچار بوونی بەو تەسلیمبونەوەیە، دواجار داوای لێکردم ئاگاداری سەرکردایەتی بکەم ،کە بە هیچ جۆرێ لەسەر رێکخستنی شار و نهێنیەکانی ناو کۆمەڵە و یەکێتی قسەی نەکردووە و ناشی بکات ، ووتیشی:" من ئامادەم هەر یەکێك لەمانە ،گەر سەرکردایەتی قایل بێ، بیکەم":.

١ـ بچمەوە ناو شۆرش و وەك پێشمەرگەیەك کار بکەم.

٢ـ بچمە ناو ئێران و لە دێیەکدا خۆم ستار کەم.

٣ـ لە هەر دێیەکی کوردستان دەڵێن و وەك هاووڵاتیەك دانیشم.

٤ـ بچمە دەرەوەی وولات.

٥ـ گەر بە هیچی قایل نەبن، بەڵێن دەدەم گەر بنێرنە سەرم بۆ کوشتنیش ناوی بکوژەکە نە درکێنم و هەتا هەم خیانەت لە کۆمەڵە و یەکێتی نەکەم و نەبمە پیاوی رژێم.

لە دوای ئاشبەتاڵ و ئەو کارەساتە گەورەیەی بەسەر کورد و پارتی و کۆمەڵەش داهات، ئەبو شەهابیش وەك خەڵکانی تر گەرایەوە، ماوەیەکی کەم لە سلێمانی مایەوە و پاشان گەرایەوە کەرکوك . لەبەر ئەوەی نەی دەویست بگەڕێتەوە سەر کارەکەی لە شەریکەی نەوتی کەرکوك کەمێ ئاسان بوو، بۆ ئەو ، کە لە کەرکوك دابنیشێ ، جگە لەوەش زاواکەی پیاوی رژێم و بە کرێگیراوێکی حزبە داتاشراوەکەی بوو.(پارتی شۆرشگێر) کە شێخ ستار تایەر شەریف بوو ، تا رادەیەك پارێزراو بوو.

بۆیە کە کۆمیتەی شارەکان دانرایەوە دوای رۆیشتنی هاورێیانی سەرکردایەتی بۆ ئێران، ئەبو شەهابیش دانرا بە ئەندامی کۆمیتەی شارەکان و بەرپرسی شاری

کەرکوك لەگەڵ ئازاد هەورامی و ئەحمەد کرێکار. لەبەر سەلامەتی ماڵی ئەبو شـەهاب، کۆمیتەی شارەکان بڕیاریـدا ، هەنـدێ بەڵگـە و مۆرەکـەی کۆمەڵـە لای ئـەو بـێ، لـەو هێرش و پەلامارەی ، کە کرایەوە سەر هاوڕێیـانی و ئاسۆی شـێخ نـوری و عوسمـان نانـەوا لـە ئەنـدامانی کۆمیتـەی شـارەکان و لیژنـەی شـاری سـلێمانی گـیران ، ئـەبو شـەهاب و ئـازاد هـەورامی ، هـەر یەکـە بەلایەکـدا ڕۆیـشتن ؛ بـێ ئاگـادار کردنـی عبدوالرەزاق لە هەولێر و بەندە لە سلێمانی. پاش مـاوەی ٣ مـانگ ئەوسـا جـوابی بـۆ ناردین ، کـە لـە بەغـدا لـە مـاڵی سـتار خـۆی شـاردۆتەوە . بەشـکم بەڵگەنامـەکان مۆرەکەی کۆمەڵە لە ماڵی ئەوان دەربازکەین و هەڵیش بدەین لە سلێمانی شوێنی خـۆ شـاردنەوەی بـۆ پەیداکـەین . مـن و عـەلی ئامـەخان چـوینە کـەرکوك و مۆرەکـە و بەڵگەنامەکانمان لەگەڵ شوکری هاوسەرمدا هێنایەوە سلێمانی . پاشان ئەبو شهابیش بـە ڕێگایـەك گەیـشتەوە سـلێمانی . پـاش دەربـازبوونی لـە دەسـت تـەها یاسـین رەمەزان و ستار تاهیر شەریف و لە ماڵی ئێمە شاردرایەوە ، تا ڕۆیـشتە دەرەوە بـۆ نـاو شـۆڕش .لـە دەرەوە نەجمـەدین و حیکمـەت تـەنگیان پـێ هـەڵچنی بوو،لەسـەر مۆرکە و تاوانباریان کردبوو ، گوایە ئـەبو شـەهاب مۆرەکـەی داوە بـە تـەها یاسـین رەمەزان . تا من چوومە دەرەوە و مۆرەکەشـم لەگـەڵ خـۆمـا بـرد ، ئەوسا ئـەبو شەهاب لە دەست ، تۆمەت و توانج وگیر و گازی ئەو برادەرانە رزگاری بوو.

## دوا کۆ بوونەوەم لەگەڵ سەرکردایەتی ڕێکخستنی ناوخۆ لەناو سەیارەدا.

– لە ڕۆژی ١٩٧٨/٧/١ لە ڕێگەی ئەحمەد سەید زادەوە، پۆستی سەرکردایەتیمان پێ گەیشت لەناو نامەکاندا دوو نامەی من و دوو نامەی شازاد سائیبی تێدا بوو . نامـەکان هی مام جەلال و نەوشـیروان بـوون . یـەکی لـە خالـەکانی داوایـان لێ کردبـووین ، کـە بڕۆینـــە دەرەوە و پاشـــان لـــە ڕێگـــەی ســـوریاوە بـــچین بـــۆ ســـەرکرایەتی . دوا کۆبوونەوەمان لـە نـاو سـەیارەکەی شـازاد دا کـرد . نزیکـەی سـەعاتێکی پـێ چـوو .

بریارماندا که من ڕێگەی ڕانیەوە بڕۆم بۆ قەڵاتوکان و لەوێشەوە بۆ قەندیل ، شازادیش بریاریدا کە لە بەغدادەوە بڕواتە دەرەوە و پاشان لەوێوە بگەرێتەوە بۆ لای سەرکردایەتی . هەردووکمان هەرچیمان لابوو ، تەسلیم بە مامۆستا جەمال تایەرمان کرد.

من بۆ سەر لێشێواندنی ڕژێم ، کەوتمە دەرهێنانی پاسپۆرت و وەرگرتنی مۆڵەت بۆ ۲۰ ڕۆژ . گوایە دەچم بۆ بلگاریا، وا بەنیازبوم کە لەکۆتایی مانگی ٨ دا ، بڕۆمە دەرەوە.

– لە ڕۆژی ١٩٧٨/٧/٤ مامۆستا جەمال تایەر هاتە دائیرە پێی ووتم : هەر ئێستا برۆ خۆت بشارەوە، ووتی: ( مەغدید کوێخا عەبدوڵڵا کە سەر بە ئەمنی جامعەیەو هاوڕێی خۆشمانە ، ئێستا ئاگاداری کردوم کە پێت بڵێم بڕۆیت خۆت بشاریتەوە، با پەیوندیمان هەبێ تا ئەڕۆیت.

## ٦– ١ بە جێهێشتنی خەباتی شار و دەستپێکردنی خەباتی شاخ.

لە ڕۆژی ١٩٧٨/٧/٩ مامۆستا جەمال تایەرم ئاگادارکرد کە سبەینێ ئەڕۆم، هاتە لام و پێی ووتم: چەند هاورێیەکیش هەیە لەگەڵ خۆتا بیان بە.

ڕۆژی ١٩٧٨/٧/١٠ لەڕێگەی ڕانیەوە بەرەو بنکەی قەڵاتوکان کە بارەگای شەهیدان خەلیل جلال و هاوار جەلالی لێ بوو لەگەڵ ( دانا ئەحمەد مەجید، کۆکژ عوسمان عەسکەری، پشکۆ سعید ئاکام، مامۆستا نوری کەرکوکی، مامۆستا جەلال، شێخ تۆفیق دەربەندیخانی) ڕۆیشتین و شەو لە قەڵاتوکانماینەوە، بۆ بەیانی بەرەو قەندیل لەگەڵ شەهید خەلیل دا بۆ بارەگای سەرکردایەتی چوین.

من پێش گەیشتنم وام زانی بارەگای سەرکردایەتی شوێنی حەوانەوەو نوایەکی هەیە. کە پیاو ستاری تیا بگرێ. گەیشتمە ئەوێ یەکەم کەس توشی هاورێ جەباربوین هەواڵی مام جەلال و کاک نەوشیروانمان پرسی، هاورێ جەبار دەستی بۆ پەنا بەردێکی

دریّ کرد ووتی: ئەوەی پالی داوە بە بەردەکەوە نەوشیروانە ئەوکاتە لەدەراوی گورگان بوین.

دوای گەیشتنی ئێمە بە" ٣ "رۆژ گوێزامانەوە بۆ شوێنێکی تر گوایە کەمێ گەرمترە ناوی(وارمیوان) بوو. لەوارمیوان لەگەڵ مام جەلالو نەوشیروانو فازل کریم کۆبونەوەیەکمان کرد. سەبارەت بە بارودۆخی ناوشارو رێکخستنەکانی ناوەوەو پاشان سەبارەت بەو نامەیەی کە رەسول مەمەند بۆ مام جەلالی ناردبو دەربارەی هاتنی هەمزە ئاغا لەلایەن حکومەتەوە بۆ گفتوگۆ دوایت، لەو کۆبونەوەیەدا بریاردا کە گەر هەمزە ئاغا بۆ گفتوگۆ هاتوە با بفەرموێ بۆ لای مام جەلالو گەر بۆ لای رەسول مامەندیش هاتوە با لەگەڵ خۆیا باسی بکا. هەر لەو کۆبونەوەیە بریاردرا کە ئەو ئەندامانەی کۆمەڵە پاش کارەساتی هەکاری هاتبونە دەرەوە بە کارێك سەرگەرم بکرێن، دەورەیەکی کادریو وشیاریان بۆ بکرێتەوە، کە مام جەلالو نەوشیروانو د. مەحمود دەرسی تیا بڵێنەوەو منیش بەرێوەبەرمو دەرسی ناکۆکیم ئەوتەوە(في التناقض).

کارەساتی هەکاری گورزێکی سەختی سیاسیو پێشمەرگانە بوو لەیەکیەتی نیشتمانی کوردستانو هێزی پێشمەرگەی شۆرشی نوێ درا بە مەبەستی لەباربردنو ئاشبەتاڵ پێکردنی، کە نزیکەی ٢/٣ هێزەکەی توشی پەرشو بڵاویو لەناوچونو چەك کردن بون لەو کاتە ناسکەی کە رژێمی بەعس سەرگەرمی جێبەجێکردنی پلانی کاول کردنو سوتماك كردنی دێهاتو شارۆچکەکانی کوردستان بوو. قیادەی موەقتە گەورەترین خزمەتکاری خۆی لەوکاتەدا بە بەعس پێشکەشکرد و بووە تابوری پێنجەمی هاوبەشی جێبەجێکەری ئەو نەخشە گڵاوە.

بە گرتنو شەهیدکردنی عەلی عەسکەریو د. خالد سەعید، کێشەی ناو بزوتنەوەش یەکلایی بۆوە، مەیدانی بریاردان بۆ رەسول مەمەند چۆڵ بوو، کە لەو باڵە بو

خوازیاری گوایە سەربەخۆیی بزوتنەوە بوون و هەمیشە لە هەوڵی خۆ دوورگرتن لەیەکێتیدا بوون.

من کە گەیشتمە سەرکردایەتی بارەگای سەرکردایەتی بزوتنەوە لەگەڵ سەرکردایەتی یەکێتی و کۆمەڵەدا نەبوون و بە جیا لە دۆڵێکی تر هەڵیان دابوو. تەنانەت بۆ کۆبونەوەکانی سەکردایەتیش نە دەهاتن تا ئەو کاتەی لە گوێزیوە چووینە شێنێ و ناوزەنگ.

وارمیوان بۆ ئێمە شوێنێکی لەبار نەبوو، بۆ مانەوە، یەکێك بوو، لەوارەکانی قەندیل کە گەرمێن و کوێستانچیەکان لە دوای مانگی "٧"وە ، واریان تیا هەڵدەدا بۆ لە وەراندنی مەرو ماڵاتەکانیان و حکومەتی ئێرانیش بە توندی چاودێری دەکردن.

هێشتا لەوارمیوان بووین ، کە جەمال عەلی باپیر و پێشمەرگە گەیشتنە لامان و دڵنیایان کردین بە لە ناوچونی هەموو هێزەکە لە خیانەت کاریکەی ق. م لە هەکاری و بە درێژی پانۆرامای چۆنیەتی کارەساتەکەی بۆ گێڕاینەوە . چەند رۆژێك دوای ئەوان ملازم عومەر عەبدوڵلاش گەیشتە لامان و نامەیەکی لە ق. م و بە دەستو خەتی سامی عبدولرەحمان پێ بوو ، بە گەیشتنەوەی کاك عومەر بۆ لامان کۆبونەوەیەکمان کرد و کاك عومەر پاش باسکردنی تەواوی روداوەکانی کارەساتی هەکاری، کەوتە باس کردنی هەوڵەکانی سەرانی ق. م لەگەڵ سەرانی کۆمەڵە لە زیندانەکانیاندا بۆ لێکدابڕینی کۆمەڵە و یەکێتی و هەوڵدان بۆ لێك نزیکبوونەوە لە نێوان کۆمەڵەو ق. م لەسەر ئەو بنەمایەی ، گوایە کۆمەڵە و ق. م هەردوولا چەپ و مارکسین ، کاك عومەر باسی ئەوەی کرد کە سامی عبدولرەحمان و تاقمەکەی ق. م گفتوگۆیان لەگەڵ خۆی و ئازاد هەورامی دا کردوە و داوایان لێ کردون لەبەر ئەوەی کۆمەڵە رێکخراوێکی چەپی م. ل و گوایە ئەوانیش چەپن راستر وایە لەگەڵ ق.م دا گفتوگۆ بکەن بۆ نزیکبونەوە لە یەکتری ، خۆ تێکەڵ نەکردنی کۆمەڵە بە کێشەکانی یەکێتیەوە.

لـە نامەکەشـیاندا کـە بـۆ سـەرکردایەتی کۆمەڵـە بـوو ، هـەر هـەمان را و بۆچـونیان نوسیبوو . وەك کاك عومەر باسی کرد ، نامەیەکی بە هەمان مانایشمان بۆ برادەرانی بزوتنـەوە نوسـیبوو ،و لـە زیندانیـشدا قـسەیان لەگـەڵ تایـەر عـەلی والی کـرد بـوو نامەشیان بۆ رەسول مامەند نارد بوو.

مەبەستی قیادە موەقتە هەڵتەکاندنی یـەکێتی و پەکخستنی مـام جـەلال بـوو، لـەو کاتەدا. لە کۆمـەڵە ئەو کاتە نەوشیروان و ملازم عومەر و فازل کەریم و بەنـدە لـەوێ بووین ، بە راوێژ لەگەڵ مام جەلال و د. مەحمود دا وەڵامی نامەیەکیان درایەوە بە نا قایلبوونی کۆمەڵـە لـە هـەر پەیوەندیـەك کـە ق. م بیانـەوێ بـە جیـا لـە یـەکێتی بیکەن، و دواشیان لـێکرا ، کە لە نزیکترین کاتدا، لـە چارەنوسـی هـاورێ و هەڤاڵـە دیار نەبووەکانمان ئاگادارمان بکەنەوە ، گەر مەبەستی پیشاندانی نیەت پاکیـشیانە ، با ڕاستەوخۆ لەگەڵ یەکێتیدا بکەونە گفتوگۆ ، نەك بە جیاجیا لەگەڵ باڵەکانی. ئـەم هەڵوێـستەی ق. م کـە هـیچ کاریگەریـەکی نـەکردە سـەر کۆمەڵـە ، بـەڵام بـە پێچەوانەوە بوو، هۆی کردنەوەی دەرگایەك بە رووی بزوتنەوەدا.

وەك لەپێـشەوە لەسـەر ناکۆکیـەکانی نێـوان خـودی بزوتنـەوەم بـاس کـردووە ، کـە بزوتنـەوە لـە ناوخۆیانـدا دوو بـۆ چـوونی جیـا لـە یـەکتریان لەسـەر بونیـان لـە نـاو یەکێتیدا هەبوو.

بۆچوونێك کە رای عەلی عەسکەری و د. خالید و هەنـدێ لـە هاورێیـانی سـەرکردایەتی دەرەوەیان بوو ، ئەوە بوو ، کە کارکردن لە نـاو یەکێتیـدا بـە هاوپـەیمانی و وەك باڵێکی یەکێتی خاوەن یەك بیرورا و هەڵوێست لەسـەر پەیوەنـدی سیاسـی نـاوەوەو دەرەوەو وەك یەك بەرە لە کاروباری پێشمەرگایەتی و دارایی لەگەڵ کۆمەڵدا لەناو یەکێتیدا کار بکەن ، بەڵام هەر رێکخراوە بە جیاش خاوەنی سـەرکردایەتی خـۆی و سەربەخۆیی ئایدیۆلوژی و رێکخراوەیی خۆی هەبێ،

بۆچوونی دووهەم : کە لـەناو شـارەکاندا و لـە سـەرکردایەتی رێکخـستنی نـاوەوەدا عەلی هەژار و سەیدا سالەح یوسفی و چەند هاورێیەکی تریان و لە دەرەوەش (لە ناو

شۆرش) رەسول مامەند ، ئەوە بوو، کە بە هەموو جۆرێ سەربەخۆیی سیاسیو رێکخراوەیی و پێشمەرگەیی خۆیان بپارێزن و خۆیان بە سیاسەت و یەك هێزی چەکداری و یەك هەڵوێستی یەکێتی لەسەر پەیوەندی سیاسی لەگەڵ حزب و دەوڵەت و دەرەوەدا نەبەستنەوە.

دیارە کارەساتی هەکاری و شەهیدبوونی عەلی عەسکەریو د. خالید ، بوو بە هۆی زاڵبوونی بۆچونی دووهەمیان لە ناو بزوتنەوەدا و هەر لە سەرەتای روودانی کارەساتەکەشەو، ئەم بۆچونە لە ناو سەرکردایەتی بزوتنەوەدا رەنگی دایەوەو برادەرانی بزوتنەوە کەوتنە دوورەپەرێزگرتن و دورخستنەوەی بارەگاکانیان لە بارەگاکانی یەکێتی.

ئەو کاتەی کە لە وارمیوان بووین ، ژمارەمان زۆر کەم بوو ، تەنیا ٣ خەیەمشمان هەبوو. خەییمەیەك مام جەلال و د. مەحمودی تیا بوو، خەیمەیەکیش نەوشیروانو هاورێ جەبار و حەمە سەعید، خەیمەیەکیش کادرەکان و هەندێ لە پێشمەرگەکانی تیا بوو ، کە لە دەوری مام جەلال بوو ین و دوو خەیمەی تریش مەسافەیەك دوورتر چەند لە پێشمەرگەیەکی تیا بوو ، لەگەڵ (حاجی کاك ئەحمەدی پشت ئاشان) کە حاجی ئەحمەد دانرا بوو ، بە فەماندەی هەرێمی پارێزگاری . واتە ئەو پێشمەرگانەی دەوری سەرکردایەتی و پێشمەرگەکانی قەڵاتوکان و ئەبو بکرە و دەراوی گۆیزی و تەنگی سیمان لە قەڵاتوکان و ئەبوبکرە بارەگای خەلیل جەلال و هاوار جەلال و کوێخا عەلی قەڵاوە و شێخە کۆلی لێبوو . کە بریتی بوون ، لە ٢٥ پێشمەرگەیەك و هاوار جەلال بەرپرسیان بوو.

لە دەراوی گۆیزیش بارەگاکانی کوێخا قادری زۆدی ، کوێخا حەمەدەمینی رەزگە، حەسەنی برایم شوانی قەڵاتوکانی لێبوو ، حەمەی مەلا شەریف چەند رۆژێك بوو تەسلیم بە رژێم بوبۆوە.

حاجی ئەحمەد کە لەناو پێشمەرگاکاندا ناونرا بوو (حاجی نێرگز) خۆی بە لێپرسراوی هەموو ئەو بارەگایانە و تەنانەت پێشمەرگەکانی بارەگاکانی بزوتنەوەش دەزانی ، کە لە سەرکردایەتی بزوتنەوە بوون . پیاوێکی نەخوێندەوار بوو ، نەیدەزانی جگە لە مام جەلال کەس لە خۆی مسئول تر هەیە. گەر کارێکی بە بارەگا دورەکان ببوایە ، یان نامەی بۆ کەس و کاری بناردایە لە چوارقورنە، نامەکانی بە ئێمە دەنوسی و پاشان مۆرەکەی هەرێمی پارێزگاری لێدەدا.

ئەوکاتە تەنیا دکتۆرێك لەسەرکردایەتی هەبوو.بەناوی د. حسین بە رەچەلەك ئازەری بوو، سەر بە سازمانی ئینقلابی بوو ، کە لە حزبی تودە جیابوونەوە ، خۆی دکتۆر نەبوو ، بەڵام دەرزی و دەرمان و برینپێچی دەزانی و پێی دەوترا دکتۆر، ئەم پیاوە هەر لە سوریاوە لەگەڵ مام جەلال هاتبوو ئەوێ . هەر لاشمان مایەوە تا سەرکەوتنی شۆرشی ئێران ، دوایی گەرایەوە بۆ ئێران.

لە " دۆڵە کۆگە"،بووین ، کە دەکەوێتەوە دوای تەنگی سیمان و پێش دەراوی گوێزی ، کۆبونەوەیەکمان بە ئامادەبوونی مام جەلال و نەوشیراون وبەندە کرد، نادرمان بە دوای فازل کریم و ملازم عومەر دا نەهاتن ، پاشان من چوم بە دوایاندا، فازل کەریم لە نەوشیروان عاجز ببوو ، بەوەی کە معامەلەی ئەندامی سەرکردایەتی لەگەڵ نەکرد بوو. ملازم عومەریش هەر عاجز بوو، ووتی : من ئەرۆمەوە بەرەو ناوچەی سلێمانی و لایەنگری فازل بوو ، و بەخاوەنی حەق دەزانی. دوایی کۆبونەوەکە ، بۆ بەیانی بریار بوو، من بڕۆم بۆ قەڵاتوکان و لەوێشەوە بۆ بەستەستێن و سەنگەسەر، مام جەلال چەند نامەیەکی دامێ لەوانە یەکیان بۆ وەستا محەمەد (حەمەی مەجید هاوار) کە خاڵی بەند ەو خلیل جەلالو هاوار جلالە. و نەوشیروانیش هەندێ نامەی نووسی بۆ رێکخستنی ناوخۆ لەسەر رۆشنایی کۆبونەوەکەی شەومان . کۆبونەوەکە پەیوەندی بە چۆنیەتی باشکردنی باری ئیعلامی ، پەرەسەندن بە هێزی پێشمەرگە لە هەر دوو رووی چەندایەتی و چۆنایەتیشەوە ، بەهێزکردنی خۆمان و راستکردنەوەی بارە گلاوەکەی کارەساتی

هەکاری و داواکردن لە دۆستان بۆ هەر یارمەتیەك ، کە لە دەستیان بێ ، بە پارە، چەك، ئازوقە، هاتنە ناو شۆرش، و پاشان گوێزانەوەمان بەرەو سنورەکانی دیوی خواروی کوردستان و نزیکبوونەوە لە ناوچەکان.

نامەکانی مام جەلال بۆ دۆست و ناسیاوەکانی خۆی بوو لە رانیە ، قەڵادزە ، کۆیە، سلێمانی، هەر هەمووی لە بازنەی باسەکانی کۆبونەوەکە بوو . نامەکانی نەوشیروان بۆ سەرکردایەتی رێکخستنی ناوخۆ و دۆستەکانی بوو ، لە رێکخستنەکانی شارەکان بۆ هەمان مەبەست.

ئەو نامەیە مام جەلال بۆ وەستا محەمەد (حەمەی مەجید هاوار) ی نوسیبوو، داوای کردبوو ، کە یان بچێتە سەرکردایەتی و مام جەلال ببینێ ، یان ناوەرۆکی نامەکە جێبەجێ بکات.

مام جەلال وەستا محەمەدی لە ساڵی ١٩٦٣ وە دەناسی ، کادرێکی چالاکی لیژنەی ناوچەی رانیە بوو ، خولی کادرانی لە شارۆچکەی "ماوەت" بە پلەی باش تەواو کرد بوو ، هەڵوێستیشی هەمیشە لەگەڵ باسکی جەلالی و پاشانیش لەگەڵ ی. ن. ك ، بوو کەسێکی زۆر چالاك و سەرەکی دروستکردنی هێڵی پەیوەندی نێوان رێکخستنەی شارەکان و سەرکردایەتی بوو . تەنانەت زۆربەی هەرەزۆری ئەندامانی سەرکردایەتی یەکێتی و کۆمەڵەش ، کە لە شارەکانەوە بەرەو سەرکردایەتی دەچون هەر لە رێگەی ئەوەوە بوو.

ئەو کاتەی رژێمی عیراقی دەستی بە جێبەجێکردنی پلانی راگوێزان و سوتانی دێهاتە سنوریەکان کرد بوو ، کەوتبووە دروستکردنی ئۆرگا زۆرەملێیەکان ، بریاری شۆرش و سەرکردایەتی یەکێتی وابوو ، کە رێگە نەدرێ و بەرهەڵستی دروستکردنیان بکرێ ، بۆیە هەر بەڵێندەرێك گرێبەستی دروستکردنی بکردایە ئینزار دەکرا و کەرەسەکانی دروستکردنیشی دەسوتێنرا.

نامەکەی مام جەلال بۆ خاڵم ئەوە بوو ، کە رێگە بەو دەدەن کە چەند ئۆردوگایەك بکات بەو مەرجەی کە لە سەدا ١٥٪ سودەکەی بۆ شۆرش بێت . لەگەڵ هاواردا

چووینە سەنگەسەر و پاشان سولْتانەدێ و نامەکانمان لە ڕێگەی (ئەحمەد سەید زادەوە ناردە ناو شار بۆ لای جەمال تایەر و خاڵیشم هاتە لام و نامەکەم دایە.
وەڵامی خاڵم ئەوە بوو ، کە (من بە هیچ جۆرێ تاوانی واناکەم و ئۆردوگاش بە قۆنتەرات ناگرم و خۆم رووڕەشی بەردەم گەلەکەم ناکەم ، چیشیان دەوێ پارە یا ئازوقە بەپێی توانای خۆم یارمەتی دەدەم ، ماوەی سێ ڕۆژ لە بەستەستێن و سەنگەسەر و سولْتانە دێ مامەوە ، وەڵامەکانی ڕێکخستنی ناوخۆ لە ڕێگەی شێخ کەمالی زیرنگر و ئەحمەدی سەید زادەوە لەگەڵ چەردەیەك پارەش گەیشتە دەستم و یارمەتیەکەی خاڵیشم کە باش بیرم نەماوە لە نزیك ٣ ـ ٤ هەزار دینارێك دەبوو ، وەرگرن و لەگەڵ هاوار جەلال گەراینەوە بۆ قەلاتوکان ، لەوێ پێیان ووتم : کە سەرکردایەتی چۆتە دەراوی گۆیزێ. بۆ ڕۆژی دوایی لەگەڵ هاوار دا بەرەو گۆیزێ ڕۆیشتین و لە ڕێگا تووشی چوار – پێنج چەکداری کوێخاکان بوین ، من نەمدەزانی چەکدارەکانی کوێخاکان دژی کۆمەڵە بوون و هاواریش کادری کۆمەڵەو یەکێتی بوو لە ناوچەی قەڵادزە و سەنگەسەر و بەرپرسی ڕێکخستنەکانی قەڵادزە و رانیە بوو ، لە دەرەوە ، چەکدارەکان کەوتنە توانج گرتن و هەندێ قسەی هەلەق و مەلەق ، بۆ ئەوەی هیچ رونەدا و وەڵاممان نەدانەوە تا گەیشتینە گۆیزێ و لەوێ لای مام جەلال روداوەکەم گێڕایەوە و مام جەلالیش بانگی کردن و چەکی کردن و یەك – دوو ڕۆژیش زیندانی کردن*

---

* نەوشیروان لەلاپەڕە (٣٥٢) ( لەکەناری دانوبەوە...) بەهەلە باسی کردوە، بەو جۆرە نەبوو، کەسیشی لەسەر ئەو عاجزنەبوەو نەڕۆیشتوە، بە پێچەوانەوە لەدروست کردنی تیپەکاندا. جگە لە حەمەی مەلا شەریف کە تەسلیم بە ڕژێم بوبۆوە، تیپی قەلاتوکان کە هاوار جەلال بوو، بەسەر تیپی کەرتەکانی لەکوێخاعەلی، شێخەکۆڵ، حەسەنی برایم شوان، وکوێخا قادری زودی، مام عبدالله ی أبوبکرە پێك هاتبون، کە هەمویان هیزی کوێخاکان بوون.

له دەراوی گۆیزی بۆ یەکەمجار سەید سەلیم و سید کەریم و رەحمان سەیدەم ناسی ، سەید کەریم و رەحمان سەیدە کۆمەڵە بوون ، هەر لەوێش بەکر پیرۆت هاتەوە لامان ، بەکر پیرۆت لەگەڵ هێزەکەی تاڵب رۆستەم دا تەسلیمبوبۆوە، و گەرابوەوە سەنگەسەر و لەوێشەوە هاتەوە ناو شۆرش سەید سەلیم پیاوێکی بە هیمەت بوو ، سەر بە رێکخستنی بزوتنەوە بوو ، لە هاتنە دەرەوەیدا پێش ئەوەی بێتە گۆیزی بۆ لای مام جەلال ، سەردانی رەسول مامەند لە دۆڵە کۆکە کردبوو، کە هاتە گۆیزی دیار بوو لە قسەکانیدا ، کە برادەرانی بزوتنەوە قسەیان لەسەر کۆمەڵە و مام جەلال بۆ کردبوو ، کاریان تێکردبوو ، سەرەتا ویستی هەولێکی خێرخوازانە لە نێوان مام جەلال و رەسول مامەندا بدا ، بەڵام بۆی دەرکەوت ، کە کێشەی نێوان مام جەلال و رەسول مامەند نیە ، بەڵکو بۆچونی تایبەتی بزوتنەوەیە لەسەر یەکێتی بە گشتی و کۆمەڵە بە تایبەتی.

هێشتا لە دەراوی گۆیزی بووین کۆبونەوەیەکی سەرکردایەتی کرا و منیشیان بانگ کرد ، من هێشتا بە رەسمی بۆم نەبوو ، وەك سەرکردایەتی بەشداری کۆبونەوەکان بکەم ، بەڵام لەبەر ئەوەی لە سەرکردایەتی رێکخستنی ناوخۆوە هاتبووم و ژمارەی ئەندامانی سەرکردایەتی یەکێتیش زۆر کەمیان لەوێ بوون ، بۆ کۆبونەوەکان منیشیان بانگ کرد ، لەو کۆبونەوەیەدا چەند بریارێك دران لەوانە:

١ـ دابەشکردنی ئەو کادرانەی ، کە لە سەرکردایەتی بوون ، بەسەر هەرێمەکاندا بە شێوەی رابەری سیاسیی هەرێم.

٢ـ باسکردنی بارو دۆخی ئەوسای ئێران ، کە لە گەرمەی خۆپیشاندان بوون ، هەر رۆژەی لە شارێکی گەورەی ئێراندا خۆپیشاندان دەکرا، و باسی کاریگەری ئەو بارودۆخەی ناو ئێران لەسەر یەکێتی و شۆرش.

---

وەتورەبوونی مام جەلالو چەککردنی ئەو چوار پێنجە لەبەر ئەوەبوو، کە من لەبەرئەوەی ئەندامی سەرکردایەتی رێکخستنی ناوخۆی کۆمەڵەو یەکیەتی بووم.ووەك ئەندامی سەرکردایەتی یەکیەتی لەدەرەوەش اعتبار دەکرام

٣- پێویستی نزیکبوونەوەی سەرکردایەتی لە هەرێمەکان و شارۆچکەکان.
٤- هەوڵدان بۆ دامەزراندنی بنگە و دەزگایەکی ئیعلامی لە ناوچەیەکی لانی کەم نیمچە ئەمین دا.

بۆیە بریاردرا کە لە رێگەی بێ دەلان، و بەرە و شێنێ و زەڵێ و خری ناوزەنگ برۆین. لە بریاری دابەشکردنی کادرەکان بەسەر هەرێمەکاندا. دانای ئەحمەد مەجید دانرا بە رابەری سیاسی هەرێمی ١٢ رواندوز و سەید سەلیم بە فەرماندەی هەرێمەکە ، بەڵام پاش ٣ مانگ دانای ئەحمەد مەجید گەرایەوە و لەگەڵ سەید سەلیمدا هەڵی نەکرد و شکاتی لە سەید سەلیم کرد ، نەوشیروان نامەیەکی توندی بۆ سەید سەلیم نارد، سەید سەلیم لەسەر ئەو نامەیە دڵی رەنجا* .

رۆژی ١٩٧٨/١٠/٢٠ بارەگامان لە گۆیزەوە بەرەو شێنێ و زەڵێ و ناوزەنگ لێکنا چەند هۆیەك هەبوو، کە ناوزەنگ و شێنێ هەڵبژێردرا:

١، بەرەو زستان ئەچوین و دەواری گۆیزی کوێستانیکی زۆر سارد و بەفراوی بوو لە زستاندا کە توانای ژیان بێ خانوبەرە و ئازوقەی زۆر سەخت بوو هەموو رێگاکان بە بەفر دەگیرا و هیچ رێگایەکی هاتوچۆ نە دەما.

٢ـ ناوزەنگ و شێنێ سەرەو رێگای قاچاخچیانی نێوان ئێران و عیراق بوو ، لەسەر دەشتەوە بەرەو قەڵادزێ و سەنگەسەر و بە پێچەوانەوە دەکرا بە هۆی ئەوانەوە بەشێکی زۆری پێداویستیەکانی شۆرش دابین بکرێ.

٣، ناوچەیەکی قایم و سەخت بوو ، بە پشتی شاخی مامەندەوە بوو ، کەمتر تۆپ و هاوەن دەیگرتەوە ، جگە لەوەش ناوچەیەکی بەربڵاو بوو ، دەکرا لە کاتی هێرشی دوژمندا تا چەند رۆژێك شەری تیا بکرێ.

٤ـ ئەوکاتە شێنێ دێیەکی گەورە و ئاوەدان بوو ، دەستی رژێمی پێ نەگەیشتبوو ، بۆ سوتان و کاولکردنی و راگواستنی ، دەتوانرا خەڵکی سودیان لێ وەربگیرێ ،

---

* نەشیروان لەکەناری دانوبەوە لاپەرە ٢٥٣ بە جرێکی تر باسی عاجزبونی سەید سەلیمی کردووە.

هەم بۆ ئیشوکاری بنکەکان وەك نان کردن و زەخیرە لێکرین ، هەم لە رێگەی هاتوچۆی ئەوانەوە گەیاندنی دەنگ و باسی بە خەڵکی قەڵادزە و رانیەو شوێنی تریش.

٥- بۆیە پەیوەندی نێوان سەرکردایەتی و رێکخستنی شارەکان و هەرێمەکانی ناوچەی قەڵادزە و رانیەو خۆشناوەتی و ئاکۆیەتی و شاربازێر ئاسانتر فەراهەم دەکرا.

٦- ناوچەیەکی سنوری باش بوو ، بۆ پەیوەندی بە ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی ، ئەوکات کە نزیك بوو لەسەر دەشتەوە، بە تایبەت بە کۆمەڵە و حزبی دیموکراتەوە، ئەوکاتەش دوو هاورێی کۆمەڵەی ئێرانمان لابوون (مامۆستا برایم"ساعد سنەیی"و د. عزیز"د. جەعفەری شەفیعی") و جاروباریش سەید برایم و محەمەدە سور سەردانیان دەکردین هەر چواریان لەسەرانی کۆمەڵەی کوردستانی ئێران بوون و لە ماوەی شەش مانگی جەولەی قەندیل تا گەیشتین بە شێنێ لە رێگەی ئەوبرایانەوە کوردی رۆژهەلاتی کوردستان یارمەتی چاکیاندائین چ لە پارەو ئازوقە و چ لە داودەرمان ناردن.

پەیوەندی یەکێتی بە ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی بە گشتی و کوردیەکان بە تایبەتی لە هەلومەرجی هەڵچون و راپەرینی گەلانی ئێران دژ بە شا و رژێمەکەی ، لەسەر سێ بنەمای فکری و ستراتیژەی بوو:

١- لە دەرەوەی کە شۆرشی کوردستان ئەلقەیەکی گرێدراوی شۆرشی رزگاری و دیموکراتی و سەرفرازی گەلانی چەوساوە و ژێردەستەیە، دەبێ پەیوەندی توندو تۆڵیشی بە شۆرشی گەلان و خەباتی رزگاریخوازیەوە هەبێ و بە تایبەتی شۆرشی ولاتێکی دراوسێ و بەشێکی دابراوی خاکی کوردستان.

٢- لەو روەوەی کە رێبازی یەکێتی رێبازێکی کوردستانیە، پێویستە ئەو تیورە بە پراکتیکیش پیادە بکا و بیسەلمێنێ و هاوکاری خۆی بۆ رۆژهەلاتی کوردستان بخاتەروو.

٣- دیارە سەرکەوتنی شۆرشی ئێران مانای شکاندنی گەورەترین ئەلقەی گەمارۆی شۆرشی خواروی کوردستان دەگەیەنێ ، پاشان کردنەوەی گەورەترین دەرگای

پەیوەندی دەرەوە بە رووی یەکێتی و شۆرشی نوێداو گەیاندنی دەنگوباسی شۆرش‌و سیاسەتی فاشستانەی بەعسیەکان بەرامبەر بە گەلی کورد.

## ٦-٢ .کۆبونەوەی فراوانی کۆمەڵە لەشێنێ .

سەبارەت بە کۆبونەوەی زۆربەی کادرە پێشکەوتوەکانی کۆمەڵەو ٣ ئەندامی کۆمیتەی هەرێمەکان‌و پێداویستی ئەو قۆناغە لە ١٩٧٨/١١/٥ بریاری بەستنی کۆبونەوەیەکی فراوان درا، کە دەکرا وەك پلینۆمێك ناو ببرێ.

تا ئەو کاتە کۆمەڵە بە شەرعی سەرکردایەتیەکی نەبوو ، هاورێیانی سەرکردایەتی پێشو لە زینداندا بوون ، کۆمیتەی شارەکان دوو ئەندامیان لە دەرەوە بوو (ئەبو شەهاب، ئیحسان نەجم‌و بەندە) کۆمیتەی هەرێمەکان تەنیا مەلا بەختیار و ئازاد عەبدولمەجید (عادل) مابوون ، نەوشیروان بە هەڵبژاردن و بە شەرعی نە سەرکردایەتی و نە سکرتێری کۆمەڵە بوو، سالار عزیز لە دەرەوەی وڵات بوو، بۆیە پێویستی بەوە دەکرد ، کە کۆبونەوەیەکی فراوان بکرێ و سەرکردایەتی کۆمەڵەی تیا هەڵبژردرێ لانی کەم نیمچە شەرعیەتێکی هەبێ تا لەباربونی بارودۆخێك بو گرتنی کۆنفرانس لە ١٩٧٨/١١/٥. کۆبونەوە فراوانەکە لە شێنێ بەسترا و نزیکەی ٢٠ ئەندام و کادرانی کۆمەڵەی تیا بەشداربو، لەوانە (بەندە ،ملازم عومەر عەبدوڵڵا ، ئیحسان نەجم "ئەبو شەهاب " ، ئازاد سەگرمە ، ئاوات قارەمانی ، فازل کەریم ، نەوشیروان مستەفا ، مەلا بەختیار ، ئازاد هەورامی ، ملازم سەید کەریم ، رێباز ، مامۆستا نوری محەمەد ، مامۆستا جەلال شێخ توفیق) و لە دوایی کۆبونەوەکە سالار عزیزیش لە ئێرانەوە گەرایەوە و بەشداری کرد . دڵنیانیم لەوەی دانا ئەحمد مەجید و کوکژ عەسکەری بەشداربوون یان نا ،ئەوکاتە رۆیشتبوون بۆ هەرێمەکان .

**بەرنامەی کاری کۆبونەوەکە لەم خالانەدا خۆی دەنواند:**

١ـ روونکردنەوەیەکی دوورو درێژ لەسەر بەسەرچونی رۆڵی بیری ماوتسی تۆنگو زەقی ناوی م. ل. و تحریفیەت ، لەلایەن نەوشیروان مستەفاوە.

٢ـ روونکردنەوەیەکی دوورو درێژ لەسەر شۆرشی ئەیلول و رۆڵی بنەماڵەی بارزانی و ئاشبەتاڵ لەلایەن د. مەحمود عوسمانەوە.

٣ـ رونکردنەوەی پێویستی لە دایکبوونی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و بۆچی دامەزرا ؟ و رۆڵی لە خەباتی شۆرشگێرانەی گەلی کورد و پێکهاتە نیمچە بەرەییەکەی لە کۆمەڵە، بزوتنەوە، هێڵی گشتی(هێڵی پان) لەلایەن مام جەلالەوە؟.

٤ـ دامەزراندنی دەزگایەکی راگەیاندن بۆ کۆمەڵەو دەرکردنی گۆڤارێکی وەرزی سیاسی فکری.

٥– گۆرینی ناوی کۆمەڵە

٦ـ هەڵبژاردنی سەرکردایەتی کۆمەڵە کە بریتی بن لە نوێنەرانی کۆمەڵە لە مەکتەبی سیاسی وسەرکردایەتی یەکێتی .

**کۆبونەوەکە پێنج رۆژی خایاندو گەیشتە ئەم ئەنجامانەی خوارەوە:**

١ـ کۆمەڵەی م. ل کوردستان ـ بیری ماوتسی تونگ بوو،بە رای زۆرینە ناوەکەی گۆرا و بۆ (کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان) لەگەڵ ئەوەش ، چەند ناوێکی تریش پێشنیارکرا وەك (پارتی کاری کوردستان، پارتی کرێکارانی کوردستان، کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی کوردستان، پارتی شیوعی کوردستان، کۆمەڵەی سۆشیالیستی دیموکراتی کوردستان).

٢ـ سەرکردایەتیەك لە ١١ ئەندام هەڵبژێدرا بە ناوی سەرکردایەتی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان.

٣ـ لەناو سەرکردایەتیدا ٥ ئەندام دیاریکران وەك (ناوەندی کۆمەڵە) ئەمانە بوون، بە نوێنەری کۆمەڵە لە م. س یەکێتی و لێپرسراوی دەزگاکانی راگەیاندن، پێشمەرگە ، دارایی و بەڕێوەبەرایەتی (أداری).

(٦) شەش ئەندامەکەی تری سەرکردایەتی کۆمەڵە دابەشکران بەوە شێوەی خوارەوە:

أـ هاورێیەك بە لێپرسراوی ڕێکخراوی کۆمەڵەو لێپرسراوی یەکێتی لە گەرمیانو کەرکوك.

ب ـ هاورێیەك بە لێپرسراوی ڕێکخراوی کۆمەڵە و لقی یەکێتی سلێمانی و ناوچەی شاربازێر.

ج ـ هاورێیەك بۆ لێپرسراوی ڕێکخراوی کۆمەڵە لە هەولێر و ناوچەی هەولێر.

٤- بریاردرا کە ئۆرگانێکی ناوەندی وەرزی دەربچێ بە ناوی (کۆمەڵە).

٥- بریار درا کە چالاکانە کار بکرێ بۆ بنیاتنانی دەزگا سەرکردایەتیەکانی (پێشمەرگە، راگەیاندن، دارایی، پەیوەندیەکان، وئیداری یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان.

٦- بریاردا کە نەوشیروان وەك سکرتێری گشتی کۆمەڵە و جێگری سکرتێری گشتی یەکێتیی کار بکات تا گرتنی کۆنفرانس یا کۆنگرەی کۆمەڵە.

ئەو(١١) ئەندامەی کە دەرچون بۆ سەرکردایەتی کۆمەڵە ئەمانەی خوارەوە بوون:

١-نەوشیروان مستەفا.

٢- ملازم عومەر عەبدوڵلا.

٣- سالار عەزیز.

٤- مەلا بەختیار.

٥- ئازاد عەبدولمەجید.

٦-ئیحسان نەجم.

٧- فازل کریم"مامۆستا جەعفەر" بە کەمترین دەنگ.

٨-شەهید ملازم سەید کەریم.

٩- بەندە.

٧- بریاردرا ئەندامانی سەرکردایەتی کۆمەڵە ئەوانەی لە زینداندان مافی ئەندامەتی سەرکردایەتیان هەبێ تا ئازاد دەکرێن.

لە دابەشبوونی کارەکان من وەك ئەندامی ناوەندی کۆمەڵە لە سەرکردایەتی مامەوە تا مانگی ئادار ، دوای ئەوەی کە مامۆستا عەزیز لە ١٩٧٩/٢/٢٥ لە زیندان لە سێدارەدرا بریار درا ، وەك لێپرسراوی لقی کەرکوك ی. ن. ك و لێپرسراوی رێکخراوی کۆمەڵە لە کەرکوك من بچمە ناوچەی قەرەداغ و گەرمیان.

گرتنە دەستی زۆربەی لێپرسراوێتی لق و هەرێمەکان لەلایەن هاورێیانی کۆمەڵەو بوونی نەوشیروان بە سکرتێری کۆمەڵە و بە جێگری سکرتێری گشتی و پاشان گرتنە دەستی لێپرسراوێتی دەزگای پێشمەرگە (مکتب عسکری) و راگەیاندن و دارایی لەلایەن هاورێیانی کۆمەڵە ، بەهۆیەوە هێندەتر دورکەوتنەوەی بزوتنەوە لە کۆبونەوەکانی سەرکردایەتی یەکێتی و هەستی پێدەکرا و خۆیان بە غەدر لێکراو دەزانی ، ئەمە بە جۆرێك لەناو بزوتنەوە رەنگی دایەوە ، کە لە نەورۆزی ساڵی ١٩٧٩دا لە یەکێتی جیاببنەوە.

## ٦ – ٤ . شەڕی شێنێ و جەنرال بەفر.

کۆمەڵە هێشتا لە گەرمەی کۆبوونەوە فراوانەکەیدا بوو، کە هەواڵ لە رێکخستنەکانی ناو رانیە و قەلادزەوە هات، کە رژێمی بەعس هێزێکی زۆری ئامادە کردووە بۆ هێرشکردنە سەر سەرکردایەتی. ناوچەی بارەگاکانی سەرکردایەتی، بریتی بوو، لە گوندی شێنێ ودەشتی زەڵی و خری ناوزەنگ "واتە ئەو دۆڵەی لەسەری شاخی

مامەنـدەوە دەسـتپێدەکا، بـۆ ناوچـەی بـێ دەلان"ئـەو شـوێنانەی، کـە دەبوایـە پێـشمەرگە بگرتایـە، خـۆی تیـا قـایم بکردایـە بـۆ بەرەنگاربونـەوەی بەعـسیەکان. دەروازەی شێنێ، جادە ڕێیـەکی چـەوی لـە" قـەڵادزێ و سـونی"وە، بـۆ دەهـات، لـە بەردەم کەلاوەکـەی مەخفەرەکـەی شـێنێ دا تـەواو دەبـوو. سـەر لوتکـەکانی شـاخی مامەندە، کە پـشتی بارەگاکـانی یـەکێتی بـوو، لـەو دیـوی قـەڵادزەوە دوژمـن پلانـی گرتنی دانابو، بۆ زاڵبـوون بەسـەر ناوچـەی ژێـر دەسـەڵاتی یـەکێتی و پاشـان گرتنـی شاخی جاسوسان، کە بەرامبەر بارەگاکانی یەکێتی بوو، لەسەر سنور لەبەری ئێران. حکومەتی بەعس ئەو پلانەی بەرەزامەندی حکومەتی ئەوسای ئێران دارێشتبوو. ئـەو کاتـە سـەرکردایەتی هێزێکـی کـەمی پێـشمەرگەی بـەدەورەوە بـوو، بـەناوی هـەرێمی شەشی پشدەر، کە ژمارەیان لە (١٥٠) پێشمەرگە تێپەڕی نـەدەکرد. ٣٧ پێـشمەرگەی هەرێمی٧ی حەوتی باڵـەکیش بـۆ هەنـدێ ئیـشوکاری خۆیـان هاتبونـە سـەرکردایەتی، لەگەڵ نزیکەی ٢٥ کادری کۆمەڵەش کە لە ناوچە جیا جیاکانەوە ولەگـەڵ نزیکـەی ٣٠ ئەنـدامی سـەرکردایەتی و کـادر وپێـشمەرگەی بزوتنـەوەش، هاتبوونـە ئـەوێ، بـۆ بەشداریکردن لە کۆبوونەوە فراوانەکە.

سـەبارەت بـە گەیـشتنی هـەواڵی هێرشـی بـەعس کۆبونەوەکـەی کۆمەڵـەمان لـە ١٩٧٨/١١/٨ وەستاند، بڕیاردرا کە (حاجی حاجی برایم) کـە ئەنـدامی سـەرکردایەتی ولێپرسراوی هەرێمی ٦ی پشدەر بوو،سەرپەرشتی شەڕەکە بکات، وئەوسێ ناوچەیەی کە دەشێ ڕژێم هێرشی لێوە بکات، قایمکات.

ڕۆژی ١٩٧٨/١١/٩سـەر لـە ئێـوارە چـەند کۆپتـەرێك کەوتنـە خولانـەوە بەسـەر ناوچەکەدا. بەڵام لە بەرزی دەفرین و بێ تەقە گەرانەوە.لەشەودا تەقە لەسـەر شـاخی مامەندەوە دەستی پێکرد،تـا نیوەشـەو، ئـیتر تەقـە دەنگـی بـڕا. بەرەبـەیان ئاگـادار کراین، کە ڕژێم سەری مامەندەی گرتوە. دەروازەی شێنێ قایمترکرا و پێشمەرگەکانی باڵەکایەتی بە سەرپەرشتی شـەهید "ئەحمـەد مـەولود" دامـەزران ، لـە دوا نێـوەڕۆی

هەمان ڕۆژدا هێزی ڕژێم لە"سونیێ" وە، نزیکی شێنێ بوونەوە، لەئێوارەدا شکان. کۆپتەرەکانی ڕژێم کە پتر لە ٥٤ کۆپتەر بوون، بە نۆرەی شەش شەشی ئەو ڕۆژە تا ئێوارە تەقەیان لە ناوچەکە و لە پێشمەرگەکان کرد. ئێمە ئەو کاتە چەکی قورس دوو "دۆشکە"مان، هەبوو، یەکیان لەسەر بستوەکەی نێوان زەڵێ و ناوزەنگ دانرا. کە شەهید "عەلی ئامەخان وحەمە سیاسی" لەسەر بوون، دۆشکەی دووهەم لە نێوان زەڵی و شێنێ لە ژێردارێکدا دانرابوو،کە (ئەحمەد خدر)ی،لەسەر بوو. ڕۆژی دووهەم و سێهەمی شەڕ دۆشکەکان تەقەیان لە کۆپتەرەکان ئەکرد. بەڵام دۆشکەی نێوان زەڵی و شێنێ لە سێهەم ڕۆژدا وەستا و تەقەی نەکرد ، هێزەکەی حکومەت لە مامەندە نەهاتە خوارەوە و هەر چاودێری ناوچەکەی دەکرد. لە ڕۆژی سێهەمدا بە فرێکی زۆر، لە شەودا تا بەیانی باری، سەری جاسوسان وسەری مامەندەی داپۆشی.لە بەیانیدا پێشمەرگەکان بۆ سەر مامەندە سەرکەوتن و شوێنی سوپاکەیان گرتەوە. ڕژێم هەموو ڕۆژێ هێرشی دەبرد ودەشکا. لەمامەندە، لەسەری جاسوسانیش بەڕۆژ بە کۆپتەر سەربازیان دادەبەزاند و لەعەسردا هەڵیان دەگرتنەوە لەڕۆژی هەشتەمدا، واتە لە١٩٧٨/١١/١٧ هێزی ڕژێم لە قوڵی "شێنێ"وە، گەیشتە پشتی ڕەزەکان. دەیویست بەرەو ناو دێ ی شێنێ وزەڵێ بڕوات.لە عەسردا بە هۆی قارەمانێتی پێشمەرگەو سەرمای بەفر وزستان شکان وگەڕانەوە دواوە. پاش بەجێهێشتنی مەیتێکی زۆر لە کوژراو وڕەق بوەوە. لەڕۆژی ١٩٧٨/١١/١٦ سەرکردایەتی کۆبونەوەیەکی کرد. لەو ئەندامانەی سەرکردایەتی کە ئەو کاتە لەوێ بوون، لە هی کۆمەڵەو بزووتنەوە کە تەنیا ٢ کەسیان بەشداریان کرد.ئەوانیش:(حاجی حاجی برایم و قادر عەزیز)بوون. ئەم بڕیارانە دران:-

١- پێویستە تا زۆرترین قوربانی شەڕکەین و هەوڵی شکاندنی دوژمن بدەین.

٢- بۆ دەستگیرنەبونی"ئێزگە"و دیکۆمێنتەکان ئامادەیانکەین، بۆ گوێزانەوەو دوورخستنەوەیان.

٣- لەکاتی تێشکانمان لـەم شـەڕە دەبـێ ئەنـدامانی سـەرکردایەتی، کـە دەمێننـەوە بلاّوەی پێ بکەین و بەسەر هەموو ناوچەکاندا دابەش ببین وڕاستـەوخۆ سەرپەرشتی پێشمەرگەکانی ناوچەکان بکەین.لـە هـەولێرەوە تـا گـەرمیان و تاخۆگرتنـەوە واز لـە دامەزراندنی بنکەو بارەگا بێنین.

٤- هەر چەند مانگ جارێك لێك نزیك بینەوە بۆ کۆبونـەوە بـەپێ ی پێویست. بـەلاّم خۆراگری پێشمەرگەو بـە هێـزی جـەنراڵ بـەفرو سـەرما خۆشبەختانە دوژمـن شـکا، ئێمەش کەوتینە خانوو دروستکردن، بەو سەرما وبەفر و زستانە سودیشمان لەهەندێ لـە خـانوە چـۆڵەکانی تۆکـان و زەڵـی و شـێنێ وەرگـرت تـا وەرزی بـەهار هـات و ژوورەکانمان تەواوبوون.

ڕۆژی ١٩٧٨/١١/١٧ تینێکـی زۆرمـان بۆهـات، بـیر لەوەکرایـەوە، کـە ئێزگەکـەو بەڵگەنامەکان و هەنـدێ کەلوپـەلّی پێویست کۆبکەینـەوە و ئامـادەی ڕەوانـەکردنیان بکەین، بۆ دیوی" مـاڵیمۆس و پـشتی هەڵـشۆ"، و خۆمـان لەگـەڵ پێـشمەرگەکان بـە سـەڵتی، تـا بکـرێ بـەرگری بکـەین. دیـسانلەو ڕۆژدا لـە عەسـردا بـە فرێکـی زۆر دایکردەوە وئیتر هەورو بەفروسارما، ڕێگەی لە جووڵەی کۆپتەر و سوپا گـرت. ڕۆژی ١٩٧٨/١١/١٨ ئەوفەیلەقە سوپایەی کە"وەلید مەحمود سیرەت" قیادەی دەکـرد.بـە شکاوی گەڕانەوە قەلاّدزە و ڕانیە و پایەگاکانی خۆیان. پـاش شـەڕێکی(٩)ڕۆژی، لـەو شەڕدا تەنیا یەك پێشمەرگە بریندار بوو، بەلاّم پتر لە(٥٠)سـەرباز بـە چـەکەکانیانەوە لە بەفردا بە جێمان و ڕەقبوونەوە یا کوژران.

## گرنگی ستراتیژی ئە م شەڕە :-

١- دوای نزیکـەی دووسـاڵ، لــە دەسـتپێکردن و بــەرپابوونی شۆڕشـی نـوێ بــە سەرکردایەتی یەکێتی، یەکەم جار بوو، کە سەرکردایەتی هەوڵی بنکە و بارەگایەکی نەبزووت (ثابت) بدا.

٢- سەرکەتن لەو شەڕە مانای گرنگی ستراتیژی ناوچەکەی سەلماند لەو ڕووەوەی کە:-

ا- ناوچەیەکی قایم وگرنگە بۆ سەرکردایەتی، کە تیایدا نیشتەجێ بێ.

ب- لەسنوورەوە ناوەڕاستی نێوان ناوچەکانی هەولێر و سلێمانی یە.

٣- خالی وەرچەرخانی یەکێتی بوو، لە شکستی گەورەی کارەساتی هەکاریەوە، بۆ سەرکەوتنی گەورەی ئەو شەڕە، کە مانای گەشەکردنی جوولانەوەکەو یەکێتی دەگەیاند.

٤- یەکەمجار بوو لە"شۆڕشی نوێ"دا، کە شەڕی ڕووبەڕوو (جەبهەوی) لەگەل هێزێکی سەربازی واگەورەدا کە فەیلەقێك سەرباز و(٥٤) کۆپتەری شەڕکەرو(١٢) فڕۆکەی شەڕکەری بەشداری تیادا بکا. بەهاوکاری ئەفسەرەکان و سوپایی ئێرانیشەوە، کە لەو بەرمانەوە چاودێری ئێمەو ڕەصەدیان بۆ کۆپتەرەکانی عێراق دەکرد. لەم شەرەدا شۆڕش سەرکەوتوانە، بەسەر پەلامارەکەدا زال بێ، کە هەم وورەبەخشێکی گەورە بوو، بەجەماوەری دانیشتووی شارەکان هەم بەلگەی لە خەم ڕەخسانی شۆڕشەکەشی دەگەیاند

٥- سەرکەوتن لەو شەڕەدا، بووە هۆی بیرکردنەوەمان لە خۆقایم کردن وخانوو دروستکردن و جێگیربوون و بوونی شێنێ و ناوزەنگ بەپایتەختی شۆرش و چەقی بڕیار تا گوێزانەوە بۆ قوولایی ناوچەی مەرگە و پاشان سەرگەلووی پەنا سلێمانی.

## ٦ ـ ٥. ڕووداوەکانی دوای نیشتەجێ بوون.

## کۆتایی ١٩٧٨ و وەرزی یەکەمی ١٩٧٩

### یەکەم ـ پێکهێنانی دەزگاکان:

هەر پاش تەواوبوونی کۆبونەوە فراوانەکەی کۆمەلە و دەست بەکاربوون بۆ دروستکردنی نوایەك بۆ مام جەلال و کاك نەوشیروان دەزگای ڕاگەیاندن و دەزگای

پێشمەرگایەتی(مەکتەبی عەسکەری)، و دابەشکردنی کارەکانی یەکێتی بەسەر ئەندامانی (م.س )دا. جۆرێك لە خۆکۆکردنەوە و خۆرێکخستنەوە دەستیپێکرد. نەوشیروان لەگەڵ ئەوەی کە بە سکرتێری کۆمەڵە هەڵبژێردرا بوو بە جێگری سکرتێری گشتی. بەڵام پتر خۆی بۆ کارەکانی کۆمەڵە تەرخان کرد، لەبارەی سەرپەرشتیکردنی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لەناو شارەکان و دەرکردنی بلاْوکراوەیەك وەك بلاْوکراوەی ئۆرگانی کۆمەڵە.لە کۆبوونەوەی بچوکی سەرکردایەتی یەکێتی دا بڕیاردرا، کە دەزگای ڕاگەیاندن (فازیل کەریم ) لێپرسراوی بێ و دەزگای پێشمەرگەش(م. ع) مولازم عومەر عەبدوڵڵا لێپرسراوی بێت، هەر دەزگایەش لە" ٣ "ئەندام پێکبێت ، یەك کۆمەڵەو یەك بزووتنەوەو یەك بێ لایەن.پاشان لە یەکەم کۆبونەوەی سەرکردایەتی دەرەوەو ناوەوەی وولاْت کە پێشتر نەکرابو، بێ لایەنەکان ناونران بە خەتی پان (الخط العریض) پاشان بوون بە خەتی گشتی (الخط العام). بەهەمان شێوەش هەموو لیژنە و ناوچە و لقەکانی یەکێتی،کە دیسان لێپرسراوی لقەکانی کەرکوك وسلێمانی لە کۆمەڵە دانران. بارەگاکانی کۆمەڵەو بزووتنەوە، هەندێکیان لە ناوزەنگ و زەڵی و هەندێکیان لە گوندی شێنێ جێگیربوون. بارەگای من ومەلابەختیار وشێرکۆی شێخ عەلی و حاجی حاجی برایم لە شێنێ بوو. سەرانی بزووتنەوە لەگەڵ ئەو هەموو پێشینە کەڵەکەبوەی نێوان ئەوان وکۆمەڵەو مام جەلال، ئەم دابەشکردنی ئیش وکارەشی هاتەسەر، کە نەوشیروان بوو بە جێگری مام جەلال ولێپرسراوی دەزگاکان ولقەکان، بە زۆری لە کۆمەڵە دانران، بزوتنەوە تووشی نائارامی و هەست بەغوبن ومەغدووری کردن بوونەوە.لەلایەکی تریشەوە لەو چەکانەی کە گەیشتبوە سەرکردایەتی، بەشی شێر بەسەر کۆمەڵەدا دابەش کران.

## دووەم: کێشەی نێوان مەلا بەختیار و شێرکۆی شێخ عەلی.

شێرکۆی شێخ عەلی پیاوێکی تێکۆشەرو خاوەن پێشینەی سیاسی بوو، لە سەردەمی وتووێژی ئازاردا بەرپرسی ڕێکخراوی جوتیارانی سلێمانی بوو. بە بنەماڵەش هەر نیشتمانپەروەربوون و خزمی"عەلی عەسکەری "بوون و"شێخ عەلی "باوکی، یەکێك

بوو، له پێشمەرگە ناسراوەکانی شۆڕشی ئەیلوول. لەدوایی ئاشبەتاڵ، شێرکۆ لە ئێران مایەوەو پاشان لەگەڵ "شێخ عەزیزی شێخ یوسفی" شەدەڵە، لەساڵی ١٩٧٦لە ڕێگەی قیادە موەقەتەوە گەڕانەوە دۆڵی جافەتی وناوچەکەی خۆیان، بۆ کاری ڕێکخستنی (ق،م) وپێشمەرگایەتی. پاشان لە قیادەی موەقەتەوە جیابووەوەو هاتە لای یەکێتی"باڵی بزووتنەوە". دوای کارەساتی هەکاری وەك ئەندامێکی سەرکردایەتی بزووتنەوە حسابدەکرا. لەمانگی شوباتی ١٩٧٩، ڕۆژێك شێرزادی برای شێرکۆشێخ عەلی کە(پ،م) بوو، لەگەڵیا تەقەی لە باڵندەیەك کرد.لای بارەگاکەی خۆیان، مەلا بەختیار لەبارەگاکەی خۆیەوە، دوو پێشمەرگەی نارد، بزانن کێ تەقەی کردووە؟ بیگرن و بەچەککراوی بیبەنە لای مەلابەختیار. پێشمەرگەکان پاش تاقیب و گەڕانەوە، پێیان ووتبو: لە مەقەڕی بزووتنەوەوە کراوە، مەلابەختیار بە تووڕەبوون و هەڕەشەو گووڕەشەوە، پێشمەرگەکانی لای خۆی کۆکردەوەو بەرەو بارەگای شێرکۆ ڕۆیشت و بە هاوار وهەڕەشە داوای تەسلیمکردن وچەککردنی شێرزادی کرد.ئەم کارە بووە، هۆی لێك دامەزراندنی هەردوولا، پاشان ئێمەو هەندێ لە خەڵکی شێنێ کەوتینە بەینەوەو نەمانهێشت تەشەنە بکا. لەڕاستیدا مەلابەختیار تازە سەرکردەیەکی گەنج بوو، لەهەر شوێنێك بوایە، خۆی بە مەسئولی ئەو ناوە دەزانی، وپێی وابوو، دەبێ خەڵکی کڕنوشی بۆ بەرن. ئەم ڕووداوە ئەوەندەی تر، کاری کردە سەر بزووتنەوە، بەتایبەتی، کە پاش شکاتی ئەوان لای مام جەلال و کۆمەڵە، هیچ کاردانەوەیەك بەرامبەر مەلا بەختیار نەکرا.

**لەمبارەیەوە نەوشیروان مستەفا،لەلاپەڕە (٧)ی کتێبەکەی (پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن):** نوسیویەتی:

لە ناوزەنگ جگە لەمام جەلال، ئەندامانی سەرکردایەتی سالار، مەلابەختیار، عومەری حاجی عەبدوڵڵا، فازیل کەریم، قادر جەباری و ژمارەیەك لە کادرانی کۆمەڵە

وەك سەید کەریم، ئیبراهیم جەلال، ڕێباز کۆبوبونەوە. نەوشیروان جگە لەوەی کە "د.مەحمود وقادر جەباری"شی، بە ئەندامانی سەرکردایەتی حساب کردوە،کە وانیە وئەو دووانە وعەدنان موفتی ویەك پێشمەرگەش لەگەڵیان لیژنەی ئامادە کاری بوون، واتە ( پارتی دیموکراتی کوردستان – لجنە تحزیری )دیسانەوە دەڵێ: لە کادرەکانی کۆمەڵە (سەید کەریم و ئیبراهیم جەلال) کە ئەمەشیان وا نەبوە. چونکە (سەید کەریم لە کۆبوونەوەی فراوانی شێنێ کە نەوشیروانی تیابوو بە سکرتێری کۆمەڵە، ئەویش بوو بە(ئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵە) و (بەندەش کە نەوشیروان هەر خۆی لە لاپەڕە ٣٥٢ ی کتێبی لەکەناری دانوب)ەوە، باسی کردوە. ئەندامی سەرکردایەتی ڕێکخستنی ناوخۆی کۆمەڵە بووم.کە چوومە شاخ و لەو کۆبونەوەیەش بە "ئەندامی ناوەندی کۆمەڵە" دەرچوم هەروەك خۆی لە هەمان لاپەڕە ئاماژەی بۆ کردوە.

**سێهەم: دەرچونی یەکەم ژمارەی ( کۆمەڵە ).**

لەسەر بڕیاری کۆبونەوەی فراوانی شێنێ، کە دەبێ کۆمەڵە خاوەن ئۆرگانی خۆی بێ، کار کرا بۆ ددرکردنی وەرزنامەیەکی کۆمەڵە بەناوی(کۆمەڵە) ویەکەم ژمارەی لە کۆتایی ١٩٧٨دا دەرچو بەقەبارەی"فولسکای دنیا٤ و بە٣٠ لاپەڕە" کە بەرگەکەی بە دروشمی (کرێکاران وگەلانی زۆر لێکراوی جیهان یەکگرن) وئەستێرەیەکی پێنج چوکڵەیی ولە ژێرەوە ناسنامەی (ئۆرگانی ناوەندی کۆمەڵەی مارکسی– لینینی کوردستان)ی لەسەربوو، دەرچونی ژمارە یەکی وەرزەنامەی(کۆمەڵە)ی ئۆرگانی ناوەندی کۆمەڵە، کاریگەرییەکی زۆری هەبوو، لەسەر ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لەناو شار وشارۆچکەو لەڕیزەکانی شۆڕشیشدا. گەلێ بابەتی بەنرخ و گرنگی بۆ ئەوکاتە تێدا بوو، کە من نامەوێ بابەتەکان لێرەدا بنوسمەوە.بەلأم قەبارەو بەرگەکەی وەك دیکۆمێنتێك لەپاشکۆی ئەم کتێبەدا بلأودەکەمەوە.

## چوارەم: یەکەم کۆبونەوەی کۆمەڵی سەرکردایەتی "یەکێتی":

بارودۆخی ئێران زۆر لەبار بوو، بۆ هاتوچۆی هاوڕێیانی کۆمەڵەویەکێتی وبزووتنەوە، ئێران بە هۆی ئەوخۆپیشاندان ومانگرتن و راپەڕینانەی، کە لە هەموو شارەکانی ئێراندا دەستی پێکرد بوو، توشی پاشاگەردانیەکی سەخت هاتبوو، ساواك وئەرتەش ودەسەلآت لەبەریەك هەڵوەشابوون .

لە مانگی ١٩٧٩/١ لە ڕێگەی ئێرانەوە ئەندامانی سەرکردایەتی یەکێتی لە دەرەوەی وولآت هەڤالآن (عومەر شێخ موسی، د.کەمال خۆشناو، عومەر دەبابە، عادل موراد، د.فوئاد مەعسوم) بە دوایی یەکدا گەڕانەوە وولآت و گەیشتنە "ناوزەنگ". تازە ژوورەکان تەواو ببوون. هەندێکیان لای مام جەلال وهەندێکیشیان لای نەوشیروان دابەزین. مام جەلال جوابی بۆناردین کە بچین بەخێرهاتنی ئەوان بکەین. کە چووینە ژوورەوە پاش بەخێرهاتنیان، زۆرم لاسەیر بوو، کە د.فوئاد مەعصومم دی ومام جەلال هەمومانی بە یەکتر ناساند، من ووتم: د.فوئاد دەناسم" د.فوئاد"لای سەیر بوو، کە دەیناسم پاشان بیرم هێنایەوە کە لەپاش ئازاری١٩٧٠ من دوورخرامەوە بۆ بەسرە بە تۆمەتی گوایە"جەلالیم".ئەویش لە بەسرە لێپرسراوی ناوچەی مەلایی بوە بانگی کردم بۆ محاسەبە، وای دەزانی لە بەسراش دەستیان دەڕوا دەمەقاڵەیەکی باشمان بوو، سەیر بوو" د.فوئادێکی" مەلایی دژە جەلالی بە قودرەتی قادر، هەڵگەڕایەوە، بووە ئەندامی دەستەی دامەزرێنەری یەکێتی، کە سکرتێرەکەی مام جەلال بوو. لەرۆژی ١٩٧٩/٢/١٥ سەرکردایەتی دەستی بە کۆبونەوەی خۆی کرد. هەر لەیەکەم رۆژی کۆبونەوە، عادل موراد، هەندێ بیروڕای خۆی دەربڕی سەبارەت بەو بارودۆخەی ئەوسای یەکێتی وئێران وعیراق. نەوشیروان زۆر بەتوندی بەرپەرچی دایەوە، عادل بێ دەنگ بوو. تا شەو ویستی دوو بەدوو گلەیی لە نەوشیروان بکا.بەلآم نەوشیروان بە ڕەقی وەلآمی دایەوە و پێی ووت:"جەنابتان وا سێ ساڵە، لە سوریا وئەوروپا ڕادەبوێرن و ئێستا کە هاتونەتەوە دەتانەوێ ڕای خۆتان بسەپێنن، فەرموون خۆتان وجانتاکانتان خوا حافیزتان بێ". عادل هەر ئەو شەوە ژوورەکەی نەوشیروانی جێهێشت بۆبەیانی ڕووە و ئێران کەوتەڕێ و ڕۆیشت بۆ تاران. کۆبوونەوەکە سێ ڕۆژی خایاند و چەند بڕیارێك درا.

١- چۆنیەتی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ بارودۆخی ئێران.

٢– هەڵوێستمان لەبەرامبەر حزبی دیموکراتی ئێران(حدکا) وکۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانی–ئێران و ڕێکخراوەکانی تری ئێرانی.

٣– هەڵوێستمان بەرامبەر قیادەی موەقەتە، کە بارەگاکانیان لە دیوی ئێران بوو.شا رای کرد بوو، شاپوور بەختیار توانای ڕاگرتنی بارودۆخەکەی نەبوو، ساواك بێ دەسەلات وسەرگەردان ببوو.

٤– کارکردن بۆکۆکردنەوەو وەرگرتنی ئەو کوردانەی، کە لە ئێرانەوە دەیانەویست بگەڕێنەوە کوردستانی عیراق لەوانە"سوارەی عەباس ئاغای ئاکۆ".

٥– بڕیاردرا کە نوێنەرێکی سەرکردایەتی بنێرن بۆ لای خومەینی بۆ پیرۆزبایی و داوای پشتیوانی کردنیش.*

## پێنجەم: دامەزراندنی ئێزگەی یەکێتی لەنۆکان.

دوای" ٣ "سێ ساڵ دەستپێکردنی شۆڕشی نوێ وپاش بڕینی چەندین کۆسپ وتەگەرەی بەردەم گەیاندنی ئێزگەیەك " لە سویدەوە بۆسوریا و لەوێشەوە بۆ سێ

---

* عەباس ئاغای ئاکۆ لە٥٠ پەنجاکاندا لەگەڵ ئەوەی کە ئاغایەکی دەست ڕۆیشتوو خاوەن ٨٥ دێی ناوچەی ئاکۆیەتی و ناودەشت بوو لە ڕانیە، بەلام پیاوێکی نیشتمان پەروەر بوو، دیوەخانەکەی لە گوندی" سەرکەپکان" ببوە جێگای خۆشاردنەوەی سەرانی پارتی وشیوعی.لە شۆڕشی ئەیلول یەکەم ئاغا بوو لە ناوچەی "ڕانیە وپشدەر و بیتوێن وکۆیە" کە چەکی هەلگرت و چوە نۆڵی خەلەکان بۆ بەرگری لە پێشڕەوی سوپای قاسم. بایزی عەباس ئاغا– لە سەرەتای شۆڕشی نوێ هاتە ڕیزی شۆڕش وسەر بە برادەرانی بزووتنەوە بوو. بەلام پاش چەند مانگێك تەسلیم بە ڕژێم بۆوەو پاشان بە ڕووداوی سەیارە مرد.(سوارەی عەباس ئاغاش) دوای ئاشبەتاڵ ڕۆیشتبۆوە ئێران و لە دێهاتەکانی سەر سنوور خەریکی مەڕداری بوو.دوای ڕووخانی شا، داوای کرد بگەڕێتەوە ناوچەکەی خۆی و بێ لایەن دابنیشێ. بەندە دژی گەڕانەوەی بوم، چونکە ڕام وابوو بگەڕێتەوە پەیوەندی بە ڕژێمەوە دەکا و ناوچەکەش، کە پردی پەڕینەوەی باڵەکایەتی ودەشتی هەولێر و کۆیە بوو ، بۆ سەرکردایەتی تووشی کێشە دەبێ. بەلام لە پاش گەڕانەوەی بە ٣ سێ ساڵ ئەوسا پەیوەندی لەگەڵ حکومەت کرد. هەم ناوچەکەی لە هێرشی حکومەت پاراست وهەم بۆ یەکێتی شوێنێکی ئارام بوو.

"سنور وپاشان گوندی نۆکان". مێژووی ئەم ئێزگەیە، داستانێکە بۆخۆی و دەکرێ کوراسێکی لەسەر بنوسرێ. ئێزگە لە گوندی نۆکان بە هیمەتی هاورێ تەلعەت گلی ناسرا بە(ئاشتی) وبە بەشداری د.خدرمەعسوم وئیحسان نەجم ناسراو بە"ئەبو شەهاب"و بەندەش. ئێزگەکە رۆژی ١٩٧٩/٣/١٩ خرایە ئیش و د.خدر بۆ گاڵتە هاواریکرد. "ئێرە ئێزگەی دەنگی برایم جەلال"ە،مام جەلال لەوە تورە بوو.

رۆژی١٩٧٩/٣/٢٠ بەفەرمی ئێزگەکە، لە سەعات شەشی ئێوارەدا بە ناوی (ئێرە ئێزگەی دەنگی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانە) کرایەوە. بە بڵاوکردنەوەی چەند سروودێکی نیشتمانی بۆ ماوەی ٢٠ بیست دەقیقە ئێوارەی رۆژی٢١ /١٩٧٩/٣ ئێزگەکە کرایەوە و یەکەم پەخشی بەووتارێکی مام جەلال دەستی پێکرد، کە پاش پیرۆزبایی و گەیاندنی مژدەی پەیدابوونی رادیۆی دەنگی شۆرشی نوێ، سەرزەنشتی جیا بوونەوەی بزووتنەوەی سۆسیالیستی کردو بە جیابونەوەی بالێکی بزوتنەوەی ناوبردن.

## شەشەم: رۆیشتنی وەفدێکی یەکێتی بۆ لای خومەینی.

دوای گەرانەوەی خومەینی لە١٩٧٩/٢/١ بۆئێران و سەرکەوتنی شۆرشی ئێران، یەکێتی بریاریدا بە پیرۆزبایی نامەیەکەوە وەفدێکی سەرکردایەتی بنێرنە لای (امام خومەینی) وەفدەکە پێکهاتبوو، لە کاك(عومەر مستەفا "دەبابە"، د.فوئاد مەعصوم، فازیل کەریم). لە ١٩٧٩/٢/٢٥ گەیشتنە تاران. بەلأم پاشان دەرکەوت، کە لە بەدیهێنانی خواستەکان سەرکەوتو نەبوون. بەلأم ئەم وەفدە بووە سەرەتای دروستکردنی پردی پەیوەندی نێوان سەرانی جمهوری ئیسلامی ئێران و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان.

## حەوتەم: جیابوونەوەی بزووتنەوە لە یەکێتی.

لەمەوبەر هەر لەم بەشەی مێژووی کۆمەڵەو یەکێتیدا لەو شوێنەی پەیوەندی بە بزووتنەوەی سۆسیالیستی کوردستانەوە هەبوو، بەکورتی باسێکی ململانێی نێوان بزووتنەوەو کۆمەڵەم کردەوە و ئاماژەشم بە هۆکارەکانیشی داوە.لێرەدا بە پێویستی

دەزانم کــە ڕاو بۆچــوونی کــادرێکی پێــشکەوتوی ئەوســای بزووتنــەوە لەســەر جیابوونەوەی بزووتنەوە بنووسم (و شهد شاهد من اهلە) و پاشان بۆچوونی ئەو کاتەی خۆشم بخەمە بەردەم خوێنەران لەسەر ئەم ڕووداوە.کاک" بەهرۆز گەلاڵی"لە کتێبی (ڕەسوڵ مامەند ٥٠ ساڵ تەمەن و٣٢ ساڵ خەبات) لە لاپەڕەی٥٧ تا٦١ لە ژێر سەردێڕی (بزووتنەوە و گرفتەکان) جیابوونەوەی بزووتنەوەو هۆکارەکانی بەمجۆرە باس دەکات : "بە بیروڕای من گرنگترین کۆسپ و ناکۆکیەکان بریتی بوون" لە:

١- بزووتنەوە پێمان وابوو پێویستە سکرتێری گشتی هی هەردوولا بێت و بەیەك چاو تەماشای هەموان بکات بەتایبەتی لەچەك دابەشکردن لەگەڵ بەڕێوەبردنی هەردوو ڕێکخراو لە هەموو ڕوویەکەوە.

٢- هاوڕێیانی کۆمەڵە هەندێکیان زۆر توند بوون پێشیان وابوو، هەر دەبێ خۆیان هەبن و ئەو ڕێکخراوانەی تر بایەخیان نیە و دەبێ هەر ئەوان پێشەنگی شۆڕش بن .

٣- هەڤاڵانی بزووتنەوە هەندێکیان لەوانەی ڕێکخستنەکانی ناو شارەکان هێشتا تەئسیرات و

بیروبۆچوونی پارتایەتی کۆنیان لە مێشکدا مابو، بەتایبەتی هی سەردەمی کۆن.

٤- هەندێکیش لەو هەڤاڵانەی دەرەوە ئەزمونی سەرکردایەتی کردنی ڕێکخراوێکی سیاسی گەورەی بزوتنەوەیان نەبوبەتایبەتی دوای شەڕی هەکاری.

٥- ململانێکە تادەهات توندتردەبوو، بەتایبەتی کە پارتی دیموکراتی کوردستان — لیژنەی ئامادەکردن مەبەست (د.مەحمود عەلی عوسمان و قادر جەباری وعەدنان موفتی)یە لەسەرکردایەتی بزووتنەوە نزیك بوونەوە کاریگەریان خستەسەر بزووتنەوە بۆ جیاکردنەوەی بزووتنەوە لە یەکێتی چونکە پارتی لیژنەی تحزیری د.مەحمود دەیویست لەگەڵ بزوتنەوەیەك بگرێ بۆئەوەی خۆی بە بزووتنەوە بەهێز بکات...... هتد

٦- هەندێ لە هەڤاڵانمان لەناو بزووتنەوە کاریگەری پارتیان هێشتا لەسەر مابوو، تەنانەت نەیاندەویست بزووتنەوە وەکو ئەندام بمێنێتەوە لەناو (ی .ن .ك) دا بۆیە

هەولّیان دەدا بزووتنەوە لەیەکێتی دووربکەوێتەوە ئەم بۆچوونەش لەدواییدا بە قازانجی زیندووبونەوەی قیادەی موەقەتە تەواوبوو.

٧- جیابوونەوەی بزووتنەوە و ململانێکەی ، هیچ ئەساسێکی فکری و مەوزوعی نەبو، لەگەڵ کۆمەڵەدا ، بەڵکو بەشی زۆری کێشە و گرفتەکان لەسەر ئەساسی زاتی بوون ......هتد

بزووتنەوە پێی وابوو، کە یەکێتیی تاقیکردنەوەیەکی تازەیە، لە هاوکاری وهاوپەیمانی و بەیەکەوە ژیانێکی چەند تەوژمێکی(تیار) فیکری جیاواز لەسەر بناغەی (ململانێ ولەدوایشدا یەکبوون).بەڵام ئەوەی کە بەڕاستی جێگەی داخە، وەکو ئێمە هیوامان بوو ئەو جۆرە نەبوو، چەندان تەگەرە هاتەپێش لەدرووستکردنی چوارچێوەیەکی گونجاوی ئەوتۆ، کە ڕێکخراوە سیاسیەکان بتوانن لەناویدا مونافەسە بکەن،بەڵکو ئەو چوارچێوەیە ووردەووردە، دەگۆڕا بۆ شێوەیەکی تاکەحیزبی. جگە لەوە یەکێتی ستراتیژێکی نەگۆڕاوی نەبو. بەڵکو تاکتیک بەشێوەیەکی فراوان باڵی بەسەر هەمو سیاسەتێکدا کێشابوو، وای لێهاتبوو یەکێتی کەوتبووە وەرگرتنی سەرۆك خێڵ ودەرەبەگەکان وکۆنەپەرستەکان لە ناوچەکانی"شلێر وپشدەرو مەنگوڕو شارەزوور وناکۆیان" لەریزی پێشمەرگەودانانیان لەناوەندی لێپرسینەوە لە ناوچە خێڵەکیەکانی ژێر دەستیان بە بیانوی جۆراوجۆر و هاندانیان بۆ کۆسپ دروستکردن لە بەردەم بزووتنەوەی سۆسیالیستی کوردستان پەکخستنی چالاکیەکانی.

ئەم گیروگرفتانە وهی تریش کە بزووتنەوە هەستی پێ دەکرد وەکو دابەش نەکردنی چەك و پارەتی و لێپرسراوی ناو هێزی پێشمەرگە بەشێوەیەکی یەکسانی ، وپاشان ڕووداوەکانی دژی پێشمەرگەکانی بزوتنەوەی سۆسیالیستی کوردستان لە (شێنێ وزەڵ وناوزەنگ) پاش ئەوەی ڕێکخراوەکانی ناوشار و ناو شۆڕش داوای سەربەخۆیی بزووتنەوەیان کرد . لە ڕۆژی١٩٧٩/٣/٢١ بزووتنەوە لە یەکێتی جیابۆوە وسەربەخۆیی خۆی ڕاگەیاند. تائێرە من هیچ تەعلیقێکم لەسەر بۆچونەکەی نیە، چونکە ڕێز

لەبیروڕاکەی دەگرم، گەرچی هەڵوێستم لەسەر یەك دوو لە خاڵەکانی هەیە .با بزانین ڕای "نەوشیروان موستەفا" ی سکرتێری ئەوسای کۆمەڵە لەسەر ئەو جیابوونەوەیە چی بوو. "نەوشیروان"لە کتێبی پەنجەکانی یەکتری ئەشکێنن لاپەڕە "٣٢ " لەژێر ناوی جیابونەوەی بزووتنەوە دەڵێ: (ئێمە لە خۆشی ڕووخانی شا وسەرکەوتنی گەلانی ئێران ڕابوین و هەزارویەك هیوای سەوزوسورمان لەسەرهەڵچنی بوو. لە پڕ یەکێتی دەلاقەیەکی تێکەوت. نەورۆزی ساڵی ١٩٧٩ڕەسوڵ مامەند بارەگاکەی خۆی لە" زەڵێ" وەگوێزایەوە بۆ گۆڕەشێر ود.مەحمود عوسمانیش لە ناوزەنگەوە هەر ئەو ڕۆژە چوو بۆ لای، بەمجۆرە بزووتنەوە جیابوونەوەی لە یەکێتی ڕاگەیاندو د. مەحمودیش دوورکەوتنەوەی خۆی ئاشکراکرد و بزوتنەوەوکۆمیتەی ئامادەکردن (لیژنەی تەحزیری) کەوتنەخۆ ئامادەکردن و هەوڵی دروستکردنی حیزبێکی تازە .....هتد. ئەم تاقمە لەم جیابوونەوەیە بەتەمای چەند شتێ بوون.

ا- لایانوابوو ئەگەر لە یەکێتی جیا ببنەوەو سەربەخۆیی سیاسی و ڕێکخراوەیی و پێشمەرگەییان هەبێ زۆرتر گەشە دەکەن و بەهێز دەبن.

ب- لایانوابوو ئەتوانن خەتی سێهەم لە نێوان جەلالی ومەلاییدا دروستبکەن، و هاوسەنگی نێوان ئەم دوو حیزبە تێکبدەن. زۆربەی پێشمەرگەکانی هەردوولا و ئەندام و کادرەکانیان کە لە ناکۆکی ئەم دوولایە و شەڕی براکوژی بێزاربوون لەمان کۆدەبنەوە.

ج- لایانوابو حکومەتی عیراق ئامادەیە بە ڕێگای گفتوگۆی سیاسی چارەسەری کێشەی کورد بکا، بەلاَم یەکێتی بۆ ڕازیکردنی سوریا و" تجمع الوطنی العراقی" درێژە بە شەڕ دەدا، ئەگەر ئەمانە سەربەخۆبن، ئەتوانن لەگەڵ بەعس ڕێکبکەون بۆ جیابونەوەکەشیان چەند بیانوویەکیان ئەهێنایەوە.

د- مام جەلال بەلای کۆمولەدا دائەشکێنێ، کۆمەڵە لەسەر حسابی بزووتنەوە بەهێز دەکا، لە دابەشکردنی چەك و پارەدا زۆرتر دەدا بە کۆمەڵە، کۆمەڵەش (ماوی) یەو

متطرف، دژی دین، ومەلان ودژی ئاغا و سەرۆك عەشیرەتن. هیچ هەولّ و تەقەلایەك بۆ پەشیمان کردنەوەیان لەم هەنگاوە سەری نەگرت و سووربون لە سەرهەڵوێستی خۆیان. حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانیش بە تایبەتی (د.قاسملۆ) کە ئەو کاتە ببوون بەهێزێکی گرنگ لەناوچەکە، هانی دابون بۆ جیابوونەوە وبەڵێنی دابونێ یارمەتی یان بدات و کار ئاسانیان بۆ بکا لە عیراق وئێراندا. نەوشیروان دیسان بە چەند دێڕێك دانی بەو ڕاستیە داناوە، کە زۆربەی هەرەزۆری پێشمەرگە و لێپرسراو وئەندامەکانی بزووتنەوە لەگەڵ ئەواندا ڕۆیشتوون وتەنیا عومەر موستەفا "دەبابە"، نەبێ وەك سەرکردایەتی بزووتنەوە چەند پێشمەرگەو کادرێکی زۆر کەمیان لەگەڵ یەکێتیدا مابوونەوە، بەلاّم"مام جەلال" نەیسەلماندوە وهەر ووتویەتی: ئەمانە باڵێکی ناو بزووتنەوەن ڕۆیشتون وبزووتنەوە ئەسڵیەکە ماوەتەوە.پاشان دەڵێ: "مام جەلال نامەی نارد بۆ هەندێ لە کۆنە جەلالیەکان لە شارەکان بێنە دەرێ وبزووتنەوە دروستکەنەوە".

پاشان دەڵێ: لەڕاستیدا بزووتنەوەکەی ئەمان لەچاو ئەوەی ڕەسولّ لاواز و تاڕادەیەك دروستکراوبوو نەیتوانی کادرو فەرماندەکانی بزووتنەوە ڕابکێشێتەوە بۆلای خۆی".

لای من جیابوونەوەی بزووتنەوە لەو کاتەدا، کە هێشتا دەلاقەی هەکاری بە گیانی ڕێکخراوەیی وپێشمەرگەکانمانەوە دیار بوو، ڕووداوێکی کاتی وسەرپێیی نەبوو، وەك نەوشیروان مەستەفا،دەڵێ:"بەڵکە ڕوداوێکی کاریگەری سەلبی بوو،بۆ شۆڕشی نوێی کورد و خەباتی سیاسی و چەکداری لەو قۆناغەدا" .

جیابونەوەی بزووتنەوە ناوەڕۆك وماناوداهاتویەکی زۆرلەوە چڕتری دەبەخشی، کە هاوڕێیانی کۆمەڵە بەتایبەتی(مەلابەختیار ونەوشیروان وپاشان مام جەلالیش) بەسادەیی سەیریان دەکرد و بەخەمساردییەکەوە وەریاندەگرت. ئەوان ئەو کاتە پێیانوابوو، کە ڕەنگدانەوەیەکی سەلبی ئەوتۆی لەسەر یەکێتی وشۆڕش نابێ، بگرە باشتر، کە ڕیزەکانی یەکێتی لە ئاغاو کوێخاو عەشایەر پاك دەبێتەوە."بەندە" کاتی

خۆی وەك ئەندامێکی ناوەندی کۆمەڵە ڕای خۆم سەبارەت بەو ڕووداوە دەربڕی، بەداخەوە نەك هەر پەسەندیان نەکرد، بەڵکو بەگژ ڕایەکەشمدا چوونەوە.

**پێموابوو جیابوونەوەیان :**

١- ترازانی باڵێکی گەورە وسەرەکی یەکێتی لەڕەوتی خەباتی یەکێتی، واتە پەیدابوونی بەرەیەکی تری ناکۆکی بەرامبەر یەکێتی .

٢- شەقبوونی ڕیزەکانی پێشمەرگەی یەکیێتی لە سەرکردایەتی و هەموو ناوچەکانی تری تەواجدی یەکێتی، جگە لەناوچەی گەرمیان وقەرەداغ کە بزووتنەوەی تێدا نەبوو.

٣- دروستبوونی دوو ناوەند و دەسەڵات و ڕابەری لە هەناى جووتیاران و گوندنشینەکان، کە تەنیا سەرچاوەی ژیان ودەرامەت وحەوانەوە وحەسانەوەی پێشمەرگە بوون.

٤- دروستبوونی دوو حاکمیەت و دوو حوکم.

٥- سەرەنجامی ئەو خاڵانەی سەرەوەو بۆ سەپاندنی حاکمیەت و دەسەڵا تی هەر یەکەیان لە ناوچەکاندا دەبوە هۆی دروستبونی ململانێ وپاشان لێکدانی نامەشروعی یەکتری بۆ پاوان کردنی ناوچەکە بۆ لایەك و دەرپەڕاندنی لاکەی تر.

٦- دوابەرهەمی تاڵی ئەم ڕووداوە، دەستچوونە خوێنی یەکتری و هەڵگیرساندنی شەڕی ناوخۆ وفراوانبوونی بەرەکانی شەڕی براکوژی .

٧- فەرامۆشکردنی ئەرکە سەرەکیەکەی شۆڕش، کە وەشاندی گورزی سەرەکی بوو بە دوژمنی سەرەکی. واتە ڕژێمی بەغداد وبەدیهێنانی ئامانجە پیرۆزەکەی .

٨- بەهێزکردنی بەرەی دژ بە یەکێتی کە قیادەی موەقەتە بوو، چونکە دوورکەوتنەوەی بزووتنەوە لەیەکێتی مانای نزیکبونەوە یان بوو لەوان، واتە یەکێتی نەك هەر دۆستێکی باشی لەکیس چوو، بەڵکو دوژمنێکی زیاد کرد .

٩- جیابوونــەوەی بزووتنــەوە کایەیــەکی تــری بــۆ گەمــەگانی حزبــی شــیوعی دروســتکرد.لــە ســەرەتاوە ســەرکردایەتی بزووتنــەوەو لیژنــەی ئامــادەکردن د.مەحمودو قادر جەباری وعەدنان موفتی و یەك پێشمەرگەیان لە ١٩٧٩/٣/٢١ بارەگایان لە شێنێ و زەڵێ وناوزەنگ گوێزایەوە بۆ گوندی گۆڕەشێر(٢) دوو بنکەی پێشمەرگەیان لە شێنێ مانەوە، (محەمەد وەتمان و ڕەسوڵ حاجی شێخە) کە خۆیان و پێشمەرگەکانیشیان هەر شێنێیی بوون.

"مــام جــەلال" و ســەرکردەکانی کۆمەڵــە لایــانوابوو، هــەر ئــەو چــەند کەســەی سەرکردایەتی بزووتنەوە جیابونەتــەوە، بۆیە بێ ئەهمیەت سەیریان دەکرد، بەڵام پــاش چــەند ڕۆژێکــی کــەم هــەمو کــادرو لێپرســراوی پێــشمەرگە و پێــشمەرگەکانی بزووتنەوەی سەردەمی کاك عەلی عەسکەری ود.خالیدیش لەیەکێتی جیابوونەوە، دەتــوانم بــە ڕاشــکاوی بڵــێم، کــە کــەمترین ژمــارەی"پ.م" و کادریــان لەگــەڵ کــاك عومەرموستەفا"دەبابە" مانەوە، کە بە پەنجەی دەست دەژمێردران. مام جەلال بۆ ئەوەی تا کانی تــەرازووی نیمچە بەرەکــەی تێکنەچــێ ، لەگەڵ کاك عومەر دەبابە کەوتنە نامە ناردن بۆ ئەو کەسانەی، کە کۆنە جەلالی بوون، لە شارەکانی کۆیە و سلێمانی و ڕانیەو شارەزوور و ماوەت و شارباژێڕ، ژمارەیەکی زۆریــان لێ کۆکردنــەوەو بە قودرەتی قادر بزووتنەوەیەك وسەرکردایەتیەکی بە پەلەیان لێ داتاشین و کردیانن بە هاوتای کۆمەڵە لە یەکێتیدا. ڕەنگە خراپ نەبێ لەگەڵ ئەم هەموو سەر ئێشەیەدا یەك - دوو ڕووداوی سەیروسەمەرەی ئەو کاتەش باس بکەین .

**<u>عەلی حەوێز و ئیزگە</u>**: ماموستا عەلی یەکێ بوو، لەوانەی نامەی بۆ چوو بوو مامۆستا عەلی حەوێز تێکۆشەرێکی زۆر کۆن وئەندامی ڕێکخراوی قوتابیــانی ســاڵانی پــەنجاکان بوو، خەڵکی کۆیەیە ودۆستی مام جەلال وکۆنە جەلالیش بوو، کە هاتبوو بەرەو سەرکردایەتی بەرەو بەستەسێن تووشی مەفرەزەکەی شەهید هاوار جەلال دەبێ و

لەکەڵ ئەوان بەرێ دەکەوێ بۆ سەرکردایەتی. لەرێگا بە دەمەتەقێ کردنەوە هەواڵی مـن دەپرسێ و پاشـان دەزانـێ کـە هـاوار بـرای منـەو بـەهاوار دەڵـێ:" کـە چـوینە سەرکردایەتی بە برایم بڵێ، بەشکم حوڵم لۆ بدا، لـە ئێزگەکـە دامبنـێن دەنگم زۆر مساعدە لۆ موزیعی". بـەڵام هـەر گەیشتە سـەرکردایەتی بـوو بـە ئەنـدامی مەکتـەب سیاسی یەکێتی.

**<u>شێخ عبدالکریم و بازەکە</u>:** شیخ عبدالکریمی کاکە حەمەی شەدەڵە، عەسکەری فـیرار بوو، ڕای کرد بووە شەدەڵەی دێکەی خۆیان، ئەوسا دەبوایە هەرچی فیراری کردایـە ، پـسوڵەیەکی ڕێگەپێـدراوی پـێ بوایـە، کـە لەلایـەن سـەرکردایەتی یـان لێپرسـراوێکی ناوچـەکەوە مـۆر بکرایـە، شـەهید جـەمال عـەلی باپیر، شـێخ عبـدالکریم دەنێـرێ بـۆ سەرکردایەتی، تا ئەو پسووڵەی مۆڵـەت وەرگـرێ، ئەوسـا ڕێ دەدات لـەوێ دانیـشێ. شێخ عبدالکریم دەگاتە سەرکردایەتی بەشکم ئەو پسوڵەیەی دەسکەوێت، پـاش یـەك دوو ڕۆژ چاوەڕوانی بزووتنەوەی نوێ خێرا پەیوەندی پێوەدەکەن و دەیبەنە لای مـام جەلال و دەبێتە ئەندامی سەرکردایەتی بزووتنەوەکە و یەکێتیش.

کاك دلێری سەید مەجید دەچێتە بارەگایان و بە مەلا بـەختیار و سـالار عـەزیز ئـەڵێ: "ئەمرۆ مام جەلال بازی هەڵدا بۆ ئەندام سەرکردایەتیەك، بازەکە بەسەر سـەری شـێخ عبدالکریمـەوە نیـشتەوە". بـەمجۆرە سـەرکردایەتی بزووتنـەوەی داتاشـراو بـێ کۆنفرانس و کۆبونەوەی فراوانیش بە پەلە پروزە دامەزرا.

## قیامی ئێران و سەرکەوتنی شۆڕش.

شۆڕشی گەلی کـورد لـە هـەر پارچـەیەکدا سـەری هەڵـدابێ، بەدرێـژایی مێـژوو قـوڵایی ستراتیژییە کەی پارچەکەی تری کوردستان بووە، بەپێ بارە جوگرافیەکەی. نـاکۆکی نێوان وولاتە داگیرکـەرەکانی کوردسـتانیش"ئێـران، عـیراق، تورکیـا، سـوریا" لەسـەر

ئاستی تاکتیکی دیسان بە سوودی جولانەوەی  رزگاریخوازی گەلی کوردستان بووە. بەلأم لەسەر ئاستی ستراتیژی ئەو داگیرکەرانە هەمیشە یەکگرتوو بوون لە حەنای مەسەلەی کورد و دژایەتیکردنی جولانەوەکەی و مافەکانیدا. بۆ سەلماندنی ئەو راستیەش دەیان بەلگەی مێژوویمان لایە، گەر وورد بەسەر شۆرشەکانی پارچەکانی کوردستانی بە زۆرلکێنراو بە ئێران و عیراق و سوریا و تورکیدا بچینەوە.دوای رێکەوتننامەی جەزائیری شای ئێران وصدامی عیراق ، ئاشبەتالی شۆرشی ئەیلوولی خوارووی کوردستان، جارێکی تر داگیرکەرەکانی کوردستان کەوتنەوە یەکگرتن بۆ لێدانی هەر جوولانەوەیەکی کوردی، کە سەر لە نوێ سەریهەڵدا.

دیارە رێپێوانە گەورەو دوور و درێژەکەی یەکێتی لە گەرمیانەوە بەرەو نۆکان و لەوێشەوە بەرەو قەندیل و کوێستانی سەخت ودواتر ناوچەی هەکاری و رووداني کارەساتە پشتشکێنەکە، کە بە کارەساتی هەکاری بەناوبانگە، بەلگەی ئەو یەکگرتنەی دوژمنانی گەلی کورد و بزووتنەوە رزگاریخوازەکەی بوو، کە بەیەکێك لە هەرەخیانەتە مێژوییەکەی گەلی کورد دادەنرێت، دوای ئاشبەتالی شۆرشی ئەیلول، جارێکی تر بە دەستپێشکەری کۆمەڵەی مارکسی– لینینی کوردستان و هیمەت و هەوڵ وهاوکاری یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، بە کەمتر لەساڵێك ئالأی شۆرشی هەڵکردەوەو بەرزکردەوە لە بارودۆخێکی ناوخۆیی و ئیقلیمی زۆر سەخت و دژواردا. لەو بارو دۆخەی دوای ئاشبەتال هەرەسی وورەی جەماوەر ومەستی سەرکەوتنی سەدام و بەعسیەکان، لە بارودۆخی ئەو شکستە گەورەیەی کە بەدەیان وسەدان هەزار پێشمەرگەی کوردستان بەچەك شۆرکراوەیی بەپشتی زیلە سەربازیەکانی بەعسیەکانەوە خۆیان تەسلیمدەکردەوە، لەو بارودۆخە ئیقلیمییەی کە ئێران وعیراق وتورکیاش لەسەری رێکەوتبوون، شۆرش بەرپا بۆوە.واتە لەناو عیراقی سەرکەوتو بەسەر شۆرشدا و دۆراوی پەیمانی جەزائیر و لە دۆخی ئاشبەتال ونەمانی چەك وپارە ودەسگاو زاڵبوونی بێ ئومێدی، لەو ناوچانەی کە سەرتاسەری سنوورەکانی بە رەبایە لەلایەن سوپای عیراقی وئێرانی پێکەوە بەندکرا بوو، شۆرش بۆ ماوەی نزیك بە سێ

ساڵ به هەموو نوچدان و تەنگەژە و تەنافی پلانەکانی دژەشۆڕش، توانی خۆی لەسەر پێی خۆی ڕابگرێ درێژە بە خەباتی خۆی بدا و بیسەلمێنێ، کە شۆڕشی ئەمجارە بەدەر لە هەموو جارەکانی تر سەرکردایەتیەکەی دواکەس دەبن لە چۆڵکردنی سەنگەر و پێشەنگیش دەبن لە قوربانیدان وگەیشتن بەشەهادەت. بارودۆخی شۆڕش لەساڵەکانی ١٩٧٦ تا١٩٧٨و لەسەرەتایی ١٩٧٩دا، زۆر سەخت وپڕمەینەتی بوو، پێشمەرگەو سەرکردایەتی سیاسی و عەسکەرییەکەی بێ چەکی قورس و کەم چەکی سوك و بێ پارە وبێ بارەگا و نواو بێ هێڵێکی پاڵپشتی ئازادکراو لە ناوچەیەکی تەنرا وبەرەبایە وپایەگای سەربازی وبێ پشتیوان شۆڕشیان بەڕێوەدەبرد.
ڕەنگە لای خوێنەر سەیربێ، کە لەساڵی ١٩٧٨ و بە تەواوی لە زستانەکەیدا ئێران بەتۆپ و هاوەن دێهاتەکانی سنووری خۆی بە پێشمەرگە چۆڵکردەو تەنانەت بەجۆرێك بو ئاگردانی گەرم و کترییە چای پێ بەجێ هێشتن و مۆڵەتی چەند سەعاتێکی نەدان. بارودۆخێك بوو، کە پێشمەرگە بە لۆیچ ئاردی بەسەردا دابەشدەکرا و بەژێر پیاڵە شەکرو چای بەسەردا دابەش دەکرا و بە مانگ و دوو مانگ و زۆر زیاتریش توشی گۆشت خواردنی گەرم نەدەبوو. جگە لە نان وچا، ئالەو بارودۆخەدا، ڕاپەڕینی جەماوەر لەئێران و سەرەتا لەتاران وپاشان لە تەورێزو شارە جامعی و پیشەسازییەکان، هیوایەکی زۆری بە ئێمە دەبەخشی.
لەمانگی ئەیلولی ١٩٧٨دا، لەڕێگەی کاك" شازاد صائب"ەوە، نامەیەك نێردرا بۆ خومەینی، کە لە نزیك پاریس دەژیا، لە فەرەنسا لەلایەن "عادل موراد و د.فوئاد مەعصوم و ئەحمەد بامەرنی"ەوە، درا بەخومەینی، کە لەنامەکەدا، کە ئەوکاتە یەکێتی زۆربەی کارەکانی کۆمەڵە بەڕێوەی دەبرد، ئامادەیی خۆی دەربڕیبو بۆ ئیمام کە بفەرموێ لە نزیکەوە لە بارەگای سەرکردایەتی یەکێتی لە قەندیلەوە چاودێری و ڕابەری ڕاپەڕین و شۆڕشی ئێران بکا وەفدەکەی یەکێتی لە مانگی ١٠/٧٨ ئیمامیان دی بوو.مانگرتن وخۆپیشاندان تا دەهات پەرەی دەسەند دامودەزگاکانی ساواك

بەرەو داڕزان و هەڵوەشان دەچوو، خومەینی هانی خەڵکی دەدا کە بە گوڵەوە بەرەو ڕووی سوپا ببنەوە سوپاش بێلایەن کرا، شا خۆی ڕانەگرت لە ۷۹/۱/۹ حوکمی تەسلیم بە شاپوور بەختیار کرد. ئێرانی بەناوی سەفەرەوە بەجێهێشت، هێشتا شاپوور بەختیار لەسەر حوکم بوو خومەینی لە ۱۹۷۹/۲/۱ لە پاریسەوە گەیشتەوە تاران و داوای ڕۆیشتنی شاپوور بەختیاری کرد، دانوستاندنی نێوانیان تا۲/۱۱ ی خایاندو پاشان لە ۲/۱۱ شاپوور بەختیار حکومەتەکەی ڕووخاو بەمجۆرە بۆ دوایین جار دەسەڵاتی شایەتی لە ئێراندا کۆتایی هات وکۆماری ئیسلامی ئێران دامەزرا. لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان هیچ حیزب و ڕێکخراوێکی ڕاشکا وئامادە نەبو، کە بە پلان لەو بارودۆخەدا فرسەت بەدەستبێنێ و شوێن پێی خۆی قایمکا. کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستان (سازمان انقلابی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێران) هەبوو، کە هێشتا ڕێکخراوێکی چەپی بچووکبوون و نەیان دەویست خۆیان ئاشکراکەن. حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانیش زۆربەی زۆری سەرکردایەتیەکەیان لەدەرەوەی ئێران بوون و پاش ڕووخانی شا و دامەزراندنی کۆماری ئیسلامی گەڕانەوە وکەوتنە خۆڕێکخستنەوە.لەو بارودۆخەدا چەند مەلایەکی وریا لە کوردستان پێشڕەوی خەڵکیان دەکرد مامۆستا "شێخ عیزەدین حوسێنی" لە مهاباد و"شێخ جەلال حسێنی" لە بانە و ئەحمەدی موفتی زادە لە سنە، لە زۆربەی شار و شارۆچکەکان (شورا)یان، لە کەسایەتیە خۆشەویست و نیشتمانپەروەرەکان پێکهێنابوو. ئێمە ئەوکاتە نزیکترین دۆست وهاوکارمان کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشان بوو، کە ناویان لێنا بوون، کۆمەڵەی ئامۆزاکە بەڕاستی زۆر هاوکاری و کار ئاسانیان لەناو ئێراندا بۆ دەکردین. هەندێ لە هاوڕێیانی کۆمەڵە نێردرانە لای کۆمەڵەی ئامۆزا بۆ سەرپەرشتیکردن وپێکهێنان و فێرکردنی دەستەی چەکدار وکاری ڕێکخراوەیی و جەماوەری و هاوکاریکردنیان لە گرتنی سەربازگا و پایەگاو پادگانەکانی سەربازی، بەرەبەرە کۆمەڵەی ئامۆزا و حیزبی دیموکرات

جەماوەریان لە دەورکۆبۆوە، لەمانگی ٣-٤ دا دەستگیرا بەسەر پادگای مهاباد وشارەبانی سنه و چەند سەربازگەیەکی بچوکیتردا، کێشەو ناکۆکی ووردەوورده لە نێوان نوێنەرانی دەسەلاتی کۆماری ئیسلامی و نێوان مەلاکان ومەجلس وشورای شارەکان دروستبوو تا سەرئەنجام به هێرش و پەلاماری کوردستان لەلایەن کۆماری ئیسلامی ئێرانەوە شکایەوە .

## حزبی شیوعی و دەرپەڕاندنیان له بەرەی نیشتمانی نەتەوەیی زۆر پێشکەوتوخواز.

نامەویَ لێرەدا زۆر لەسەر حزبی شیوعی وهەڵوێستیان لەمەسەلەی کورد ودژایەتیکردنی سەرەتای هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلول و پاشان پەنابردنە بەر شۆڕشی ئەیلول بۆ پاراستنی خۆیان، له چەقۆی بەعسیان ساڵی ١٩٦٣ و ڕۆڵی پیلانگێڕیان لەناو شۆڕش تا بەیانی ئازار و پاشان چوونیان بۆ ناو بەرەی نیشتمانی و نەتەوەیی پێشکەوتوخوازی بەعسیان لە مانگی ١٩٧٣/٦ ومانەوەیان تا ٧٨/١١/١٢ لەناو ئەو بەره زۆر پێشکەوتوخوازه بدوێم. چونکە کەم تا زۆر لەکتێبی (شۆڕشی ئەیلول بنیاتنان و هەڵتەکاندن )باسم کردوەو باس کردنەوەیان زیادەیە

حزبی شیوعی وەك فاتح ڕەسولْ له کتێبی (صفحات من تاريخ كفاح الشعب الكردى ) لەژێر سەردێڕی(الارهاب الوحشى)دا، نوسیویەتی:( اخذت الحملات والضربات الموجهة لتنظيمات ح.ش.ع فألنظام الفاشى وسع من نطاق حملته الشعواء من خلال تدمير وتصفية ا لمناطق التنظيمية واحدة تلو أخرى أبتداء من محافظة البصرة حيث تساق يوميا مئات من ا لرفاق والمؤيدين الى دوائر الامن والاستخبارات و مقرات البعث و جميع المنظمات التابعة له، و كانو يتعرضون الى ابشع اساليب واشكال التعذيب الجسدى والنفسى طالبين منهم افشاء الاسرار الحزبية و التخلى عن العمل السياسى مع الحزب الشيوعى، والتوقيع على التعهد بعدم العودة مرة اخرى الى الحياة الحزبية. . . . الى ففى صبحية يوم ١٩٧٨/١١/١٢ شن هجوم وحشى مفاجيء على عدد من الرفاق ا لمعروفين

والضباط القدامى واصبحو من عداد المفقودين . . . .وصلت فى الساعة الثامنة مساء الى بيت الرفيق"اسعد خضر" وسلمنى رسالة قصيرة جاء فيها(وصلت حملة النظام الى بغداد كونوا حذرين،أفصلوا مافى امكانيا تكم لصيانة انفسكم وتنظيمات الا قليم كافة).

لەلاپەڕە(٥٠)ی هەمان سەرچاوەشدا دەڵێ: هەر لەما نگی ٧٨/٣ وە بەعس دەستی بە پەلامار دانیان کردەوە.بەڵام ئەمان هەر خۆیان ڕاگرتوە.

باسەکە لێرە دایە کە :

١- لێدانی شۆڕشی ئەیلول ئەرهابی وەحشی نەبوە بەڕای ئەمان.

٢- کاولکردن وسووتاندن و ڕاگواستنی٤٠٠٠ چوار هەزار گوندی کوردستان لە١٩٧٧ و١٩٧٨ دا، ئیرهابی وەحشی نەبوو؟ .

٣- دروستکردنی دەیان ئۆردوگایی زۆرەملی وزیندانی تەلبەندکراو وقەتیسکردنی دەیان هەزار کورد لەناویدا ئیرهابی وەحشی نەبوو؟ .

٤- قەدەغەکردن وتەحریمکردنی سنووری دەستکردی نێوان عیراق و ئێران بە قوڵایی ٢٠- ٤٠ کیلۆمەتر وبەدرێژایی هەمو سنوورە،کە لە زاخۆوە تاکو دیالە، بۆ تێدا ژیان و کشتوکاڵکردن، ئیرهابی وەحشی نەبوو؟ .

٥- گرتن و ڕاپێچکردنی سەدان منداڵی کوردی خوار ١٨ ساڵە بۆ زیندانەکان و تەمەن گەورەکردنیان و لەسێدارەدانیان،ئیررهابی وەحشی نەبوو .

٦- لێدان وگرتن وکوشتن ولەسێدارەدان و شاردنەوەی لاشەکانیان لە کەس وکاریان و سەندنەوەی پارەی ئەو فیشەکانەش، کە تێکۆشەرانیان پێدەکوشت لە کەس وکاریان،ئیرهابی وەحشی نەبوو؟.

٧- پاکتاوکردن وگرتن وکوشتنی تەنانەت ئەندامەکانی خۆشیان تاپێش ١١/١٢ ئیرهابی وەحشی نەبوو. بەڵام لە ڕۆژی ١٩٧٨/١١/١٢ وبەدواوە کە مەترسی چەقۆی بەعسیان بۆ سەرملی لێپرسراوان و(الرفاق اعزاءالقیادة) بەعسی نیشتمانی نەتەوەیی

پێشکەوتوخواز بوون بە (النظام الفاشی) و خەسڵەتەکەشیان گۆڕا بۆ (الارهاب الوحشی). لە٢٣/١١ قادەی تەنزیماتی هەرێم بڕیاری بەجێهێشتنی شاردەدەن بەرەو ناوچەی ئارام لە ناوزەنگ ناوچەی سەرکردایەتی یەکێتی ودۆڵی حزبەکان. بەڵام بە تۆرەو بە قۆناغ .مەلائەحمەدی بانی خێڵانی لە١٧/٢/٧٩ گەیشتە ناوزەنگ وپاشان لە ناوەڕاستی مانگی ٧٩/٣ فاتح ڕەسوڵ لە مانگی٧٩/٤ دا بەهائەدین نوری وکەریم ئەحمەدیش گەیشتن وبنکە وبارەگایان لە زەڵی بو دانراو.ووردەووردە ڕۆژانە ئەندام وکادرەکانیان لە کوردو عەرەب دەگەیشتنە لایان.یەکێتی هاتنی حزبی شیوعی بۆ ناو شۆڕش ودەرچونیان لە جوغزی بەعس زۆر لاگرنگ بوو، بە ڕوداوێکی مێژوویی و وەرچەرخانێکی گەورەی دەزانی بەتایبەت مام جەلال وهەندێ لە برادەرە عیراقیە کۆمەڵەکان، کە ئایندە دەریخست تەواو پێچەوانە بوو، حەقیشیان بو ببنە دژمان لەبەر ئەم هۆیانە:

١- داڵدەماندان چەکی شانی پێشمەرگە وکادرانی خۆمان دانێ. موچە وخەرجی خۆیان و بارەگاکانیانمان دابینکرد، کە دەبوایە وەك سیفەتی خۆیان دژایەتیمان بکەن .

٢- لەناو یەکێتیدا ولەو کاتەدا و پاش جیابوونەوەی بزووتنەوە کۆمەڵە داینەمۆی شۆڕش وبڕیاری سیاسی وچالاکی پێشمەرگانە بوو، حشع کۆمەڵەیان بە ئەلتەرناتیڤی خۆیان دەزانی لەکوردستاندا، بەتایبەتی ( قیادەی أقلیم) یان لە دواییدا بە درێژی باسی ڕۆڵیان بەباش وخراپ دەکەم .

## ٦- ٦. چوونم بۆ لقی دووی کەرکوك.

لەدوای لە سێدارەدانی شەهیدی تێکۆشەر مامۆستا(عەزیز مەحمود) لە ١٩٧٩/٣/٢٥ و گەیشتنی هەواڵەکە. سەرکردایەتی بڕیاریدا، کە جارێکی تر لقی کەرکوك دروست بکرێتەوەو بڕیاردرا، کە بەندە وەك لێپرسراوی لق ومامۆستا جەلال وەك ئەندامی لق

ونوێنەری هێڵی گشتی ومامۆستا ئەنوەریش وەك ئەندامی لق لـە لقـی دووی کـەرکوك دەست بەکاربین.من تا ئەوکاتەش مەفرەزەیەك یا دەستەیەك پێشمەرگەی چـەکداری تایبەتی خۆمم نەبووە. بۆیە سەرکردایەتی بڕیاریدا کە کەرتێك لەگەڵ خۆمدا بەرم کـە کەرتەکەی خلیل جەلال بوو، بڕیاریش درا کە دوو کـادری کۆمەڵـەش بنێـرن بـۆ لقـی٢ ئەوانیش هاوار جەلال و لەتیف عەبدوڵڵا ئیبراهیم بوون، لەگەڵ برین پێچێك کـە نـاوی د.خدر بوو، بەلاَم نە لەتیف ونە د.خدر و ژمارەیەکیش لە پێشمەرگەکانی کەرتەکـەی خەلیل نەهاتن لەگەڵمان وقایل نـەبون، لـە ناوچـەکەی خۆیـان ، قـەلاَدزەو ڕانیـە بـوو دوورکەونــەوە، وبەغەدریــشیان دەزانــی کــەلێیان دەکــرێ بــە تایبــەتی بەدەســتی ئەوشیروانیان دەزانی.*

بەرلەوەی بەرەو کەرکوك بەڕێ بکەوم لەسەر داوای ناوەندی لەگەڵ شـەهید هـاواردا بۆ هاوکاریکردنی وهاب لە شارباژێڕەوە گوێزابویانەوە بۆ شوێنەکەی هاوار لە ناوچەی قــەلاَدزەو ڕانیــە، بــەرەو قــەلاَتوکان و پاشــان دەشــتی بەستەســێن و سەنگەســەر ڕۆیشتین، بۆ ناساندنی وەهاب بە شانەو بە ڕێکخستنەکانی ئەو ناوە. بـۆ بـێ شانـسی

---

* خەلیل جەلال و هاوار جەلال کە هـەردووکیان بـرام بـوون ، شـەهید خـەلیل لـە گـردی ڕەمکـان لـە کـاتی چوونی بۆسەرکردایەتی واتـە نـاوزەنگ لـە قەلاَتوکانـەوە کـە نامەوپۆسـتی نـاوخۆیی بـۆ ناوەنـدی کۆمەڵـە بەگوولەی هاوەن کەلەڕەبایەکانەوە تێیان گرتبوون لەگەڵ ئەندامێکی تری کۆمەڵە کە لە سەربازی ڕای کرد بــــوو ســــلام عــــومر پێکــــەوە لــــە مــــانگی ١١ /١٩٨١ شــــەهید بــــوون. شەهید هاوار لە مانگی٧/١٩٨١ لە شەڕێکی دەستەویەخە لەگەڵ جاشـەکانی حەمـەی مـەلا شـەریف.پـاش دوو سەعات شەڕکردن شەهیدبوو ، هاوڕێکانیشی نەك هەر ڕایان کرد بوو ترسنۆکانە شـەڕیان نـەکرد بـوو ، دوای ڕۆژێك زانیبویـان کـە هـاوار شـەهید بـووە تەرمەکەشـی دەسـت جاشـەکان کـەوتوە، شـەهید لـەتیف عەبدوڵلاَ ئیبراهیم ، ئەمیش لە کاتێکدا کە باری ڕێکخراوەیی دەچێتە سەنگەسەر لەوێ جاشەکانی عەباسی بایزی بالو ئاغای سەرەك جاش دەیگرن وتەسلیم بە عەباسی دەکەن،عەباسـیش کـە شـەهید لـەتیف بـاش دەناسێ و خەڵکی سەنگەسەر بوون، لەتیف دراوەتە دەست ئیستخبارات بە ڕاپۆرتێکی خۆشیەوە لەسەری ئەمیش لە زیندانەکانی فاشی لە موسڵ لە سێدارە درا.

وەهاب هەر ئەو شەوە لە ماڵی "مەلاوسو"دانیشتبوین ووتیان: جاش هات وەهاب دەرپەڕی و وبەرەو دواوە گەڕایەوە، تا دۆزیمانەوە زۆرمان پێ چوو. بۆ ڕۆژی دوایی لەو ناوە خۆمان حەشارداو هاوار بەشێکی لە برادەرانی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی پێ ناساندوشەوەکەی گەڕاینەوە بۆ سەرکردایەتی، ئیتر وەهابیش بڕیاریدا با چەکی کەن یا ناچێتە شوێنەکەی هاوارو دەگەڕێتەوە بۆشاربازێڕ، وەهاب ناهەقی نەبوو چونکە :

١- هیچ شارەزاییەکی لەو ناوچەیە نەبوو .

٢-هیچ پێشمەرگەو مەفرەزەیەکی خۆی کە شارەزاو لێیان ئەمین بێ لەگەڵدا نەبو .

٣-کەسێك کە خۆی خەڵکی ناوچەکە نەبوایە، ئەستەم بوو تیا هەڵبکا و کاری پێشمەرگانە و ڕێکخراوەیی بۆ بکرێ .

ڕۆژی ٣/٢٦ لەناوزەنگەوە بە ڕێکەوتین بە شارەزایی و چاو ساغی (شەهید حاجی چاوشین، سەدیق ئیبراهیم) حاجی چاوشین پیاوێکی کەڵەگەتی باریك و بەورەوتیژڕۆ بوو، لە ڕۆیشتندا ماندوو نەدەبو، هەر کەس ڕێی لەگەڵدا بکردایە بەهیلاك دەچوە، پیاوێکی زۆر شارەزاش بوو، لە هەموو ناوچەکانی قەرەداغ و شارەزوور و شاربازێڕ و تەنانەت هەموو دێهاتە سنووریەکانی ناو ئێرانیش ، تەنیا گەیەنەری نامە و بەیان و هەواڵەکان لە سەرکردایەتیەوە بە ناوچەکانی شاربازێڕ وشارەزوور و قەرەداغ و بە پێچەوانەشەوە بوو.ئێوارەی ٣/٢٧ گەیشتینە گوندی دوکان و لەوێشەوە چوینە گوندی (کەڵوش ) ماڵی شەهید سیروان"فەیسەڵ تاڵەبانی" لەوێ بوو، لەگەڵ فەیسەل یەکمان گرتەوە.

## فەیسەڵ تاڵەبانی ناسراو بە- سیروان تاڵەبانی.

بۆ یەکەمجار کە فەیسەڵم ناسی لە ساڵی ١٩٧٢ لە کەرکوك بوو، فەیسەڵ ئەندامی یەکێ لە ڕێکخراوەکانی پارتی بوو، قسەی لەگەڵدا کرا بۆ خۆ پەروەردەکردن ، بەڵام ئەو هەستی بەوە کردبوو کە من لە ڕێکخراوێکی نهێنیدا کار دەکەم، لەگەڵ فەیسەڵدا

جگە لەوەی، کە هەردووکمان لەیەك دائیرەدا فەرمانبەر بووین، کە دائیرەی خانەنشینی بوو، لە دەریشەوە ماڵەکەمان لەیەك گەڕەك و زۆر لە یەکەوە نزیك بووین ، ماڵی ئەوان بۆ ماوەیەکی زۆر هاوسێی ماڵی فەرەیدون عەبدولقادر بوو، ڕۆژانە لەگەڵ فەیسەڵدا بەیەکەوە دەچوین بۆ دائیرەو بە یەکیشەوە دەگەڕاینەوە بۆ ماڵەوە فەیسەڵ پیاوێکی زۆر بە وورەو بە هیمەت و چالاك بوو، لە کاری ڕێکخستندا، چەندین کەسی لە شانەکەی پارتی کە خۆی تیا بوو، کردنە کۆمەڵە یەکێك لەوانە شەهید بێستون نانەوا، حەمەسالەح ، بەهانەدینی فەڕاشی دائیرەو کەسانی تر.
زۆر کاری نهێنی پێ دەسپێردرا تائەوکاتەی شەڕی ساڵی١٩٧٤ دەستی پێکردەوە لەسەر بڕیاری کۆمەڵە لەگەڵ فەرەیدون و عەلی بچکۆل وئازاد هەورامی و حەمیدی پۆلیس وچەندانی تر چوونە ناو شۆڕش.لە دوای ئاشبەتاڵ گەڕایەوە کەرکوك، ڕژێم لەساڵی ١٩٧٥ دا ڕێگەی نەدەدا کوردەکان لە شەریکەی نەوت و دائیرەکانی حکومەتدا بمێنن فەیسەڵ گوێزرایەوە بۆسلێمانی و منیش گوێزرامەوە بۆ سلێمانی هەر لە هەمان دائیرە، فەیسەڵ تایپیستێکی زۆر خێراو بە توانای دائیرە بوو، زووربەی نوسراو و بەیانەکانی ئەو کاتەی پێش شاڵاوی گرتنەکان ئەو لە دائیرە بە دزییەوە تایپی دەکرد، لە کێشەی نێوان کۆمیتەی هەرێمەکان و کۆمیتەی شارەکان چەندجار بە ئامادەیی ئەو کۆبونەوەکان لە ماڵی ئەواندا کراوە، لە سلێمانی پاش ڕێکەوتنی نێوان کۆمیتەی شارەکان وهەرێمەکان بە ئامۆژگاری وداوا وبڕیاری شەهید شەهاب و ئەندامانی سەرکردایەتی ناو زیندان، فەیسەڵ یەکەم کادری پێشکەوتووی کۆمەڵە بوو، کە بڕیاری چەك هەڵگرتن و چوونە شاخی داو بوونە یەکەم مەفرەزەی سەرەتایی لە ناوچەی قەراداغ لەگەڵ فەیسەڵدا، کە لە شار بووم بەردەوام نامەگۆڕینەوەمان هەبوو. زۆرم لاخۆش بوو، کە بۆ لێپرسراوی لقی دووی کەرکوك دانرام، سەبارەت بەوەی، کە هەم لە ناوچەکە شارەزا بووم. هەر لەساڵی١٩٦٢-١٩٦٤ وەك ئەندامی لیژنەی ناوچەی قەزای سلێمانی لەوێ بووم و بارەگاکەی لە ناوچەی قەراغ بوو، هەم ئامر

هەرێمەکەی فەیسەڵ تاڵەبانی ، هاوڕێی چەند ساڵە و هاوبیرم بوو. زۆر هیوام بەوە هەبوو، کە پێکەوە بتوانین تەکانێك بە ناوچەکە بدەین ماوەی چەند ڕۆژێك بەیەکەوە جەولەمان کرد وپاشان جوابمان نارد بۆ کەرتەکانی مام ڕۆستەم و کاك سامان لە ناوچەی قەرەداغ یەکمان گرتەوە، هەر سێ کەرتەکە کە مام ڕۆستەم و کاك سامان و شەهید گۆران فەرماندەیان بوون ، لەگەڵ کەرتەکەی هەرێم وکەرتەکەی لق کۆبوونەوەیەکمان لە پشتی دێی دوکان کرد. بە بڕیارەکانی سەرکردایەتیم پێ ڕاگەیاندن کە بریتی بوون لە :

١- چوونی کاك فەیسەڵ بۆ سەرکردایەتی، تاڵەوێ چەك وفیشەك و هۆکی تۆکی و نارنجۆکی دەستی و ئەلغامی سەیارەو ئەوەی دەست بکەوێ لە سەرکردایەتی لەگەڵ خۆیدا بهێنێتەوە بۆ هەرێم، لەوکاتەدا پاشاگەردانی لە ئێراندا بەجۆرێك بوو، کە هەموو جادەولەهەموو شار و شارۆچکە و تەنانەت هەندێ گوندیش ببوو، بە دوکانی فرۆشتنی ئەو چەك و تەقەمەنیانەی، کە خەڵکی لە گرتنی پادگانەکان و پایەگاکاندا تالأنیان کردبوو، بۆ یەکێتیش فرسەت بوو، کە هەرێمەکانی خۆی پێ پۆشتە بکاتەوە .

٢-مامۆستا نەریمان کە کادری کۆمەڵە بوو، لە لقی دوو لەگەڵ کاك فەیسەڵدا بنێردرێتە سەرکردایەتی بۆ لێکۆڵینەوە لەگەڵیا، سەبارەت بە گیرانی شەهید مامۆستا عەزیز .

٣- هەوڵدەدەین چەند جەولەیەکی دوور و درێژ بە ناوچەکانی قەرەداغ و بازیان و گەرمیاندا بکەین،کە تائەوکاتە نەشەهید ئارام و نە شەهید مامۆستا عەزیز بەو فراوانیە و بگرە لە چەند دێیەکی ناوچەی قەرەداغ تێپەڕیان نەکرد بوو. لە وێوە شەهید فەیسەڵ و کەرتەکەی لەگەڵ مامۆستا نەریمان وحاجی چاوشین لێمان جیابوونەوە بەرەو سەرکردایەتی بەڕێکەوتن. ئێمەش چەند ڕۆژێك بە دێهاتەکانی ناوچەی قەرەداغدا جەولەیەکی بە کۆمەڵمان کرد.پاشان بەرەو ناوچەی بازیان و

سنووری کەرتەکەیان چووین جەولەیەکی تێروتەسەلمان تیاکرد، لە هەمو دێهاتەکان کۆبونەوەمان بە خەڵکی کرد لەوێشەوە بەرەو ناوچەی گەرمیان ڕۆیشتین. لە ڕۆژی ١٩٧٩/٤/٢٠ لەگوندی (تەپە عەرب)شەڕێکی سەخت لە نێوان پێشمەرگەکانی کەرتی "١و٢و٣"ی هەرێمی کەرکوك و جاشەکانی قالە فەرەج ڕویدا لەو شەڕەدا تەنیا یەك پێشمەرگە بریندار بوو، بەناوی دلێر قەلآیی. هەر لەو جولەیەی گەرمیاندا بوو، قالە فەرەج سەرەك جاشی چەکداری پارتی لە ناوچەکە،نامەیەکی بە خاڵی مام ڕۆستەم دا بۆ ناردین، دەیەوێ بمانبینێ و گەر ڕێگەی بدەین دەیەوێ بە ناوچەکانی ژێر دەسەلآتی یەکێتییدا بڕواتە ئێران بۆ لای پارتی ئێمە وەلآممان دایەوە وشوێنی یەکتربینینشمان دیاریکرد، لەڕاستیدا ئێمە نیازمان وابوو،لە هاتنیدا بیگرین وبەرەو سەرکردایەتی ڕەوانەی کەین، بەلآم وا خاو نەپێچرابوەوە، کاتی هاتنەکەی، کە دیاریکرابوو نەهات، بەلآم بۆ ئەو شوێنەو لەو کاتە دیاری کراوەدا ٣ سەیارەی لاندکرۆزەر هاتن ، پێشمەرگە دامەزراوەکان لە کەرتەکەی مام ڕۆستەم بوون، خەریك بوو تەقەیان لێ بکەن وایان زانی بوو قالە فەرەجە، بەلآم ڕۆستەم زوو هاواری لێکردن تەقە نەکەن سەیارەکان هەموویان ژن و منداڵ و زیارەتکەر بوون.

## کوردەمیر و سەرتاشینەکە.

شەو چووینە کوردەمیری قەڵبەزلوقمان، کە خۆیان پێیاندەوت: کوردمێری قەلوەزلوغمان و کۆبونەوەمان بە دانیشتوانی دێیەکە کردو لە بەیانیدا، کە دەمانەویست دێیەکە بەجێبهێڵین، کاك سامان، کە هێشتا لەناو دێدا بوو جوابی نارد، کە بوەستین، کاك سامان وژنێك هاتەلام بە گریانەوە شکاتی لە کوڕی شوبراکەی، واتە کوڕی برای مێردەکەی کرد، ووتی:" ئەم کوڕە منداڵەم، کە تەمەنی هەر ٧-٨ ساڵ دەبوو، لەلایەن ئامۆزاکەیەوە کە١٨ ساڵ زیاترە پەلاماری دراوە، لەلای بەرغەل و باوکی منداڵەکەم نایەوێ شکات بکات لەبەر براکەی، لای ئێوە شکات دەکەم ولە

حەقەکەم بپرسن".هەر دوای ئەو ژنە چەند کەسی تریش هاتن و شکاتیان لە هەمان کوڕە کرد، کە ڕێ لە کچان دەگرێ و دەچێتە سەر کانی ژنان و بەدڕەفتارە. پرسیارمان کرد ئەو کوڕە لەدێ دایە ووتیان: چۆتە "کوردە میری سەروو" بۆسەر شایی. کە گرتمان دانی بە تاوانەکانی خۆیدانا، لەو کاتەش دوژمنەکانی کۆمەڵە گەلێ تۆمەتی ناڕەوایان دەخستە پاڵ کۆمەڵە. وەك بێ دینی وکافری و داوێنپیسی و دەست تێکەلکردن لەگەڵ خوشك ودایکی خۆیان و....هتد. لەو دێیەی کە شایی یەکەی تیابوو، خەڵکێکی زۆر لە دێهاتەکانی تر و دەربەندیخان و چەمچەماڵ و لە سلێمانیشەوە هاتبوون بۆ شاییەکە، هەلێکی باش بوو، بۆ قسەکردن بۆ خەڵکەکە و سەلماندنی ڕەوشت بەرزی کۆمەڵە و پیرۆزی ڕێبازەکەی و پوچەڵکردنی ئەو تۆمەتانە.پاشان داوامان لە خەڵکەکە کرد چ بڕیارێك بە شایستەی ئەو گەنجە تاوانبارە دەزانن هەموویان داوایان کرد سەرو برۆی بتاشرێ و بە پەند بکرێ ، لەسەر داوای خەڵکەکە لە چەند لاوە سەری تاشراو کرا بەخەریتە ولایەکی سمێڵ و برۆشی تاشراو هەر یەك لەشایی کەران تفیان لێکردو بەجێمان هێشت.

## مامساڵح گۆڕنەسپی و ئەندامەکەی مامۆستا جەعفەر ( فازیل کەریم ).

لە جەولەکەماندا چووینە گوندی گۆڕنەسپ، مام ساڵح کە خەڵکی گوندەکە بوو، فەرماندەی یەکێك لە مەفرەزەکانی کەرتەکەی گەرمیان بوو، کە کاك سامان فەرماندەی کەرتەکە بوو، شەو لە گوندەکە خەڵکمان کۆکردەوە ، لە کاتی کۆبونەوەکە کوڕێکی گەنجی تەمەن لە ٢٥ ساڵ بەرەو سەر زوو زوو دۆی بۆ دەهێناین و بەخزمەت بوو، بەیانی دیسان زوو کەوتەوە خزمەت کردنێکی سەرنجڕاکێش، کە لە دێکە چووینە دەردوە لە کاك سامانم پرسی ئەو گەنجە کێ بوو ، کاك سامان ووتی: خزمی مام صاڵحە و مامۆستا جەعفەرێکی خستوە بۆ کۆمەڵە، بە کاك سامانم ووت: گومانم لێی هەیە، کاك سامان سەرسام بوو، منیش شەهید ئاسۆی دەلاك و ئازادی

شێخ ڕەئوف و شەهید هاواری برام نارد بە دوای گەنجەکەدا، هەر کە چوو بونە ماڵەکەی و بانگیان کرد بوو یەکسەر وورەی ڕووخابوو کە هێنایان لە یەکەم پرسیار و لێکۆڵینەوەدا، دانی بە وەدانا کە ڕژێم لە دەربەندیخان داوای لێکردووە یەکێك لەم (س) ناوانە بکوژێ ( سامان، ساڵح کە مامی خۆی بوو، سۆران بوو کە ڕابەری سیاسی هەرێمەکە بوو، سیامەند کە بەندە بوو) لە پاداشتی ئەوە پارچەیەك زەوی لە دەربەندیخان و دوو هەزار دیناری بداتێ و لە شارەوانیش دایبمەزرێنن، پاشان لەسەر داوای مام صاڵح لێی خۆشبوین و بەڵێنی خۆچاککردنیمان لێوەرگرت. ئێمە نزیك بناری زەردە و هەسانەکە ببووینەوە بە مەبەستی گەڕانەوەمان بۆ ناوچەی قەرەداغ، تا لەگەڵ کاك سیروان‌دا یەکبگرینەوە کە بڕیار بوو، لەو هەفتەیەدا بگەڕێتەوەو بە وچەکانەی دەیهێنن بێ چەکەکان چەکدارکەین و گەشەش بە کەرتەکان بدەین و کەرتی تریش دروست بکەین.

## شەهید بوونی کاك سیروان و هاوڕێکانی.

لە بانیخێڵان بووین، کە هەواڵێکی یەجگار دڵتەزێنیان بۆ هێنایین، کە ئەمشەو لە شارەزوور تەقەیان لە کاك سیروان و پێشمەرگەکانی تر کردوە و کاك سیروانیش دیار نیە ئێمە جەولەکەمان بڕی و گەڕاینەوە ناوچەی قەرداغ و هەوڵماندا کە هەواڵەکە نەگات بە ماڵی خۆیان، تا بە تەواوی بۆمان ساغ دەبێتەوە. کاك سیروان پاش ئەوەی مانەوەی بە دوو هەفتە لە سەرکردایەتی و بینینی سەرکردایەتی و مام جەلال و پاش وەرگرتنی چەردەیەکی باش تەقەمەنی و چەند چەکێك و یەك ،دوو هاوەن و نارنجۆك ئەنداز و نارنجۆکی دەستی ومینی چاندن لە١٩٧٩/٤/٢٨ لە سەرکردایەتیەوە لە گەڵکەرتەکەی بەرەو قەرەداغ دەگەڕێنەوە، لە خۆشی ئەوەی ئەو چەك و فیشەك وکەلوپەلانەیان دەستکەوتوە زۆر بە پەلە دەبێ بگەڕێنەوە هەرێمەکە و دەست بە چالاکی بکەن.

ڕۆژی ١٩٧٩/٤/٢٩ بە ڕووناکی پاش نیوەڕۆ لە شارباژێری تەختەوە بارەکانیان و خۆیان دوو تراکتۆر دەگرن و ڕووەو شارەزوور دەکەونە ڕێ و ئێوارە درەنگ دوای نان خواردن خۆیان دەکەن بە دیوی شارەزووردا لە شەوی٢٩-١٩٧٩/٤/٣٠ لە پەنای گوندی زیرینجۆ لە شارەزوور حەمە خانی حاجی دارای خۆفرۆش وجاش وموخابەراتی حکومەت و ئەندامی چالاك و جاشی پێشمەرگەی پارتی، کە پێشتر هەواڵی وەرگرتبوو کەمینیان بۆ دادەنێن و کەرتەکەی شەهید سیروان دەکەونە کەمینەکەوە بە سواری تراکتۆرەوە، لە تراکتۆری یەکەم کە لەپێشەوە دەبێ (شەهید شێخ فەیسەڵ ، شێخ ڕەشید تاڵەبانی ناسراو بە سیروان، سەدیق ئیبراهیم ناسراو بە حاجی چاوشین، حەسەن ئەحمەد ناسراو بە"حەسەن خاوی"، عەلی چەلەبی، نەجات ڕەحیم و سایەقی تراکتۆرەکەش شەهید دەبن، و پێشمەرگەکانی تر کە یەکیان شەهید ئەیوبی برای شەهید سیروان بوو، زۆر بە زەحمەت خۆیان دەرباز دەکەن و هەندێکیان بەرەو دوا دەگەڕێنەوەو هەندێکیان ڕووەو تەڕەفی سلێمانی دەڕۆن، بەڵام هیچ کامیان لە دەربازبوەکان ئاگاداری شەهیدبوون یان برینداربوون یان دەربازبوونی ئەو شەهیدانە نەبوون.

ئێمە بەپەلە لە ڕۆژی ١٩٧٩/٤/٣٠ خەڵکمان نارد بۆ شارباژێڕ و هەڵەبجەو سلێمانی تا هەواڵێکی ڕاستمان دەستکەوێ .لە ئێوارەی ١٩٧٩/٤/٣٠ دا شەهید ئەیوب و دوو پێشمەرگەی دەرباز بوو گەیشتنە لامان لە دوکەڕۆ ئەوانیش . هیچیان لە ڕاستی شەهید بونیان نەدەزانی ، هەر ئەو ڕۆژە دوو سێ هەواڵی ناڕاستمان بۆ هات ، یەکیان گوایە شەهید سیروان بریندار بووەو بە برینداری دەرباز بووەو گەڕاوەتەوە بەرەو ئێران و سەرکردایەتی، ئەوەیتریان گوایە بە برینداری خۆی گەیاندۆتە نزیك سلێمانی و جوابی بۆ ڕێکخستن ناردووە هەر ئەو شەوە ڕێکخستن بردوویانەتە ناو شارو گەلێ هەواڵی سەیر سەیری تر.

ڕۆژی١/٥/١٩٧٩ لـە شـارەوە هـەواڵمان بـۆ هـات کـە هـەر پێنجیـان شـەهید بـوون و تەرمەکەشیان کەوتۆتە دەست حەمەخان و بۆ ناسـینی شـەهید سـیروان تەرمەکـەیان بردۆتە چەمچەماڵ.

ڕۆژی ٢/٥/١٩٧٩ لەگـەڵ چـەند پێـشمەرگەیەکی دەسـتەکەی خـۆم بـە ڕاسـتی بـە پەژارەیەکی یەکجار زۆرەوە چووم بۆ گوندی کەلۆش و بۆ ماڵی کاک سیروان، زۆرم لـە خۆمکرد تا توانیم هەواڵی ڕاستی شەهیدبوونی بە خێزانەکەیی و دایکی بڵێم و پاشـان پێم ووتن: دەیانەوێ چی بکەن هەر لە کەلۆش دەمێننەوە یـان دوای پرسـەی شـەهید سیروان بۆ کۆیەیان بنێرین؟ جگـە لـە خـۆی چـوار بـرای تریشی هـەبوو کـە سـیانیان لەگەڵ خۆیدا پێشمەرگە بوون عومەر و ئەیوب و غەریب و هـەر یەکـەیان لـە شـەڕێکی قارەمانانەدا شەهید بوون .شەهید سیروان کچێك و کوڕێکی هەبوو، کـچەکەی خێزانـی سۆرانی ئەوسا ڕابەر سیاسی هەرێمی کەرکوك و کوڕەکەشی کاك پۆلا ئەندام مەکتەبی مافی مرۆڤە لە کەرکوك. پاش تەواوبوونی پرسە لەگەڵ کاك حەسـەن (مـام ڕۆسـتەم ) وکـاك حـسێن (شــەهید گـۆران) کـاك حەیـدەر (کـاك سـامان) لـە گونـدی خـاوێ کۆبونەوەیەکمان کرد و بڕیارماندا کاك سامان بەشێوەی کاتی فەرمانـدەیی هەرێمەکـە بگرێتە ئەستۆ و نامەشمان بۆ سەرکردایەتی نارد، کە بەڕای ئێمە کاك سامان بکەن بە فەرماندەیی هەرێمی کەرکوك، یان خۆیان یەکێك بنێرن.* بڕیاریـشماندا کـە کەرتـەکان

* سەبارەت بەدانانی کاك سامان بەشێوەی کاتی بەفەرماندەی هەرێم ، هەندێ ئاڵۆزی بۆ دروست کردین.چەند هاوڕێیەك هەبوون خۆیان لەو موستەحەقتر دەزانی و سەرکردایەتیش هیچ وەڵامێکیان نەدایەوە.لە ٩/٨/١٩٧٩ کۆبونەوەیەکی گشتی لق و هەرێمان لە گوندی "ئاوەسپی" کرد. پاش تاووتوێکردنی کار و چالاکی ئەو چەند مانگە، بڕیارماندا کە من بڕۆم بۆ سەرکردایەتی بۆ یەکلاکردنەوەی ئەو کارانە. ڕۆژی١٥/٨/١٩٧٩ من و شەهید خەلیل و شەهید هاوار و مەفرەزەکەی لق لەگەڵ کاك سۆرانی ڕابەری سیاسی هەرێمی کەرکوك بەرەو سەرکردایەتی بە ڕێکەوتین لە٢٠/٨/١٩٧٩ دا گەیشتینە سەرکردلیەتی.

هەر یەکەیان بگەڕێنەوە ناوچەکانی خۆیان . کەرتی بازیان (مام ڕۆستەم بۆ بازیان و شەهید گۆرانِ لە ناوچەی قەرەداغ و کاك سامانیش بگەڕێتەوە گەرمیان و دەست بە چالاکی بکەن. ئێمەش کەرتی لق بووین بە سێ بەش مامۆستا ئەنوەر لە ناوچەی قەرەداغ و مامۆستا جەلال لە بازیان ومنیش لە گەرمیان لەگەڵ کەرتەکان جەولە بکەین . لە٧/٥/١٩٧٩ ئێمە لەگەڵ کەرتی گەرمیان لە گوندی خاوێ لێیان جیابوینەوە بەرەو گەرمیان .من هەتا ٧/٨/١٩٧٩ لە لقی دوو بووم .لەو ماوەیە ڕژێم هێرش و پەلاماری توندی دەکردە سەرمان بۆ هەر شوێنێك بڕۆیشتینایە دوای ڕۆژێك یا چەند سەعاتێك انزالی بە کۆپتەر دەکرد تەنانەت جارێکیان مام ڕۆستەم ووتی:" دەبڕۆ ماڵت بەقوڕگیرێ، حکومەتت لێ ورووژاندین، بەرۆکمان بەردە لەوەتەی تۆ هاتووی ئیسراحەتمان نەکردووە بەردەوام جەولە وئینزال جەولەو ئینزال". هۆکەشی ئەوەبوو، کە پێش من نەشەهید ئارام و نەمامۆستا عەزیزیش لەو چەند،دێیانەی دۆڵی قەرەداغ دوور نەکەوتبوونەوە، ئێمە بەردەوام لە سنووری کەرتی قەرەداغ و بازیان و گەرمیان ئەو ماوەیە، لە جەولە و کۆکردنەوەی خەڵك دابووین و کەرتەکانیش چالاکی باشیان هەبوو.

## شەوکەتی حاجی موشیرو نامەکانی .

ئێمە لە جولەی دووهەمی گەرمیان بووین، شەوکەتی حاجی موشیر بە تەماعی مەسئولیەت لە یەکێتیی هەڵگەڕابۆوە و چوو بووە لای ڕەسوڵ مامەند و لە ٣-٦/٨/١٩٧٩ لە بزووتنەوە و "٣" تاقانەکەی د.مەحمود ( د.مەحمود، قادرجەباری ، عەدنان موفتی ) کۆنفرانسیان گرت و پاشان لە ٨/٨/١٩٧٩دا ڕایانگەیاند، کە لەو کۆنفرانسە هەردوولا بوون بەیەك وناوی بزووتنەوەی سۆسیالیستی کوردستان و لیژنەی تەحزیری ئەما و بووبە حزبی سۆسیالیستی یەکگرتووی کوردستان – عیراق (حسکع). کاك شەوکەت بووبە ئەندامی سەرکردایەتیەکەی و گەڕابۆوە بۆ شارەزوورو لەوێوە چەند نامەیەکی بۆ هەرێمی کەرکوك ناردبوو، لەوانە بۆ مام ڕۆستەم وشەهید

گۆران. لەنامەکاندا واینوسیبوو، کە حسکع دروستبووە و سێ لەسەر چواری یەکێتیی چۆتە لای ئەو حزبە نوێیە و شارەزوور و شاربازێڕ و دەشتی هەولێر کەسی یەکێتیی تیا نەماوە، پێمانباشە ئێوەش هەرلای خۆتانەوە پەیوەندیمان پێوەبکەن بڕیارمانداوە هەرێمی کەرکوك بکەینە(٢) هەرێم و هەر یەکەتان دەبنە فەرماندەی هەرێمێك، وەڵاممان بدەنەوە تا بەرەو لای ئێوە بێین بە هەموو لایەك ناوچەکە لەو جەلالیانە پاك کەینەوە .....هتد .

کە ئێمە گەڕاینەوە دۆڵی قەرەداغ هەم پێشمەرگەو هەم شەهید گۆران ومام ڕۆستەم نامەکانیان بۆهێنام وخوێندمانەوە، ومن وەڵامی نامەکەیم نووسیوە بە دوودێڕ.

" گەر دەتانەوێ بێن ناوچەکە لە جەلالیەکان پاککەنەوە، بفەرموون و خۆتان تاقیکەنەوەو لە کوێش دەفەرموون تاقتان بۆ لێبدەین". نامەکەی من و ڕۆستەم و گۆران ئیمزامان کرد و بۆمان ناردەوە. بەڵام مەسئولیت و حسکیەکەی شەوکەت ئەوەندەی نەخایاند ، چونکە ئەو کات شەوکەت بێ شارەزوور و سەر حدودی ئێران نەدەژیا و شارەزوور و شاربازێڕ و حدودیش کە یەکێتی تیا باڵادەست بوو. لەلایەکی تریشەوە کاریگەری (حامید حاجی خالید و حەمەی حاجی مەحمودی لەسەر بوو، کە هەردووکیان لەگەڵ یەکێتی وکۆمەڵەش بوون ، و نامەیەکی مام جەلالیشی بۆ چوو بوو. ڕۆژی ١٩٧٩/٩/٢ لە بنێوخەڵەف توشی شەوکەت بووم ، ووتی:" ئێستا لای مام جەلال گەڕاومەتەوە و وازم لە (حسکع) هێناوەو دەچمەوە بۆ شارەزوور.

## مامۆستا ئەنوەر و ڕاپۆرتەکانی .

من پێشتر مامۆستا ئەنوەرم بە مامۆستا (ڕەفیق) ئەناسی، کە چوومە قەرەداغ ناسیمەوە. پێش من لەگەڵ مامۆستا عەزیز ئەندام لق بوو، کە من چوومە قەرەداغ دەستمان بە جەولە کرد، مامۆستا ئەنوەر داوایکرد ئەو لەدۆڵی قەرەداغ بمێنێتەوە. توانای جەولەی نیە، منیش زۆرداوام لێکردکە دەبێ لەگەڵمان بێ ، کاک ئاواتی شێخ

جەناب و شەهید ئاسۆی دەلاك ووتیان:" ئەگەر تەڵە بۆ مامۆستا ئـەنوەر بنێتـەوە لـە بەینی گوندی میوڵی و خاوی ئەیگری، چونکە لە وەتەی لە دەرەوەیە لەم ٦-٧ دێیـە دەرنەچوە و هەر خەریکی ڕاپۆرت نوسینیشە لەمولەو" ئەو ماوەیـە مامۆسـتا ئـەنوەر بە نا بەدڵی لەگەڵمان بوو، بەڵام بـە ڕاسـتی مانـدوو ببـوو، لاوازیـش ببـوو، کـە ئێمـە گەڕاینەوە سەرکردایەتی و نامەیەکی دامێ و، ووتی: ئەم نامەیەم بۆ بدە بە کاك سالار عەزیز، تومەز ڕاپۆرتی لەسەر خۆم نوسی بوو، دابوشـی بـەخۆم ، بیـدەم بـە (م.س) منیش بە ئەمانەتەوە دام بەکاك سالار عەزیز. جگە لەوە هـەر لـە سـەردەمی کێشەی کۆمیتەی شارەکان و کۆمیتەی هەرێمەکانەوە،من وسالار عـەزیز لەگـەڵ یەکدا نـاکۆك بووین، لەناو شۆڕشیش خۆی بە بەرپرسی یەکەمی کۆمەڵە دەزانـی بـە تایبـەتی دوای شەهیدبوونی ئارام وسەفەری نەوشیروان بۆ دەرەوەی وولات.

بە فرسەتی زانی بوو ، نامەکەی مامۆستا ئـەنوەری بـرد بـوو بـۆ"مـام جـەلال" پـێش ئەوەی من مام جەلال ببینم.دوای ڕۆژێك چووم بۆ لای مـام جـەلال مـن بـە نیـازبووم باسی پێویستی یەکانی هەرێمەکە و دانانی ئامر هەرێمی لەگەڵدا بکەم . مام جەلال بە گرژییەوە باسی ڕاپۆرتەکەی مامۆستا ئەنوەری لەگەڵ کردم ، گوایـە مـن لـە لقـی دوو ڕێزم لە کادر و ئەندام لقەکان نەگرتووە ، لە باتی کاری سیاسی خۆم بـە ئـامر هـەرێم دانـاوە خـۆم لـە کـاری عەسـکەری هەڵقوورتانـدوە، فـەزڵی براکـانی خـۆم بەسـەر کادرەکـانی تـردا داوە. مـن زۆر لـە پێـشمەرگەکان و ئەنـدامانی لقـم لـە ١٩٧٩/٦/١٢ بردووە بۆ"سێوسێنان" بومەتە هۆی شەهیدبوون و بریندارببوونیان لەو شەڕەدا و گەلێ شتی بێ سەروبەر و پاشان نامەیەکی سالار عەزیزی پیشاندام ، گوایـە مـن لـە پـارەی شۆڕش فەرشێکم کڕیوەو ناردوومەتەوە بۆ سەنگەسەر ، من بۆ ڕاپۆرتەکەی مامۆستا ئەنوەر داوام لە"مام جـەلال" کـرد کـە سـۆرانی ڕابـەر سیاسـی هـەرێم بـانگ کـات لـە بەردەمی من یـان بـەبێ مـن پرسـیاری لێ بکـات. بـەڵام بـۆ نامەکـەی سـالار ئەمـە بـە تۆمەتێکی ناراست و دروست کراو دەزانم و تـا لیژنەیـەکی تـەحقیقی لەسـەر نـەگیرێ

وازناهێنم و ناشكەڕێمەوە بۆ لقی دووی كەركوك . پاشان شەهید"خەلیل"ی برام بووە، كە خاڵم (حەمەی مەجید هاوار) لە ڕانیەوە پارەی بۆ ناردووە تا بیدا بە قاچاخچیەكانی ناوزەنگ فەرشێكی ئێرانی بۆ بكڕن و بۆی بنێرنەوە.دوای یەكلایی كردنەوەكە، داوامكرد دەبێ سزای سالار بدرێ لەسەر ئەو تۆمەتە ناڕاستە.مام جەلال ووتی:" ئەوشیروان لێرە نیە، بگەڕێرەوە بۆ جێگاكەی خۆت تا ئەو دێتەوە ئەوسا وەرە قسەی لێدەكەین". من سوربووم لەسەر داواكەم و "مام جەلال"یش بڕیاریدا كە هیچ ئەركێكی لێپرسراوێتیم پێ نە سپێردرێ ڕۆیشتمەوە شێنێ و لەگەڵ مەفرەزەكە لەوێ مامەوە.

## ٦-٧. سەدام وحاكمیەتی موتلەق .

هەر لە هاتنیان بۆ سەر حوكم، چەندین ناو و نازناوی سەیر سەیر لە قیادەی قەومی و قیادەی قوتری ئەنجومەنی وەزیران و سەرەك كۆمار دەووتراو ودەبیسترا، بەلاّم لە ناویاندا سەدام حسێن كەسایەتی هەرەدەسەلاّتدار و خاوەن بڕیار بوو ."ئەحمەد حەسەن بەكر" كە بە ناو سەرەك كۆمار و سەرۆكی مجلس قیادە الثورة بوو، بەلاّم بە كردەوە هەمووی سەدام بوو، تا ڕۆژی ٧٩/٧/١٦ كەوا بلاّوكرایەوە ئەحمەد حەسەن بەكر، بەهۆی نەخۆشیەوە وازی هێناو، سەدام لە شوێنەكەی ئەو بوو، بە سەرەك كۆماری عیراق و فەرماندەی گشتی هێزی چەكداری عیراق و ئەمینی سڕی قیادەی قوتری عراقی حزبی بەعس و رئیس مجلس قیادە الثورة .

بوونی سەدام بە سەرۆك كۆمار لە سەرەتاوە سودێكی بۆ شۆڕش و كۆمەڵە و یەكێتیش تێیدا بوو ، ئەویش دەرچوونی بڕیاری لێبووردنی گشتی زیندانیەكان بوو، كە پۆلێكی باش لە ئەندامانی سەركردایەتی و كادران و ئەندامانی كۆمەڵە لە بەندیخانە و لە سێدارەدان ڕزگاریان بوو، دایكی دەروون و دەروونی كچیشم هەر بەوە بەربوون. دوای دەرچوونی لێبوردنەكەی سەدام لە مانگی ١٩٧٩/٨ لە مانگی ١٠-

١٩٧٩/١١ و هاوڕێیـانی سـجن لـه شـوێنی جیاجیـاو لـه کـاتی هاتنـه دەرەوە و لـه سەرەتاوە هەموویان له ناوزەنگ له سەرکردایەتی کۆبونەوە.

### تاقمەکەی سجن و خەتی شەهید شەهاب.

دوای بـەربوون و هاتنـەدەرەوەی ئـەو هاوڕێیانـە بـۆ یەکـەمجار بـوو "ژن" لـەناو بارەگاکانی یەکێتیدا ببینرێ. یەکێك لەو هاوڕێیانە لـە ترسـی گرتنـی هاوسـەرەکانیان لەگەڵ خۆیان هێنا بویانن لەوانە" پـاکیزە، پەخـشان، نـەرمین، پرشـنگ" کـە لەگـەڵ فەرەیـدون و ئەرسـەلان و دارۆ و ئـاوات عەبدولغـەفوردا هـاتبون. دوای هـاتنی ئەمان"ڕووناکی شێخ جەناب دەزگیرانی حیکمەت بوو، دلگیری خێزانی "سـالار عـەزیز "یش هاتن، پاشان ووردەووردە ژنی تریش هاتن. هاتنـە دەرەوەی بـە شـێکی باش... ئەندام و لایەنگرانی بزووتنەوەی ناو شارەکان و دۆستەکانی "مـام جـەلال" هـەر لـەو چەند مانگەدا له ڕاستیدا تـەکانێکی باشیان بـە بـارودۆخی ئەوسـای یـەکێتی دا. لـە بەرەو بەهێزکردنی ڕێکخستنەکانی و هێـزی پێـشمەرگە و پڕکردنـەوەی ئـەو کەلێنـەی جیابوونەوەی بزووتنەوە دروستی کرد بـوو، بـە ڕای مـن سـەر لـە نـوێ دارشـتنەوەی بزووتنەوەو هاتنە دەرەوەی هاوڕێیانی سجنی کۆمەڵە، چـەند گۆڕانکاریـەکیان لـە نـاو یەکێتی وکۆمەڵەو بزووتنەوەدا دروستکرد.

١- بزووتنەوەی ناو یەکێتی توانی ووردە ووردە وەك ئەلتەرتاتیڤی بزووتنـەوەی جیـا بۆوە خۆدارێژێت و سەرکردایەتی و ڕێکخراوەکانی دروستکاتەوە، ووردە ووردە لـەناو شارەکانیش بە هاوکاری مام جـەلال پـەل بهـاوێن، کـە هـیچ دۆسـت و ناسـیاوێکی نـە مابوو کە داوایان لێ نەکات کە بچنە ناو بزووتنەوە دروست کراوەکەوە.

٢- سەرکردایەتیە نوێەکەی بزووتنەوە دروستکراوەکە هەمویان دۆسـت و دەسـتنێژ و دانراوی مام جەلال بـوون و هـیچ جـۆرە نـاکۆکی و ململانـێ یـەکیان نـەبوو، تەنانـەت بـچوکترین جیـاوازی بـیروڕا و بڕیاریـان بەرامبـەر بڕیارەکـەی مـام جـەلال نـەبوو،

تاماوەیەکیش مام جەلال بەرگی (قاسم مشترك)لێپرسراوی هێڵی گشتیەکەی دانا و بوو بە سکرتێری بزووتنەوە دروستکراوەکەی خۆی تا کەمێ خۆی گرتەوە دیارە بە نەبوونی کۆسپ لە بەردەم کۆبونەوەکانی سەرکردایەتی و بڕیارەکانی مام جەلال ، کارەکان ئاسانتر و باشتر دەچوە پێش.

٣- هاتنە دەرەوەی هاوڕێیانی کۆمەڵە پاش بەربونیان تەکانێکی توندیان بە گەشەکردنیدا. لە ڕووی بیروبۆچوون و چەندایەتی و چۆنایەتیشەوە ، دریان بە گەمارۆی عیراقچێتی و دوو سەرەییدا ، کە تا ئەو کاتە زۆربەی لەناو سەرکردایەتی کۆمەڵە و( م.س) بوون. ئاستەنگیشیان لە بەردەم نەوشیروان و تەنانەت"مام جەلال"یش ، دروست کردبوو ، کە لە دواییدا دێمە سەر باسی.

٤- ... بە خۆداهاتنەوەیەی یەکێتی بە هەوڵ و تەقەلای کادرانی سیاسی و پێشمەرگایەتی لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی یەکێتی تارادەیەك کاریگەری هەبوو، لەسەر گەڕانەوەی هەندێ لە کادرانی سیاسی و پێشمەرگانەی بزووتنەوە کۆنەکە.

## ململانێی نێوان کوردستانی و عیراقچی کۆمەڵە.

کێشەی نێوان هەرێمەکان و کۆمیتەی شارەکان پاش گیرانی سەرکردایەتی لەوەدا نەبوو، کە کێشە بێ لەسەر کورسی و سەرکردایەتی و دەسەڵات، چونکە ئەو کاتە خەڵکی بگرە چەندان لە ئەندامانی کۆمەڵەش خوا خوای خۆشاردنەوە و دەست بەسەر کڵاوداگرتن و خۆدوورەپەرێز ڕاگرتن بوون، ململانێکەی نێوانیان لە کاتێکدا بوو، کە هێرش و پەلاماری یەك لەدوای یەك دەکرایە سەر ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە، لە کاتێکدا بوو، کە بارودۆخی پاش ئاشبەتاڵ و ڕووخانی وورەی جەماوەری ڕاکردنی سەرکردایەتی پارتی و مەیدان چۆڵکردنی کاری سیاسی و ئەو پەڕی دەسەڵاتداری ڕژێمی بەعسیان بوو، نە کورسی و نە دەسەلات و نە مەسئولیەت و نادارایی، جگە لە مەرگ وگرتن و ڕاونان و کوشتن، چ بەرهەمێکی تری نەبوو. بۆ کێشەی نێوانیان کێشەی بیر و باوەڕی کوردستانی و عیراقچێتی پاشماوەی ساڵی ١٩٧١ بە دواوەی ناو

ڕیزەکانی کۆمەڵە بوو. کێشەی جیاوازی بیروڕا و بۆچوون بوو، لە سەر دیاریکردنی قۆناغی کۆمەڵگای کوردی و باری ئابووری و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی کوردستان و جیاوازی لەگەڵ قۆناغی کۆمەڵگای عیراقی لەو ڕوانەوەیان لێکچوونیان. جیاوازی بیروڕا لەسەر قۆناغی خەباتی خەڵکی کوردستان و عیراق گەلی کورد و عەرەب، کرێکارانی نەتەوەی سەردەست وولات داگیر لەگەڵ کرێکارانی نەتەوەی ژێردەست و وولات داگیرکراو، خەباتی ڕزگاری نیشتمانی و چارەسەری کێشەی نەتەوایەتی، یان قۆناغی لێدانی بۆ ڕژوازێتی حوکم بەدەست و خەباتی چینایەتی، ئایا دەکرێ خەباتی یەك چین واتە چینی کرێکاران لەناو یەك حزبی پێشڕەودا وەك کۆمەڵەی (م.ل)، لە دوو نیشتمانی لێك جیاوازی وەك کوردستان و عیراق و لەناو دوو نەتەوەی جیاوازی وەك کورد و عەرەب لە دوو قۆناغی جیاوازی خەباتی نەتەوایەتی و چینایەتی دوو سەرخان و دوو ژێرخانی ئابوری و سیاسی فەرهەنگی کۆمەڵایەتی جیاوازدا ڕابەری بکرێ؟.

ئایا عیراقی عەرەبی وەك کوردستان داگیر کراو و بە زۆر لکێنراوە؟ یان کوردستان وەك عیراق قۆناغی ڕزگاری نیشتمانی بڕیوە و چارەنووسی خۆی بۆ خۆی دیاری کردووە، کە هەتا هەتایە بە لکێنراوی بەعیراقەوە دەمێنێتەوە؟. لە دیاریکردنی ناکۆکیەکانمان، ئایا ناکۆکی سەرەکی واتە دوژمنی سەرەکی کێشەی نەتەوایەتی و ڕزگاری نیشتمانی کوردستان لەگەڵ ئەمریکاو ئیمپریالیزمی جیهانیە، یان لەگەڵ داگیرکەرانی کوردستانە بە عیراق و ئێران و تورکیاو سوریاشەوە؟ .

**- ئایا ناکۆکی کرێکاری کورد لەگەڵ بۆرژوای پیشەسازی (کە لەجێی نەبوانە) کوردیدایە؟.**

**- ئایا بۆرژوای عەرەبی و کوردی پێکەوە لەسەر حوکمن و پێکەوە کرێکارانی عەرەب و کورد دەچەوسێننەوە؟.**

**- ئایا خەباتەکەی کۆمەڵە لەو قۆناغەدا خەباتی چینایەتیە دژی دەرەبەگ و بۆرژوای کوردی یان جەماوەریە کرێکار و جوتیار و بۆرژوای نیشتمانپەروەرە بۆ ڕزگاری نەتەوایەتی و نیشتمانی ، ئەم هەموو ئایا و چۆن و بۆچوونە جیاوازانە هەبوو، لە نێوان بیر و بۆچوونی کۆمیتەی هەرێمەکانی عیراقچی پاشماوەی ناکۆکیەکانی ساڵانی ١٩٧١و١٩٧٢ کە خۆی لە ئارام و سالار**

**و بەختیاردا ، دەنواند.وله نێوان سەرکردایەتی کۆمەڵەی گیراو و کۆمیتەی شارەکانی کۆمەڵـە، تا بڕیاردان لەسەر پێکهێنانی مەفرەزە سەرەتاییەکان.***

لەگەڵ هەڵگیرسانەوەی شۆڕش و بڕیاردان لەسەر پێکهێنانی مەفرەزە سـەرەتاییەکان و گەیشتنی نامـەی سـەرکردایەتی یـەکێتی بـە تایبـەت "مـام جـەلال" لـە دەرەوەی وولات سەبارەت بە چۆنیەتی پێکهێنانی مەفرەزەکان بەناوی (مفارز الدعایە المسلحە) لەو هەل و مەرجە ئاڵۆزەی پاش ئاشبەتاڵ، و بۆ بەگژداچوونەوەی پلانـەکانی ڕژێمـی بەعس لەمەر ڕاگواستن و بەعەربکردن و بە بەعسیکردن و بۆ بەرگریکردن لەو شـالأوی گرتن و ڕاونان و پەلامارانەی حکومـەت بـۆ سـەر ڕێکخستنەکانی کۆمەڵـە و بـە لەبـەر چاوگرتنی ناکۆکی سەرەکی ڕژێم وبە لاوەنانی ناکۆکیە لاوەکیەکان و پاش چـوون بـۆ ئەبوغریب و وەرگرتنی بڕیاری هەندێ لە ئەندامانی سەرکردایەتی بە تایبەتی (شـەهید شەهاب) کە بە ئیلحاحەوە داوای لێکردین لەگەڵ کۆمیتەی هەرێمەکان هاوکاری بکەین و هەموو. ناکۆکیەکانی نێوانمان بخەینە لاوە و بەڵگەش، ئاڵوگۆڕی ئەو نامانەی نێوان من و ئارام و کۆمیتەی هەرێمەکانە.**

بەڵام هەر لەپاش هاتنەدەرەوەی"عەلی عەسکەری و د.خالد سـەعید"و سـەرکردایەتی بزووتنەوەو کـارکردن بـە بڕیـاری هاوبەشـی بـەرەیی لـە یەکـەم هـەنگاوەوە دەبوایـە کۆبوونـەوەی هاوبـەش و دیـاریکردنی ئەرکـەکان و ڕابەرایـەتی هێـزی پێشمەرگەیان بکردایە، بە پێچەوانەوە کۆمیتەی هەرێمەکان نەك هەر هەڵوێستی دژایـەتیان لـەڕووی کـار و پڕوپاگەندەشـەوە بەرامبـەر بزووتنـەوە گرتەبـەر، بـەڵکو بەرامبـەر هاوڕێیـانی کۆمەڵەی سەر بە کۆمیتەی شارەکانیش هەمان هەڵوێستیان هـەبوو، و لەبـەر ئـەوەی

---

* سەبارەت بە ناکۆکی ڕەوتی کوردستانی ە عراقچێتی ،نامیلکەیەکم بەناوی( کۆمەڵەی ڕەنجدەران بۆ کوردستانیە) لە ساڵی ١٩٨٤ نوسی و بلأوکردەوە، کە چوار جار چاپکرایەوە و"٥٠٠٠" هەزار دانەی لێ چاپکرا.

** سەیری نامەکانی نێوان شەهید ئارام و بەندە بکە لە پاشکۆی کتێبەکەدا.

که پاش گەڕانەوەی مام جەلال و یەکەم کۆبونەوەی سەرکردایەتی هاوبەشی یەکێتی، کە ئارام بەشداری نەکرد و مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی هاوبەش زۆربەی هاوڕێیانی سەر بە کۆمیتەی هەرێمەکان بوون، ئەو ناکۆکی وململانێیە تارادەیەك کپ کرا بوو، بەڵام بە بەربوونی هاوڕێیانی سجن و هاتنە دەرەوەیان و هاوبەشی کردنیان لە سەرکردایەتی کۆمەڵەش و یەکێتیش ئەم بارودۆخە گۆڕاو. دەسەڵاتی بێ چەند و چوون وکێبڕکێ بە دەست مەلا بەختیار و سالار و جەعفەرەوە نەما.

## کۆمیتەی هەرێمەکان دوو فلیقانە کاریان لەناو شۆڕش و یەکێتییدا دەکرد.

**کۆمیتەی هەرێمەکان بەمشێوەیە دوو فلیقانە کاریان دەکرد:**

١- لەلایەکەوە ناوەندێکی بنکەی سوری شۆڕشیان لە قەرەداغ دانا بوو، کە سەرچاوەی هەموو بڕیار و فەرمانەکانی ئارام و کۆمیتەی هەرێمەکان بوو، بۆ مەفرەزە و پێشمەرگە و کادرەکانی کۆمەڵەی سەر بەو کۆمیتەیە، بەڵام لەلایەکی تریشەوە مەلا بەختیار و سالار عەزیز یان بەرامبەر "عەلی عەسکەری و د.خالد سەعید"دانا بوو ، بۆ سەرپەرشتی کردنی هێزی پێشمەرگە و ڕێکخستنەکانی یەکێتی.

٢- لە لایەکەوە پەیڕەوی پێشمەرگە و ئۆرگانی تایبەت بە کۆمیتەی هەرێمەکان (ئاڵای شۆڕش) یان دەردەکرد و دەبوایە هەموو کادری سیاسی و پێشمەرگانەی کۆمەڵە، کاری پێ بکردایە کە هەر کەس بە ووردی بیانخوێنێتەوە، هیچیان لە ڕێنمایی و ئۆرگانی شۆڕشێکی نەتەوایەتی ڕزگاری نیشتمانی ناچێ، بگرە لە هی شۆڕشێکی چینایەتی وەك ڤێتنام ......هتد دەچێ. بەڵام لەلایەکی تریشەوە لەناو سەرکردایەتیەکانی یەکێتیشدا تا گەڕانەوەی "مام جەلال"، پەیڕەوی ڕێنماییەکانی"مام جەلال"یان دەکرد.

٣- لە لایەکەوە پڕوپاگەندە و خوتبەو وەعز و ئیرشادی ئەو برادەرانە لە هەموو گوندەکان و لەناو جەماوەر و پێشمەرگە بریتی بوو ، لە پێکهێنانی بنکەی سوور و

ئاراستەکردنی شـۆڕش بـە شۆڕشـی چـینایەتی و جێبـەجێکردنی هـەردوو ئەرکـە چینایەتی و نەتەوایەتیەکە ڕابەری پارتی پێشڕەوی چینی کرێکـاران و دژی داگیرکـەر و دەرەبەگایەتی و خێڵەکی و عەشایەرو شێخ ومـەلاو دینـە. ئـەم ڕەفتارکردنـە تـەواو پێـچەوانەی یاسـاکانی کـاری بـەرەیی و ڕێزگـرتن لـە بـیروڕای ڕێکخـرا و حزبـی تـرو بەشداری لە شۆڕشدا بوو. بەڵام لەلایەکی ترە و ئامادەی بەشداری و کارکردنی کـاری سیاسی و پێشـەرگانەی ناو یەکێتی بوون، کە پێکهاتبوو لە دووباڵ ونیـو لـە حاڵـەتی لە دایك نەبوونی حزبی پێشڕەودا بوون.

٤- لە ڕاستیدا هاوڕێیانی کۆمیتەی هەرێمەکان لەو کاتەدا کۆمەڵە لاوێکی خوێن گەرم و چەپێکی توندڕەوی بێ خەبەر لە یاساکانی کاری بەرەیی و نە شارەزا لـە سیاسـەت و سەرکردایەتی کردنی هەم جەماوەر و هـەم شـۆڕش و بـێ ئـەزمون لـە پراکتیکـدا، و نەشیان دەویست ددان بەو کاڵیەی خۆیاندا بنێن و هەوڵدەن سوود لە ئەزمون و لانی کەمی ژیانی بەرەیی وولاتانی تری سەرکەوتوو وەربگرن .بەڵام نەك هـەر دانیـان بـەو ڕاستیانەدا نەدەنا، بگرە خۆیان بە سەرکردە و شارەزا و لێهـاتو و وشـیار و ڕۆشـنبیر دەزانی و گوێـشیان بـە ئامۆژگارییـەکانی سیاسـەت مـەدارەکانی وەك "مـام جـەلال و نەوشیروان" نە دەدا.

گەڕانەوەی مام جەلال و نەوشیروان و چەند هـاوڕێ و هـەڤاڵێکی تـری بـە ئـەزمون و هاتنـە دەرەوەی چـەند کـادرێکی پێـشکەوتوی شـارەکان و هاوڕێیـانی سـجن . نیـوە ناچلێ بەشێکی ئەو ناکۆکی و نە شارەزاییەی ناو شۆڕشیان پینە و پـەڕۆ کـرد ، ئـەم پینە و پەڕۆ کردنە نەبووە هۆی بنەبڕی کێشەکان ، بەڵکو برینـەکانی لـە ناخـەوە لـە ژێر ئەو قەتماغەیەدا قوڵتر کردەوە ، تا ئەو ڕادەیەی کە ، نەجمـەدین عـەزیز"سـالار" بەو پەڕی جورئەت و ڕاسـتگۆییەوە لـە بـار و دۆخەکـە قایـل نـەبوو، و شۆڕشـی جـێ هێشت وچـوە سـوریا و پـاش سـاڵێك گەڕایـەوە کـە دواڕۆژی کۆبوونـەوە فراوانەکـەی شێنێ و زەڵێ بوو. ئەم ناکۆکیەی نێوان کۆمەڵە و کۆمەڵـە بـەردەوام بـوو، تەنانـەت

لەناو ئەندامان و کادران و سەرکردایەتی کۆمەڵەش ڕەنگی دابۆوە، بەلاّم گەورەترین هەڵەی سەرکردایەتی ئەو کاتە ئەوە بوو، کە پاش هاتنە دەرەوەی هاوڕێیانی زیندان و زەقتر بوونی ناکۆکیەکان بە پەلە کۆبونەوەیەکی فراوان نە بەسترا بۆ یەکلایی کردنەوەی ئەو ناکۆکیە تا کۆنفرانسی یەك لە مالیموس لە مانگی ٥ / ١٩٨١دا گیرا .
لە کۆنفرانسی یەکیشدا گەرچی بەشێکی کەمی کێشەکان خرانە بەردەم کۆنفرانس ، بەلاّم هیچ کام لە ئەندامانی کۆمیتەی هەرێمەکان بە ئاشکرا و بە جورئەتەوە ڕاستی ڕا و بۆچونەکانی خۆیان نەوت جگە لەسالار ، کە بەو پەڕی سووربون و هەڵوێستەوە بیروڕای خۆی نەشاردەوە و ڕای گەیاند ، کە ئەوانە خەباتیان بۆ کردنی کۆمەڵە بە ڕێکخراوێکی چەپی عیراقی ئەلتەرناتیڤی حزبی شیوعیە . بە پێچەوانەوە گوایە ڕابەری خەتی ئارام و تیۆریستەکەی "حکمت محمد" مەلا بەختیار زەمیشی هەبوو بەسەر لایەنە کوردستانیەکەی کۆمەڵەدا بە جۆرێك کە ووتی: "من نەك هەر عیراقی نیم، لەکەڵە ئەنگۆستی پێمەوە تا تەوقی سەرم کوردستانیم".ئەم برینی تیراوییە لەناو کۆمەڵە و یەکێتیدا مایەوە تا دوای لێدانی تاقمی بە ناو ئالأی شۆڕش (ئاش)، ئەویش سەبارەت بە هەڵە و تەوافقی "نەوشیروان و مام جەلال" چونکە لە "کۆنفرانسی یەك" دا، جگە لە مەلا بەختیاری زۆر کوردستانی ئەوانی تری کۆمیتەی هەرێمەکان کەسیان لە کۆنفرانس هەڵنەبژێردران و سەبارەت بە دەرنەچوونیان عاجز بوون و بەرەو ئێران و تاران بە نیازی خارج کەوتنەڕێ، بەلاّم هەم مام جەلال و هەم نەوشیروان لە گەڵیان دانیشتن و دڵیان دانەوە و بە ناشەرعی کرانەوە، بە ئەندامی (م.س) ی یەکێتی.
نەوشیروان لە لاپەڕەی ١٤١ کتێبی (پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن) ئەڵێ: "ئەوانەی لە کۆمیتەی هەرێمەکان بوون خۆیان بە خەتی" شەهیدئارام"دا ئەناو. وایان ئیدعا دەکرد درێژە بە خەتی ئەو ئەدەن ئەوانیش لە سەرکردایەتی پێشووی کۆمەڵە بوون خۆیان بە خەتی "شەهید شەهاب" دا ئەناو. وایان ئیدیعا دەکرد ، درێژە بەخەتی

ئەو ئەدەن. ڕاستیەکەش ئەوە بوو، هیچ کامیان خەتێکی وای دا نەڕشتبوو ئەمانە شەڕی لەسەر بکەن...هتد". نەوشیروان پێی وابوو ، کە هەردوولایان ئەو دوو شەهیدە یان بۆ مەبەستی خۆیان بەکار هێناوە. بەڵام نەوشیروان لێرەدا ڕاستی نەپێکاوە ، چونکە ئەو دوو خەتە لە ڕاستیدا دوو خەتی جیاواز لەیەکتری و خاوەن فکر و بۆچوونی جیاوازی ناو کۆمەڵە بوون ، کە ڕیشەکەی دەگەڕایەوە بۆ ساڵی ١٩٧١و١٩٧٢و، دواتری ناو کۆمەڵە کە بە دوو خەتی جیاوازی کوردستانی کۆمەڵەوە عیراقی کۆمەڵە ناسران، تا جیابوونەوەی (ئاش) . لەبەر ئەوەی مەبەستی سەرەکیمان باسکردنی بەشێکی سەرەکی کۆمەڵەیە ، پێویستە بە تێر وتەسەلی باسی ململانێ و ناکۆکی نێوان ئەم دوو خەتە بکەم ، کە نەوشیروان بە ململانێی بەرژەوەندی یەکانی هەردوولای دەزانی. من پێم وایە گەر ململانێی کۆمیتەی هەرێمەکان ، یان خەتی شەهید ئارام (ئاش) گەر بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان بوایە و پەیوەندی بە نهج و ڕێباز و بیروبۆچونیانەوە نە بوایە ، ئەو برادەرانە لەو پەڕی دەسەڵاتدا بوون . لە سەردەمی ئارام و سەرەتای شۆڕش تا گەڕانەوەی مام جەلال و نەوشیروان خۆیان حاکم و دەسەڵاتدار و سەرکردە و ڕابەر و هەموو شتێ بوون ، لە دوای گەڕانەوەی نەوشیروان و مام جەلالیش کە چواریان مابوونەوە ( نەجمەدین عەزیز – سالار ئەندامی م.س بوو، تا بەجێهێشتنی یەکێتی و ڕۆیشتنی بۆ دەرەوە،حیکمەت محەمەد کەریم– مەلابەختیار ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی کۆمەڵەو لێپرسراوی گەرمیان و کوێستانی یەکێتی بووە، تا کۆنفرانسی سێی کۆمەڵە، فازیل کەریم– مامۆستا جەعفەر لە پڕ بوو بە کوڕ ئەندامی( م.س ) و مەسئولی ئیعلامی یەکێتی بوو، تا ڕۆیشتنی بۆ خارج لە دوای دەرنەچوونی لە کۆنفرانسی یەکی کۆمەڵە، لە ساڵی٩٨١ دا، " ئازاد عەبدولمەجید – عادل ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی بووە تا شەهید بوونی). دەبێ ململانێی ئەوانە لەسەر تاکی خۆیان لەچی دا

بوو بیّ؟ کە لە لووتکەی دەسەلاّتی ناو کۆمەڵە و یەکێتیشدا بوون گەر ململانێی فکریشیان نە بو بیّ وەك نەوشیروان دەڵیّ؟

تۆ بڵێی ئەو خەتەی شەهید ئارام (کۆمیتەی هەرێمەکان– ئاش) گەر ململانێی فکریان نەبو، هەر بۆ ئارەزوو، ویستبێتیان ئەو شۆڕشەی کە خۆیان و ئەندامانی تری کۆمەڵە بەردی بناغە و نەخشەکەیان دارشت هەوڵی هەڵوەشانەوە و داڕووخانی بدەن بەم ڕەفتارانەی خوارەوەیان.

١– ئەو برادەرانە گەر کۆمەڵەیان بە هی خۆیان دەزانی و کێشەی فکریان نەبوو، بۆیە بە شێوەی (خت مائل) لەناو ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەدا لە شار و لە دەرەوە کاریان دەکرد ، لەناو ڕیزەکانی کۆمەڵەدا تەقەلای بەهێزکردنی خەتەکەی خۆیان دەدا .

٢– بۆ هەوڵی گرتنەخۆ ودڵدانەوە و ڕێگەگرتنی محاسەبەکردنی ئەو کەسانەیان دەدا ، کە سەرکردایەتی کۆمەڵە لەسەر ڕەفتاری نا شۆڕشگێڕانە و نا کۆمەلاّنە دەیویست محاسەبەیان بکا و سزایان بدا، بەو جۆرە دەیان ئەندامی کۆمەڵە و یەکێتیان سەقەت کرد و لە خۆیانیان کۆکردنەوە.

٣– ئیزعاج کردن و پاڵ پێوەنانی کەسانێك لە هەر ناوچەیەك کە سەربەخۆیان نەبیّ یان ملکەچی فەرمانیان و بیروبۆچونەکانیان نەبیّ بۆ وازهێنان لە کۆمەڵە یا یەکێتی و بوون بە لایەنی تر، ئیتر گرنگ نەبوو بە لایانەوە بۆ لای دۆستی یەکێتیی یا لایەنێکی تری یەکێتی یان دوژمنی یەکێتی بیّ.

بۆنموونە: خۆبادان و خۆبەزلزانین و بەکەم سەیرکردنی کەسایەتی وەك" د.خدر هەورامی (خدرمعصوم) و د.عومەر شێخموس...هتد"، کە ئەمانە زیاتر هەڵگری فکری کۆمەڵە بوون. بەلاّم بە گەیشتنیان بۆ ناو شۆڕش و سەرکردایەتی یەکێتیی و کۆمەڵە و بینینی ڕەفتاری سەرانی کۆمیتەی هەرێمەکان ، هێڵی گشتی و لای مام جەلالیان هەڵبژاردو پیّ باشتر بوو، لە کۆمەڵە.

یان حەمەی حاجی مەحمود بە جۆرێك ناچاریان کرد، کە کۆمەڵە و یەکێتیی بەجیّ بهێڵیّ و بچێتە لای حسك.

٤- ساردکردنەوەی دەیان کادری شۆڕشگێڕ وخوێن گەرمی کۆمەڵە و سەقەت کردنی فکریان بە بیر و تێڕوانینی عیراقچیانە یان توشکردنی گێژاوی فکریان.*

٥- تەنانەت هاندان و ناردنەوەی چەندین کادری سیاسی و پێشمەرگانەی وەك (ئارازی حەمەلاو و شەهید بابە تایەر و برازاکەی نەجمەدین عەزیز (سالار) بۆ ناو حکومەت و کردنیان بە فەرماندەی مەفرەزەی موخابەرات و جاش ، هەر بۆ دژایەتیکردنی کۆمەڵە ویەکێتیی ، کە ئەم ڕەفتارەیان ڕێك لە ڕەفتاری قیادەی موەقەت دەچوو، لە چاندنی سەرۆك جاشەکانی تەحە شاوەیس و قالە فەرەج و هەباسی بایزی باڵو ئاغا وحەمە خانی حاجی دارا.

٦- پەیوەندی کردن بە ڕێکخستنەکانی شارەوە بە"خط مائل"ی و کنە کردن لە ناویاندا بۆ لادانیان لەسەر ڕەوتی کوردستانی کۆمەڵە، بە گەیاندنی هەواڵ و ڕووداوی هەڵبەستراو ناڕاستییان لەسەر کۆمەڵە و یەکێتیی .

٧- تەخشان و پەخشان کردنی چەك و پارەی یەکێتیی و کۆمەڵە و بەخشینەوەیان بەسەر ئەو فەرماندە و پێشمەرگە و کادرانەی کە عاجز یا دردونگ یان کەمی دڵگران یان هەست بە غوین کردن ببوون ، بۆ کڕین و بردن بە لای خۆیاندا و پاشان چاندنیان وەك لوغم بۆ کاتی تەقینەوە.

٨- خۆئامادەکردنیان وەك دوایین ئامانج بۆ پارچە پارچە کردنی هێزی پێشمەرگە و گەر بۆشیان کرا جیابوونەوە لە یەکێتی وکودەتا کردن بە سەریا .

---

* سەیری لاپەڕە ٢٦٧،٢٦٨ کتێبی (ڕۆژ ژمێری پێشمەرگەیەك) نوسینی"محەمەد حاجی مەحمود"، وسەیری دەستخەتی ئیعترافەکەی"مەلا بەختیار، پشکۆ، شێخ عەلی"بکە.

## ٦-٨. حزبی شیوعی عیراقی وپەندی " خۆت لە شەڕی ئەوە بپارێزە، کە چاکەی لەگەڵ دەکەیت".

لەدوای هەشت ساڵ، بەشداریکردنی حزبی شیوعی عیراقی لە حوکمی بەعسیان لە١٩٧١ بۆ ١٩٧٩و دوای بە ڕپرسیارێتیان لە جێبەجێ کردنی چەندین بڕیاری شۆڤێنانەی بەعسیان کە داگیرکەرانە و دیکتاتۆریانە و دژ بە مافی مرۆڤ و دژ بە هەموو یاساو نەریتێکی دیموکراتی و نەتەوەیی و نێونەتەوەیی بوون. پاش بەشداریکردنیان لەگەڵ بەعسیەکاندا و لەناو " بەرەی نیشتمانی پێشکەوتنخواز"دا، لە لێدان و ڕاونان و گرتن و کوشتنی ڕێکخستنەکانی ناصریەکان و عیراقیەکان و پێشکەوتنخوازەکان و بەعسیە گوایە چەپەکان و تەنانەت لێدانی ڕێکخستنەکانی شیوعیەکان خۆشیان ، هێشتاحزبی شیوعی پشتیوانی خۆی دەردەبڕی لە بڕیارە زۆر شۆڕشگێڕی وسۆسیالیست و دژە ئیمپریالیزمەکەی کاسترۆی عیراق و ئەو بڕیارانەی.بە دەسکەوتێکی زۆر گەورە ومەزن دەزانی بۆ گەلانی عیراق کە بەعس و بەرەکەیان دابووی .

١- بڕیاری خۆماڵی کردنی نەوت : کە تەنیا بریتی بوو ، لە داخستنی دەرگا لەسەر مۆنۆپۆڵەکان و کردنەوەی پەنجەرە بۆیان واتە لەدەرگاوە نەوتی بەعسی کرد و لە پەنجەرە وە بە ڕێگای یەکیەتی سۆڤیەتیەوە بۆی ناردنەوە و بەنرخێکی هەرزان تر لە جاران. سەبارەت بە هەڵهێنجانی زۆرتر لە پێش خۆماڵی دا حزبی شیوعی ئەوەی باش دەزانی، خۆماڵی کردنی نەوت موستەلزەماتی خۆی هەیە و دەبێ زەمینەسازی بۆ بکرێ پێش تەئمیم، هەر لەبەر چاو دانانی بایکۆت و دۆزینەوەی بازاڕەوە تا ئابلۆقەدانی ئابووری لەلایەن وولاتە سەرمایەدارەکان و مۆنۆپۆڵەکانی نەوت وولاتانی پەیوەندیدار بە خۆماڵی کردنەکە، بەلاّم بە پێچەوانەوە بێ بایکۆت و ئابلۆقە وگەڕان بەدوای بازاڕدا و بەهۆی هەڵهێنجاتی پتر لە پێشوو مسۆگەری ساغ کردنەوەی هەر لەلای هەمان مۆنۆپۆڵەکان. بەلاّم لەڕێگای سۆڤیەتەوە ، داهاتی نەوت چەندین قات

زیادی کرد. بۆ نمونە داهاتی عیراق پێش خۆماڵیکردن لە ساڵی ١٩٧٢ – ٥٧٥ ملیۆن دۆلار بوو، بەلام لە ساڵی١٩٧٤ دا بە دووساڵ دوای خۆماڵی داهاتەکەی بوو بە( ٥,٧٠٠) ملیاروحەوت سەد ملیۆن داهاتی عیراق لە ماوەی دوو ساڵدا (١٠) قات پتر بوو، کەچی هەر لەم ماوەیەدا داهاتی تاکی خەڵکی و جموجۆڵی ئاوەدانی و خزمەتگوزاری نەك دوو بەرامبەر نەبوو ، بەڵکە حکومەتی بەعسیان سیاسەتی سك گوشین (تقشف)یان پیادە کرد ، بۆ گەلانی عیراق کە حزبی شیوعی ناوبەرەکەش بوونە شەریکی دز و ڕەفیقی قافڵە، واتە لەلایەکەوە داهاتی نەوت دە بەرامبەر زیادی کرد، کەچی لەلایەکی ترەوە لەسەر ژیان و گوزەرانی خەڵکی عیراق و برسی کردنیان بە ڕێگای سیاسەتی (تقشف) پەزمەنەی سەرمایە بۆ، بۆرژوای بیروکراتی دەسەلات داری بەعسیان دەکرا.

٢– بڕیارو دەرکردنی یاسا ئۆتۆنۆمیە کارتۆنیەکەی بەعسیان کە دزێو ترین پەردەی ڕەشی پڕ لە شوورەیی بەشداربوونی حوکمی ئەو کاتەیە بۆ حەلاڵ کردنی لەناو بردنی گەلی کورد وکاول کردنی کوردستان

حزبی شیوعی سەبارەت بەشارەزایی گوایە تەواوی لە مارکسیزم –لینینیزم وسەرەتاکانی سەبارەت بە چارەسەرکردنی کێشەی گەلانی ژێردەست وولاتانی داگیرکراو، دەبوایە لە هەمو کەس زیاتر و زووتر لەو شانۆگەرییە پڕ شوورەییەی سەدام حسێن بگەیشتنایەو و چاویشیان لێ نەنوقانایە ، نەك پاش لێدانی شۆڕشی ئەیلوول ئەو کارەساتە هەرە گەورەیەی١٩٧٥ بە شانازی یەوە بەشداربونایە لەو ئۆتۆنۆمیە پڕلەسەر شۆڕیەی خۆیان و بەعسیان ، وە دەبوایە هەرگیز ئەوەی پەسەند نەکردایە کە ببێتە ئەکتەرێکی فاشی و تۆڕهەڵدراوی ئەو شانۆگەریەی سەدام کەچی بە پێچەوانە و بە شانازیشەوە بەشداریان لەو ناوی زل ودێی وێرانەدا کرد.

٣- ڕێکەوتنە شوومە پڕ لە شەرمەزاریە تاوان ئامێزەکەی جەزائیری نێوان سەدامی - کاسترۆی عیراق ونێوان شای کۆنەپەرستی پیاوی ئیمپریالیزم، بەپلانی ئیمپریالیزمی ئەمریکی. حزبی شیوعی عیراقی وەك لایەنێکی بەرە زۆر پێشکەوتوخوازی یەکەی بەعسیان ئەو ڕێکەوتننامەیەیان نەك هەر پەسەند کرد، بەڵکو بە یەکێك لە دەسکەوتە مەزنەکانی گەلانی عیراقیشیان دەزانی، و بە سەقامگیرکردنی ئاسایش و ئاشتی نێوان دەوڵەتانیشیان ناو دەبرد. لە کاتێکدا کیسینجەر لە واشنتۆن لە کۆبونەوەیەکدا ووتی:" ئێمە دەسبەرداری کوردەکان دەبین تاکو عیراق بیپەرژێتە سەر لێدانی سووریا، حزبی شیوعی لە لایەکەوە پارتی تاوانبار دەکرد بە پەیوەندی لەگەڵ ئێران وشای کۆنە پەرست وئیمپریالیزم ، کەچی لەلایەکی ترەوە خۆی دەبوە هاوپەیمان و پشتیوان و چەپڵە لێدەری پەیمانی نێوان شاوسەدام.

٤- حزبی شیوعی لەگەڵ حزبێکی وەك بەعسدا لەبەرەدا بوو، کە نەك پێشکەوتوخواز نەبوو، بەڵکو هێندە شۆڤێنی بوو، کە بە تاڵە موێەکیش بە نێونەتەوەییەکەی ئەوانەوە نەدەبەسترایەوە ، ئەمە بەشێکی کورتی بڕیارێکی کۆنگرەی سیانزەهەمی بەعسیانە سەبارەت بە کورد و نەتەوەوی تر " ئەو نەتەوانەی کە زمان و نەریتی جیاوازیان لە زمان ونەریتی عەرەبی هەیە و لەسەر خاکی عەرەب دەژین، وەك نەتەوەی کورد کە لە زۆر کۆنەوە بە چەندین ڕیشەوە بە نەتەوەی عەرەبیەوە بەستراونەتەوە، نەتەوەی کورد لە دروست بوونیەوە تا ئێستا لەسەر خاکی عەرەب دەژی ، ئەو خاکەی کە بە درێژایی مێژوو بە خاکی عەرەب ناسراوە. لەگەڵ جیاوازی ناو و ناوی ئەو دەوڵەتانەی کە لەپارچەکانی وولاتی عەرەبی نراوە، ئەمە مەسەلەیەکی زۆر گرنگە ئەو خاکەی کە ئەو نەتەوانەی لەسەر دەژین بەشێکن لە دەوڵەتی عەرەبی ، ئەو دەوڵەتە عەرەبیانەی کە هەزاران ساڵ لەمەوبەرەوە دامەزراون کە دوایترین دەوڵەتی گەورەی عەرەب دەوڵەتی عەباسی بووە ، هەر ئەو خاکەش

شوێن نیشتەجێی ئەو نەتەوانە بووە ، لەسەر ئەم بنچینە ناسنامەی عەرەبایەتی ئەو خاکەی کە ئەم نەتەوە جیاوازانەی لەسەر دەژین لە ڕێگەی داگیرکردن و زۆر وستەمەوە نە هاتوە بە بەڵگە موڵکایەتی عەرەب بۆ ئەو خاکە لە هەزاران ساڵ لەمە وبەرەوە وەك واقعێکی مێژووییە ".

گەر خوێنەر لەم بۆچون و تێڕوانینەی شۆڤێنی یەی بەعسیان وورد بێتەوە ، ئەوسا دەزانێ کە حزبێکی( م.ل) نێونەتەوەیی چەند تاوانبارە لە هاوبەش کردنی لە حوکم دا.

٥- هەر لە ساڵی١٩٧١ وەبەعسیەکان بیریان لە داڕشتنی (سێ کوچکەی بەعسیان) بەرامبەر بە کورد کردبۆوە، کە بریتی بوون لە ( ڕاگواستن ، بەعەرەبکردن ، بەبەعسی کردن). بەلاَم لە ساڵی١٩٧٥ وە بە ئاشکرا هەنگاویان نا بۆ جێبەجێکردنی ئەو نەخشەیە وادارێژرا بوو ، کە ٤٠٠٠ چوار هەزار گوند وشارۆچکە وشاری کوردستان بە قولایی٢٠-٤٠ کیلۆمەتر لە سنوری نێوان عێراق - ئێرانەوە، و بە درێژایی سنووری نێوانیان لە کوردستان لە زاخۆوە تا مەندەلی بگرێتەوە واتە هەمو خاکی "لبنان و فەلەستین"کە ڕابگوازرێن و کاول بکرێن و سوتماك بکرێن، پاشان خەڵکەکەشی لە ئۆردوگا زۆرەملیکاندا نیشتەجێ بکرێن و بەرەبایە و معسکراتی عێراقی چوار دەورە بدرێن لە مێژوودا ئەو نەخشەی تواندنەوەی نەتەوەبچوکانە ڕوی داوە وەك " فرانکۆ لە ئیسپانیا و ستالین لە سۆڤیەت و هیتلەر لە ئەڵمانیا و نەمسا" کردوویانە ، کە هەموویان شۆڤێنی بوون. بەلاَم بۆ حزبێکی (م.ل) ئومەمی وەك حزبی شیوعی سەیر وسەمەرە بوو، کە چەپڵە بۆ نەخشەیەکی ئاوا لێ بداو بەشداری جێبەجێ کردنیشی بکات لە ساڵی١٩٧٥ و تا١٩٧٩ . واتە تا ئەو کاتە کە بەعسیەکان ئیشیان بەمان نەماو بەرە بەرە دەریان کردن ، واتە ئەو بەرە زۆر پێشکەوتنخوازەشیان پێ ڕەوا نەبینین.

## حزبی شیوعی تێڕوانینیان بۆ حزبە کوردستانیەکان بە تایبەتی کۆمەڵە.

سەرەتای هاتنە دەرەوەی حزبی شیوعی وەك لە پێشەوە باسمانکرد و لە مانگی ١٩٧٩/٢ بە گەیشتنی "مەلا ئەحمەدی بانی خێلانی" بۆ بارەگای سەرکردایەتی یەکێتیی دەستی پێکرد کە ئیتر وورده وورده لە ماوەی (٢)مانگدا بنکە و بارەگاکانیان لە زەلێ قەرەبالغ بوو، یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بە کۆمەڵەشەوە لە ڕێگەی ڕێکخستنەکانی ناو شار و شارۆچکەو ئۆردوگا زۆرەملێکانەوە هاوکاری زۆری ئەندامان و لایەنگرانی حزبی شیوعیان کرد، بۆ چاوساغی کردن و گەیاندنیان بە ناوچە ڕزگارکراوەکان ، لە ناوچە ڕزگارکراوەکانیش بە تایبەتی لای سەرکردایەتی یەکێتیی کە بە (دۆڵی ئەحزاب) ناسرا بوو ، یەکێتی شوێنی حەوانەوە و بارەگا وکەلوپەلی پێویستی بۆ دابین کردن. پاشان مانگانە و ئازووقەی پێویستی بژێویەکانیشی بۆ دابین کردن، ئەمە جگە لەو چەکانەی کە لە شانی پێشمەرگەکانی خۆی دەکردەوەو دەیدایە حزبی شیوعی تالانی کەم سەرکردە و مەفرەزەکانی بارەگاکانیان چەکدارکەن. یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بە تایبەتی"مام جەلال" و برادەرانی زۆر چەپی ناو کۆمەڵەو باڵە دروستکراوەکەی بزووتنەوە وایان دەزانی بە هاتنی حزبی شیوعی بۆ ناوشۆڕش ، ئیتر ڕێگای نێوان ناوزەنگ و مۆسکۆ دەبێتە کاروانسەرای هاوکاری سۆڤیەت بۆ کوردستان .. بەڵام وا دەرنەچو. حزبی شیوعی حەوت ساڵ کاری بەرەیی لەگەڵ بەعسی فاشی و سۆڤیەتی و عەسکەرتاری پێ قبوڵ و ڕەوا بوو، کەچی دەستی دەکرد بە پێشنیارەکەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بۆ پێکهێنانی بەرەیەك لەگەڵ یەکێتیدا کە ببێتە ناوکی بەرەیەکی فراوانی ئەوتۆ هەموو حزبە کوردی و کوردستانیەکان و ئۆپۆزسیۆنی عیراقیشی تیا کۆببێتەوە منجە منج و دەستی دەستی یەکەی حزبی شیوعی یەك ساڵی خایاند، کە تەنیا هۆکەشی پەسەند نەکردنی ئەو درووشمە بوو، کە یەکێتیی هەڵی گرتبوو، کە بریتی بوو لە (خەبات بۆ ڕووخاندنی ڕژێمی بەعسی) لەلایەن شیوعیەکانەوە ، تا پاش

یەك ساڵ قایل بوو، كە بچێتە ناو (بەرەی نیشتمانی ونەتەوەیی ودیموكراتی) (الجبهة الوطنية والقومية الديمقراطية) جوقد كە لە١٩٨٠/١١/١٢ بەیانی دامەزراندنەكەی لە دیمەشق ڕاگەیەندرا، كە پێكهاتبوون لە (یەكێتیی وحسیك وحزبی شیوعی وبەعسی سەر بەسووریا وحەرەكەی ئیشتراكی عەرەبی وحزبی ئیشتراكی عیراقی و ڕێكخراوی "الجيش الشعبي لتحرير العراق".بەلأم حزبی شیوعی بە نابە دڵی وبە زۆرەملی بەشداری ئەم بەرەیەی كرد لەبەر ئەوەی پارتی تیادا نەبوو.حزبی شیوعی عیراق كە ٧ساڵ دژایەتی پارتی كرد وبە پیاوی شا و ئیمپریالیزم و ئیسرائیلی دەزانین ولەگەڵ بەعسدا لە ساڵی ١٩٧٤دا بە گژ پارتی داچۆوە، كەچی لە ساڵی١٩٨٠ دا ئامادە نەبوو درێژە بە خەبات بدا لەناو بەرەیەكدا كە پێنج حزبی سۆسیالیستی وەك خۆی دژ بە حكومەتی عیراقی تێدا بوو، لەبەر خاتری ئەوحزبەی كە بە بڕوای ئەوان تا هاتنە دەرەوەشیان لە بەرەكەی سەدام كۆنەپەرست وخێڵەكی وخزمەتكاری شا بوون ، بۆیە دوای ١٦ ڕۆژ تێپەڕبوون بەسەر دروست بوونی جوقد دا ئەمان و پارتی وحسك بەرەیەكیان لە ڕاژان دروست كرد بە ناوی (بەرەی نیشتمانی دیموكراتی) (الجبهة الوطنية الديمقراطية – جود) لە ١٩٨٠/١١/٢٨ دا ، ئەم كارەی حزبی شیوعی تەواو پێچەوانەی سەرەتاكانی كاری بەرەیی و بەرەی جوقد بوو، چونكە یەكێك لە بڕیارەكانی جوقد ئەوە بوو كە نابێ هیچ كام لە لایەنەكانی ناو بەرە بچێتە بەرەیەكی ترەوە لەگەڵ لایەنێكی تر كە دژ بە یەكێك لە لایەنەكانی ناو جوقد بێت . یەكێتیی زۆری هەوڵدا كە حشع پەشیمان كاتەوە لە بەرەی جود، بەلأم سوودی نەبوو لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٨٢ بارودۆخەكە كەمێ ئارام بۆوە، جارێكی تر هەوڵی زۆری خێرخوازان درا لەگەڵ حزبی شیوعی دا كە پێویستە چیتر هێزەكانی گۆڕەپانی كوردستان بە شەڕی ناوخۆ و یەكتریەوە خەریك نەبن . و پاش تەقەلایەكی ٥-٦ مانگی لەسەر بانگهێشتنی (معمر قذافي) كۆبونەوەی ١٩ قۆڵی پارت و ڕێكخراو و كەسە نیشتمان پەروەرەكانی كوردستانی وعیراقی لە ١٩٨٣/٢/٦ (الجبهة الوطنية

العراقيـة) پێکهـات، کـە حزبـی شـیوعی بـە دوو نوێنـەر بەشـداریکرد و میـساقەکەیان مۆرکرد.

بـەڵام حزبـی شـیوعی وەك پیـشەی هەمیـشەیی بەرامبـەر حـزب و ڕێکخـراوە پێشکەوتنخوازەکان نـەك بەعسی و فاشـی و دیکتاتۆرەکـان دیـسان لـەو بەرەیـەش پەشیمان بوونەوە و لە سەرەتای مانگی ١٩٨٣/٣ لە دووهـەم کۆبوونـەوەی بەرەکـە ، کشانەوەی خـۆی لەبەرەکـە ڕاگەیانـد وگەڕایـە نـاو باوەشـی جـود.بـە پێـی میـساق وسەرەتای ئەم بەرە نۆزدە قۆڵیە، هەردوو بەرەکـەی جوقـد و جـود هەڵوەشـایەوە و هیچ کام لە ئەندامانی ئەم بەرەیە بۆیان نەبوو، لەلایـەکی تـرو بەرەیـەکی تـر دروست بکەن یان بچنە بەرەیەکی ترەوە . بەڵام حزبی شیوعی ئەم سەرەتایەشی پێشێلکرد.

جێی خۆیەتی لێرەدا هەندێ لەهەڵ و کۆششەکانی سەرکردایەتی یەکێتیی، کە لەگـەڵ حزبی شیوعی دای، بۆ دەرنەچونیان لە جوقد یان بـێ لایـەن کردنیـان لـە کێـشەکانی نێوان یەکێتیی و پارتی و حسك بڵاو بکەینەوە . لە ١٩٨١/١١/١دا مام جەلال سەردانی بارەگای سەرکردایەتی حزبی شیوعی کرد و داوای لێکردن ، کە وەك لایەنێکی بـەرەی جود و وەك ناوبژیکەرێك هەوڵی خاوکردنەوەی بارودۆخە گرژەکـەی نێـوان یـەکێتیی و پـارتی و حـسك بـدەن بـۆ دانـانی سـنورێك بـۆ شـەڕی براکـوژی و پاشـان هـەوڵی ئاشتبوونەوەی هەموو لایەك بدەن، یـان هـەر نـەبێ لـەو ناکۆکیـەدا خۆیـان بـێ لایـەن ڕابگـرن ، لەگـەڵ ئـەوەی بـەڵێنیان بـە مـام جەلالـدا کـە هـەوڵ دەدەن بارودۆخەکـە خاوکەنەوە، کەچی هەر دوای ڕۆیشتنی مام جەلال ئەم نامەیە دەنوسن بۆ حسك:

## بەڵگەنامەی ژمارە ( ٦ )

## حزبی شیوعی عیراق

**ژمارە:٢٣٥**

**مێژوو:١٩٨١/١١/١**

**برایانی بەڕێزو خۆشەویست( م.س ) حزبی سۆسیالیست**

**سلاوێکی شۆڕشگێڕیمان**

**هیوادارین پارێزراو بن.**

١- برایان (سەید کاکە و ئەبو عائد) دوێنێ بروسکەیان هات ، کە گەیشتوون بە سەلامەتی. سبەینێ دانیشتنی هاوبەشیان"تەنسیقیان " هەیە ببورن بە ڕێکەوت لە یادمان نەبوو ئاگادارتان کەین.

٢- وەك پێش ئەم ئێوارەیە بۆمان نوسین، دووجار جەماعەتی"مام جەلال" هاتن بۆ لامان داوای بێ لایەنی ئێمەیان کرد لە باڵەك ، ووتمان شتی وانیە و نابێ داوای هودنەی وەقتیان کرد، تا دەگەینە حەلێکی مام ناوەند، ووتمان ئێمە هاوکاری جود دەکەین ، و ئەم بروسکەیەمان پاش لقانەکەیان بۆ هاوڕێیان نارد لە پشت ئاشان." ئە.و.ك " دوو جار پەیوەندیان پێو ەکردین داوای بێ لایەنیمان لێدەکەن، یان داوای هودنەی وەقتیمان لێ دەکەن، بەلام ئێمە پێمان ووتن شتی وانیە، وریابن وا دیارە یەکێتیی هەست بەلاوازی خۆیان دەکەن یان دەیانەوێ کسبی کات بکەن.*

چوونی"مام جەلال" بۆ بارەگای حزبی شیوعی دوای هێرش و پەلامارەکەی جود بوو، بۆ سەر هێزەکانی لە دەشتی هەولێر و دۆڵی بالیسان . واتە دوای ئەو هەموو زیانەی کە لە دەشتی هەولێر و بالیسان و دۆڵی باڵەك و ناوچەی مەرگە و جافەتی لە

---

* وثيقة رقم(٦) من وسائق تدين تآمر اطراف الجود.

هێزەکانی یەکێتیی کەوتبوو. هێشتا یەکێتی داوای ڕێکەوتنی لێکردن، بەڵام حزبی شیوعی قبوڵی نەکردەوە و ئەو داواکردنەی یەکێتیی بە لاوازی و بێ توانایی لێک داوەتەوە و سووربوون لەسەر بڕیارەکەی خۆیان.

جگە لەوەش بە پێی ئەم بەڵگەنامەی خوارەوە، برادەرانی شیوعی ویستویانە، پەلاماری مەڵبەندی (٣) ی یەکێتی لە وەرتێ بدەن و پاش گرتنی ئەو مەڵبەندە پەلاماری سەرکردایەتی یەکێتی بدەن و یەکێتی نەهێڵن.

## ژمارەی بەڵگەنامە (١)*

**حزبی سۆسیالیستی کوردستان-عیراق** **ژمارە: ف**

**مێژوو:١٩٨١/٨/٣١**

**بۆ مەکتەبی عەسکەری بەڕێز.**

ئێمە کاتێ چووینە خوارەوە بۆ جەولە کاتێك نوسراوی ئێوەمان پێگەیشت و چۆنیەتی شەهید بوونی کاك شێرکۆ**مان زانی ئێمەش لای خۆمانەوە کەوتینە دوای جەلالیەکان لە دۆڵی هەروتی و بالیسانەوە دەستمان پێکرد بە ڕاونان و چەك کردنیان، تائێستا لە دۆڵی خۆشناوەتی (٢٠) جەلالیمان چەك کردووە، کە یەکێکیان "ئار، پی، جی" یەکی حزبی شیوعی تەسلیم کردبۆوە و دوایی هاتبوو التحاقی بە جەلالیەکانەوە کردوە و ئێستاش لامان گیراوە ، یەکێکیش بە چەکەوە التحاقی پێمان کردوە و بە کەفالەتیش بەرماندراون تەنها ئەوەی ئار،پی،جی یەکەی تەسلیم کردبۆوە بەرنەدراوە . ئەمەش بە هاوکاری هەرێمی (١٧،١٢) و کەرتی حسین شان کرا و ئێستاش لە گەڵمانن لە سماقوڵی گزنگ، لە سنووری هەرێمی ١١و١٠ش پێش ئەوەی

---

* وثيقة رقم(١) من وثائق تدين تآمر أطراف الجود.

** شێرکۆی شێخ عەلی" بوو، کە ئەندامی سەرکردایەتی حسك بوو، لە شێنێ لە ساڵی ١٩٧٩ لەگەڵ "مەلا بەختیار" بەگژ یەکداچوون. پاشان لای حسك بوو، بە فەرماندەی پێشمەرگەکانی جافایەتی و سەرگەڵو، کە خۆی خەڵکی سەرگەڵو بوو . زۆر هاوڕێی شەهید " جەمالی عەلی باپیر" بوو ، کە ئامر هەرێمی یەکێتی بوو ، هەر لەو ناوچەیە"مەلا بەختیار" کە بۆ جەولە دەچێ بۆ ئەو ناوچەیە تانە و تەشەر لە جەمال دەدا، کە چۆن دۆستایەتی شێرکۆ دەکا و جەمالیش پیاوێکی ئازا و نەترس بوو ، بەم هاندان و سوکایەتی مەلا بەختیار قایل نابێ و دەچێتە سەر شێرکۆ و لە شەڕەکەدا هەردووکیان دەکوژرێن و (١٣) پێشمەرگەی هەردوولاش دەکوژرێن و بریندار دەبن . ئەم ڕووداوە بووە هۆی قووڵکردن و تەنینەوەی شەڕی نێوان یەکێتی و جود تا قرناقە و پشت ئاشان ئەم شەڕە لە١٩٨١/٨/٢٢ دا ڕوویدا.

ئێمه بیان گەینێ ، کەپێشتر لە جێوە خەبەری هەردوو هەرێممان دابوونێ، زۆر باڵەوانانە لە نازەنین و دۆڵی سماقوڵی هەڤالأنمان لە جەلالیەکانیان دابوو، جەلالیەکان نزیکەی (٤٠) کەسیان لێ تۆپی یە*(١). بەلأم توانرا (٦٢) یان لێ چەك بکرێ و ئەوانی تریش ڕاو بنرێن و چەك کراوەکانیش بە کەفالەت بەر بدرێن ، ئێستا هەموومان هەرێمی ١١، ١٠، ١٧، ١٢ کۆبوینەوە خەریکی ڕاونانیانین سەربازیش*(٢) گەیشتە لامان پێشمەرگەکانیشمان زۆر بە وورەن و هەموویان داوا دەکەن ، کە زوو بچینە سەرکردایەتیشیان لەوێش بە جارێك دەریان پەڕێنین و من*(٣)، هەمان ڕەئیم هەیە. بەلأم دەربارەی وەزعی دەشتی هەولێرمان هەرێمی (٨) مان ئاگادار کردەوە ، کە ئەو جەلالیانەی لەوێ هەن لێیاندەن و ڕاویاننێن و ئێمەش لای خۆمانەوە ڕێگاکانمان گرتینە ڕێگەی دۆڵی سماقوڵی و ئالانە و دەرەشێر و دۆڵی یلەمان لێگرتوون . سەربازیش دەنێرمەوە لای کۆسرەت*(٤) ڕێگەیان لێ بگرێ و هەرێمی(١٧) شمان ناردۆتەوە بۆ مەنتیقەی سەران وورتێ*(٥) دەرگەڵە و ئەوناوە بۆ نەهێشتنی جەلالیەکان، لە وەرتێ چاوەڕوانی ئەوامری ئێوەین، عبدالله بۆر و بورهان بەڵێنیان داوە، کە بە ( ٤ سەعات) مامەندە*(٦)یان لێ بگرێ ئێوەش کەرتی ئاسۆس ئاگادار بکەنەوە ، کەلای بەحریان"مەبەست بەنداوی دوکانە" لێ بگرن...و پێشنیار

---

* (١)چل کەسیان لێ تۆپیە. سەیرکە شەڕی براکوژی بگاتە ئەو ڕادەیەی ، کە بە شەهید و کوژراوەکان بوترێ تۆپیو . ووشەی تۆپیو: لە کوردەواریدا بۆ مردن یان بۆ کوشتنی سەگ بەکاردێ.

* (٢) سەرباز پێشمەرگەیەکی ئازای خەڵکی کۆیە بوو، سەرەتا لەگەڵ حسك بوو، پاشان هاتە ناو یەکێتی و شیوعییەکان بە ناغافڵ و لە پەنای دۆستایەتیدا لەگەڵ "شێخ شەماڵ" لە باداوان لە١٦/٤/٨٣ شەهید کران.

* (٣) من :واتە سەیدکاکەخۆی هەمان ڕەئی هەبووە.

* (٤) کۆسرەت: مەبەست شاخی کۆسرەتی لە دوکان.

* (٥) سەران و ورتی : دوو گوندن لە دەڤەری باڵەکاتی و خۆشناوەتی.

* (٦) مامەندە: مەبەست شاخی مامەندەی پشتی بارەگاکانی سەرکردایەتی یەوە.

دەکەین، کە مامۆستا سەعد بگەڕێتەوە بۆ مەلەکان*(٧)، کە مقەڕی حزبی شیوعی لێیە بە ئیش و کاری جەبهە هەڵسێت و ئەگەر بتوانێ ماڵی ئێمەش بێنێتەوە مەلەکان شتێکی باشە،هێزەکانیشیان زۆرشپرزەن ولەناوخۆش ناکۆکن هەتا لەو ڕۆژانە"ئازاد خۆشناو و مامۆستا ابراهیم*" شەڕیان لەگەڵ یەک کردووە، ئازادلەگەڵ جاش دانیشتنی کردووە جەماوەریش بەچاوەکی سووکەوە سەیری جەلالیان دەکەن پێشمەرگەکانیش بەڵێن دەدەن کە خوێنی شەهید شێرکۆ و هەڤاڵەکانی لەناوچوونی جەلالیەت دەبێ. وە ئەگەر بتوانرێ بە ئەمانەت دۆشکە (٥٧) ملیمە کە ئامادە بکرێ لەودیو** بۆ لێدانی قیادەی جەلالیەکان ئەگەرلاتان پەسەند بێت.و جەلالی کوێخا عبداللە*** و براکەی بنێردرێنەوە بۆ منطقەی سەرگەلو، چونکە شارەزای ئەو منطقەیە و ئەگەر کاك"ئەحمەد فەقێ ڕەشیش"بچێتە منطقەی سەرگەلو زۆرباشە.

ئیتر بۆ پێشەوە

سەیدکاکە

---

* (٧) مەلەکان:گوندێکی خۆشناوەتیە.

* مامۆستا ابراهیم: ڕابەری سیاسی بوو، لە دۆڵی خۆشناوەتی، لەگەڵ کەرتەکەی ئازاد خۆشناو.

** لەودیو: واتە لە دیوی ئێران لەگوڕەشێر و بێ وەلان و شاخی جاسوسان بەرامبەر بارەگاکانی سەرکردایەتی یەکێتی.

*** جەلالی کوێخا عبداله وبراکەی خەڵکی گوندی چوخماخ" بوون و پێشمەرگەی حسك بوون، بەڵام لەسەر کوشتنی پیاوێکی قاچاخچی کوردی ئێران تاوانبار کراو لای حسکەوە ڕۆیشتەلای حکومەتی بەعس و بوویە ئیستخبارات لە شاری سلێمانی.

دوای ئەوەی یەکێتی بەم پلانەی جودی زانی و پاش ئەو هەموو دان بەخۆداگرتن و هەوڵدانە لای شیوعیەکان ، تا ئەوەی هودنەی موەقەتیش بێ باشە، ئنجا شیوعی ئامادەی هیچ هاوکاریەکی یەکێتی نابێ بۆ خاوکردنەوەی بارودۆخەکە . حزبی شیوعی پاش ئەو هەموو هێرشانەی کە لەگەڵ جود کردیانە سەر هێز و ناوچەکانی یەکێتی و پاشان جێبەجێکردنی پەلاماردانی مەڵبەندی (٣)لە وەرتێ و شەهیدکردن و چەك کردنی چەند پێشمەرگەیەکی یەکێتی ئەوسا یەکێتی کەوتە لێدانی هێزەکانی جود و ئابلۆقەدانیان لە دەربەندی وەرتێدا ، بەڵام دیسانەوە یەکێتی نامەیەکی بۆ"ئەبو عائدی"ئەندامی مەکتەب عەسکەری حزبی شیوعی نارد، کە چاکترە واز لە شەڕ بێنن. نامەکەش لە ملازم" عومەر عەبدوڵلا" لێپرسراوی مەکتەبی عەسکەری یەکێتیەوەدەبێ بۆ ئەبو عائدی ئەندام مەکتەب عەسکەری شیوعیەکان ، ئەبوعائدیش وەك خۆی دەڵێ، بە ناچاری قبوڵی دەکا و داواش لە قادر جەباری لێپرسراوی حسك دەکات کە قایل بێ ، بەو نامەیە و دەڵێ:

## وثيقة رقم (٨)*

**الاخ المناضل قادر جبارى المحترم.**

**تحية اخوية**

وصلنا الان رسالة من الاخ ملازم عمر و فيها تحيات لكم يؤكد مايلى :

١- سحب كمائنهم والدوريات بناء على طلبنا.

٢- تاكيدهم بتنفيذ الاتفاقية المعقودة بين الاطراف الثلاثة نحن وانتم وهم.

٣- اعتذار حول تصرف بعض مفارزهم و وعد بمحاسبتهم وذلك ارجو سحب الاخ محمد من ألمكائن واعتقد من المفيد لحزبنا في الوقت الحاضر و اقامة علاقات الاعتيادية اصعف الايمان حتى الربيع . و طبعا تبقى المسالة مرتبطة بموقفهم وارى من الضرورى عدم السماح للاخ محمد بتصرفات فردية لاتجدى نفعا.

**تحياتى لرفاقكم ورفاق باسوك**

**مع فائق اعتذارى**

**رفيقكم ابوعائد**

**١٩٨١/١٢/١٦**

ئەو هێرش وپەلامارەی حزبی شیوعی و حسك و پاسۆك و پارتی بۆ سەر یەكێتی لە كاتێكدا بوو، كە بەشێكی زۆری هێزەكانی یەكێتی لە كوردستانی ئێران بوون، بۆ هاوكاری هێزەكانی حزبی دیموكرات و كۆمەڵەی ئامۆزا لە بەرامبەر هێرشەكانی كۆماری ئیسلامی ئێران بۆ سەر كوردستان. سەیر لەوە دا بوو، كە چۆن و ئەو بیروبۆچوون و ئەیدیا جیایانە لە دژی یەكێتی یەكیان گرتبوو؟

---

* وثيقة رقم (٨) من وثائق تدين تآمر أطراف الجود.

**پاسۆك:** حزبێکی نەتەوەپەرستی تا سەر ئێسقان داواکەری کوردستانی گەورە.

**پارتیەکی:** یارمەتیدەری کۆماری ئیسلامی ، هێرشکەر بۆ سەر کوردستانی ئێران و کاولکردنی.

**حزبی شیوعی:** خاوەن فکری (م.س) و ئومەمیەتی شیوعی و دژی دەوڵەتی نەتەوەیی.

**حسك:** خاوەن فکری سۆسیالیستی نەتەوەیی بڕوا بوو بە خەبات لە کوردستانی عێراق و دەست نەخستنە کاروباری پارچەکانی تر.

ئەم هەموو بیروبۆچوونە ناکۆك بە یەکانەی ناو جود، لەم نامەیەی شیوعیەکان بۆ حسك دا دەردەکەوێ ، کەبەئاشکرا پەشیمان بوونەوەی پارتی بەرزانی لەو پەیمانە و سوێند خواردنەکەی، کە هەموو حزبە کوردستانیەکان و شیوعیش لەگەڵ حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران کردبوویان ، کە بریتی بوو لە :

**١- هاوکاری حزبی دیموکراتی کوردستان ئێران و کۆمەڵەی ئێران.**

**٢- دەست نەخستنە ناو کاروباری شۆڕشی ئێران و هاوکاری کردنی کۆماری ئیسلامی ئێران . بەلآم پارتی بارزانی دەست نوێژەکەی بۆ هەڵنەگیرا و شکاندی بە یارمەتی سوپای (مستەفا چەمران) لە هێرشدا بۆ سەر ناوچە ڕزگارکراوەکانی ئێران.**

## بەڵگەنامەی ژمارە ( ٥ )

**حزبی شیوعی عیراق** **ژمارە/ ف**

**مێژوو/٢٥ - ١٩٨١/١١/٢٦**

**برایانی بەڕێز ( م.س ) حزبی سۆسیالیستی کوردستانی تێکۆشەر.**

**سڵاوێکی شۆڕشگێڕانەمان**

برایان وامن بڕیار نامەکی ڕێکەوتنەکەم ئیمزاکرد و ناردم بۆ خزمەتتان ئەمەش ملاحظاتی هاوڕێیانمانە، ئەوانیش و منیش هەست دەکەین هەنێ ، نقاطی ضعفی تێدایە. وەك تەحدید کردنەکان، ماوەکورت و دیاری کردنەکان و شتی تریش ،لەم ڕووەوە دەربارەی ئەم شتانە هەموو لایەکمان بەپەرۆش بووین، کە ئەم سوێند خۆرانەمان لەم گێروگرفتە ڕزگارمان کەن و زیاتر تووشی ڕوزەردیمان مەکەن. سەرجێکی تری هاوڕێیانمان ئەوەیە، کە نابێ ئەم شتانە لە زیانی جەلالەوە پێیان بڵێن واتە بە (پ.د.ك). بۆیە بیروڕاکەی ئێوەمان لاپەسەندە، کە وەك یاداشتێك ئامادەیکەین و چەند خاڵێکی پاڵفتەی ئەو خاڵانەیان بدەینێ و بۆیان بنێرین و هەندێ لە مەرجەکانی دیموکراتیشیان بۆ باس بکەین و لە قسەکردندا وەعدەکانی پێشووشیان، کە زۆربەیان نەبردۆتە سەری بیخەینەوە یادیان.

وملاحظة یەکیش هەیە، کە ئێمە هیچ ئیلتیزامێکمان نەداوە، چونکە ئێمە نووسیومانە بەو پێیە هەڵوێست وەردەگرین، ئەویش لەگەڵیان دەچین بۆ جەولات یان لەگەڵیان دەچین بۆ شەڕ و لە هەندێ ماڵ و جێگادا بۆ تەنگەتاوکردنیان، بۆیە ئێمە سبەینێ پێشنیارێکی نووسراو وئەو یاداشتە ئەنێرینە لاتان، کە زیاد و کەم نەزەری خۆتانی لەسەر بدەن ئەگەر پەسەند کرا بینێرنە لای برایانی (پ.د.ك) پێمباشە ڕۆژی ٨١/١١/١٩ سەفەرەکە بکەین.

تێبینی: ئەوا بروسکەیەکی کاك سەید کاکە و تەنسیقتان بۆ دەنێرم ، تکایە ئەگەر بکرێ نوسخەیەکمان بە ئیمزا کراوی بۆ بنێرەوە لەجیاتی ئەبو سەرباز.

**لەگەڵ ڕێز و سڵاوماندا دووبارە.**

دەقی ئەو ڕێکەوتننامەیەی نێوان (حشع و یەکێتی) کە بۆ حسك وپارتیشیان ناردووە و بە دەست پێشکەری یەکێتی و نووسینی"مام جەلال"بوو، لەسەر دەست تێوەرنەدانی قیادەی موەقەتە(پارتی) بوو، لە کاروباری ناوخۆی کوردستانی ئێران و پەلاماردانی حیزبی دیموکرات و کۆمەڵە و پێشمەرگەکانیان. ئەمەش لەسە ر داوای حزبی دیموکرات بوو، لەو کاتەی ، کە یەکێتی بە هەموو هێزیەوە یارمەتی حزبی دیموکراتی دەدا، داواشیان لە جود کرد، کە ئەوانیش یارمەتیان بدەن . مەبەست لە (ئەم سوێند خوارانەمان) پارتیەکە بە شەڕفرۆشتن بە حزبی دیموکرات و لێدانی شۆڕشی کوردستانی ئێران گیروگرفتیان بۆ لایەنەکانی تری جود دروست کردووە ، هەم لە ئێران و هەم لە عێراقیش و تووشی ڕوو زە ردی هاتوون .پاشان دەڵێ:" سەرنجی هاوڕێیانمان" واتە سەرکردایەتی حزبی شیوعی ئەوەیە (کە نابێ ئەم شتانە) واتە ئەو پێشنیارانەی ناو بەیانەکەی مام جەلال نوسیویەتی بە پارتی بڵێن، کە ئەمانە هی مام جەلالە*. هەندێ لە مەرجەکانی دیموکراتیشیان بۆ باس بکەین، واتە ئەو مەرجانەی، کە حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران هەیانە لەسەر جود وپارتی دەڵێ:" وەعدەکانی پێشوشیان، کە زۆربەیان بەجێ نەگەیاند". مەبەستیان لەو وەعدانەیە، کەپارتی بە لایەنەکانی تری جودی دابو، لە چەك و فیشەك و چەکی قورس و ئازووقە و چەکداریش، کە بۆیان بنێرێ لە کاتی شەڕەکانیان لەگەڵ یەکێتی ، کە هیچی بۆ نەنارد بوون. کە دەڵێ:"پێمباشە ڕۆژی ١٩٨١/١١/٢٩سەفەرەکەمان بکەین" مەبەستی ئەوەیە لەو ڕۆژەدا هێرشەکەیان بۆ سەر سەرکردایەتی یەکێتی دەست پێ بکەن . ئەو ڕێکەوتننامەیەی یەکێتی و هێزەکانی کوردستانی ئێران لەگەڵ لایەنەکانی جود، و کێشەکانی جود لە مەڵبەندی(٣)و هودنەکەی نێوان حزبی شیوعی و مولازم عومەری یەکێتی بارودۆخەکەی کوردستانی عیراقی تا ڕادەیەکی

---

* (وثائق تدين مؤخرات اطراف الجود)، من منشورات الأتحاد الوطني الكردستاني.

باش هێمن کردەوە ، کە ئەو ئارامیە نزیك بە ساڵێکی خایاند . واتە بە درێژایی ساڵی (١٩٨٢)ئارام بووە، چەند هۆیەکی تریش هەبووە، کە نە یەکێتی و نە جود نەپەرژێنە سەر شەڕکردن لەگەڵ یەکتریدا.لەوانە:

١- بەرەی جود تارادەیەکی باش جێ پێی خۆیان لە دەشتی هەولێر و ناوچەی کۆیە کۆکردبۆوە ، نەیان دەویست پاش کشانەوەیان لە مەڵبەندی (٣) شەڕ بەردەوام بێ و شوێنیان لەوێش پێلەق بکرێ.

٢- یەکێتی کە گفتی بە کۆمەڵەی زەحمەتکێشان و حزبی دیموکراتدا بوو، یارمەتیان بدات و هاوکاریان بکات بەناوی (هێزی پشتیوانەوە) بەچەك وپێشمەرگە،تەنانەت"مام جەلال" بارەگا کاتیەکەی خۆی بردە ناو خاکی ئێرانەوە، بۆ سەرپەرشتی هێزەکانی یەکێتی، نەیدەویست لەو گفتەپەشیمان ببنەوە و نەشی دەتوانی هەم شەڕی ئێران و هەم شەڕی جود و شەڕی عیراقیش بکات.

٣- حسك و حزبی شیوعی و پاسۆکیش، کە لەناو "جود" دابوون، و بەهۆی پارتیەوە ڕوو زەرد و سوك و سەلیمی بەردەم کوردی کوردستانی ئێران و دیموکرات و کۆمەڵەش ببوون، دەیانویست بەو ڕێکەوتنە کەمێ ئەو ڕوو زەردیە لەسەر خۆیان لابەرن و وای نیشاندەن ، کە هاوکاری پارتی (بارزانی) نین لە لێدانی کوردی ئێران و شۆڕشەکەی. ماوەی ئەم یەك ساڵە بێ شەڕ و شۆڕەی نێوان یەکێتی و جود هەلێکی زۆرباش بوو، بۆ خۆشکردنی زەمینەی ئاشتبوونەوەی گشتی و ڕێکەوتن و پێکهێنانی بەرەیەکی کوردستانی ، بەڵام بەداخەوە هێمنی پێش گەردەلولی هەرەگەورە بوو.

## ٦-٩. چوونم بۆ لای کۆمەڵەی ئامۆزا.

پاش ئەوەی بڕیاری نەگەڕانەوەمدا بۆ لقی(٢)ی کەرکوك، لەسەر ئەو بوختانە نابەجێ و داخ لە دڵیەی"سالار عەزیز" دیارە "مام جەلال"یشم لێ چوو بە قینا، ( قوڕ بەسەر ئەوەی بەر نەفرەتی فرعەون دەکەوێ) لەوکاتەشدا نەوشیروانی سکرتێری کۆمەڵەش

له دەرەوەی وولآت بوو، نوێنەری کۆمەڵەش لە (م.س) یەکێتی (سالار عەزیز و فازیل کەریم) بوون هەردوو ناکۆکەکانم . ئیتر "مام جەلال و م.س" بڕیاریاندا بوو ، کە هیچ کارێکی ترم نەدرێتیٚ، منیش لە ناوەڕاستی مانگی ١٩٧٩/٨چوومە شێنێ و خانویەکی بەتاڵی لێ بوو، کردمە بارەگا. شەهید"خەلیل وشەهید هاواری براشم، لەگەڵ مندا بەر ئەو نەفرەتە کەوتن، ئەوان و پێشمەرگەکانیش لەگەڵ من مانەوە . لەرۆژی ١٩٧٩/٨/٢٥ دوای کۆبونەوەی (٥) قۆڵی یەکێتی، شیوعی، حسك، حزبی دیموکرات ، کۆمەڵەی ئێران بڕیاردرا، هێزی هاوبەش پێکبێنن بۆ بەرگرتن لەو هێرش و پەلامارەی حکومەتی ئیسلامی کردیە سەر کوردستان ، من لەلایەن مام جەلالەوە بانگکرام و پێی ڕاگەیاندم، کە لەگەڵ پێشمەرگەکاندا بڕۆم بۆ لای برادەرانی کۆمەڵەی ئامۆزا بۆ هاوکاری کردنیان . ئێمە بەرەو شاری بانە ڕۆیشتین و لە بانە لەگەڵ (فوادی سولتانی) کە وەك سکرتێر و کەسی یەکەمی ناو کۆمەڵە وابوو ، من تاکو ئەوکاتە ، کاك فوئادم نەناسی بوو، دکتۆر عەزیز (جەعفەری شەفیعی) پێی ناساندم ، بەو چوار – پێنج حزبە بڕیاریاندا بوو، هێزێکی نزیك بە (١٥٠٠) چەکدار ئامادەکەن بۆ سە ر شاری مەریوان و گرتنی ، کە یەکێتی(٤٥٠)پێشمەرگە وحسك (٣٠٠) پێشمەرگە و شیوعی(٢٥٠)پێشمەرگە وحزبی دیموکرات (٣٥٠) پێشمەرگە وکۆمەڵەی زەحمەتکێشانی کوردستانی ئێرانیش (١٥٠)پێشمەرگە. لەبەر ئەوەی کە بڕیار بوو لەگەڵ کۆمەڵەی ئامۆزابم ، لەوکاتەدا سوپای پاسدارانی ئێران لەژێر فەرماندەیی (مستەفا چەمرانی) وەزیری دفاعی ئێران، هێرشی بۆ سەر کوردستان دەست پێکرد بوو، گەیشتبوە شاری (پاوە) ولە پاوە هێزی کورد چواردەوریان گرتبوو، بۆیە "ئیمام خومەینی" فەرمانی هجومی گشتی بۆ سەر کوردستان کرد و لە رۆژی (١٩٧٩/٨/١٨) شاری پاوەیان گرتەوە، کە من چوومە شاری بانە، هێزەکانی یەکێتی بە سەرپەرشتی ( بەکری حاجی سەفەر) و هی حسك بە سەرپەرشتی ئەنوەر مەجید سوڵتان لەوێ بوون، بڕیار وابوو تا ١٩٧٩/٨/٢٧ هێزەکانی شیوعی و حزبی دیموکرات بگەن و

هێرش بۆ سەر مەریوان دەست پێ بکرێ، پێش ئەوەی هێزی چەمران بگاتە ئەوێ . ئەوکەرتە پێشمەرگەیەی، کە لەگەڵ من دابوو خەلیل و هاواری براشم لەگەڵ کاك فوئادی سوڵتانی و نزیك بە (١٠) پێشمەرگەی ئەوانیش، ئەوانیش لەسەر داوای کاك فوئاد بە سەیارە لە شاری بانەوە لە ڕۆژی١٩٧٩/٨/٢٦ ڕێکەوتین بەرەو مەریوان بۆ کەشفێکی ناوچەکە و چۆنیەتی دابەشکردنی هێزەکان، ئێمە لە نزیك شاری مەریوان، لە دێیەك لاماندا، کە نزیکەی (٣٠)پێشمەرگەی تری کۆمەڵەی لێبوو. شەوی٢٧/٢٦ ئابی١٩٧٩ کاك "فوئاد" چەند کۆبونەوەیەکی لەگەڵ چەند کەسێك کرد، کە خەڵکی شاری مەریوان و ناوچەکە بوون و شارەزایی تەواویان لەسەر ناوچەکەی دەوروبەری مەریوان هەبوو.

ڕۆژی ١٩٧٩/٨/٢٨ چاوەڕێ بووین ، کە هێزەکان و تۆپەکانی حزبی دیموکرات بگەن، تا لەرۆژی ٨/٢٩ دا پەلاماری مەریوان بدرێ ، بەڵام ئەو ڕۆژەش هیچ دیار نەبوو، بۆ ڕۆژی ٨/٢٩ گەیشتینە ئەو بڕوایەی ، کە ئەو هێزە ناگات ، من بە کاك فوئادم ووت : بڕواناکەم ئەو هێزە بگات، نزیکەی (٦٠) پێشمەرگەمان لەگەڵدایە با لە ڕەبایەکان و معەسکەرە بچوکەکانی دەوروبەریەوە بدەین، هەر نەبێ هەندێ چالاکی بکەین . کاك فوئاد قایل نەبوو ، پێی وابوو، ئەو کارە نەخشەکەمان لێ تێك ئەدا.

لە ڕۆژی ١٩٧٩/٨/٢٨من و کاك فوئاد و دوو لە فەرماندەی پێشمەرگەکانی خۆیان ، لەماڵێك دانیشتین بۆ تاووتوێ کردنی بارودۆخەکە، کاك فوئاد ووتی: سبەینێ لەگەڵ من و یەك پێشمەرگە لەوێوە بەرەو جادەکە بڕۆین و بە سەیارە بگەڕێینەوە بۆ"بانە" تا بزانین هاتنی ئەو هێزە بەچی گەیشتووە. ئەو ماڵەی کە ئێمە کۆبونەوەکەمان تیاکرد ، دوو کوڕی جاشیان هەبوو، لای حکومەت بوون، من گومانم پەیا کردبوو، لەوەی کە باوکی کوڕەکان هەواڵ بە کوڕەکانی ئەدا، کاك فوئاد ڕای وابوو، کە ماڵەکە زۆر کوردپەروەر و دڵسۆزن و کوڕەکانیشی لە ژێرەوە پەیوەندیان بە کۆمەڵەوە هەیە . بەو دو– سێ ڕۆژە، کە لەو ماڵە بووین، ماڵەکە ناوی منیشیان زانی بە (مامۆستا برایم

و مەلا برایم).لە ڕۆژ ١٩٧٩/٨/٣٠ من و کاك فوئاد بەیانی زوو لەگەڵ پێشمەرگەیەکی سازمانی ئینقلابی بە ناوی (تامرز) کەوتینە ڕێ، لەو کاتەدا پیاوێکی بە تەمەن و کوڕێکی گەنج هاتن و ووتیان : ئێمەش دێین لەگەڵتان، ئەڕۆین بۆ بانە پیاوەکە ناوی (عوسمان شێخ خالید) وکوڕەکەش کوڕی بوو، وابزانم ناوی تایەر بوو، چوینە سەر جادە بە پێچەوانەی ڕۆژانی پێشوو، هیچ سەیارەیەك نە ئەهات و نە ئەڕۆیشت ،بە پێ بەسەر جادەکەدا ڕۆیشتین، تا ئێوارە درەنگ داهات، لاماندا بۆ دێیەك ناوی(کانصمت)بوو، چوینە ماڵێك سەر بە کۆمەڵەی ئامۆزا بوو، شەو لەوێ ماینەوە، بەیانی هەستاین ، کاك فوئاد پرسی بۆ دوێنێ سەیارە نەبوو؟

ووتیان: دوێنێ و پێرێش سەیارە نەبوو، جگە لە ماشێنەکانی، کە پێشمەرگەکانی حزبی دیموکرات هاتوچۆیان پێ کردووە. ئێمە دیسانەوە بەرەو سەرجادە کەوتینەڕێ، هەتاو کە وتبوو، گوێمان لە دەنگی کۆپتەر بوو، پاش تۆزێك لێمان نزیك بوونەوە، لە جادە لاماندا بۆ بەستێك چەند داربیەکی کورتە باڵای چەمی تیابوو، خۆمان دایە ژێر سێبەری دارەکان، کۆپتەرەکان تێپەڕین ، بە کاك فوئادم ووت: با هەر لەم چەم و بەستەوە برۆین ، نە چینە سەرجادە لەوە ئەچێ ئەم کۆپتەرانە بە دوای شتدا بگەڕێن یان هێزەکە لە بانەوە ، کەوتبێتەڕێ و ئەمانە بیانەوێ بپشکنن .

ئێمە بەردەوام بووین لەسەر ڕۆیشتنی خۆمان ، شوێنەکە پێچاوپێچ و گردی بەرز و تەپۆڵکاوی بوون، لەو ماوەیە کۆپتەرەکان (٣-٤) جار ئەگەڕانەوە بەرەومەریوان ودیسان ئەهاتنەوە بەرەو بانە، دوای ٣ سەعات ڕێکردن نزیك بوینەوە بە پاسگایەك و بە دووربین سەیرم کرد، جووڵەی خەڵکی تیابوو، هەم لەسەر بانەکە و هەم لەبەر پاسگاکەشدا، دووربینەکەم دا بە کاك فوئاد، ئەویش سەیری کرد و ووتی: لەوانەیە پێشمەرگەکانی حزبی دیموکرات بن لەوێ بن ، ئیتر ئێمە بە ڕیز مەسافەمان وەرگرت و بە چەمەکەدا ڕووەو پاسگاکە ڕۆیشتین ، لە پێچێکدا پیاوێکمان تووش بوو، بەرەو

ئێمە دەهات لە منی پرسی:"ئێوە پێشمەرگەن و هەر ئەوەندەن". منیش پێم ووت : پێشمەرگەکان زۆرن و لە دواوەن .

پاشان لێم پرسی: لەم ڕێیە چی هەیە؟ چی نیە؟

ووتی: واللە هیچ نیە وبە پەلە لە ئێمە تێپەڕبوو ڕۆیشت ، ئێمە لە چەمەکەدا گەیشتینە بەرامبە ر پاسگاکە ودەنگیان داین لە دوورەوە ووتیان: "ئیت "، ئاوڕم دایەوە ، بانگی کاك فوئادم کرد، ووتم: ئەمانە پاسدارن خێرا پێ هەلگرن با بەچەمەکەدا ڕاکەین ، تا دووردەکەوینەوە لێیان، ئێمە نەمانزانیبوو، ئەو کۆپتەر کۆبرایانە پاسداریان لەناو پاسگاکە دابەزاندووە ، بەوسێ چوارجار هاتوچۆیە، کاك فوئاد هاواری کرد وگووتی: ناتوانم بڕۆم زۆر هەوڵمدا بێ سوود بوو ، ناچار دامەزراین، (تایەر)لە پێش منەوە بوو (تامورز)دوای من بوو، دوای ئەو کاك فوئاد بوو، لەدوای ئەویش (شێخ عوسمان)بوو، کات نزیکەی عەسر ببوو، بوو بە تەقە تا ئێوارە تەقە نەما، تاریك داهات بەرەو دواوە گەڕامەوە بینیم، کاك فوئاد و تامرز شەهید بوون، شێخ عوسمان دیار نەبوو، گەڕامەوە هەر بە چەمەکەدا بۆ پێشەوە بڕۆم، چەمەکە تا دەهات هەر بەرەو نشێوتر لە جادەکە دەچوو، دووریش دەکەوتمەوە، بە هیوا بووم، بگەمە گوندێك و پێیان بڵێم یارمەتیمان بدەن بۆ دەرکردنی لاشەی شەهیدەکان، بەلاّم هێندە نەشارەزا بووم زیاتر لە ٥سەعات، ڕێمکرد، نەگەیشتمە هیچ دێیەك، بەردەوام بووم لە ڕۆیشتن تا نزیکەی بەرەبەیان، لە قەراغ چەمەکە، کەپرێکی بچکۆلەم بینی لامدا پشوویەك بدەم ، خەوم لێکەوت لە دەنگە دەنگی لۆری و دەبابە خەبەرم بۆوە، کە بە دووربین سەیرمکرد، ئەو هەموو ڕێگایەی شەو بڕیومە، کەچی بە هەمووی دوو کیلۆمەتر لە پاسگاکە دوور نەکەوتومەتەوە، تومەز بەناو چەمەکەدا بە دەوری خۆمدا خوولاومەتەوە، دیسان بە چەمەکەدا کەوتمەڕێ ،تا دەهات چەمەکە لە جادەکەوە دوور دەکەوتەوە. ڕادیۆم پێ بوو، کردمەوە و خستمە سەر ڕادیۆی کرماشان ، هەر خەریکی لێدانی سروودی حەماسی بوون ،پاشان لە بەینی

سروودەکان جارجار کورتە هەواڵی دەدا، تا گوێم لێ بوو، ووتی: لە نزیك پاسگای (کارنصت) کە هێزەکانیان لە تاقمێك دژی ئینقلابیان داوە، لەوانە دوویان کوژراون بە ناوی (فوئاد سوڵتانی * و مەلا برایم)، فوئاد سوڵتانی یەکێکە لە سەرانی گرووهی ئینقلابی کۆمەڵە، مەلا برایم یەکێکە لە کادرانی ئیتحادی مهنی عیراق. ئەوسا من تێگەیشتم کە کاك فوئاد و منیش لەماڵەکەی کە لێی بووین ئیخباری کرابووین و دووشەهیدەکەش لەبەر ئەوەی تامرز ، خەڵکی تەورێز بوو، نە ناسراو بوو، هیچ ناسنامەیەکی پێ نەببوو، وایان زانیبوو، کە منم.

من دوای دوو شەو و دووڕۆژ، ئەوسا گەیشتمەوە نزیك"بانە"، بەو نەشارەزاییە ، گەیشتمەوە لای پێشمەر گەکانی(بەکری حاجی سەفەر) و کەرتەکەی خۆشمان بە گەڕان بە دوامدا ئەوانیش گەیشتبوونەوە لای کاك بەکر، و لەوێ وەزانیم ، کە چەمران پاش گرتنی پاوە و مەریوان بەرەو بانە هاتوەو ناوشار بۆردومانکراوە ، خەڵکی وپێشمەرگە هەموو لە شاردا نەماون، لە بانە بڕیاردرا دو وادەی"دوو ئاو" سەقزیان لێبگیرێ، بەڵام یەك سەعاتیش پێشمەرگە خۆی نەگرت، جگە لە ڕتڵی دوور و درێژی سوپا بەردەوام کۆپتەری کۆبرا پاسداریان لەسەر هەموو تەپۆڵکەکان و ئەم لاو ئەولای جادەکە دادەبەزاند.

چەمران گەیشتەوە ناو شاری بانە وهێزەکانی حزبی دیموکرات و تۆپەکانی و هێزی حزبی شیوعی وحسك ، جگە لە دەستەکەی (شەهید ئەنوەری مەجید سوڵتان) کە خۆشی لەو شەڕەدا شەهید بوو ، هەر نەگەیشتن. کاك فوئاد و تامرز لە ئێوارەی(٩٧٩/٨/٣١ )شەهید کران.

هێرش و پێشڕەوی هێزەکانی کۆماری ئیسلامی بەرەو هەموو ناوچە ڕزگارکراوەکانی کوردستان بەردەوام بوو، تا لە ماوەی٣مانگدا، هەموو کوردستانی گرتەوە،

---

* کاك فوادی سوڵتانی و تامرز لە ئێوارەی ١٩٧٩/٨/٣١ شەهیدکران.

بارەگاکانی شێخ عزالدین وکۆمەڵە و حزبی دیموکرات هاتنە شێنێ و توژەڵە و ئاشی پشتکاوی نزیك بارەگاکانی یەکێتی.

## شەهید بوونی کاك فوئاد و دیسان فرسەتی.

ئێمەش لەگەڵ هێزەکانی خۆمان گەڕاینەوە دواوە و من و کەرتەکە و براکانم گەڕاینەوە بۆ کۆنە بارەگاکەمان لە شێنێ، لەگەڵ (مامۆستا شێخ عزالدین) بووین بە دراوسێ. لەو ماوەیە دیسان سالار عەزیز بە کۆنەقین کەوتەوە شەڕفرۆشتن لەگەڵما، ئەمجارە هەوڵیدا بۆ سەرکردایەتی کۆمەڵە ئامۆزا وا تێبگەیەنێ کە لە شەڕدا من ڕامکردووە و کاك فوئادم بەجێ هێشتوە، بۆیە ئەو کوژراوە و من نەکوژراوم، هێشتا کاك نەوشیروان نەگەڕابۆوە و سالار عەزیز خۆی بە بەرپرسی یەکەم و دواهەمی کۆمەڵە دەزانی ، ناچاربووم داوا لە سەرانی کۆمەڵەی ئامۆزا بکەم کە بە ڕاپۆرتێك رای خۆیان لەسەر من بدەن بە (مام جەلال)، بە ڕاستیش هەرواشیان کرد و ڕاپۆرتێکیاندا بە مام جەلال، کە من نە ڕامکردووە و نە کاك فوئادیشم بەجێهێشتوە، خۆشیان لێکۆڵینەوەیان کردبوو گەیشتبوونە ئەو ڕاستیەی، بە نە شارەزایی کەوتوینە کەمینەوە و ئەو دوانە شەهید ببوون، باشترین بەڵگەی کۆمەڵەی ئامۆزاش بۆ بەرپەرچدانەوەی تۆمەتەکانی سالار عەزیز، ئەوە بوو، کە پاش بڵاوکردنەوەی بەیانەکەی (ئیمام خومەینی) لە ئێزگەی تاران لە ڕۆژی (۱۹۷۹/۱۰/۲۹ ) دەربارەی ڕاگرتنی شەڕی کوردستان، داوایان لە کۆمەڵە و مام جەلال کرد، کە دووبارە برۆمەوە و کاریان لەگەڵدا بکەم.

# بەشی حەوتەم
# شۆڕشی ئێران

## ٧-١. بەیانی ڕاگرتنی شەڕ و دەرکەوتنی ئاسۆی گفتوگۆ ١٩٧٩/١١/١٧.

ڕووخانی ڕژێمی شا و بەرپابوونی شۆڕشی کوردستانی ئێران قۆناغێکی نوێی لە شۆڕشی گەلی کورددا دروستکرد. دوای گەڕانەوەی خومەینی بۆ ئێران و دامەزراندنی کۆماری ئیسلامی ئێران، شۆڕش و ئاکارەکانی و هیوا و ئاواتەکانی کرێکاران و قوتابیان و زەحمەتکێشان و بۆرژوازیەکان پاشان حزبەکانی (تودە و چرێکی فیدائی اقلیەت و أکثریەت وسازمانی انقلابی ،خەونە سەوزەکانی گەلانی کورد و تورکمان سەحراو ئازەرۆ بلوج وعەرەب ، بە بارێکدا سوورا ، کە هەموو ئەو حزب و ڕێکخرا و نەتەوە و چینانەی تووشی شۆك و نا ئومێدی کرد، هەر لەو ماوە زۆر کەمەدا (مەلا و ئاخوندەکان)جلەوی ڕاپەڕین و تەزاهورات ئیعتصام وشۆڕشیان لە دەست چەپ و دیموکرات وشۆڕشگێرەکانی تر سەندەوە و لە ماوەی کەمتر لە ٦ مانگدا بەهێزترین سوپای سەربەخۆیان بەناوی سوپای پاسەوانی شۆڕشەوە (سپای پاسداران) دامەزراندو هەموو ئەو حزبانەشیان لە ئێران دەرپەڕاند و شۆڕشی(٣)مانگەی کوردی کوردستانی ئێرانیشیان شپرزە کرد ، کە شۆڕشی کوردستان "حزبە کوردستانیەکان دیموکرات وکۆمەڵە"، لە هەموو حزبەکانی تری سەرتاسەری ئێران خۆڕاگرتر و بەوورەتر و درێژخایەنتر بوون. کۆماری ئیسلامی کارێکی وایانکرد، کە ڕۆژنامەی ناوەندی حزبی تودە بە مانشێتی گەورە لەلاپەڕەی یەکەمدا بنوسێ (تیوری لینینی ڕەهبەری خومەینی) . بەڵام لەلایەکی ترەوە ڕووخانی ڕژێمی "شا"و بەرپابوونی شۆڕشی کوردستانی ئێران، کاریگەریەکی زۆری کردە سەر شۆڕشی نوێ ی کوردستانی عیراق و پێینایە قۆناغێکی نوێ، هەلومەرجی گەشە کردنی شۆڕش یەجگار زۆر لەبارکرد، بەتایبەتی پاش بەرپابوونی شۆڕشی نێوان عیراق و ئێران،

تارێکەوتنەکەی نێوانیان و دەستپێکردنی ئەنفالەکان . لەو ساڵانەدا ،واتە ناوەڕاستی (١٩٧٩) تا ڕاگرتنی شەڕی نێوان ئێران – عێراق ، گەر حزب و ڕێکخراوە کوردیەکان دژی یەکتری خەریکی شەڕی ناوخۆ و براکوژی نەبوونایە و بە هەموویان یەکگرتوانە شەڕی دوژمنی سەرەکیان بکردایە ، کە حوکمی سەدام بوو، ڕەنگە بارودۆخی شۆڕش و ڕزگارکردنی ناوچەکان و ناچارکردنی ڕژێمیان بۆ وتووێژ و داسەپاندنی داواکاریەکانیان بە بارێکی زۆر جیاواز و بە هێزتر و سەرکەوتوتردا ببردایە.

**ڕووخانی شا ئەم هەلومەرجانەی خوارەوەی بۆ شۆڕشی کورد ڕەخساند.**

١– سنورێکی داخراوی دوور و درێژ کرایەوە ، هەم بۆ شۆڕشی کوردستانی – عێراق و هەم بۆ شۆڕشی کوردستانی–ئێران.

٢– کێشەی زۆر کۆن ولە مێژینەی سنووری ئاوی ئێران– عێراق سەری هەڵدایەوە و توندوتیژتر بوو ، لەبەر چەند هۆیەك.

ا– دەرکردنی ئیمام خومەینی لە نەجەف لەلایەن ڕژێمی سەدامەوە لەسەر داوا و خواستی شای ئێران، و ڕۆیشتنی بۆ پاریس بە پێی بەندەکانی ڕێکەوتنی جەزائیر ، کە نە دەبوو هیچ کام لە ئێران و عێراق داڵدەی دژەکانی یەکتریان بدایە.

ب– پاشگەزبوونەوەی سەدام پاش ڕووخانی شاە لە ڕێکەوتننامەی جەزائیر و ئەو هەموو تەنازولاتەی ، کە بۆ شای کرد ، لە بەرامبەر ئاشبەتاڵ کردنی شۆڕشی ئەیلول.

ج– هاندان و دنەدانی سەدام بۆ بیانوگرتن بە کۆماری ئیسلامی ،لەلایەن و وڵاتانی ڕۆژئاوا و ئەمریکاوە بە تایبەتی پاش گرتنی دیلە ئەمریکیەکان لە سەفارەتی ئەمریکا لە تاران ، بە مەبەستی بەرگرتن بەلافاوی تەوژمی ئیسلامی و ئیسلامگەری ، کە مەترسی سەرهەڵدان و گەشەکردن و تەنینەوەی ئەو جۆرە ڕژێمە لە ئێرانەوە ، بۆ وڵاتانی تری ئیسلامی و عەرەبی هەبوو.

٣- پەیوەندی باش و پتەوی یەکێتی بە ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی پێش ڕووخان و پاش ڕووخانی "شا" ش وەك (بەرەی ئیسلامی سەر بە خومەینی، بەرەی نیشتمانی سەر بە "کەریمی سنجابی" بەرەی چەپی وەك تودەی کیانوری ، و چریکی فیدائی خلق اکپریەت و اقلیەت و مجاهدینی خلقی مەسعود رەجوی) و دیسان هێزە کوردیەکانی وەك حزبی دیموکرات و ڕێکخراوی کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستان- ئێران. یەکێتی و شۆڕشی نوێ تا ڕادەیەك سوودی لە زۆربەی ئەو ڕێکخرا و حزبە ئێرانیانە و زۆریش لە حزبە کوردستانیەکان لێوەرگرت، جگە لە فەترەیەکی زۆر کەم نەبێ ساردی لەگەڵ حزبی دیموکرات دروستبوو، لەگەڵ مجاهدینیش بە تەواوی تێکچوو پاش گرتنی ئەو دێکۆمێنتانەی، کە دەرکەوت بوونەتە ڕەصد و جاسوسی حزبی بەعس لە بارەگاکانیان لە سەفرە و زەرون و دۆڵی جافەتی.

٤- لە ڕووی پەیوەندی نێودەوڵەتیەوە، ڕووخانی "شا" بۆ ئێمە کردنەوەی دەرگایەکی زۆر فراوان بوو، بە ڕووی وولاتانی دەرەوەدا . یەکێتی و کۆمەڵە لەناو یەکێتیدا دۆستایەتی بەهێزی لەگەڵ سوریا و لیبیا هەبوو ، کە هەردووکیان نەیاری بەعسی سەدامی بوون، کۆماری ئیسلامی پەیوەندیەکی بەهێزی لەگەڵ سوریا و لوبنان هەبوو، شۆڕشی ئێران ئەو کلك لێکگرێدانەی نێوان ئێران و عیراق و تورکیای هەڵتەکاند ، عیراق و ئێران کە دۆست بوون ، پێکەوە دژی کورد بوون، بوون بە دوژمنی یەکتری و دۆستی کورد (حلفی مقدس)ی نێوانیان هەڵتەکا،سەر ئەنجام ئێران بوو بە پشتیوانێك بۆ ئۆپۆزسیۆنی عیراقی بە کوردیشەوە و عیراقیش بوو ، بەپشتیوانێك بۆ ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی بە کوردیشەوە ،کوردی هەردوو پارچەکەش دژایەتیان حەرام کرد ، بە تایبەتی یەکێتی لەگەڵ حزبی دیموکرات و کۆمەڵەی ئامۆزا.

٥- یەکێتی ئەو بارودۆخە ڕەخساوەی قۆستەوە، بارودۆخی ناکۆکی نێوان ئێران و عیراق و بارودۆخی دۆستایەتی بەهێزی نێوان ئێران و سوریا و لوبنان . بۆ سوود

لێوەرگرتن بە تایبەتی لە کردنەوەی دەرگایەکی باش بە ڕووی وولاتانی دەرەوەدا هەم لە ڕووی ڕاگەیاندن و گەیاندنی دەنگی کورد و شۆڕش بە جیهانی دەرەوەو هەم هێنانی ئەو یارمەتیانەی ، کە لیبیا و سوریا و فەلەستینیەکان ئەوکات دەیان نارد.

٦- یەکێتی ئەزمونی پەیوەندی مەرجداری بارزانی لەگەڵ ئێران لەبەر چاو بوو، بۆیە بە دووربینیەکی زۆر و بە حەزەرێکی زۆریشەوە کاری بۆ بەهێزکردنی پەیوەندی خۆی لەگەڵ کۆماری ئیسلامی ئێراندا کرد لەسەر چەند بنەمایەك .

ا- پەیوەندیەکی تەکتیکی ئەوتۆ ، کە لە بەرژەوەندی ستراتیژەکەی پێکەوە گەشەپێدان و بەهێزکردنی شۆڕش و لاوازکردنی ڕژێمی عیراقی بێ.

ب- نابێ ئەو پەیوەندییە لەسەر بەرژەوەندی کوردستانی ڕۆژهەلآت بکەوێت. یەکێتی هەرگیز ئامادە نە بوو پەیوەندی خۆی لەگەڵ ئێراندا بە جۆرێك بێ، کە دژایەتی شۆڕش و حزبی دیموکرات و کۆمەڵەی پێ بکرێ، وەك پارتی هەم لە سەردەمی شا و هەم لە سەردەمی کۆماری ئیسلامی ئێرانیش ببوون بە بەشێکی پاسداران بۆ لێدانی حزبی دیموکرات و کۆمەڵە و شۆڕشی کوردستانی ئێران. بە پێچەوانەی یەکێتی پەیوەندی باشی لەگەڵ ئێراندا ، باشترین پشتیوانی کوردی ئێران و حزبەکانی بوو، تا ئەو ڕادەیەی کە ناویان لە هێزەکانی یەکێتی نا بوو، هێزی پشتیوان، و یەکێتی و کۆمەڵە بە تایبەتی ببوون بە ناوبژیکەری نێوان شۆڕشی کوردستانی ئێران و کۆماری ئیسلامی ئێرانیش لەلایەکی تریشەوە هاوکار و هاریکاریکەری ڕێکخستن و ڕاهێنانی هێزە چەکدارەکانی حزبی دیموکرات و کۆمەڵەی ئامۆزا بوو.

ج- پەیوەندیەکە تەنها لەسەر بناغە و سود و بەرژەوەندی یەکانگیری نێوان یەکێتی و ئێران بێ ، کە بریتی بوو لە (دوژمنی دوژمنم دۆستمە) واتە ڕێکەوتن لەسەر دژایەتی یەك دوژمنی ، کە ڕژێمی عیراق بوو.

٧- یەکێتی بڕوای تەواوی بەوە هەبوو ، کە قولآیی ستراتیژی شۆڕش و خەباتی هەر پارچەیەکی کوردستان پارچەکانی تری کوردستانە،تەحالوفاتی ستراتیژیش ،

هەر پێکەوە کارکردن و هاوپەیمانی نێوان حزب و ڕێکخراوە کوردستانیەکانە . هەر بۆیەش یەکێتی چۆن بە خۆی ڕەوا دەبینێ پەیوەندی تاکتیکی لەگەڵ ئێران هەبێ ئاواش بە حزبی دیموکرات و کۆمەڵەی ئامۆزا و ڕێکخرا و هێزە کوردیەکانی ڕەوا دەبینی کە ئەوانیش لەسەر بنەمای (دوژمنی دوژمنم دۆستمە) پەیوەندیان لەگەڵ عیراق هەبێ . بەلاّم بە مەرجێ لەسەر بەرژەوەندی شۆڕشی کوردستانی عیراق نەبێ ، هەر بۆیەش بە درێژایی شۆڕشی ڕۆژهەلاّتی کوردستان، هەموو بنکە و بارەگاکانی سەرکردایەتی و هێزەکانی حزبی دیموکرات و کۆمەڵەی ئامۆزا لە خوارووی کوردستان و نزیك بنكە و بارەگاکانی سەرکردایەتی کۆمەڵە و یەکێتی و یان لە ناوچە ڕزگارکراوەکانی ژێر دەسەلاّتی یەکێتیدا بوو، هەر بۆیەش لەو دید و ڕوانگە سیاسیە ڕاست و دروستەوە، یەکێتی نیشتمانی کوردستان و بەرەی کوردستانی بە ڕێکەوتن و ڕاگرتنی شەڕی عیراق – ئێران، شۆڕشی نوێ نە ڕووخاو چۆکی دانەدا و ئاشبەتاڵی نەکرد ، وەك ئاشبەتاڵی ساڵی (١٩٧٥)ی شۆڕشی ئەیلوول. لە کاتێکدا کە لە ئاشبەتاڵی شۆڕشی ئەیلوولدا (٧٠ هەزار) حەفتا هەزا ر کیلۆ مەتری دووجا زەوی ڕزگارکراو و(١٥٠)سەد وپەنجا هەزار پێشمەرگەی چەکدار و(١٠)دەیان ملیۆن دیناریان هەبوو،کە کەس نەیزانی ئەو پارانە ، کێ بردی و کێ خواردی لە بنەماڵەی بارزانی دا.

پێش ئەوەی خومەینی لە (١٩٧٩/١١/١٧) بڕیاری ڕاگرتنی شەڕی کوردستان بە ڕەسمی ڕابگەیەنێ "مام جەلال" هەوڵێکی زۆریدا بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد لەگەڵە ئێران بە ئاشتی ووتووێژ، بۆ نمونە کۆبوونەوەکەی "مام جەلال" و نوێنەرانی کۆماری ئیسلامی بە سەرۆکایەتی (داریوشی فروهەر) نوێنەرەکانی حزبی دیموکرات و کۆمەڵە و شێخ عزالدین پێش دانیشتنێکیان لە ئاشی پشتکاوی کردبوو، نوێنەرانی کورد خواستەکانی خۆیان دابوو بە داریوش، ئەمە جگە لەوەی هەر بە هەوڵی یەکێتی و مام جەلال لە (١٩٧٩/١٠/١٨) دیسان کۆبونەوەیەکی تر لە نێوان نوێنەرانی حکومەتی ئێران داریوش فروهەر، کە ئەوسا وەزیری کار بو لەگەڵ (٣) فەرماندەی

سەربازی سازکرا ، نوێنەرانی کوردیش (مامۆستا شێخ عزالدین و سەلاح موهتەدی و ئیبراهیم عەلی زادە) لە کۆمەڵەی ئامۆزا بێ نوێنەری حزبی دیموکرات، لەم هەوڵەشدا هیچ بە دەست نەهات . لەگەڵ ڕاگەیاندنی شەڕ لەلایەن ئیمام خومەینی یەوە، هەل و دەرفەت بۆ حزبە کوردی و کوردستانی و چەپەکانیش ڕەخسا، کە چەکدار و کادریان بنێرنەوە دێهاتەکان.

دیسان لە مانگی (٧٩/١١) سەرکردایەتی کۆمەڵەی ئامۆزا داوایانکرد، کە بچم کاریان لەگەڵ بکەم و (نەوشیروان) گەڕا بۆوە و هاوڕێیانی حسکیش هەندێکیان گەیشتبوونە لامان، دیسانەوە من چوومەوە دیوی کوردستانی ئێران لەگەڵ برادەرانی کۆمەڵەدا. ڕاستیەکەی تەنها لەبەر ئەوە داواکەیانم پەسەند کرد، کە بیسەلمێنم ئەوەتا پاش لێکۆڵینەوە لە چۆنیەتی شەهیدبوونی (فوئاد سوڵتانی) لەلایەن سەرکردایەتیانەوە، دیسان داوای منیان کردۆتەوە کە کاریان لەگەڵ بکەم، وبیسەلمێنم کە (سالار عەزیز) بە غیابی (نەوشیروان و تووڕەبوونی مام جەلال شەرم بە کۆنەقین لەگەڵدا دەکا و ئەنجامیش هەروا دەررچوو، خۆی سەری خۆی هەڵگرت. من لەگەڵ برایانی کۆمەڵەی ئامۆزا بۆ جاری دووهەم کەوتمەوە ئیشکردن. تا مانگی (١٩٨٠/٣) لەو ماوەیەدا هەوڵێکی زۆرمدا تاکو برادەرانی کۆمەڵە بگەیەنمە ئەو قەناعەتەی، کە ئەوان ئەزمونی تاڵی شەڕو کێشەی نێوانی حزبەکانی کوردستانی عیراقیان لەبەر چاو بێ . هەوڵدەن لەگەڵ حزبی دیموکرات بە هیچ جۆرێك تێکی نەدەن و توندڕەوی نەکەن. ئەوکات نێوانی حزبی دیموکرات و کۆمەڵەی ئامۆزا باش نەبوو، حزبی دیموکرات خۆی بە زلهێزی سەر گۆڕەپانەکە دەزانی خاوەنی چەك و چەکدارێکی زۆر بوون،پەیوەندیان لەگەڵ عیراق دروستکرد بوو، لە ناوچەی بانەش (شێخ جەلالی بانە و سمکۆ علیار) ئەوانیش بە ناوی سازمانی جیاجیاوە پەیوەندیان لەگەڵ عیراق دروستکرد بوو، کۆمەڵەی ئامۆزا پەیوەندی نەبوو، پێیان وابوو پەیوەندی کردن بە عیراق کارێکی تاوانکارانەیە، حزبی دیموکراتیان بە نوێنەر دەرەبەگ و بۆرژوای

کورد و دۆستی داگیرکەری کوردستانی عیراق دەزانی. لەهەر شوێن و بۆنەیەکدا، کۆبونەوەیەك بکرایە گەر نوێنەری حزبی دیموکرات لەوێ بوایە، هی کۆمەڵە نە دەچوو هەرواش بە پێچەوانەوە. حزبی دیموکرات بە قەبەیی کوتوپڕی خۆی زۆری هێزە چەکدارەکەی خۆی زۆر دەنازی ،لە سەرەتاوە پێی وابوو، کە سەرتاسەری کوردستانی کۆنترۆڵ کردووە و دەیوست هاتو چۆی یەکێتی بە سنوورەکاندا لە ژێر کۆنترۆڵی ئەودا بێت ، تەنانەت لە زۆر ناوچە پێشمەرگەکانی دیموکرات وا فێر کرابوون هەرپێشمەرگە و مەفرەزەیەکی یەکێتی یا حسك و شیوعی ، تەنانەت هی کۆمەڵەی ئامۆزاش تووشیان ببوایە، دەبوایە پسووڵەی هاتوچۆی مۆرکرا و ئیمزاکراوی حزبی دیموکرات و ئیمزای ( د.قاسملۆی ) لەسەر بوایە ئینجا ڕێیان دەدا.
(د.وانێك لوی )جارێکیان من لە بۆکانەوە گەڕامەوە ناوزەنگ و بە ڕێکەوت پسووڵەی هاتوچۆکەم پێ نەبوو ، بەڵام لەگەڵ مەفرەزەیەکی خۆیاندا بووم لە نزیك سەردەشت تووشی نوقتەیەکی پشکنینی ئەوان بووین، داوای وەرەقەیان کرد. منیش ووتم :وەرەقەم پێنیە. بەڵام ئەم برادەرانە مەفرەزەی خۆتانن ، بەڵام بێ سوود بوو ، گیرفانەکانم گەڕام وەرە قەیەکی کۆنی خۆمانم پێ بوو، پیشانمدان. ووتیان: (وەرەقەکمان دەوێ مۆری وانێك لوی ) پێوە بێت. مەبەستیان (قاسملۆ) بوو . گێڕانەوەی ئەو نوکتەیە بۆ من بوو ، بەڵام من ئەم ڕووداوەم بۆ هەندێ برادەر گێڕایەوە لە (بۆکان) لە ماڵی (کاك سەلاحی موهتەدی) ئەمە گەیشتبۆوە بە حزبی دیموکرات و (د.عەبدولرەحمان قاسملۆ) نامەیەکی بۆ " مام جەلال " نوسیبوو ، گوایە " من " بە گاڵتەجاڕیەوە بە (د . قاسملۆم ووتوە، وانێك لۆ).

**٧-٢.هەیئەتی نمایندەگی خەڵکی کورد و قەتع نامەی( ٦ ) مادەیی یا( ٢٦ ) مادەیی.**

دوای ڕاگەیاندنی پەیامی ئیمام خومەینی بۆ خەڵکی کورد لە (١٩٧٩/١١/١٧) کە ناوەرۆکەکەی داوای خومەینی بۆ خەڵکی کورد بۆ ڕاگرتنی شەڕ و گرتنەبەری ڕێگای (مذاکرة) گفتوگۆ ، نەك ڕێگای شەڕ و چەك، و دانپێدانانی خومەینی بوو، بە زوڵم لێکراوی و چەوساوەیی خەڵکی کورد حزبە کوردیەکان بە تایبەتی حزبی دیموکرات و کۆمەڵەی ئامۆزا کەوتنە خۆیان بۆ قۆستنەوەی ئەو مبادەریەی خومەینی و پێکەوە ڕێکەوتن لەسەر پێکهێنانی دەستەیەك، کە نوێنەرایەتی هەمو لایەك بکات لە گفتوگۆدا و پاشان ڕێکەوتن لەسەر ئەو داخوازیانەی، کە کورد دەیەوێ، برادەرانی کۆمەڵەی ئامۆزا لە سەرەتاوە ڕایان وابوو ، کە بە تەنیا قطع نامەیەك بدەنە نوێنەرانی دەوڵەت . بەلاَم بە هەوڵی ئێمە و ڕوونکردنەوەی سوودەکانی کاری هاوبەشی قایل بوون . حزبی دیموکرات و کۆمەڵە و چریك و شێخ عزالدین وەفدێکیان پێکهێنا لە(٤) دیموکرات و(٢) کۆمەڵە و (٢) چریك بە سەرۆکایەتی (مامۆستا شێخ عزالدین ) و قسەکەر (سخن گو) ێکی حزبی دیموکرات .و قطع نامەیەکیشیان (پرۆژە) یەکی (٢٦) خاڵیشیان ئامادەکرد وەك سەرجەمی خواستەکانی کورد ، کە لە ٩٥./. ئەو(٢٦)مادەیە لە هەمان پرۆژەکەی شۆڕشی ئەیلول دەچوو، خاڵە هەرە گرنگەکانی پرۆژەکە:

١- دانی مافی نەتەوەی کورد لەسەر بنەمای ئۆتۆنۆمی (حوکمی زاتی - خودموختاریٚ).

٢- هەڵبژاردنی مجلس (شورای) خودموختاری لە هەموو شارەکانی کورد ، لەلایەن خەڵکی کورد خۆیەوە .

٣- لە کوردستاندا زمانی کوردی زمانی ڕەسمی بێ لە هەموو بوارێکدا.

٤- نوێنەرایەتی کورد لە تاران بەپێی ڕێژەی دانیشتوانی کوردستان بۆ ئێران بێ لە ئەنجومەنی شورای ئیسلامی و هەموو دامودەزگاکانی تری حکومەتی کۆماری ئیسلامی ئێراندا.

٥- سنووری کوردستان دیاری بکرێ.

٦–ئەنجومەنی شورای کوردستان (مجلس تشريعي–پەرلەمان) و حوکمی زاتی خۆیان هەبێ وزارە و ئەمانەی عامە و کۆمەڵێ خواستی تریش.
لەلایەن کۆماری ئیسلامیشەوە وەفدێکیان نارد بۆ گفتوگۆ لەگەڵ وەفدی کورددا ، بە ناوی (هەیئەت حسن نیەت) بەڵام پاش دانیشتن و دانوستاندێکی کورت و کەم تەمەن ئەم هەوڵەش سەری نەگرت و حکومەت خواستەکانی کوردی قبوڵ نەکرد و هەیئەتی حوسنی نیەت خۆیان چەند مافێکیان بە کورد ڕەوابینی و لە قطع نامەیەکی خۆیاندا لە کۆتایی مانگی (١٢/١٩٧٩) لە ئیزگەی تارانەوە بلاوکردە وە کە لەم خالانە پێکهاتبوو.
١– هەبوونی ڕۆژنامە و ڕادیۆ و تەلەفزیۆن بە کوردی بێت.
٢– لە هەموو دائیرە و قوتابخانەکاندا زمانی کوردی لەگەڵ زمانی فارسی بەکاربێ .
٣– هەر شارێکی کوردستان ئەنجومەنێکی شورای خۆی و جۆرێك لە خودمختاری یان ئۆتۆنۆمی هەرێمی هەبێ .
٤– پاراستنی ئاسایشی شارەکانی کوردستان بە دەزگای ئاسایشی ناوچەیی ناوخۆ بسپێردرێ ئەو قطع نامەیەی هەیئەتی حوستی نیەت بەناوی (تەرحی خودگەردانی خلقی کورد) لە تارانەوە لە ڕۆژنامەکاندا بلاوکرایەوە.
جارێکی تر هێزە کوردیەکان خۆیان کۆکردەوە و زەنگی شەڕ لێدرایەوە و کۆماری ئیسلامی کەوتەوە لەشکرکێشی و لە ماوەی چەند مانگێکدا دیسانەوە هەموو پێشمەرگە و بارەگای حزب و ڕێکخراوەکانی کردەوە بەو دیوی سنووری ئێران و عیراقدا.

## ٧-٣. گەڕانەوەم بۆ سەرکردایەتی و کۆبوونەوەی سەرکردایەتی.

دوای گەڕانەوەی (نەوشیروان) لە سوریاوە بۆ کوردستان لە دەوروبەری ناوەڕاستی مانگی (٢/١٩٨٠) بۆ سوود وەرگرتن لە ئەزموونە تاڵەکەی جیابوونەوەی بزووتنەوە و

دروستکردنی بزووتنەوە نوێیەکە و هاتنە دەرەوەی هاورێیانی کۆنی سەرکردایەتی کۆمەڵە و بەربوونیان لە زیندان بۆ پڕکردنەوە و قسەکردن لەم کەم و کوڕیانەی ، کە لەناو یەکێتیدا هەبوو. بڕیاردرا کۆبونەوەیەکی فراوانی سەرکردایەتی بکرێ، کە هەموو ئەندامانی سەرکردایەتی و کادرە پێشکەوتوەکانی بەشداری بکەن. من لە کۆتایی مانگی (٢/١٩٨٠) گەڕامەوە بۆ سەرکردایەتی و چوومەوە شێنێ تا دەستپێکردنی کۆبونەوەی کۆمیتەی سەرکردایەتی و کادرە پێشکەوتوەکان لە (١٩٨٠/٣/٢) . پێش کۆبونەوەکە ڕۆژێك کاك عومەر (هەڤاڵ کوێستانی) هات بۆ بارەگاکەمان، لە شێنێ و پاش دانیشتن و هەندێ ووتوویژ ووتی: (من بۆ ئەوە هاتووم پێتان بڵێم ئێوە سێ برا ، لە دەرەوەن و دوو خێزانیشتان بێ سەرپەرشت بەجێ هێشتووە، زیاتریش بەهۆی تۆوە هەردوو خیزان سەریان لێشێواوە هەر جارەی یەکێکیان ی ئەگرن یا باوکت یا دایکت یا ڕزگاری برات یا خێزانت، ئەمە غەدرێکی گەورەیە حەقە یەکێکتان یا دووانتان بڕۆنەوە و تەسلیمببنەوە). زۆرم لاسەیر بوو، عومەر ئەو پەیامەی پێگەیاندم، سەرەتا لەگەڵیا زۆر نەرم بووم ، داوام لێکرد، بزانم ئەم داوایەی هی کێیە؟ پاش هەندێ منجەمنج، درکاندی کە (سالار عەزیز) ڕای سپاردوە. منیش پڕ بەپێستی خۆی وەڵامم دایەوە و بە شەرمەزارییەکی زۆرەوە گەڕایەوە. کۆبونەوەی ئەمجارەی یەکێتی زۆری خایاند زیاتر لە (١٥) ڕۆژی خایاند ، زۆربەی ڕۆژەکانی کۆبوونەوە بە کێشە و موناقەشەکانی نێوان هاوڕێیانی زیندان و هاوڕێیانی کۆمیتەی هەرێمەکان و چۆنیەتی دابەشکردنی ئیش و کارەکان بەسەر دەبرا. " مام جەلال " ڕاپۆرتێکی دوور ودرێژی لەسەر یەکێتی خوێندەوە ، بریتی بوو، لە باسی دروستبوونی یەکێتی و چۆنیەتی ناردنی مەفرەزەکانی سەرەتایی لە سووریاوە و ڕووداوەکانی (پاڤێ و هەکاری) و کۆبونەوەی برادۆست و پاشان کۆبونەوەی مانگی (٢/١٩٧٩) و دوا بەشی پێشنیار و بۆچوونەکانی خۆی لەسەر جیابونەوەی بزووتنەوە و دروستکردنەوەی بزووتنەوە و پێکهێنانی خەتی گشتی و چۆنیەتی دامەزراندنی دەزگاکان (مەکتەبەکان) و ژمارەیان وجۆریان و شێوەی کارکردنی لەمەودوای یەکێتی، بە هەر سێ باڵەکەیەوە ( کۆمەڵە، بزووتنەوە، هێڵی

گشتی – خەتی گشتی) لە مەکتەب سیاسی و سەرکردایەتیەوە تا مەکتبەکان و هەرێم و لق و ناوچەکانی یەکێتی. نەخشەکەی مام جەلال گەوهەرەکەی بۆ بەهێزکردن و فراوانکردنی ڕێکخستنەکانی بزووتنەوە و خەتی گشتی بوو ، لە بەرامبەر کۆمەڵەدا ، چونکە تا ئەوکاتە لە ڕاستیدا هەر کۆمەڵە ڕێکخستنی پتەو فراوانی لە کوردستاندا هەبوو، چ لە دێهاتەکان و چ لە شارەکان. ڕێکخستنەکانی بزووتنەوە زۆربەی هەرەزۆری لەگەڵ ڕەسوڵ مامەند و ئەوان ڕۆیشتبوون خەتی گشتیش شتێکی زۆر نوێ بوو ، تەنیا لە کۆنەدۆست و ناسیاوەکانی مام جەلال خۆی پێکهاتبوون هیچ پەیڕەو وپڕۆگرام و بەرنامەیەکی تایبەت و داڕێژراویان نەبوو، (مام جەلال) تا ئەو ڕادەیە پشتگیری بزووتنەوە و خەتی گشتی دەکرد، کە هەر چەند مانگێك و خۆی بە سکرتێری یەکێکیان دەزانی. تا کار گەیشتە ئەوەی، کە هاوڕێیانی کۆمەڵە داوای خۆساغکردنەوەی (مام جەلال) بکەن، ئەگەر سکرتێری بزووتنەوە یان خەتی گشتیە، نابێ سکرتێری یەکێتیش بێت و پێویستە دەزگایەکی سکرتاریەت هەبێ ، کە لە هەر سێ سکرتێرەکە پێکهاتبێ ، و ئەگەر سکرتێری گشتیش بێ دەبێ ڕەچاوی گەورەیی بە قەبارەش و بە ناوەڕۆك و بە چەندایەتی و چۆنایەتی کۆمەڵە بکا ، هەم لە ڕووی ڕێکخراوەیی و هەم لە ڕووی ژمارەی پێشمەرگە و هەم لە ڕووی چالاکی زۆر و هەم لە ڕووی ڕۆشنبیریشەوە.

بەڵام" مام جەلال" گوێی نەدا ،بە داواکاریەکانی کۆمەڵە و بیروڕا سێ لایەنەکەی خۆی سەپاند:

- مەکتەب سیاسی پێکبێ لە (٦) کەس، دوانی کۆمەڵە و دوانی بزووتنەوە و دوانی خەتی گشتی.
- سەرکردایەتی پێکبێت لە (٢١) کەس ٧ کۆمەڵە ٧ بزووتنەوە ٧ خەتی گشتی.
- مەکتەبی عەسکەری پێکبێت لە (٣) کەس ١ کۆمەڵە ١ بزووتنەوە ١ خەتی گشتی.

- مەکتـەبی دارایـی پێکبێـت لـە (٣) کـەس ١ کۆمەڵـە ١ بزووتنـەوە ١ خـەتی گشتی.
- مەکتـەبی ئـیعلام پێکبێـت لـە (٣) کـەس ١ کۆمەڵـە ١ بزووتنـەوە ١ خـەتی گشتی.
- مەکتـەبی عیلاقـات پێکبێـت لـە (٣) کـەس ١ کۆمەڵـە ١ بزووتنـەوە١ خـەتی گشتی.
- مەکتەبی ڕێکخستن پێکبێت لـە (٣) کـەس ١ کۆمەڵـە ١ بزووتنـەوە١ خـەتی گشتی.
- لقەکان پێکدێت لە (٣) کەس ١ کۆمەڵە ١ بزووتنەوە ١ خەتی گشتی.
- هەرێمەکان پێکبێت لە (٣) کەس ١ کۆمەڵە ١ بزووتنەوە ١ خەتی گشتی.
- کەرتەکان پێکبێت لە (٣) کەس ١ کۆمەڵە ١ بزووتنەوە ١ خەتی گشتی.
- ناوچەکان پێکبێت لە (٣) کەس ١ کۆمەڵە ١ بزووتنەوە ١ خەتی گشتی.

**ئەو کۆبونەوە (١٥-١٦) ڕۆژیە ،هەردوو لایەنی باش و خراپی هەبوو:**

**لایەنە باشەکانی:**

**١-پێکهێنانی دەزگاکانی ڕێکخستن و دارایی و ڕاگەیاندن و پەیوەندیەکان.**

گەرچی لەپێشتردا هەندێ لەم دەزگایانە هەبوون.وەك عەسکەری و ڕاگەیاندن و ڕێکخستن. بەلأم بەهۆی جیابوونەوەی بزووتنەوە و دروستکردنی خەتی گشتی پێویستی بەوەوە گرت، کە لەو ئیفلیجیەی ڕزگار بکرێن لە ڕاستیدا هەر بەناو مەکتەبی عەسکەری و مەکتەبی ڕێکخستن هەبوو . ئەگینا مەکتەب عەسکەری مانای (مولازم عومەری) دەگەیاند و مەکتەب ڕاگەیاندنیش (فازیل کەریم) مەکتەب ڕێکخستنیش کە (سالار) بەرپرسی بو و، یەکێتی هیچ ڕێکخستنێکی ئەوتۆی نەبوو.

٢- زۆربەی زۆری کادر و پێشکەوتوەکان کە تا ئەوکات زۆربەیان بێ کاربوون خرانەگەڕ و لەو مەکتەب و لق و هەرێمانەدا ، دانران بە تایبەتی برادەرانی سجن.

٣- جۆرێك لە گوڕ وتین خرایەوە ناو دەزگاکان و لقەکان و هەرێمەکان.

٤- ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە چ لە شار و چ لە دەرەوە و ناو شۆڕش سەربەخۆیی خۆیان بە پارێزراوی هێشتەوە و ناوەندی کۆمەڵە سەرکردایەتی دەکردن . هەروەها بەهێزتر کران و پەیوەندی فراوانتر و بەهێزتر لەگەڵ سەرکردایەتی ڕێکخستنی شارەکاندا کرا.

**لایەنە خراپەکانی:**

١- ئەم سێ بەگایەتیە ناحەقیەکی زۆری تیا بەدی دەکرا، لە هاوکێشەیی نێوان هەر سێ باڵەکە .

بۆ نموونە لە مەیدانی کاری عەسکەریدا نە بزووتنەوە و نە خەتی گشتی هێندەی کۆمەڵە کەسانی شارەزا و بە توانا و لێهاتوویان نەبوو ، دەتوانم بە ڕاشکاوی بڵێم بە هەردوو باڵەکەی تر، بە ژمارەی پەنجە دەستیشیان شارەزا نەبوو ، کەچی

بەشـداریکردن و نوێنەرایـەتیان وەك کۆمەڵـە بـوو ، لـە مەکتـەب عەسـکەری و هەرێمەکان و کەرتەکانیش ، هەرواش لەسەر ئاستی مەکتەبـەکان و لقـەکان و لیژنـە ناوچەکانیش.

٢- ڕێخۆشکردن بۆ پێشێلکردنی سەرەتای کەسی شیاو بۆ شوێنی شیاو.

٣- دڵـسۆزی و شـارەزایی کرایـە قوربـانی ئینتیمـای ڕێکخراوەیـی و تەنانـەت تاقمگەریش.

٤- ووشەی کادر ومەرجەکانی کادر فەرامۆش کرا ، لە دابەشکردنی ئیش و کارەکاندا . بۆ نموونە خەتی گشتی یا بزووتنەوە دروستکراوەکە نوێ بوون ، هەرگیز لـە هـەموو ناوچەکان و لەسەر ئاستی هەموو لق و هەرێم و کەرت و لیژنـە ناوچـەکان ژمـارەی کـادران و تواناییـان وەك یـەك نـەبوو ، بـەڵام لەبـەر ئـەو سـێ بەگایەتیـە کەسـانی هەڵپەرست و تازە بابەت و بودەڵەوە بوونە ئەندامی ئەو دامو دەزگایانەی یەکێتی.

٥- سەرەتای دەست پاکی و دەم پاکی و دواوێن پـاکی پێشێلکراو، کرایـە قوربـانی خۆهەڵواسین بەم باڵ و بەو باڵ و بەم تاقم و بەو تاقم. بۆ نموونە کەسێك لە یەکێ لە باڵەکان بەتایبەتی لە کۆمەڵە بانگ بکرایە و محاسەبە بکرایە و لە کارەکـەی لا ببرایـە ، دەڕۆیشت دەبو بە بزووتنەوە یان خـەتی گشتی لەهـەمان کارەکـەی پێشووی وەك نوێنەری باڵەکەی تر دەمایەوە.

٦- ڕیزەکـانی یـەکێتی لایـەنی چـەندایەتیەکەی زۆر گەشـەی کـرد .لەسـەر حسابی چونایەتیەکەی، بە تایبەتی ئەو دوو باڵەی یەکێتی بۆ زۆربوونی ژمارەیان و ژمـارەی چەکداریان و هاوکێشەییان لەگەڵ کۆمەڵە هەمو جۆرە کەسێکیان قبـوڵ بوو،وەریـان دەگرتن.

٧- موونافەسەیەکی ناشەریفانە لەناو باڵەکانی یەکێتیدا دروستبوو ،بە تایبەت لـە نـاو دەزگاکان و لقەکان و کەرتەکان و لیژنە ناوچـەکان ، هـەر باڵـە خـەریکی ملشکاندنی باڵەکـەی تـر بـوو. هـەر ڕاپـۆرتی ناڕاسـت بـوو، بـەرەو سـکرتێری گـشتی ڕێـچکەی

بەستبوو ، کەسێ کەسێکی نەویستایە دەیان درۆیان بۆ هەڵدەبەست و دەیگەیاندە " مام جەلال "، مام جەلال خۆشی ئەو دیاردەیەی خولْقاند بوو ، ئەویش بۆ گرتنی جڵەوی هەموو(م . س) و سەرکردایەتی ودەزگاکان و لقەکان و هەرێمەکان و هەتا دەگاتە کەرت و لیژنەی و ناوچە و شانەکان و مەفرەزەکانیش بە دەست خۆیەوە.

## چەند ڕاستیەك هەن ڕەنگە جێی خۆی بێ لێرەدا بدرکێندرێن.

١- ئێمەی گەنجانی سەردەمی شۆڕشی ئەیلول و شەستەکان و حەفتاکان ، وامان دەزانی تەنیا پارتی دیموکراتی کوردستان مەرکەزیەتەکەی زاڵە بەسەر دیموکرات و سەرکردایەتی بە کۆمەڵدا و لە ناو ئەو مەرکەزیەتەشدا بڕیار و دەسەلاّتی بوون و نەبوون بە دەست بارزانی بوو. بەلاّم بە ئەزموون بۆمان دەرکەوت، لەناو هەموو حزبەکانی عیراقی و کوردستانی هەر چوار پارچەکەی کوردستانیش سەرۆك و سکرتێر هەر هەمان بارزانین بە ناسیۆنالیست و ئەنتەر ناسیۆنالیستەکانیەوە بە خێڵەکی و پێشکەوتوخوازەکانیەوە ، بەبێ ئاگا و شارەزاکانیەوە.

٢- تەنها ڕێکخراوێك کە بتوانم گەواهی ئەوەی بۆ بدەم ، کە کاری بە کۆمەڵی سەرکردایەتی نەبوونی تاك دەسەلاّتی و دیکتاتۆری و خۆداسەپاندن تەنیا کۆمەڵە بوو، ئەویش تا شەهیدبوونی (شەهید شەهاب).لەدوای شەهیدبوونی شەهید شەهابەوە هەر لە خۆداسەپاندنی ئارام لە کۆمیتەی هەرێمەکان تا خۆداسەپاندنی (نەوشیروان لەپاش شەهید ئارام) بە سکرتێری بەزۆر داسەپاو بە سکرتێری هەڵبژێردراویەوە، بە ئەندامی سەرکردایەتی سەپێنرا و بە ئەندامی سەرکردایەتی بە ناو هەڵبژێردراویەوە و شوێنەکانیان لەسەر تاپۆ کراو. سکرتێر خاوەنی بڕیاری بێ چەند و چون بوو ، تا کوشتنی کۆمەڵە و حەلکردنی هەر بە یەك چەقەنەی سکرتێرەکەی.

٣- لەڕاستیدا من هەر لەساڵی (١٩٧٨) وه بۆم دەرکەوت، کە یەکێك لە خەسڵەتە هەرە خراپەکانی کەسایەتی ڕۆژهەلاتی و ئاسیایی بچووك، بریتیە لە ئارەزووی خۆداسەپاندن، هەر کاتێ بۆی بلوێ، ڕەنگە ئەویش پەیوەندی بە بنەما ئابووریەکەمانەوە هەبێ کە کاری کردۆتە سەر کلتور و هوشیاریشمان لەو کاتەوە بۆم دەرکەوت ، کە کەسێ ئامادە بێ لەسەر نانێك یان تەماتەیەك، یا پلە گۆشتێك یا خەیمەیەك یا چەکێك بیکات بە شەڕ و فەرتەنە و بەکارهێنانی دەسەلاتەکەی بۆ دەستخستنی، دەبێ لەکاتی هەبوونی و حوکمڕانی و سامانی وولات کەوتنە ژێردەستی هەڵوێستی چۆن بێ و دەسەلات و سوپا و چەك و هێز ومەسئولیەتەکەی چۆن بەکاربێنێ.

٤- گەر سەرنجێکی ووردی سیاسەت و حوکمڕانی لە ڕۆژهەلات و ئاسیا بدەین، جگە لە یابان ،دەبینین هەر لە بیست و سیەکانەوە هەتا ئێستاش بە شیوعی و قەومیەوە بە ئیشتراکی ودیموکراتییەوە، بە مەلەکی و کۆمارییەوە، تاقم و کۆمەڵ و حزب و حوکم بە دەست بە درێژایی یەك سەدە ئامادەی ئاڵوگۆڕی حوکمڕانی و سەرکردایەتی نەبوون . هەر هەموویان بە ئینقلاب یان بە شۆڕش یان بە شەڕ لەسەر حوکم و دەسەلات لابراون یان بە دەردی خوا مردوون، دوای مردنشیان بڕا یان کوڕ یان یەکێك لە بنەماڵەکەی خۆیانی ئامادەکردووە بۆ گرتنەوەی جێگاکەی.

٥- مام جەلالیش بە ڕای من بەدەر نەبوو، لەو ئەڵقە ڕۆژهەلاتی و ئاسیاییە، بەتایبەتی ،کە سەرکردایەتیەکەی بێ توانای فیکری و بێ ڕابوردووی سیاسی زۆر و بێ ئەزموونی ڕابەرایەتی و سەرکردایەتی کردن بوون. بە پێی ئەو بڕیاری سی فلیقانەیە، منیش وەك نوێنەری کۆمەڵە لە دەزگای دارایی دانرام ،کە لە (٣)کەس پێکهاتبوو لە (عەلی عەوێز ئەندامی (م.س) و ئەندامی بزووتنەوە لێپرسراو بوو، میرانی (فوئاد مەستی) نوێنەری خەتی گشتی ئەندام بوو، بەندەش .

بە پێی بڕیارەکانی کۆبونەوەکە (م.س) لە (٦ ئەندام) پێك هاتبو (٢ لە کۆمەڵە) دیسان ( فازیل و سالار) دانراوە، (٢ لە بزووتنەوە. عەلی عەوێز و جەمال ئاغا) دانران،

که هەردووکیان تازە هاتبونە ناو شۆڕش دوای جیابونەوەی بزووتنەوە بە نامەی "مام جەلال" هاتنەدەرێ و کران بە سەرکردایەتی بزووتنەوە داتاشراوەکە.*

ئەندامی (م.س)، دوانیش لە خەتی گشتی" کە عومەر شێخ موس و. د.کەمال خۆشناو " بوون دوو کەسایەتی هەم سیاسی و هەم بە شەخسیەت هەر دووکیشیان بە نهێنی سەر بە کۆمەڵە بوون.**

ئەوکاتە مەکتەبی دارایی داهاتێکی زۆر کەمی هەبوو، کە سەرچاوە بەهێزەکەی ئەو پارەیە بوو، کە لە دەرەوە دەهات لەگەڵ پارەی ئەو گومرگانەی ئەوکات لە بێدەلان و قاسمەڕەش وەردەگیران. مانگی (٥/١٩٨٠) کاك شازاد هاتبوە تاران و پارەی هێنابوو، من چووم بۆ تاران، ئەو کاتە"د. فوئاد مەعسوم" لە تاران بوو، د.فوئادیش پاش ئەوەی دۆلارەکانی کرد بە تمەن دای بە من (کاك شازاد) بە منی ووت: چەند دۆلاری هێناوە و بە چەندیش گۆڕدراوەتەوە؟. بەڵام ئەو پارەیە دەرنەچو، کە دکتور دابووی بە من، کە گەڕامەوە بە مام جەلالم، ووت : لە باتی ئەوی لەوکاتە بێ توانایی دارایی و بێ سەرچاوەییەدا، لەو پارە دیار نەبووە بکۆڵێتەوە، بە پێچەوانەوە ڕووی خۆی لە من گرژ کرد و هیچ وەڵامێکی نەدامەوە و دوای گەیشتنەوەی من بە ناوزەنگ مام جەلالیش سەفەری کرد.

---

* بۆ یەکەمجار کە منیش لە شارەوە چوومە ناو شۆڕش و لە قەندیل چاوم بە (مام جەلال) کەوت پێی ووتم: ( هێشتا خۆت نە ناساندووە بە برادەرانی کۆمەڵە).

ووتم : بۆ ؟.

ووتی: دەمەوێ خۆت بە کۆمەڵە نە ناسێنی ، بەڵکو خۆت بە خەتی گشتی بناسێنی تا وەك نوێنەری خەتی گشتی ئەندامی سەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسی بی).

ووتم : من کۆمەڵەم و کاریش بۆ کۆمەڵە دەکەم . دیار بوو (مام جەلال ) ئەو وەڵامەی پێی ناخۆش بوو.

** د.عومەر شێموس کە رەفتاری هەندێ لە ئەندامانی سەرکردایەتی بینی بوو بە هێڵ گشتی ود کەمال خۆشناو لە کۆنفرانسی یەکی کۆمەڵەش خۆی بە کۆمەڵە ئاشکرا کرد و بووە ئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵە.

( یەکێك چاوپۆشی لە پەیمان شکاندن بکا ، خۆشی پەیمان شکێنە ).

مام جەلال ڕۆیشتبوو بۆ تاران، تا لەوێوە بڕوا بۆ سوریا بەو هیوایەی بتوانێ لەگەڵ سەرانی کۆماری ئیسلامی ڕێکبکەوێ لەسەر ڕێگەدان بە ناردنی ئەو چەکانەی کە (لیبیا و سوریا) بەناوی ڕێکخراوە فەلەستینیەکانەوە دەیان داینێ. سەفەرەکەی مام جەلال بە حساب بۆ یەك -- دوو مانگ بوو، بەلأم دوای چوونی بۆ سوریا، ئێران تا یەك ساڵ ڕێگەی نەدا، بە ئێراندا بگەڕێتەوە، لەو ماوەیە پارتی بارزانی(٣ برادەری) ئێمەیان گرتبوو ، کە هەر سێکیان کۆمەڵە بوون و چوو بوون بۆ ئێران و لە خانی لای پارتی گیرابوون . (نەوشیروان) داوای لە حزبی شیوعی کر د بکەونە بەینەوە بۆ گۆڕینەوەیان بە١٥ چەکداری پارتی کە پێشمەرگەکانی باڵەك لە باتی ئەو سێ کەسە گرتبویانن. حزبی شیوعی کەوتە بەینەوە بڕیاردرا، هەردوولا گیراوەکان بدەن بە شیوعیەکان و ئەوان بیانگۆڕنەوە. بەلأم شیوعیەکان پارتیە گیراوەکانیان دایەوە بە پارتی، پارتی گیراوەکانی یەکێتی نەدایەوە بە شیوعیەکان، شیوعیەکانیش چاویان نوقاند و ئەو سوکایەتیەیان قبوڵکرد.

## بۆردومانی سەرکردایەتی و دەرپەڕینەکەی بنێوخەڵەف.

مەکتەبی دارایی و مەکتەبی عەسکەری لە دووخەیمەدا بوون ، لە نزیك یەکەوە لەناو دارگوێزەکانی توژەڵەدا لەسەر جۆگەلەی پەناگرد و تەم تەمیکا ، من چووم بۆ لای (خاڵە سەید مەجید) کە لە مەکتەبی عەسکەری بوو ، (میرانی فوئاد مەستی)ش، لە خەیمەکەی خۆماندا بوو پێش نیوەڕۆی ڕۆژی (١٩٨٠/٧/٨) بوو ، لە پڕ گرمەی تەیارە و گرمەی چەند بۆمبێك هات،(خاڵە سەید مەجید)خۆی هەڵدایە ناو جۆگا وخۆی خستە ناو کەندەکەوە ، من هەر لەناو خەیمەکەدا ڕاکشام و مامەوە، خاڵە سەید مەجید هاواری کرد : وەرنەلام؟ (میرانیش) خۆی گەیاندە لای لە پڕ چەند تەیارەیەکی تر دەستیان کرد بە تەقە بە ناوچەم و دارگوێز و خانوە دیارەکاندا

،پاش چەند دەقیقەیەك دەنگی تەیارەكان نەما و خاڵە سەید مەجید هاواری كرد: بریندارم؟ كە چووم خۆی و میرانیش بریندار بوون. بەلام برینیان سووك بوو،لەو بەرمانەوە گوێم لە دەنگ و هاوار بوو ، بەرەو ڕوویان چووم هاوڕێ (حەمە سەعید) بریندار بوو ، بەلام سەخت هەموو دەموچاوی خوێن بوو ، هاوڕێ (جەباریش) بریندار بوو،پەلامارم دان ، هاوڕێ حەمە سەعید ئەیتوانی بڕوا ، بەلام هاوڕێ (جەبار) نەیئەتوانی ، چوومە بن باڵی و لەگەڵ حەمە سەعیددا چووینە خەیمە سەفەریەكەی خەستەخانەكە ، پێشڕەوی سەید برایم، بینیم بە پشتا كەوتبوو، ووتیان: بریندارە، بەلام سەیرم كرد ، بریندار نەبوو، بەڵكو (تاسا بوو).لەو قەسفەدا دەزگای ڕاگەیاندن هەمووی ڕووخا و سووتا ٦ بریندار و شەهیدێكیشان هەبوو، شەهیدەكە ناوی (بورهان) بوو.* لە سكرتاریەتی مام جەلالیش پێشمەرگەیەك شەهیدبوو، ناوی ( مامۆستا محەمەد) بوو، خەڵكی كۆیە بوو. ئەو ڕۆژی بۆردومانە( كاوەی شێخ لەتیف) هاتبوو بۆ سەركردایەتی بە مەفرەزەكەیەوە لەگەڵ بۆردومانە، كە گەیشتبونە(بنی خلف).لەگەڵ بریندارەكان (میران و سەید مجید و حەمەسەعید و پێشڕەو چەند بریندارێكی تریش بووم چووینە (بنێوخەلەف) لە مزگەوتەكە دامانان تا وولاخیان بۆ بگیرێ ببرین بۆ شاری سەردەشت. ئەو ڕۆژە وێنەگرێكی تەلەفزیۆنی فەرەنسی پێش بۆردومانەكە ڕەسمێكی زۆری ناوزەنگ و بازاڕی قاچاخچیەكان و بارەگاكانی یەكێتی گرتبوو پێش بۆردومانەكە، لەكاتی بۆردومانەكەش نەترسا بوو هەر ڕەسمی گرتبوو. ڕەسمی خانو و كەپری ڕووخاو و سوتاوی دوای بۆردمانەكەشی گرت، ئەویش دوای نیوەڕۆ هاتە مزگەوتەكەی (بنێوخلف)، لەوێ خەریكی تاقیكردنەوەی فلیمەكەی بوو، دەنگی تەیارە تەسجیل كراوەكان هات،(كاوەی شێخ لەتیف و چەند پێشمەرگەیەك وایان زانی فڕۆكەكانن هاتونەتەوە بە پەلە و بە ڕاكردن لە مزگەوتەكە چوونە دەرێ،

---

* لە دەزگای ڕاگەیاندن زۆر بە وورەو قارەمانانە هاورێیانی دەزگاكە جوامێریان نواند لە یارمەتیدانی بریندارەكان و ڕزگاركردنی هەندێ لە دیكۆمێنتەكان بە تایبەتی شەهاب عوسمان.

پێشڕەویش،کە تا ئەوکات هەر تاساو و بێتاقەت بوو. لە پڕ ڕاپەڕی و دەرپەڕیە دەرێ ، دوای دوو — سێ ڕۆژ کەسوکاری (مامۆستا محەمەد و بورهانی شێخ مستەفا) هاتن و تەرمەکانیان بردنەوە.

### ٧-٤. بەربوونی شوکری هاوسەرم و هێنانە دەرەوەی.

لەناوەڕاستی مانگی (٦/١٩٧٩) دا، کە من لە قەرەداغ و گەرمیان بووم، دائیرەی ئەمن شوکری هاوسەرمیان گرت ، جگە لەوەی هەوڵێکی زۆریاندا بوو، کە هاوڕێ و ناسیاوەکانی منیان پێ بڵێ، هەوڵیاندا بوو، شوێنی خۆشاردنەوەی دایکم و خوشکەکانم و ڕزگاری براشمیان پێ بڵێ، بەلآم بێسوود ببوو. هەر لە سەرەتای ساڵی (١٩٧٨)وە، کە من هێشتا لە سلێمانی بووم، لە ڕانیە باوکمیان لەسەر شەهیدان (خەلیل و هاوار) گرت و دایکم و خوشکەکانم و ڕزگاری برام بەهۆی ماڵی (شێخ مستەفای شێخ بایزی باقلان) دەرباز بوون،و لە سلێمانی لە ماڵی هاوڕێییەکی گەنجیم و ئەندامێکی کۆمەڵەدا کە ناوی وەستا ئیبراهیم مەجیدە و بە برایمی گوڵبەهار ناسرا بوو، شاردرانەوە. وەستا برایم لە شەستەکاندا ئەندامێکی چالاکی حزبی شیوعی بوو،پێشمەرگەیەکی ئازای شۆڕشی ئەیلولیش بوو، لە ساڵی (١٩٧٢) پەیوەندیم پێوە کرد، تاکو بیکەمە کۆمەڵە،بوو بە ئەندامی کۆمەڵە، وەستا برایم جگە لەوەی کە کرێکارێکی بە بیروباوەڕ و پێشمەرگەیەکی زۆر ئازا بوو، ئەندامێکی زۆر چالاك وخۆ نەویست بوو، وەستا برایم خاوەنی دوو برای شەهید بوو، یەکیان ئیسماعیل کە لە(١٩٦٣) لەبەر حەوزە ووشکەکە ئینزباتە عەسکەریە دڕەکەی کوشت و ئەوی تریشیان (عومەر لە شەڕەکەی ساڵی ١٩٧٤لە بۆردومانکەی زانکۆی سلێمانی لە شارۆچکەی قەلآدزە بەر بۆردوومان کەوت، وەستا برایم، جگە لە بەخێوکردنی مناڵەکانی خۆی ، خێزانی شەهید ئیسماعیل و کچێك و کوڕێکی شەهید و خێزان و دوو کوڕی شەهید "عومەر"ی براشی بەخێوکردن و پێی گەیاندن .

لەگەڵ عەفوە عامەکەی سەدام حسێن بەبۆنەی بوونی بەسەرۆك کۆمار لەمانگی ١٩٧٩/٨ باوکم و شوکری هاوسەرم بەر بوون. شوکری هاتە دەرەوە، بۆلام لە ناوزەنگ، لەو کاتەشدا (عەلی بچکۆل) یش ڕووناکی خواستبوو، سەبیحەی جەبار فرمانیش هاتبووە دەرێ،من و عەلی بچکۆل و جەبار فرمان لە زەلێ لە دامێنی شاخی مامەندە (٣ ژووری) بەیەکەوە وەك فارغۆنی شەمەندەفەرمان دروستکرد لەگەڵ یەك هەیوان. ئەو ماوەیە واتە ساڵی (١٩٨٠) لە شێنێ و قولەهەرمێ و زەڵی و ناوزەنگ و توژەڵە، چەندین خانو و بارەگا و خەستەخانە و زیندان و هۆڵی کۆبونەوەی تیا دروستکرا. هێندەی نیمچە شارێکی لێهاتبوو، بەهۆی شەڕی ئێران – عیراق مەترسی هێرشی عیراقی کەم بوو. شوکری و سەبیحە تا مانگی (١٩٨١/٢) مانەوە ، دوای ئەوە بە دزیەوە گەڕانەوە سلێمانی و هەولێر لەبەر قوتابخانەی منداڵەکان.

## ٧-٥. شەڕی ئێران و عیراق.

ئێران و عیراق لەکۆنەوە کێشەی سنوریان هەبووە، بەشێکی ئەو کێشانە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی شەڕی نێوان ئیمپراتۆریەتی سەفەوی ئێرانی و ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، هەر چەند ساڵێك وپەیمانی سنوریان مۆر کردووە، یەکێك لەو پەیماننامە ، ئەوەی جەزائیر بوو ، کە بەعسیەکان تەنها بۆ خۆ تەرخانکردن بۆ شۆڕشی کورد و پچڕانی ئەو پەتی پەیوەندیەی نێوان (مەلا مستەفا و ئێران) دەستی لە بەشێکی زۆری ئاوی ( شط العرب )ی سنوری هەڵگرت. ئەمە جگە لە دەستهەڵگرتن لە هەندێ ناوچەی سنووری ئێران و عیراق لە کوردستانەوە. زۆرمان لەسەر پەیمانی جەزائیر لە کتێبی (شۆڕشی ئەیلول)دا باسکردووە. دوای ڕووخانی ڕژێمی شای ئێران و سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی . سەدام بە هەلی زانی ، کە لە پەیمانی جەزائیر پەشیمان بێتەوە و پاشگەزبێتەوە لەبەر ئەم هۆیانە:

١- به ڕووخانی " شا" هەموو دامودەزگایەکانی ساواك و ئەرتەش(سوپا)ی ئێرانی ڕووخان ، و مەلاکان کەوتنە بژارکردنی سوپا لە گەورە ئەفسەرەکانی سەر بە حوکمی شایەتی ، بەمەش ئێران هێزێکی سوپایی بە دیسپلینی ئەوتۆی نەما ، شەڕی پێ بکا.

٢- شۆڕشی ئیسلامی ئێران، بوو بە سەرەتای سەرهەڵدانی لافاوی مدی ئیسلامی و شیعەگەرایی، ئەم ڕووداوە بۆ عیراق بوو، بە جێگەی مەترسی چونکە:

ا- دوو لەسەر سێی عەرەبی عیراق شیعە بوون، بە درێژایی (٦٠ساڵ) لەلایەن دەسەڵاتداری عەرەبی سوننە مەزهەبەوە دەچەوسێنرانەوە، بە تایبەتی لە ژێر دەسەڵاتی حوکمی بەعسیەکاندا، عیراق دەترسا، ئەو پەتایە زوو لە عیراقدا بڵاوبێتەوە.

ب- ئیمام خومەینی رابەر و سەرکردەی ڕوحی شۆڕشەکە،لەلایەن حکومەتی بەعسیەوە ئەزیەت درا بوو. لەسەر داوای "شا" و بەپێی پەیمانی جەزائیر لە شاری نەجەف دەرکرا بۆ فەرەنسا.سەدام زۆری لێ ئەترسا شەڕ بخاتە ناو عیراقەوە، واتە شەڕی نێوان شیعە و ڕژێمی بەعس و سەدام ڕووبدات.

٣- ترسی تەشەنەکردنی مدی ئیسلامی یا ئیسلامیزم بەهۆی شۆڕشی ئێرانەوە، سەرجەم وولاتانی ئەورووپا و ڕۆژئاوا و ئەمریکاشی بێ تاقەت کردبوو. بۆیە ئەوانیش هانی سەدامیاندا ، کە شەڕ بخاتە ناو ئێرانەوە و بەری ئەو لافاوە بگرێ.

٤- بۆ سڕینەوەی ئەو شورەیی و نەنگیەی ، کە بەهۆی دەست هەڵگرتنی لە خاك و ئاوی (عەرەب) لە پەیمانی جەزائیردا هاتبووە سەری ، تووشی نەخۆشی دەروونی کردبوو ، بەرامبەر سەرانی عەرەب.

٥- تەماع و چاوتێبڕینی نەوتی (ئەبادان) و بیرە نەوتیە سنوریەکانی نزیك بە (بەسرە و عەممارە)لە خواروو کرماشانیش لە ژووروە. ئەمانە هەمووی وای لە سەدام کرد، کە پەلە بکا لە بردنی شەڕ بۆ ناومالّی دوژمن بەر لە بە خۆداهاتنەوە و خۆبەهێزکردنی

و سـەقامگیربوونی ئێـران .بۆیـە لـە رۆژی (١٩٨٠/٩/١٧) پەیماننامەکـەی جـەزائیری هەڵوەشـاندەوە، لــە ڕادیــۆ و تەلــەفزیۆن و ڕۆژنامــەدا بــڵاوی کــردەوە. لــە رۆژی (١٩٨٠/٩/٢٢) دا دەستپێکردنی شەڕی ڕاگەیاند، بـە نـاردنی پـتر لـە(١٥٠) فڕۆکـەی شەڕکەر. لەو شەڕە، عیراق پشتی بە چەند سەرچاوەیەك قایم کردبوو، دەوڵـەتانی کەنداوی عەرەبی لە دروشمەکەی کۆماری ئیسلامی (تـصدیر الثـورة) تـۆقی بـوون و خاوەنی ئەو هێز و دەسەلاتەش نەبوون خۆیانی لێ بپارێزن ، بۆ دوورخستنەوەی ئـەو بەڵایە لە خۆیان بەپارە پشتیوانیان لە سەدام دەکرد.

ئەمریکا بۆ ئەوەی بەر بە لافاوی شۆڕشی ئێـران بگـرێ، هاوکاریـەکی زۆری سـیخوڕی عیراقی دەکرد و هەموو زانیاریەکی لەسەر شوێن و موڵگا و نەخشەی هێزی چەکداری ئێرانی دەدا بە عیراق.جگە لەوەش کە عیراق چاوچنۆکانە چاوی بڕی بووە (ئەبادان و خورەم شەهر) و بە حسابی خـۆی ئێـران بەرگـەی شـەڕێکی درێژخایـەن نـاگرێ و بـە چەند هێرشێکی کتوپڕ چەند شارێك لە ئێـران داگـیر دەکـا و ئێـران ناچـاری گفتوگـۆ دەکات . وەك چۆن ئیسرائیل جـولان و کـەرتی غـەزە و سـینای داگیرکـرد ئـەمیش ئەو دوو بەنداوە گرنگە بە پیتە داگـیر دەکـا . سـەدام شـەڕەکەی نـاو نـا ( قادسـیەی سەدام) و شەڕی ئیسلامی و (فرسی مجوس)، بە ناوی ئەو شەڕەی ، کە کاتێ خۆی لە شەڕە داگیرکاریەکانی ئیسلام و عەرەبدا بۆ سەر ئێران و ئیسلام کـرد یـان ڕویـدا ، کەپێی ووترا (معرکە قادسیە).

هەر لە یەکەم ڕۆژی سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی و دامەزراندنی کۆمـاری ئیـسلامی ئێرانـی ، حکومــەتی سـوریا پـشتیوانی خـۆی ڕاگەیانـد و حزبـی ئەمـەلی لوبنـانیش تبعیەتی خۆی بۆ ئیمام ڕاگەیاند ، ئەم کارە بـوو ، بـە هـۆی بێـزاری سـەدام و بڕیاری ڕاگرتنی بۆری نەوتی عـیراق سـوریای دەرکـرد ، لـەو کاتانـەدا نەوشـیروان جێگری مام جـەلال بـوو ، دەیەویـست لـە نـەبوونی مـام جەلالـدا هەنـدێ نەخـشەی

داڕێژێ ، تاکو جێ دەستی دیار بێ ، بەتایبەتی هەموو هۆکارە بابەتیەکان زۆر لەبار بوون بەهۆی شەڕی ئێران عیراقەوە .

١- زۆربەی ئەو ڕەبایە سەربازیانەی حکومەت پاش ئاشبەتاڵ و ڕێکەوتنەکەی جەزائیر لەسەر سنورەکانی نێوان ئێران و عیراق و لەسەر شاخ و گردەکانی قولایش بلاوی کردبوونەوە،کۆی کردنەوە و ناردنی بۆ بەرەکانی شەڕ، بەمەش زەمینەیەکی لەبار ڕەخسا بۆ هاتوچۆو و جەولەی پێشمەرگە بە ناوچەکانی سنووری ئەودیوی عیراقدا و بەسەر ڕاگەیشتنی ناوچە دوورەکانیش وەك شارباژێر و شارەزوور و دەشتی هەولێر و گەرمیان.

٢- کەمبوونی مەترسی پەلاماری هێزەکانی ڕژێم بە هۆی شەڕەوە، وورەی خەڵکی بەرزترکردەوە بۆ چوونە ناو ڕیزی پێشمەرگە و گەورەبونی قەبارەکەی.

٣- گۆڕینی بیروڕای ئێران لە سەرمان، کە بەهۆی یارمەتی و هاوکاری حزبی دیموکرات و کۆمەڵەوە بیروڕایان لەسەر یەکێتی و بە تایبەتیش لەسەر کۆمەڵە بە فیتی پارتی و حسك زۆر خراپ بوو، بەلام بە فراوانبوونی شەڕەکەی ئێران - عیراق و درێژە کێشان، ناچاربوون پێویستیان بە نەیارەکانی عیراق هەبێ بۆ بە گژداکردنی سوپای عیراقی.

٤- برینی بۆری نەوتی عیراق - سوریا، سوریای زیاتر هاندا، کە هەوڵی یەکپێگرتنی هێزە نەیارەکانی کورد و عیراقی بدات و هاوکاری پتر لە جارانیشیان پێشکەش بکات، هەر بۆیەش لەو چوونەی" مام جەلال " بۆ سوریا و مانەوەی، بووە هۆی لە دایکبوونی بەرەیەکی عیراقی و لەسەر داوای سوریاش شۆڕشی کوردستان ناوبنری شۆڕشی عیراقی لە کوردستانەوە هەڵگیرساو، بەرەکەش بە ناوی(جوقد) بەرەی نیشتمانی ونەتەوەیی ودیموکرات بوو.

بۆیە نەوشیروان زنجیرەیەك کۆبونەوەی یەك لە دوای یەکی دەکرد . زۆرجار کادرە پێشکەوتوەکانیشی بۆ کۆبونەوەکان بانگ دەکرد. دواتر بڕیاردرا :

١- هەوڵی گەشەکردن و فراوانکردنی شۆڕشەکە بدرێ.

٢- چەند ناوچەیەك ئازاد بکرێ و شێوەی شەڕ بگۆڕدرێ.

٣-هێرش و پەلاماری زۆر بکرێتە سەر دوژمن، لە بەرەکانی سەر ڕێگای هاتوچۆی پێشمەرگەو دەوروبەری ئۆردوگا زۆرەملێیەکان.

٤- ڕێکخستنەکانی ناو شارەکان ئاگادار بکرێن، کە هەموو بۆنە(مناسبات) کان، بەکاربێنین بۆ ڕاپەڕین و خۆپیشاندان و فشارخستنە سەر ڕژێم.

٥- ئەمەیان کە لە هەموویان گرنگتر بوو، یەکێتی دەست پێشکەری بکات، لە دانیشتن لەگەڵ حزبی شیوعی و حسك تەنانەت پارتیش، ئەگەر شیوعیەکان ناوبژی کردنەکە بگرنە ئەستۆ، بۆ ئەوەی شەڕی یەکتری نەکەن و ئەم هەلەی شەڕی ئێران و عیراق لە دەست نەدەن و بە هەموویان بکەونە لێدانی دوژمن و ڕژێمی سەدام.

## شەڕ فرۆشتنەکانی پارتی لە دۆڵەتوو قەلاتووکان.

پێشمەرگە دڵخۆش و بە هیوای دەست وەشاندن لە دوژمن بوو، هەر ڕەبایە بوو، چۆڵدەکرا و حکومەت بەشێکی زۆری سوپاکەی لە کوردستان دەکێشایەوە، وورده وورده خەڵکی دەگەڕانەوە دێهاتە چۆڵکراوەکان. لەبەر نەبوونی ڕەبایە،پێشمەرگە بە ئازادی کەوتەوە جووڵە لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی یەکێتی لە گەرمیان و شارەزورو دەشتی هەولێر و کۆیە و شارباژێڕ و بازیان و باڵەکایەتی و خۆشناوەتی، هەڵسانی کۆپتەر زۆرکەم بوو، کە بە ڕاستی کۆپتەر یەکێك لە هۆکارە هەرە بە هێزەکانی ڕژێم بوو، بۆ لێدانی پێشمەرگە. لە پڕ لەناو بارەگاکانی سەرکردایەتی مقۆمقۆی دوو هەواڵی سەیر بڵاوبۆوە، یەکیان: هاتنی نامەیەك لە (شێخ محمد شێخ عبدالکریمەوە) کەحکومەت ڕای سپارد بوو، بۆ خۆشکردنی زەمینەی گفتوگۆ لەگەڵ ڕژێم دا، بەلام"نەوشیروان" وای زانی بوو، لە شەڕی ئێران و عیراقدا هەردوولا یەکتری ئەبڕێننەوە و لاواز ئەکەن ،پێویست بە گفتوگۆ ناکات، بەخراپی جوابی دابوو، وەك دەرکردن وابوو.

هـەواڵی دووهـەم: لـە شکرکێـشی پـارتی بـۆ سـەر یـەکێتی، ماوەیـەك بوو،پـارتی کەوتبوونە هێرش و پەلاماری ئیعلامی و بلاوکردنـەوەی ووتـاری بـێ پێـز و ناشـرین و قسەی سوك و سەلیم.گەیشتنی ئـەو هەواڵـەمان زۆر لاسـەیر بـوو، لەلایـەك حکومـەت داوای گفتو گۆ بکـات و هـەر لـە هەمانکاتیـشدا پـارتی هێـرش بکاتـە سـەرمان. ئـەم هەواڵەیان ڕاست دەرچوو، هێزی چەکداری پارتی قەلاتوکانیان گرت و پێشمەرگەیەکی زۆریـشیان لــە ئێرانــەوە هێنــا بــووە گــۆیزی ودۆڵــەتوو و دۆڵــە کوگــە. لــە ڕۆژی(٣/١٠/١٩٨٠) پێشمەرگەکانی خۆمان لـە قەڵاتووکانـەوە هاتنـە سـەرکردایەتی و هەواڵی گرتنی قەڵاتووکانیان گەیاند .

**لەشکر کێشیەکەی پارتی لەو کاتەدا بە ڕای من دەگەڕایەوە بۆ چەند هۆیەك.**

١- شەڕی ئێران وعیراق دەستی پێکردبوو، پارتیش نانخۆری ئێـران بـوون ، شـوێنی حەوانەوە و چەك و ئازوقە و موچەیان بە دەست ئێران بوو، وەك بەشـێکی چـەکداری ژێردەسەڵاتی سوپای پاسداران سەیریان دەکردن وناویان لێنابوون (ئەفرادی بارزانی) هەر کـوردێکی عیراقـی لـە ئێرانـدا، گـەر هەویـەی أفـرادی بـارزانی پـێ نەبوایـە، ڕێـی هاتوچـۆیان نـەدەدا لـە ئێرانـدا تەنانـەت شـیوعیەکان و حـسکیش هـەر بـە هەویـەی ئەفرادی بارزانی لە ئێراندا هاتوچۆیان دەکرد و دەحەوانەوە . کۆماری ئیسلامی تینی بۆ هێنابوون، کە دەبێ بگەڕێنەوە عیراق و شەڕی حکومـەتی عـیراق بکـەن، ئـەوانیش دەیانویست لە پەنای ئەو بیانوەدا بە چەك و ئازووقە و پارەی ئێرانیش هێرش بکەنـە سەر یەکێتی و لە ناوچەکانی یەکێتییەوە ڕێگای چوونە ناو عیراق بکەنەوە.

٢- پێ دەچوو(شێخ محمدی شێخ عبدالکریم) چۆن نامەی بۆئێمە نـاردبوو، هـەرواش نامەیان بۆپارتی ناردبێت بۆ ڕێخۆشکردن بۆ گفتوگۆ و ڕژێم و پارتی ئاگاشیان لەیـەك بوو بێ، چونکە لەگەڵ لە شکرکێشیەکەی پارتی بۆ دۆڵ و دێهاتەکانی سـەر سـنووری دیـوی ئێـــران بەرامبـــەر بارەگاکـــانی ســـەرکردایەتی. حکومـــەتی عیراقـــیش لـــە

(١٩٨٠/١٠/١٩) له قەلآدزێ و هێرشی کرده سەر مامەنده و چەند ڕەبایەیەکی لێ دامەزراند، پارتی لای وابوو، که هێرشی حکومەت و هێرشی ئەوان بۆ سەر یەکێتی، یەکێتی ناچار دەکا به تەسلیم بوون بۆ داواکانیان.

٣- لەوکاتەدا نێوانی یەکێتی وحسك زۆر خراپ و گرژ و ئالۆز بوو، بارەگاکانی حسکیش له گۆڕەشێر و دۆڵەتوو گۆیزێ و ئەو ناوه بوو، پارتی پێیان وابوو به پشتیوانی حسك و چاوساغی بۆیان له ناوچەکه ده توانن پەلاماری سەرکردایەتی بدەن.

٤- لەوکاتەدا دەنگ وابلاوبوو، که هەرێمی (١) ئامر هەرێمەکەیان (حەمەی حاجی مەحمود) بوو، له ناوچەی هەڵەبجه و هەورامان له یەکێتی جیابوونەتەوه و چوونەته لای حسك، تەنانەت شیوعیەکان وایان بلاوکردەوه (حەمەی حاجی مەحمود) له (١٩٨٠/١٠/٩)له یەکێتی جیابۆتەوه و تەئکیدیشیان له( ڕەسول مامەند) کرد بوو، که هەواڵەکه ڕاسته. بەلام وانه بوو، حەمه لەو مێژووه بانگکران بۆ سەرکردایەتی بۆ محاسەبه کردن، لەسەر ئیلتیزام نەکردنی به (ئەبوشەهاب)ەوه، که لێپرسراوی لق بووه به (ئاسۆی شێخ نوری)ەوه، که کرابوو، به ڕابەر سیاسی هەرێمەکه،و هەروەها ئیلتیزام نەکردنی بەلابردنی خۆی له ئامر هەرێمی و دانانی (مەلابەختیار) به ئامر هەرێم.

(حەمەی حاجی مەحمود له ٩/٢٩) بەخۆیی و ئامر کەرتەکانی هەرێمی(١) دەگەیشتنه سەرکردایەتی وملکەچی هەموو محاسەبەیەکیش بوون.*

---

* (فاتح ڕەسول)له بەشی دووهەمی چەند لاپەڕەیەك له خەباتی گەلی کورد ، لاپەڕە (١٩٧) به شه عەرەبیەکەی دەڵێ : " له (١٩٨٠/٩/٧) ( ڕەسولْ مامەند) هاته لامان و هەواڵی التحاقی (حەمەی حاجی مەحمود) وهەرێمەکەی پێ گەیاندین ".

لەشکرکێشیەکەی پارتی بە هێزێکی زۆرەوە، کە دەگوترا نزیک بە (٢٠٠٠) چەکدار و هەموو سەرکردە عەسکەریەکانیان و(مسعودبارزانی ) زۆربەی (م.س )وسەرکردایەتیشیان پلانێکی زۆر گەورە لەگەڵ ڕژێمدا بۆسەر یەکێتیان داڕێشتبوو. بەڵام یەکێتی بە تایبەت کۆمەڵە هەڵوێستێکی زۆر واقعیانەی گرتەبەر، داوای لە شیوعیەکان کرد، بکەونە بەینەوە و هەوڵی ناوبژیکردن بدەن. حزبی شیوعی دەبوایە ئەو ناوبژیە بکەن، چونکە بارەگاکانی سەرکردایەتیان کەوتبووە بەینی ئەو دوو بەرداشەوە، گەر شەڕ بوایە خۆشیان بارودۆخیان خراپ دەبوو، جێیان پێ لەق دەبوو. سەرانی شیوعی لەگەڵ هەوڵی ناوبژیدانیان هەوڵی تریشیاندا، بۆ جێ خۆشکردنی خۆیان لای پارتی بە مەبەستی.

أ- زەمینەی دروستکردنی بەرەیەك لەگەڵ پارتی وحسکدا، لە بارکەن کە کردیان بە ناوی (جود)ەوە.

ب-خۆیان لەو ناوچانەی سەرکردایەتی یەکێتیش ڕزگارکەن، لەگەڵ پارتیدا ڕێبکەون، کە ڕێگەیان بدەن سەرەتا جێی خۆیان لە بادینان خۆشکەن و پاشان وردە وردە سەرکردایەتیەکەیان لە دۆڵی (احزاب)وە بەرنە بادینان. هەوڵی حزبی شیوعی لە ناوبژیکردن لەگەڵ پارتی زۆری خایاند و پارتی ملی نەدەدا، تاشەڕی مامەندە و هێرشی ڕژێم لە مامەندە شکا، دوای شکانی هێرشی ڕژێم، پارتی ئامادەی ڕێکەوتن بوون لەسەر چەند خاڵێك.:

١-شەڕی ڕاگەیاندن و شەڕە جنێو ڕابگیرێ.

---

بەڵام (حەمەی حاجی محمود)لە کتێبی (ڕۆژمێری پێشمەرگەیەك) لاپەڕە٢٨٥ دەڵێ :" لە ڕۆژی (١٩٨٠/١١/٢٩) ئاگاداری پێشمەرگەکانی کردوە، کە لەو ڕۆژەوە ئیتر یەکێتی نیە و ئیلتیزام بە (مەلابەختیار و ئەبوشەهاب و ئاسۆی شێخ نوری)یەوە ناکات، تا گەڕانەوەی مام جەلال.

٢–پارتی له قه‌ڵاتوکان بکشێنه‌وه و چۆڵی که‌ن.*

٣–یه‌کێتی ڕێگه بدا ، له‌لای ڕۆژئاوای جاده‌ی حاجی ئۆمه‌ران پارتی چالاکی خۆی تیابکات و یه‌کێتی ئه‌وبه‌ری بۆچۆڵکات و پارتیش ئه‌په‌ڕێته‌وه بۆ به‌ری ڕۆژهه‌ڵاتی جاده‌که ، واته یه‌کێتی

ناوچه‌کانی گرتگ و روست بۆ پارتی چۆڵکات و پارتیش نه په‌ڕێته‌وه بۆ به‌ری دێگه‌ڵه و وه‌رتێ و دۆڵی خانه‌قا وبه‌ری قه‌ندیل.

٤– هودنه‌یه‌ك بۆماوه‌ی سێ مانگ بکرێ ، هه‌ردوولا شه‌ڕی یه‌کتری نه‌که‌ن.

٥– ئه‌گه‌ر هه‌ر کێشه‌یه‌ك له‌و ماوه‌یه‌دا ڕوویدا ، به ناوبژیوانی شیوعی چاره‌سه‌ر بکرێ.

حزبی شیوعی له‌و ناوبژیکردنه‌دا جێی بۆ خۆی وحسك له قه‌ڵاتوکان خۆشکرد.

## حه‌مه‌ی حاجی مه‌حمود و محاسه‌به کردنه‌که‌ی

ماوه‌یه‌ك بوو، لقی(١)ی سلێمانی یه‌کێتی که لێپرسراوی لقه‌که‌ی (ئه‌بوشه‌هاب) به ڕاپۆرت نوسین که‌وتبوونه خوێندن له (حه‌مه‌ی حاجی محمود). ناوبراو، یه‌کێکه له پێشمه‌رگه سه‌ره‌تاییه‌کانی ناوچه‌ی هه‌ڵه‌بجه و شاره‌زوور و هه‌ورامان، له سه‌ره‌تاوه

---

* شاخی گه‌لاڵی که به‌شێکی زنجیره لوتکه به‌رزه‌کانی شاخی قه‌ندیله و هه‌ڵکه‌وته‌که‌ی وه‌ك حه‌وزێك وایه، که دره‌به‌ندێکی له به‌رده‌مدایه، له‌ناو ئه‌و حه‌وزه‌دا دوو گوندی تیایه " ئه‌بوبه‌کره و قه‌ڵاتوکان". قه‌ڵاتوکان که‌وتۆته سه‌ر ڕێگای گردی ڕه‌مکان، ئه‌بوبه‌کره‌ش که‌وتۆته سه‌رده‌می ده‌ربه‌نده‌که به‌ره‌و ده‌شتایی به‌سته‌سێن و سه‌نگه‌سه‌ر به‌لایه‌ك و ڕێگه‌ی ئیندزه و قرناقه و پشت ئاشان و دۆڵی خانه‌قا. قه‌ڵاتوکان ده‌رگای مه‌ره گرنگی هاتوچۆی هێزه‌کانی یه‌کێتی بوو، له سه‌رکردایه‌تیه‌وه بۆ ده‌شتی بتوێن و دۆڵی باڵه‌یان و ده‌شتی هه‌ولێر و خۆشناوه‌تی. له قه‌ڵاتوکان یه‌ك تیپی پێشمه‌رگه‌ی لێ بوو، که سێ که‌رت بوون ، که‌رتی (حه‌سه‌نی برایم شوان خه‌ڵکی قه‌لاتوکان بوو. که‌رتی کوێخا عه‌لی خه‌ڵکی باره‌پانه بوو، که‌رتی شێخه کۆڵ سه‌نگه‌سه‌ری بوو، شه‌هید هاواری برام سه‌رتیپیان بوو.

گەنجێکی خوێن گەرم و دڵسۆز ، خۆی بە کۆمەڵە ئەزانی و لەگەڵ (شێخ عەلی وشەوکەتی حاجی موشیر و رەئوف سەعید)دا، دەستیان بە کاری پێشمەرگانە کرد، پیاوێکی ئازا و گورج و گۆڵ بوو ، ڕووخۆش و بە ووره بوو، خەڵکی ناوچەکە خۆشیان دەویست. پاشان لە پێشمەرگایەتی سەرکەوت تا بوو بە فەرماندەی هەرێمی(١)ی هەرامان. حەمەی حاجی مەحمود بەهۆی بیستنەوەی ناوبانگی خۆی لە ناوچەکە غرور گرتی، کەوتە سەرکێشی و قاچ و قۆچ وشیرە خۆری، لە شەڕدا هەر چیەکی بگرتایە بۆ خۆی گل دەدایەوە و دەیفرۆشت و پارەکەی فت دەکرد. کەوتە داسەپاندنی دەسەڵاتی خۆی و هیچ حسابی بۆ ڕابەری سیاسی هەرێم نەدەکرد ، برادەرانی لق و ڕابەر سیاسی و کۆمەڵەکانی ناوچەکە، کەوتنە دژایەتیکردنی تا ئەو ڕادەیەی پاڵیان پێوە نا، بوو بە بزووتنەوە. لەو ماوەیەی مام جەلال سەفەری کرد، "مەلابەختیار" کە ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی بوو، تەماحی بوو، بکرێتە ئامر هەرێم، وبە تایبەتیش بۆ هەورامان بۆ جێگاکەی " حەمەی حاجی مەحمود ، مەلابەختیار بۆ جەولەیەك لەگەڵ مەفرەزەیەکی خۆیدا چووە ناوچەکە، بۆ جێ پێ لە قکردنی حەمە، ناکۆکی و ناخۆشیان گەیشتە ئەو ڕادەیەی مەلابەختیار ویستی حەمە چەککا و حەمەش ویستی مەلابەختیار چەککا. مەلابەختیار جێی نەبۆوە لە ناوچەکە، لەبەر ئەوەی هەموویان حەمەیان قبوڵ بوو، مەلا بەختیاریان قبوڵ نەبوو. مەلابەختیار گەڕایەوە سەرکردایەتی و ڕاپۆرتێکی دووروودرێژی لەسەر حەمە و هەندێ لە ئامر کەرتەکانی دابوو بە مەکتەب سیاسی. مەکتەب سیاسیش کە سالار و جەعفەر بوون، پشتیوانی مەلا بەختیاریان دەکرد. داوایان لە حەمە کرد، بێ بۆ سەرکردایەتی، حەمە لە کۆتایی مانگی ئەیلولی ١٩٨٠ لەگەڵ نزیکەی (٥٠) پێشمەرگەوە هاتە سەرکردایەتی. نزیکەی (٢) مانگ لە سەرکردایەتی مایەوە و بەشداری شەڕەکەی مامەندەشی کرد. محاسەبە کرا، هەوڵیاندا لەو ماوەیە حەمە لە پێشمەرگە و کەرت و مەفرەزە و هەرێم ڕووت کەنەوە، ئاسۆی شێخ نوریان بە ڕابەر سیاسی نارد بۆ

هەرێمی یەك بۆ كنەكردن لەناو هەرێمەكە تا حەمە هەڵتە كێنن، ئاسۆ ویستی نەچێ هاوڕێیانی سجن نەسیحەتێكیان كرد بوو بڕوا باشە ، با وەك (برایم جەلالی لێنەكەن كە بە قسەی "مام جەلال"ی نەكرد و نە گەڕایەوە لقی دووی كەركوك و بەر نەفرەتی فیرعەون كەوت . پاش كێشمەكێشێكی زۆر ، كە دوو مانگی خایاند . حەمە بە تەجمید كراوی گەڕایەوە ناوچەی شاربازێڕ و شارەزوور و هەورامان ، مەلابەختیار كرا بە فەرماندەی هەرێمی یەك وحەمە ئیلتزامی پێوە نەكرد . پاشان بەهۆی قین لە دڵی مەلابەختیار وسەركێشیەكانیەوە، حەمە لە (١٩٨٠/١١/٢٩) خۆی بە حسك لە ناوچەكە ئیعلانكرد، كە تا ئەوكاتە یەك مەفرەزەی حسك لەو ناوچەیە و شارەزور و هەورامان نەبوو. پاشان حەمە بە وەشەوە نەوەستا پەیوەندی بە بەشی (اطلاعاتی) ئێرانەوە كردوو، بووە یەكێك لە دەسەلأتدارانی (اطلاعاتی) ئێرانی لە ناوچەكە و كرایە لێپرسراوێكی گەورە و ئەندامی سەركردایەتی حسك. من ئەوكاتە لە دەزگای دارایی بووم، دوو- سێ جار لێكۆڵینەوەم لەگەڵ "حەمەی حاجی مەحمود" كرد، لەسەر مەسەلەی پارە. بەلأم بێ سود بوو، جارێك حەیوانمان سەربڕی بۆ خۆی و پێشمەرگەكان، بە دەم پارچە پارچەكردنی مەڕەكەوە جگەرەكەی بە كاڵی خواردو و تەواوی كرد.

## ٧-٦. گەڕانەوەی هێزەكان لە سەركردایەتی بۆ دەشتی هەولێر.

لەسەر ئەو بڕیارانەی، كە لە كۆبونەوەكانی دوای دەستپێكردنی شەڕی ئێران- عیراق درابوون. پاش شكانی حكومەت لە مامەندە و گەڕانەوەی هێزەكانی پارتی بۆ ناو ئێران و لەوێوە بۆ حاجی ئۆمەران، ئەو هێزەی یەكێتی كە لە سەركردایەتی خڕ كرابوونەوە، پاش دابەشكردنی هەندێ كار بەسەر لێپرسرا و كادراندا، لە ڕێگەی قەڵاتوكان و كەندەكەو دۆڵی شاورەو نێردرانەوە بۆ شوێنەكانی خۆیان. لەو ماوەیەی كە ئەو هێزانە لەسەركردایەتی بوون، هێزی حسك بە فرسەتیان زانی بوو، دەشتی

هەولێریان خستبوە ژێر دەسەلاتی خۆیان و ئەو چەند مەفرەزەیەی یەکێتی، کە لەوێ مابوون، یان چەکیان کردبوون یان ڕاویان نابوون، بۆ دەشتی کۆیە. هێزەکە لە چەند کەرتێکی تێکەلاو پێکهاتبو، بەشێکی پێشمەرگەکانی دەشتی هەولێر بوون ، کە هەم ئامر کەرتی تازەی وەك، سابیر ڕەسول و هەم ئەندام لقی وەك " شەهید جەمیل ڕەنجبەر، پاشان لێپرسراوی عەسکەری وەك، ( سەید کەریم ) کەرتێکی پێشمەرگەکانی بازیان بوون، ڕۆستەمیان لەگەڵدا بوو، لەگەڵ پێشمەرگەکانی گەرمیان کەوا سامان گەرمیانیان لەگەڵدا بوو، لەگەڵ هەندێ لە کادر و ئەندامانی لیژنەی ناوچەکانی یەکێتی و ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە و بزووتنەوەش.

عومەری سەید عەلی، پاش بریندار‌بوونی لەناو مزگەوتەکەی پیرانە ڕەشدا، کە خرایە ناودارە مەیتەکەوە، تا بنێردرێتەوە بۆ سەرکردایەتی ئیشارەتی فەرەیدونی کرد، لە گیرفانی تۆپەڵێ کاغەزی دەرهێنا، کە هەمووی ناوی خەتی ڕێکخستنەکانی ناو شار بوون و دای بە " فەرەیدون " تا ئەو لە جیاتی خۆی کارەکان جێبەجێ بکات. بۆ شارەزابوون لە کاری پێشمەرگەیی و ناوچە ڕزگارکراوەکان وسەردانی لق و هەرێمەکان، عومەری سەید عەلی و فەریدون عەبدولقادر و عەلی بچکۆلیش لە هاوڕێیانی سەرکردایەتی کومەڵە لەگەڵ هێزەکە دابوون، "بەندەش" لەگەڵ هێزەکە ڕۆیشتم وەك ئەندامی دەزگای دارایی بۆ لێکۆڵینەوە لە داهات و خەرجی لقی هەرێمەکان . واش بڕیاردرا کە ئەو هێزە تا دەگەنە دەشتی هەولێر و لەوناوەش هەندێ جەولەی بە کۆمەڵ دەکەن، بۆ چاوترساندنی حسك و سەقامگیربوونی"سەید کەریم" و هەرێمی دەشتی هەولێر ، (سەید کەریم) لێپرسراوی ڕە تڵەکە بێت و پاشان هەر هەمان هێزەکە بگەڕێنەوە ناوچەکانی خۆیان لە (١٨/١١/١٩٨٠). دەوری نیوەڕۆ بوو، لە شاخی "کەندە بوکەوە" ئاوای ئەو دیوی "ماخۆبزنان" بووین، هێشتا زۆر زوو بوو، لەگەڵ ڕۆستەم دا بە سەیدکەریمان ووت : ئەمڕۆ بەیانی (عەولا سور) لە ڕەبایەکەی سەر کێوەڕەشی داوە با تۆزێ درەنگ بکا ئەوسا بکەوینە ئەو دەشتاییەی دۆڵی شاورێ . سەید کەریم گوێی نەدایەو . ووتی : من بەرپرسی ڕە تڵەکەم ، نیوەڕۆ پێشمەرگە لە گوندی ماخۆبزنان وجەلکان و زەنگلان دابەش بوون ، پاشان لە کاتی

دەستپێکردنی ڕۆیشتندا دوو کۆپتەر سێجار بەسەرماندا هاتن و ڕۆیشتن لە چوارەم جاردا ، بە شەست تیر کەوتنە تەقەکردن تەقەیەکی زۆریان لە ئێمە و لەوانەی پێشەوەمان لەوانەی دواشمانەوە کرد، ئێمە کەوتبووینە ناوەڕاستەوەڕۆستەم "ئار، بی ،جی" یەکی تێگرتن بەوە کۆپتەرەکان سڵەمینەوە و ڕۆیشتن ئەوانەی دواوە و ئێمە هیچ زیانمان نەبوو، بەلآم ئەوانەی پێشەوەمان زیانیان زۆر بوو ، ٨ شەهیدو،١٢برینداریان هەبوو.شەهیدەکان (جەمیل ڕەنجبەر) کە تازە کرابوو، بە ئەندامی لقی هەولێر، (دڵشاد محەمەد) کە ئەندامی لیژنەی ناوچەی کۆیە بوو، شەش پێشمەرگەی دەشتی هەولێریش، بریندارەکانیش ئەوەی بە خەستی بریندار ببوو، "عومەری سەید عەلی"کە لە سێ چوارلاوە لە پشتیا بریندار بوو،(سابیر ڕەسوڵ لێپرسراوی کەرت بوو ، ئەویش بەوبرینداریە چاوی لە دەستدا، ئەوانی تریش ماموستا نازم عومەر و مەحمود بەنزین و هەندێ برادەری تربوون ، ناوەکەم بیر نەماون. شەو (٨) شەهیدەکە، لە پیرانەڕەش نێژران و"عومەری سەید عەلی"خرایە دارمەیتێکەوە و نێردرایەوە بۆ سەرکردایەتی و بریندارەکانی تریش بەو شەوە تاریکە و بارانە بەهێزە بە کێوەڕەشی سەختا گەیەندرانە دۆڵی ئاکۆیان و بەندە چاوساغیان بوو.(سوار ئاغا)لەوێ شوێن ودکتۆر و دەرمانی ئامادەکردبو.*

## جەولەکەی من و گرتنی کاك نەوشیروان.

دوای گەیشتنمان بۆ دۆڵی ئاکۆیەتی و گوندی پڵنگان، سەرەڕای ئەو ماندو بوونەی سوار ئاغا و بریندارەکان،لەوچەند ڕۆژە لەوێ بووین هەندێ لێکۆلینەوەم لەگەڵ کەرتەکانی هەرێمی"١٤" کرد، دەرکەوت کە هەموو کەرتەکان لە ٢ مانگەوە تا ٦مانگ ئەو یارمەتیەی سوار ئاغا لە سەرکردایەتی وەری گرتبوو، نەیدابووە ئەوان. پاش

* نەوشیروان گرتنەکەی و ڕاکردنەکەی خۆی بە درێژی لە کەتیبەکەی خۆیدا، پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن)لاپەرە(١٨١)بە دوور و درێژی باسی کردوە جگە لەلادان لە هەندێ ڕاستی، کە بە هەڵە یان بە عەمدی شێواندوویەتی.

ئەوەی ڕاپۆرتێکی دارایم  بە سوارئاغا ئیمزا کرد لەگەڵ  هێزەکە ڕوەو دەشتی هەولێر و پاشان بەرەو دەشتی کۆیە و بازیان و پەڕینـەوە بـۆ ناوچـەی قـەرەداغ. لـە هـەموو هەرێمەکان لێکۆڵینەوەی خۆمم ئەکرد و ڕاپۆرتیشم بۆ دەزگای دارایی ئامـادە دەکـرد و بۆیانم دەنارد، دواجار پەڕیمەوە بۆ شارەزوور و شـاربازێڕ سـنوری هـەرێمی سـێ " کاك بەکری حاجی سەفەر فەرماندەی هەرێمەکە بوو،لـەو جەولەیـە تـا لای کـاك بـەکر لەو ماوەیە نزیکەی دوو مانگ و نیوم پێ چوو، هێشتا لە بەری  قەرەداغ بووم هەواڵی گرتنی"نەوشیروان"مان پێگەیشت، هەواڵەکـە بـەوجۆرە بـوو، کـە نەوشـیروان لەگـەڵ مەفرەزەیەکی ٦–٧کەسی خۆیدا لە سەرکردایەتیەوە بە ناو ئێراندا چۆتە دۆڵی گەلاڵە و لەوێ توشی تایەری عەلی والی و هێزەکەی حەمەی حاجی مەحمود، کە تازە ببووە حسك دەبێت، تایـەر دەعـوەتی دەکـا بـۆ نیـوەڕۆ دوای نـان خـواردن بـەپلان چـەکی دەکەن و دەیگرن.*

لەرۆژی (١٩٨١/١/١٠) گەیشتمە لای کاك بەکری حاجی سـەفەر  فەرمانـدەی هـەرێمی (٣) ی شـاربازێڕ لـە دێـی "بزەنیـان" هـەرێمی١ و هـەرێمی٢ پێـشمەرگەکانی لـق و مەفرەزەیەکی سالار عەزیز لەگەڵ مەلا بەختیار و ئاسـۆی شـێخ نـوری و ئەبوشـەهاب هەمویان لەوێ بوون، ئـەو هێـزە لـەو نـاوە بـە دوای هێزەکـەی حـسکەوە بـوون وەك فشارێك لەسەر حسك بۆ بەردانی نەوشیروان. بەڵام  ئەو هێزە زۆرە و ئەو فـشارە لـە بـاتی ئـەوەی ببنـە کـاتێکردنی فـشار لەسـەر حـسك، بـە پێـچەوانەوە دەبـووە هـۆی دوورکەوتنەوەی حسك و بردنی نەوشیروان لە ناوچەکە و چـون بـۆ دیـوی ئێـران، کـە مەترسی  تەسلیم  کردنەوەی بە پارتی هەبوو. من بیروڕای خۆمم پێ ووتن لەسەر ئەو

---

* حەمەی حاجی مەحمود زۆر بە درێژی باسی ئەو گرتنەی نەوشیروان لە (ڕۆژژمێری پێشمەرگەیەکدا) لەلاپەرە(٣٩٩ تالاپەرە٤١٧) دەکا . بەڵام  هەر کەس بە ووردی بیخوێنێتەوە ، جگە لە هەندێ بەروارەکانی ، بۆی دەردەکەوێ کە حەمەی حاجی مەحمود بە ڕاستی پیاوێکی شارەزایە لە دارشتنی داستانی خەیاڵی و خۆهەڵکێشاندا.

فشاره و خواستەکەی حسك، حسك داوایانکرد بوو، کە بەچەند مەرجێك نەوشیروان بەردەن:

١- هێزەکانی حسك لە ناوچەکەبن و فشاریان نەخرێتە سەر و ناوچەکە بۆ هەموان ئازاد بێ.

٢- یەکێتی (١٠٠) چەك بدا بە حسك و ئەو چەکانەی ، کە لە شەڕەکانی نێوان یەکێتی و حسکدا یەکێتی گرتوونی بیان داتەوە.

لە (١٩٨١/١/٢٢) یەکێتی موافەقەتی کرد و جەمال ئاغا وشێخ دارا بۆ گفتوگۆ چوو بوون.

لە (١٩٨١/١/٣١) نامەی مەکتەبی سیاسیان بۆ چوو بوو بۆ بەردانی ، بەلاّم بەریان نەدا.

لە(١٩٨١/٢/٦) لە ئەشکەوتی هەزار ستون ڕای کرد.

من ڕام لەسەر ئەوە بوو، کە ئەو چەکانە بدرێت، گەر بەو کارە نەوشیروان بەردەن، کاك بەکری حاجی سەفەریش هەمان ڕای هەبوو، بەلاّم (مەلا بەختیار و سالار) ڕایان وابوو، کە نەدرێت و مەرجەکانیشیان پەسەند نەکرێت، ڕای سالار وابوو، کە کۆمەڵە کۆمەڵێك سەرکردەی شەهید بووە، با ئەویش وەك هەر یەکێك لەوانە شەهید بێت ، (نەوشیروان لە٩٨١/١/٥) لە گوندی قەویلە گیرا. من هەر پاش کۆبونەوەکانم لەگەڵ هەرێمی سێ و یەك و لق گەڕامەوە سەرکردایەتی،"د . مەحمود عوسمان لە دەرەوە گەڕایەوە بۆبارەگای حسك لە (دۆڵە توو).

لە رۆژی ١٩٨١/١/٢١، د.عومەر شێخ موس و دکتۆر کەمال خۆشناو.پێیان ووتم : کە بە ناوی بەخێرهاتنەوە بچم بۆ لای د.مەحمود عوسمان و سەبارەت بەگرتنی نەوشیروانیش قسەی لەگەڵدا بکەم، بارەگاکەم لە شێنێ بوو، بارەگای دوو کەرتی حسکیش هەر لە شێنێ بوون، فەرماندەی کەرتەکان " محەمەد وتمان و ڕەسوڵی حاجی شێخە" خەڵکی شێنێ بوون. ناردم بە دوای هەردووکیاندا و هاتن پێم ووتن :

پێکەوە بچین بۆ بەخێر هاتنی د. مەحمود بە خۆشحاڵیەوە پەسەندیان کردو بۆ بەیانیەکەی رۆژی (١٩٨١/١/٢٨)هەرسێکمان و مەفرەزەیەك پێشمەرگەی ئەوان بە ریکەوێن وپێش وەخت جوابم بۆ دکتۆر نارد بوو، من کەسم لەگەڵ خۆما نەبرد ، هەر لە ئاشی پشت کاوێ و تا ناو دۆڵەتوو ، رێگاکان پێشمەرگە و کەمینیان تیا دانا بوو، لای نیوەڕۆ گەیشتینە ئەو ژوورەی، کە د. مەحمودی تیا بوو، چووینە ژوورەوە، ڕەسوڵ مامەند و حاجی حاجی برایمی لەلا بوو. پاش دانیشتن و چاخواردنەوە، بە دکتۆرم ووت: کارێکم بە جەنابت هەیە، کاك ڕەسوڵ هەڵی دایەو، ووتی: ئێمەش(م.س) نین ؟

ووتم: بەس بۆ لای دکتۆر هاتووم. ئیتر هەردووکیان و محەمەدی وەتمان و ڕەسوڵی حاجی شێخە چوونە دەرێ .

بە دکتۆرم ووت: جگە لە بە خێرهاتنەوەت پەیامێکی تریشم پێیە بۆ جەنابت، ئەویش گرتنی نەوشیروان و شێوەی گرتنەکەیەتی. ووتم: من ئێستاکە لەم ژوورەدا لای تۆم هیچ ڕەوشتێکی سیاسیانەیە بمگرن وبمکەن بە ڕەهنی دەستان، کاك عەلی عەسکەری چوو بۆ کەرکوك وپاشان بەغدا بۆ ووتووێژ، سەدام ئەو کارەی نەکرد بیگرێ و بیکاتە ڕەهن و مەرج و مەرجکاری لەسەر شۆڕش دابنێ، ئێوە خۆتان نوێنەرتان نارد و سەری نەگرت، نوێنەرەکانیان گرتن؟. ئێمە پێمان وایە هەر بڕیارێکی هاوبەش لەگەڵ شیوعیش دەرکەین بە ڕەهنی نەوشیروان و بەردانی، هەر ئەوەندە حوکمی دەبێ تا نەوشیروان بەردەبێ و دەگاتەوە سەرکردایەتی . باشتر وایە بێ مەرج و مەرجکاری هەوڵ بدەی بەربدرێ.*

---

* فاتح رسول، صفحات من تاريخ كفاح الشعب الكردي ،ص٣٥٨- ٣٦٥.لە لاپەرە ٣٦٧ دا،دەڵێ:( الشهيد طاهر علي والي، الذي كان مناضلاً هادئا و بعيد النظر كان يقف بقوة ضد الحرب وأقتتال الأخوة و لهذا قد خففوا الرقابة و الحراسة على نةوشيروان، و قبل أن يصل مبعوثنا الى مكان سجنه ، و كان متمينا الفرصة و ناجياً بنفسه)

دکتۆر محمود بە ڕاشکاوی ڕای وابوو، ئەو کارە نەشیاوە و هەڵەیەکی گەورە بووە کردوویانە. ووتی:"من لەگەڵ م.س کۆبونەوە دەکەم و تا دوو ڕۆژی تر وەڵامتان دەدەمەوە بە برادەران بڵێ وەعدیان پێ ئەدەم بێ مەرج و مەرجکاری، نەوشیروان بەرئەدەم، گەر بە قسەیان نەکردم، حسك هەڵدەتەکێنم".

دوای نانی نیوەڕۆ گەڕاینەوە و وەڵامەکەم دایەوە بە (عومەر شێخ محمودو دکتۆر کەمال خۆشناو) ڕۆژی ٨١/١/٢٣) مەکتەبی سیاسی حسك دوو نامەی نووسی بۆ مەکتەبی سیاسی حزبی شیوعی و بۆ برادەرانی خۆشیان لە شارباژێڕ (تایەرعەلی والی ، قادر جەباری ، شیروان شیرەوەندی ، حەمەی حاجی مەحمود) لە نامەکەی حزبی شیوعیدا پاش باسکردنی کۆمەڵێ ناحەقی و شەڕفرۆشتنی یەکێتی، کە

---

بەلام حەمەی حاجی مەحمود لە ڕۆژمێری پێشمەرگەیەك لاپەڕە-٤١٥د، دەڵێ:"لە ڕۆژی (١٩٨١/٢/٦) نەوشیروانیان نارد بۆ بارەگای حزبی شیوعی لە ئەشکەوتی هەزار ستوون،و شەو برادەرانی حزبی شیوعی ووتبویان:ئەگەر ئەڕۆیت برۆ، پێشمەرگەت لەگەڵ ئەنێرین."شێخ کاوەش"لەوێ بووە، ئەویش ووتویەتی: ئێمە مەسئولیات هەڵدەگرین، نامەی مەکتەبی سیاسی گەیشتبوو، کە بەری بدەین،بەلام ئێمە دەمانویست شەڕەکە کۆتایی پێ بێ ئەو کاتە بەری بدەین، و چەکەکانی هەرێمی یەك وەربگرینەوە .

نەوشیروان خۆی لە(پەنجەکان یەکتری ئەشکێنن) لاپەڕە(١٩٢)ئەڵێ: (نیوەڕۆ مولازم تایەر هاتەلام......تاپێ ی ووتم : دەتگوێزینەوە شوێنێکی دوورە دەست لە برادەرانتان ،پاشان یەکێك لە "پ.م"کاتی حسك کە دۆستم بوو، خەبەری بۆ هێنام کە لەگەڵ "تالە هەورامی" ڕێکەوتون لە نزیك بانی شار بنکەیەکی هاوبەش دابنێن لەگەڵ پارتیا و منیش بەرن بۆ ئەوێ،بۆ ئەوەی هێزەکانی هەردوو حزب ئێشکم لێ بگرن، کاوەش"کاوەی شێخ لەتیف" ئەم هەواڵەی بیستبوو.....هتد ).

دیسان لەلاپەڕە(١٩٣)دا دەڵێ:"( فەرەحم ئاگادار کرد خۆی ئامادە بکا،کاوە ووتی : ئەوەکو تووشی تەقە بین چەکی پێشمەرگەکانی من ببەن، من نەمویست کاوە ئیحراج بکەم، چەکم لێ وەرنەگرت. بەلام هەندێ نارنجۆکم لێ وەرگرت ، کاوە بە زۆر دەمانچەکەی خۆی دامێ ، لەگەڵ فەرەحدا وا ڕێکەوتم کە من دەرچم و ئەویش بە دوامدا بۆ شوێنی چاوەڕوانی، دەورووبەری سەعات١٠ی شەو لە کاتی حەرەس گۆڕین بە ناوی میزکردنەوە لە دەرگای ئەشکەوتەکە دەرچووم ، دنیا زۆر تاریك بوو ،چاو چاوی نەدەبینی ، بەردە قوتەکانی بەردەم ئەشکەوتەکە، لە زەلام دەچوون ، چوومە پەنا بەردێك و بەبێ ڕاوەستان بۆ لای سەرووی ئەشکەوتەکە چووم و دوای تاوێ ، فەرەحیش هات و بە شاخەکەدا هەڵگەڕاین.....هتد).

هەمویان لە٦ خاڵدا کۆکردبۆوە، لە شەشەم خاڵدا پێیان ووتون: کە بڕیاریان داوە نەوشیروان بێ مەرج بەرەڵاکەن لەسەر داوای لایەنەکانی ناو (جوقد). نامەی دووهەمیش بۆ برادەرانیان بریتی بوو، لە بڕیاری ( م.س) حسك بۆ بەردانی نەوشیروان بێ هیچ مەرجێك. من دڵنیام کە فشاری (د.مەحمود) بووە لەسەر (م.س)،کە ئەو بڕیارەیان دابوو . بەڵام لەگەڵ ئەوەی کە حزبی شیوعی بەپەلە لە کۆپی هەرد و نامەکەیان ناردبوو بۆ (کاك عومەر شێخ موس و د.کەمال خۆشناو)لە شارباژێڕ ئەو چوار برادەرە حسابیان بۆ نامەکەی (م.س) خۆیان نەکردو بەریان نەدا و سووربوون لەسەر ئەو١٠٠ چەکەی داوایانکرد بوو، بەڵام نەوشیروان لە(١٩٨١/٢/٦)شەو فرسەتی هێنا بوو ڕای کردبوو.

## ٧-٧. پەرەسەندنی کێشەکانی ناو کۆمەڵە و کۆنفرانسی یەك.

ا- تا دەهات دەورووبەری سەرکردایەتی قەرەباڵغتر دەبوو، قەرەباڵغیەکەش جۆراوجۆر بوو، هەبوو بە هۆی شەڕی ئێران- عیراقەوە، هیوای زۆر بە شۆڕش پەیداکرد بوو، لە شارەکانەوە دەهاتنە دەرێ .

هەبوو لە ڕێکخستنەکانەوە مەترسیان لەسەر دروست دەبوو دەهاتنە دەرێ. هەشبوو لە بەرەکانی شەڕی ئێران- عیراق ڕایان دەکرد و دەهاتنە دەرێ. لە بەشی یەکەم و دووهەم زۆریان کۆمەڵە بوون و ڕووە وسەرکردایەتی ولقەکان دەچوون و دیسان دەهاتنەوە بۆ سەرکردایەتی بۆ کار پێ سپاردن. بەڵام بەشی سێهەم لە دێهاتە ڕزگارکراوەکاندا دەمانەوە بە تایبەت دێهاتەکانی نزیك بە شار و شارۆچکەکان. ئەوانەی لە کۆمەڵە بوون، کە هاتبوونە دەرێ زۆربەیان هی ڕێکخستنەکانی پێش کۆمیتەی هەرێمەکان بوون. و زۆربەیان لە هاتنە دەرەوەیان ناقایل بوون، لە ڕەفتاری سەرکردەکانی کۆمەڵە بە تایبەتی (سالار عەزیز و فازیل کەریم وپاشان مەلا بەختیار) کێشەی نێوان سەرکردایەتی کۆن(کتلەی سجن)و نێوان کۆمیتەی

هەرێمـەکانی کـۆن ، کتلـەی ئـارام لـەناو شـانەکانی خـوارەوە و کادرەکانـدا ڕەنگـی دابۆوە . دوای بەربوونی نەوشیروان بڕیار درا، کە کۆمەڵە فراوان بووە و پێویستی بـە گرتنی کۆنفرانسێکە بۆ سێ مەبەست.

ا- هەڵبژاردنی سەرکردایەتیەکی شەرعی.

ب- یەکلاکردنەوەی کێشەکانی نێوان کۆمیتەی هەرێمەکان و هاورێیانی سجن.

ج- داڕشتنی نەخشەیەکی کاری سـەرکەوتوو ، لەگـەڵ ئـەو بارودۆخـەی شـۆڕش و شەڕی ئێران – عیراق دا بگونجێ.

ڕۆژێك" نەوشیروان" ناردی بـە دووامـدا چـووم لای. ووتـی : خـەڵکێکی زۆر لـەم نـاوە کۆبونەتـەوە لـە برادەرانـی کۆمەڵـە هەموشـیان کەسـانی خوێنـدەوارو هوشـیارن بـۆ دەورەیـەکیان بـۆ نەکەینـەوە دەشـنێرین بـە دوای کـادران و لێپرسـراوەکانی ڕێکخـستنەکانی کۆمەڵـە لـە هەرێمـەکان و لـە شارەکانیـشەوە، بـۆ ئـەوەی پـێش کۆنفرانس لەو دەوروبەرەدا هەندێ زانیاریان لەسەر کۆنفرانس هەبێ، لەهەمانکاتـدا " ئاسۆی شێخ نوری"شی بانگکرد بوو. ئـەو کاتـەی نەوشـیروان لای حـسك گـیرا بـوو، ژمارە(٦) ی کۆمەڵە زسـتانی زسـتانی١٩٨١ لـەمانگی"١"دا دەرچـوو، ووتـارێکی تیـا نوسرا بوو، بەناوی (ئۆپۆرتـۆتیزم) ووتارەکـە" فازیـل کـەریم " نوسـیبووی زۆربـەی مەبەستەکانی لەسەر نەوشیروان بوو . نەوشیروان ئەمەی زۆر لەلا ناخۆش بوو . مـن لە شێنێ و ئاسۆی شێخ نوری لە زەڵێ، دەورەیەکی یەك هەفتەیی پێش کۆنفرانسمان کردەوە، سیمیناری تیا ئەگیرا بۆ ئەو کادر و ئەندامانەی بۆ کۆنفرانس هاتبوون. مـەلا بـەختیاریش دوای دوو ڕۆژ بـەو دەورەیـەی ئێمـەی زانـی، ئـەویش لـە نـاوزەنگ لـە بارەگاکـەی خـۆی چـەند کـادرێکی کـە خـۆی و سـالار و جەعفـەر مەبەسـتیان بوو،کۆکردەوە.

دوو ڕۆژ پێش کۆنفرانس، نەوشیروان جـوابی بـۆ نـاردم پێویـستی بـە خـۆ وونکردنێك هەبوو ، کـە دێتـە لای ئێمـە، و هـات و لـە ژوورێکدا، کـە جگـە لـە یـەك پێـشمەرگە

دەیزانـی خـواردن و چـای بـۆ دەبـرد کـەس نـەیزانی کـەلای ئێمەیـە، ئـەو دوو ڕۆژە خەریکی نوسینەوەی ڕاپۆرتێك بوو، بـۆ کـۆنفرانس، ئـاخر ڕۆژ بـوو، نەوشـیروان لێـی پرسیم : تـۆ بلێـی لـەم کۆنفرانسە سـەرکەوین ؟ ئـەو بەلایانـەمان لـە کـۆڵ بێتـەوە مەبەستی (سالار و جەعفەر و مەلابەختیار) بوو، منیش پێمـووت : ئەگـەر تـۆ هـەقت نەبێ و بە زۆر نەیان خەیتـەوە سـەرکردایەتی بـە تایبـەتی مـام جـەلالیش لێـرە نیـە دڵنەواییان بکا، ئەوا دڵنیابە، کە دەرناچن و لە کۆڵ کۆمەڵە دەبنەوە .

نەوشیروان ووتی: من هەقم بەسەریانەوە نیە و لایەنگری هیچ لایەکیشیان ناکـەم، کـێ دەرچـوو بـا دەرچـێ ، بـەلاّم ئەگـەر ئەمانـە دەرچـنەوە مـن واز ئـەهێنم و بـیر لـە ڕێکخراوێکی تر دەکەمەوە دایبمەزرێنین لەگەڵمدای ؟

بێ سێ و دوو کردن ووتم : لەگەڵتام.

کـۆنفرانس لـە (١٨٩١/٥/٧) لـە تەختایەکـەی بـەردەم شـاخی (بلفـت) پـشتی کانیـە زەردناوی (مالیمۆس) بوو گیرا. جگە لە ڕاپـۆرتی نەوشـیروان ، کـە ڕاپـۆرتی کۆمەڵـە بوو، سەردێکی ژیانی سیاسی و ڕێکخراوەیی وپێشمەرگایەتی و ڕاگەیانـدنی کۆمەڵـە بـوو، لـە دامەزراندنیـەوە تـا ئەوکاتـە بـە پێـی بارودۆخـەکان، یـەك ڕۆژی خایانـد بـە موناقەشە کردنیـشیەوە، ڕۆژێکـیش بـۆ هەڵبـژاردنی سـەرکردایەتی تـەرخانکرا، بـاقی ڕۆژەکـانی تـری کـۆنفرانس کـە(٨) ڕۆژ بـوو، هـەمووی بـۆ ڕەخنـە و چـۆنیەتی دروسـتبوونی کۆمیتـەی هەرێمـەکان و بـەیانی شـوبات و ڕۆیـشتنی سـەرکردایەتی بـۆ ئێـران و ئیعترافـاتی هەنـدێ لـە زیندانیـە سیاسـیەکان و بیروبۆچـوونی عیراقـی و کوردستانی و سۆشیالیست یـا سۆشـیال ئیمپریالیـستی سـۆڤیەت وصـراعی صـینی و ئەمانـە تـەرخانکرا.لـەو کۆنفرانـسەدا کـە (١٨٥ ) ئەنـدام بەشـداریان تێـدا کـرد. (٥) ئەنـدامیان ژن بـوون، ئـەوەش بـۆ ئـەو سـەردەمە نـەریتێکی نـوێ و داهێنـراو بـوو. هەڵبژاردن ودەرچـوون بـۆ سـەرکردایەتی دەبوایـە پـتر لـە نیـوەی دەنگـی ئەنـدامانی بەشداربووی کۆنفرانس ، واتە(٩٣) دەنگی پتر بهێنایە. هەڵبژاردنی سـەرکردایەتی لـە

هەفتەی یەکەمدا کرا بە هۆی گەڕانەوەی نوێنەری شارەکان، بەڵام ئەنجامەکەی هەڵگیرا بۆ دوارۆژی کۆنفرانس. "د.کەمال خۆشناو" کە تا ئەو کۆنفرانسە خۆی ئاشکرا نەکرد بوو، کە کۆمەڵەیە و لەسەر خەتی گشتی بوو،لەو کۆنفرانسە هات و بەشداریکرد و خۆی ئاشکرا کرد، بوو بە چەپڵەڕێزان و هەرا لە دەنگدانیشـ دوای نەوشیروان یەکەم دەنگی هێنا.

**دوای دەرچونی ئەنجامی هەڵبژاردنەکە ، تەنیا حەوت کەس لە نیوەی دەنگەکانـدا زیاتری هێنا:**

**١- نەوشیروان مستەفا**

**٢- دکتۆر کەمال خۆشناو**

**٣- عومەری سەید عەلی**

**٤- فەریدون عەبدولقادر**

**٥- ملازم عومەر**

**٦- مەلا بەختیار**

**٧- عەلی بچکۆل.**

سالار و فازیل و کەریم و ئازاد هەورامی وبەندە دەرنەچوون. مولازم عومەر و مەلا بەختیار کەمترین دەنگیان هێنا ، ئەم برادەرانە بە دەرنەچوونیان و کەمی دەنگەکانیان، زۆر تێکچوون و هەڵچوون و نەریتێکی زۆر خراپیان لەناو کۆمەڵەدا داهێنا، کە بریتی بوو،لە قبوڵنەکردنی ئیشکردن گەر سەرکردایەتی نەبن وفشار خستنەسەر کۆمەڵە بۆ گەڕانەوەیان بۆ سەرکردایەتی بە ڕێگەی ئیستیقالەی بە کۆمەڵ، پاش ئەوەی "سالار و فازیل و مولازم عومەر و مەلابەختیار "یەك لە دوای یەك سوکایەتیەکی زۆریان بە ئەندامانی کۆنفرانس و قواعدی کۆمەڵە کرد. هەر لەوێدا بڕیاریاندا ئیتر کار نەکەن لە کۆمەڵە و شۆڕشدا و بە ڕێگەی تارانەوە بچنە دەرەوەی وولات، لەلایەن هەندێ لە برادەرانی ناو کۆنفرانس وەڵامی ڕەقیان درایەوە. بەڵام

نەوشیروان بە پێچەوانەی بەڵێنەکەی پێش کۆنفرانس، خۆی تێ هەڵقورتاند و هەوڵی هێمنکردنەوە و دلنەوایی کردنی ئەو برادەرانەی دا و پتر لە (٣) ڕۆژ لە هاتوچۆدا بوو بۆ لایان تا قایلیان بکات بە نەڕۆیشتن و بەڵێنی بە سالار و جەعفەر و ئازاد هەورامیدا، کە لە مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی یەکێتی بیانهێڵێتەوە." مەلا بەختیار و مولازم عومەر" لەگەڵ ئەوەی، کە دەرچو بوون ، لە وانی تر توندتربوون لەسەر ئیستیقالە و ڕۆیشتن، دواتر ڕۆیشتن، بەڵام لەو کاتەدا "مام جەلال" هاتەوە بۆ تاران و لەوێ قایلی کرد بوون و لەگەڵ خۆیدا هێنانیەوە . ئەم برادەرانە لەو کاتەوە بە تەواوی خۆیان تەرخانکرد بۆ دژایەتیکردنی کۆمەڵە و هەوڵدان بۆ بەهێز کردنی گیانی دووبەرەکی و دەستپێکردنی ململانێیەکی ناڕەوا، هەتا بۆیان بکرایە هەوڵی ملشکاندنی کادر و ئەندامانی کۆمەڵەیان دەدا، گەر لە بیروڕادا لەگەڵیان نەبوایە، لوتبەرزی خۆبەزل زانینی هەندێکیان لە بەرامبەر پێشمەرگە و کادرانی کۆمەڵە گەیشتبووە ڕادەی بڵاوبونەوەی بێزاریەکی زۆر لەناو پێشمەرگەو کادران(سالار و جەعفەر و مەلابەختیار) پێیان وابوو، دەبێ وەك "جەلال تاڵەبانی" سەیریان بکرێ.

## هاتنەوەی مام جەلال و چوونم بۆ تاران.

مام جەلال لە مانگی (١٩٨١/٦)دا، بە کارتێکردنی"لیبیا وسوریا" ،حکومەتی ئێران ڕێگەیدا بگەڕێتەوە تاران . دیسان ئێران وەعدی دا ، کە ڕێگە بدا هەموو چەکەکانیش کە لە سوریاوە دێن بە خاکی ئێراندا ببرێتە کوردستان، لەو کاتەدا (بنی صدر) سەرەك وەزیران بوو ، چەمران وەزیری بەرگری بوو ، ئاغای فەلاحی سەرۆکی سوپا بوو، ئەمانە بەینیان لەگەڵ مام جەلال باش بوو، بڕیاریاندا بوو هەوڵدەن هەمو چەکە قورس و ناوەنجی و سوکەکانمان بۆ بگەیەننەوە کوردستان و پێشەکی نزیکەی ٢٥٠–٣٠٠ کلاشینکۆفیشیان دابوو بە "مام جەلال" لەگەڵ خۆیدا هێنایەوە سەرکردایەتی. لەگەڵ مام جەلال، سالار و جەعفەر و بەختیار و مولازم

عومەریش هاتنەوە، مام جەلال لە تاران پەشیمانی کردبونەوە و نە ڕۆیشتنە دەرەوە. جارێکی تر بە نا شەرعی (سالار و جەعفەر) کرانەوە بە ئەندامی مەکتەبی سیاسی مولازم عومەر و مەلابەختیاریش بە ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی. لە گەڕانەوەی مام جەلال و گەیشتنی هەواڵی ئەو هەموو چەکە جۆرا و جۆرە دەنگۆکەیەکی وا گەورە بەناو شۆڕش و جەماوەر و تەنانەت حکومەتیشدا بلاوبۆوە، کە ئیتر بە ئاسانی دەتوانین بەو چەکە قورسانە شەڕی بەرامبەری و سوپاگاکانی ڕژێم و ناو شار بکەین. بەلأم ئەو هیوایە هێندە بڕی نەکرد لە شانسی یەکێتی ، هەموو دۆستەکانی لە حوکمی کۆماری ئیسلامیدا تڕۆ کران و ئاغای (فەلاحیشیان ) لەناو کۆپتەردا کوشت (بەنی صدری)ش بۆ فەرەنسا رایکرد. کار بە دەستانی ئێران کەوتنە دژایەتی کردنی یەکێتی و دەستیشیان بەسەر هەموو چەکەکاندا گرت بە بیانوی ئەوەی گوایە یەکێتی هاوکاری حزبی دیموکرات و کۆمەڵەی ئامۆزا دەکا. لە شەوی سەری ساڵدا بوو، شوکری هاوسەرم مناڵەکانی هێنا بووە شارۆچکەی سەنگەسەر، لە وێشەوە شەهید "هاوار" ی برام لەگەڵ خۆیدا هێنانی بۆ شێنێ، سێ ڕۆژ بوو، مناڵەکانم هاتبوون ، "مام جەلال" بە دوای ناردم بۆ ئەوەی بچم بۆ تاران پارە هاتبوو بیهێنمە سەرکردایەتی، (شەهاب عوسمان) لەلای بوو ، بە مام جەلالی ووت: مناڵەکانی هاتونەتەلای . مام جەلال هەندێ پارەی بۆ سەرفکردم ، ووتی : مناڵەکانیشت بەرە، دوو هەفتەیەك لەوێ بن ، ئێمە ڕۆیشتین بەرەو سەردەشت و پاشان تاران، هەر یەك هەفتە ماینەوە لەو سەرەوە پارەکانم وەرگرت و جانتایەکمان وا دروستکرد بوو ، کە ژێرەکەی بە تەنکی دوو قات بێ، ئەوەی لە وێدا جێی بویەوە دامنا و هەندێکی مایەوە خستمە ناو پاکەتی (قنادی) یەوە، دواتر هێنامانەوە لە(بنێو خەڵەف).لە ڕۆژی ١٩٨١/٨/٢٧ تووشی هاواری برام بووم بەسەر ئێسترێکەوە و دوو پێشمەرگەشی لە گەلا بوو، هاوار سەروچاوی بە لەفاف بەسترا بوو ، ڕۆژی پێشوو لە بەستەسێن کەوتبوونە کەمینی جاش و عەسکەریەوە لەگەڵ

(شەهید عەبدوڵلا و عوسمانی برای شێخه کۆڵ و پێشمەرگەیەکی تر، عوسمان و پێشمەرگەکەی تر ڕایان کرد بوو،" هاوار و عەبدوڵلا " شەڕیان کرد بوو، تا فیشەکیان پێ مابوو عەبدوڵلا شەهید بوو، هاواریش سەری و لاچاوی و قۆڵی و قاچی هەموی بریندار ببوو، له عەسکەر و جاشەکانی (٧کوژراویان) هەبوو، یەکیان ئەفسەر بوو، وایان زانی بوو هەردووکیان شەهید بوون مەیتەکانی خۆیان بەو شەوە بردبۆوە بۆ سەنگەسەر چەکەکانی هەردوکیشیان برد بوو، هاوار هەر ئەو شەوە بە سنگەخشکە له شوێنی شەڕەکە دوور کەوتبویەوەو خۆی گەیاند بووە ناو کەپری توتنەوانێك و له نیوەشەودا بە سواری وولاخ بەرەو سەرکردایەتی بە ڕێیان کردبوو، "هاوار"م بە وورەیەکی یەجگار زۆرەوە بینی و وامزانی برینداریەکەی سوکە منالەکانم لەگەڵ شەهید مستەفا ناردەوە بۆ سەنگەسەر کە بڕۆنەوە بۆ سلێمانی دوای تەسلیم کردنی پارەکان، گەڕامەوە بۆ سەردەشت "هاوار" هێشتا نە نێردرا بوو، بۆ عیلاج ،پەیوەندی نێوان یەکێتی و ئێران هێشتا بە تەواوی نەپچڕا بوو، یەکێتی نوێنەری لە تاران هەبوو، برینداره‌کانی یەکێتی دەنێردرانە خەستەخانەکانی ئێران لە سەردەشتەوە تا تاران، له سەردەشت "هاوار" م بینی برینەکانی زۆر بوو، یەکێ له فیشەکەکان بەر بەینی ڕوومەتی و چاوی ولای لووتی کەوتبوو چاوێکی نەی دەبینی ، پاشان هاوار برایە تاران بۆ عیلاج و منیش گەڕامەوە شێنێ.

### ٧-٨. شەهید بوونی خەلیل و درۆی ناچاری.

لە مانگی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٨١/ چووم بۆ سەردەشت تا تەلەفۆن لەگەڵ "هاوار" بکەم و بزانم تەندروستی چۆنە و چاوی نەشتەرگەری کراوە یان نا، شەو لە سەردەشت مامەوە، و تەلەفۆنم بۆ هاوار کرد ووتی: برینەکانی دەرمان کراون و لەژێر عیلاج دایە ، بەڵام هێشتا عەمەلیاتی چاوی نەکرا بوو، سەلام و هەواڵ پرسینی پیاناردم بۆ "خەلیل" ووتیشی وا هەفتەیەك دەبێ کە تەلەفۆنی لەگەڵ

نەكردووە. ڕۆژی دوایی گەڕامەوە بۆ شێنێ عەسرێكی درەنگ گەیشتمەوە ئەوێ، پێشمەرگەكان زۆر مات بوون و دوانیش لەپێشمەرگەكان لەوێ نەبوون، دوای بەخێرهاتنەوە، لەوانم پرسی بۆ وا ماتن. هیچ ڕووی داوە؟ یەكیان پێی ووتم : كاك "خەلیل" لە گردی ڕەمكان بە هاوەن برینندار بووە، ناردومانە بیهێننەوە، من لە ماتیەكەیان تێگەیشتم كە (كاك خەلیل) شەهید بووە نەك برینندارە، هەندێ پێشمەرگەی ترم نارد بە پیریانەوە، هەر لەوكاتەدا هەندێ لە برادەرانی سەركردایەتی گەیشتنە بارەگاكەمان كە زانیبوویان گەڕاومەتەوە بۆ ئێوارە دوو تەرم گەیشتنەوە بارەگا. شەهیدەكەی تریان- "سلامی عومەری نەجار" بوو، ئەندامی كۆمەڵە بوو،لە سەربازی ڕای كرد بوو، هاتبوو بۆ سەنگەسەر لەوێشەوە لەگەڵ "خەلیل" بێ بۆ سەركردایەتی وبمێنێتەوە و ببێتە پێشمەرگە،لە چێشتەنگاودا دەگەنەسەر كانیەكەی گردی ڕەمكان، پێش گوندی شەروێت، بۆ ئاو خواردنەوە لادەدەن و پێشمەرگەی باڵەكایەتیشیان لەگەڵدا دەبێت، لەو كاتە ڕەبایەكەی سەر شاخەكەی پشتیان هاوەنێكیان تێدەگرێ ، "خەلیل و سلام شەهید دەبن پێشمەرگەیەكی باڵەكایەتیش برینندار دەبێ و پێشمەرگە ساغەكەش بریندارەكە دەگەیەنێتە سەركردایەتی و هەواڵی شەهید بوونی ئەو دوانەش دەگەیەنێ . بۆ من شەهید بوونی "خەلیل" داخ و پەژارەیەكی زۆر زۆر بوو ، ئێمە برا بووین ، بەڵام هاوڕێ بووین ، زیاتر لەوەی وەك برا هەڵسوكەوت لەگەڵ یەكدا بكەین ، شەهید "خەلیل" لە دایكبووی ساڵی ( ١٩٤٥) بوو، دوو ساڵ لە من بچوكتر بوو ، تا ساڵی (١٩٥٥) سێ برای ترمان مرد بوون ، بە ناوی (ئیسماعیل و سمكۆ و بەختیار) بۆیە تەمەنی منالیمان و پاشان هەرزەكاریمان هەر پێكەوە برد بووە سەر، تا ساڵی (١٩٧٠)لە یەكتری جیا نەبووینەوە، شەهید "خەلیل بە پێچەوانەی من پیاوێكی زۆر هێمن و لەسەرخۆ بوو، نەیدەزانی تورە بوون چیە.لەناو هاوڕێكانیدا پێشمەرگەیەكی زۆر خۆشەویست و بەڕێز بوو.لە ساڵی (١٩٧٤) كە سەرۆكی شارەوانی تەوێڵە بوو،لەگەڵ شەڕبونەوەدا ڕۆیشبووە ناو شۆڕش

و گەڕابۆوە بۆ قەلادزێ، لە بۆردومانەکەی مانگی (١٩٧٤/٤) لەگەڵ خوێندکار و فەرمانبەرەکانی زانکۆدا بەر بۆردومان دەکەوێ و بە سوکی بریندار دەبێ ، لە پاش ئاشبەتاڵ ئەویش گەڕایەوە ڕانیە . بەلام نەگەڕایەوە بۆ فەرمانبەری . شەهید "خەلیل" لە ڕێگەی منەوە ، لە ساڵی (١٩٧٣) وە ، لەگەڵ شەهید "هاوار"ی برامان پەیوەندی بە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەوە کرد و لە ڕێکخستندا پەیوەندی بە (مراد زیندین کە ناسرا بوو بە د.مراد) هەبوو .لە ساڵی (١٩٧٥)دا ڕاسپێردرا ، کە نامەیەکی ئێمە بەرێ بۆ "کاسکان و زارگەلی " بۆ لای " فەقێ حەسەنی حەمە ئاغای کاسکان و کوڕی میر حەمەدی زار گەلی " تا بەو چپەکانەی کە ئەوان شاردبویانەوە ئامادەکاری بکەن بۆ پێکهێنانی مەفرەزەی سەرەتایی، لە کاتی ڕۆیشتنی بەرەو دۆڵی شەهیدان، لە قەلادزێوە لەسەر پردەکەی پێش قەلادزەوە خاڵی پشکنینی سەربازی ڕێی پێ دەگرن و دەیپشکنن و نامەکانی پێدەگرن ، ئەو کەسەی زمانیشی لێدا بوو (صباحی حەقی ئاغای ئیندزە )بوو ، کە هاوڕێی خۆی بوو. بەگیراوی و بە نامەکانەوە،دەیبەن بۆ ناو پۆلیسخانەی قەلادزێ ،پاش لێکۆڵینەوە و ئەشکەنجەدان بۆ ماوەی ٣ ڕۆژ ئەم نکۆلی لە نامەکان دەکا و دەڵێ ئەو سەربازانە هی خۆیان بووە،پاشان معاونی ئەمنی قەلادزە بڕیار دەدا بە کۆپتەر بینێرن بۆ کەرکوك لە کاتی هێنانە دەرەوەی لە ژووری زیندانی پۆلیسخانەی قەلادزە، دوو پۆلیس دەبن، دەیانەوێ بیبەن بۆ زیندانی دائیرەی (أمن) لە دەستیان ڕا دەکا وخۆی دەکا بە کۆلانەکاندا وپاشان خۆی دەکا بەناو زێرابێکدا و خۆی دەشارێتەوە تا شەو، شەو بە زێرابەکەدا دەڕواتە دەرەوەی شار و لە وێوە خۆی دەگەیەنێتە گوندی (سوڵتانە دێ) و پاشان دەچێتە گوندی (ئەبو بەکرە و قەڵاتوکان) لە حەوزی شاخی گەلاڵی. هەر لەوێ لەگەڵ مام عەولای ئەبو بەکرە و حەسەنی برایم شوانی قەلاتوکان و یەك — دوو کەسی تر مەفرەزەیەکی سەرەتایی دروستدەکەن بە دوو چەکەوە، جوابی بۆ خاڵم نارد بوو، کە جواب بۆ من بنێرێ تا کۆمیتەی هەرێمەکان ئاگادارکەم لە

دروستبوونی ئەو مەفرەزە سەرەتاییە لە مانگی (۱۹۷٦/۳) و هەر لەو مانگەدا لەگەڵ (قادر خەبات) پەیوەندی بە یەکەوە دەکەن، قادر خەباتیش لە ئاشبەتاڵ تەسلیم بە ڕژێم نەبوبۆیەوە، لە گوندەکەی خۆیان (خەزێنە) لە باڵەکایەتی مابویەوە. ئەویش هەر لەو مانگەدا مەفرەزەیەکی پێکەوە نابوو . شەهید" خەلیل " لە ئەبوبەکر و قەلاّتوکان بنکەی دانا بوو، ببووە شوێنی خڕبوونەوەی زۆربەی ئەوانەی کە دەهاتنە دەرەوە، وەك (عەلی عەسکەری و د. خالید و علی کۆ، بایزی ئەباس ئاغا ، عەلی حەسەن ئاغای مەنگوڕ، هەباسی بایزی باڵو ئاغا) ئەم چوارەیان دوای ماوەیەکی کەم تەسلیم بە حکومەت بوونەوە، بایز حکومەت بە پلان کوشتی ، عەلی ئاغاش هەر لەسەر پردەکەی سەڵتانە دێ ئیعدامی کرد و هەباسیش بوو بە دڕندەترین خۆفرۆشی کورد وسەرۆك جاش، تەنانەت کون بە کونی ڕاوی پێشمەرگەکانی یەکێتی دەکرد و نێردراوی قیادە موەقەتە بوو، لە ناوچەی قەلاّدزە و تا ئێستاش لەپەنای پارتیدا بە هەموو تاوانەکانیەوە پارێزراوە. دوای گەڕانەوەی نەوشیروان و دانانی بارەگای سەرکردایەتی گەڕۆك لەو سنورە لە قەندیلەوە تا نۆکان بنکەکەی شەهید "خەلیل" ئەڵقەی پەیوەندی نێوان سەرکردایەتی و ڕێکخستنەکانی ناوخۆ و شارەکان بوو . شەهید "خەلیل" لە پێشمەرگایەتیەوە بوو، بە فەرماندەی مەفرەزە و پاشان فەرماندەی کەرت، ماوەیەك لە دەشتی هەولێر و ماوەیەك لە قەرەداغ و گەرمیان و ماوەیەك لە دۆڵی جافەتی و دواجار لە سەرکردایەتی پێشمەرگایەتی کرد. دوای دوو هەفتە "مام جەلال" ناردی بە دوامدا، چووم بۆ لای . ووتی: بڕۆ بۆ تاران پارە هاتوە، بەلاّم بە "هاوار" مەڵێ "خەلیل" شەهید بووە، نەك عیلاج نەکات و بگەڕێتەوە، چووم بۆ تاران هاوار زۆر هەواڵی خەلیلی لێ دەپرسیم، گلەیی هەبوو، کە بۆ کاك خەلیل نە هاتۆتە سەردەشت تەلەفۆنی لەگەڵ بکات، منیش دەمووت سەرکردایەتی لەگەڵ نەوشیروان ناردوویانە بە ئیش بۆ ناوچەکانی وەرتێ و دەشتی هەولێر. لەوکاتە هێزێکی زۆر لە سەرکردایەتی کۆ کرابۆوە بۆ لێدانی هێزەکانی

(جود) بە فەرماندەیی "نەوشیروان" ڕۆیشتن بۆ دۆڵی باڵەیی و وەرتێ و پاشا ئاکۆیەتی، هاوار لە ڕێگەی هاتوچۆ و ڕادیۆوە ئەو هەواڵانەی بیستبوو، بۆیە بڕوای بە قسەکانم دەکرد. من لە ناخەوە دەکوڵام، کە درۆی ناچاریم بۆ دەکرد،تا لەپاش مانگێك عەسر کتوپڕ "هاوار" هاتە بەردەمی بارەگاکە ، و بێ خۆتێکدان و شڵەژان ڕووی تێکردم ووتی: ( کاکە تۆ خۆت لە من بە خۆڕاگر تر دەزانی؟ بۆ پێت نە ووتم : کاك "خەلیل" شەهید بووە؟ بۆ لات وایە من نازانم، کە هەر یەك لە ئێمە لە کات و لە شوێن بە هۆی جیاجیاوە شەهید دەبین). هاوار تەنیا ٣ ڕۆژ لە شێنێ مایەوە ، ووتی : دەگەڕێمەوە تاران ، تا سەرکردایەتی نەڵێن ئەو هەموو پارەیەمان تیا خەرج کرد و نەشتەرگەریەکەشی نەکرد.

# بەشی هەشتەم
# چەند ڕووداوێکی لابەلای سەرە تای شەڕێکی سەخت.

**بەشی هەشتەم: چەند ڕووداوێکی لابەلای سەرە تای شەڕێکی سەخت.**

ماوەیەك بوو، شەڕی ئێران عیراق کارێکی وای کرد، کە هەموو لایەنەکان بکەونە هەوڵی خۆ بە هێزکردن و زیادکردنی ژمارەی چەکدار، بەتایبەتی بە هۆی ئەو شەڕەوە بە هەزاران گەنجی کوردی سەربازی هەڵاتوو " عەسکەری فیرار " ڕایان کردبۆوە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگە و دێهاتەکان، هەلێکی باش بوو، بۆ حزبەکانی ناو شۆڕش بیانکەن بە پێشمەرگەی خۆیان بێ ئەوەی گوێ بدەنە چونیایەتی گەنجەکان یان بێ هیچ پێوانەیەك گرنگ. ئەوە بوو هەر لایە و ژمارەی خۆی پێ زیاد بکات. تا ناوەڕاستی ساڵی (١٩٨١) بە ڕاستی دەستی باش لە دوژمن دەوەشێنرا . بەلاًم لە ناوەڕاستی ساڵی (١٩٨١) وە تا کۆتایی ئەوە ساڵە کۆمەڵێ ڕووداو هاتە پێشەوە کە ئەو هێمنیەی شێواند .

١- کێشەی ئەنجومەنی ئاواییەکان و لایەنەکانی بەرەی (جود).*

دانانی ئەنجومەنی دێیەکان، داهێنانێکی نوێی شۆڕشی کوردی بوو، بریتی بوو، لە هەڵبژاردنی چەند کەسێك لەلایەن خەڵکی دێکەوە ، کە بەم ئەرکانە هەڵسن.

ا- هەر کێشەیەکی دێیەکە هەبێ وەکو ژن و ژنخوازی، زەوی و زار ،یان کێشەی کۆمەڵایەتی ببرێتە لای ئەنجومەن و ئەوانیش چارەسەری بکەن، گەر نەکرا ئەوسا لە ڕێگەی ئەوانەوە ببرێتە لای لێپرسراوی کۆمەڵایەتی شۆڕش.

---

* کۆمەڵەی ڕەنجدەران لە کۆنفرانسی یەکەمی خۆیدا ( ٣ کاری) زۆر کاریگەری ئەنجامدا.

ا- بڕیاری دانانی ئەنجومەنی گوندەکان.

ب- دانانی پەیڕەو و پرۆگرامی کۆمەڵە.

ج- پێکهێنانی قوەتەکان .

ب- دابەشکردنی پێشمەرگە و جێبەجێکردنی پێویستیەکانی لە ڕێگەی ئەوانەوە، ئەوان دەیانزانی لەناو دێکەدا کێ حاڵی باشە و کێ زۆر نەبووە، بۆ کەمکردنەوەی قورسایی لەسەر نەبوان، جگە لەوەش جۆرە ڕاهێنانێکی خەڵکی دێهاتەکان بوو، لەسەر بەڕێوەبردنی کاروباری خۆیان بە شێوەی فرە دەنگی و هەڵبژاردن و پەیڕەوکردنی جۆرە دیموکراتیەتێك. بۆ خۆشکردنی زەمینەی ئەم کارەش، ژیانی ڕێکخراوەیی ئەو ژمارەیەی کۆمەڵە بۆ ڕاهێنان و شارەزاکردن و پەسەندکردنی ئەندامانی کۆمەڵە تەرخانکرد بوو ، کە چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەم ئەزمونە نوێیە بکەن. بەڵام بە داخەوە لایەنەکانی تری ناو شۆڕش وەك (حسك و حشع و پاسۆك) بەربەرەکانی ئەم ئەزمونە سەرکەوتو و دیموکراتیەیان دەکرد و پێیانوابوو، ئەم ئەنجومەنانە بەشێکن لە ڕێکخستنەکانی یەکێتی بە تایبەتی حسك، کە دووەم هێز بوو لە دوای یەکێتی لە ڕووی ژمارەی چەکدارەوە. لەبەر ئەوە کەوتنە دژایەتی کردنی ئەنجومەنەکان و گوێ پێنەدانیان و زۆرجار سوکایەتی پێکردن و لێدانیشیان، ئەمە یەکێك لە هۆکانی دروستبوونی پشێوی ناوەڕاستی ساڵی١٩٨١ بوو.

٢- هۆکاری دووهەم: ئەو ڕووداوەی ڕۆژی (١٩٨١/٦/٢٢) گوندی مامەخەلانی ناوچەی شارباژێڕ بوو، کە لە نێوان مەفرەزەیەکی یەکێتی لە بەری قەرەداخەوە هاتبوون لەگەڵ مەفرەزەیەکی پاسۆك ڕوویدا، کە بووە هۆی کوژرانی ( ٢) کەس لە پاسۆك و (١) کەس لە یەکێتی . هەر ئەو ڕۆژە لە گەڕەدێی شارباژێڕ کەرتی پێشمەرگەی پاسۆك کەمین دادەنێن و مەفرەزەیەکی کەرتی مامۆستا جەمال، لەگەڵ مامۆستا جەمالدا بە سواری سەیارە بێ ئەوەی ئاگاداری ڕووداوەکەی مامەخەلان بن، دەچنە ناو گەڕەدێ کەرتەکەی پاسۆك دەیاندەنە بەر دەستڕێژ و شەش پێشمەرگەی یەکێتی دەکوژن و پاشان شارباژێڕ بەجێدێڵن و ڕا دەکەنە سنووری ئێران بۆ شاخی سورکێو.لەم شەرە مامۆستا جەمال عەزیز وەستا فایەق و٤ پێشمەرگە شەهید کران.

٣- ڕووداوەکەی کانیە ڕەشی پشتی گوندی سیکانیانی دۆڵی جافەتی بوو، کە بووە هۆی شەهید بوونی (٧کەس) لە یەکێتی کوژران لەوانە شەهید "جەمالی عەلی باپیر"

و برینداببوونی (٦پێشمەرگەی)تریش و لە حسکیش ٦ کەس کوژران لەوانە"شێرکۆی شێخ عەلی و بێستونی برای " و چوار پێشمەرگەی تر. ئەم ڕووداوەی کە لە نێوان یەکێتی و حسك ڕوویدا، مەلا بەختیار بە هەڵگیرساندنی تاوانبار کرا، گەرچی خۆی نکوڵی لێ دەکرد، بەڵام ئەو بریندارانەی یەکێتی بێ پێچ و پەنا، ووتیان: کە مەلا بەختیار جەمالی هانداوە و تەنانەت تانۆتیشی لێداوە، کە نەیتوانیوە شێرکۆ لە ناوچەکە دەرکا. لەوکاتەدا جەمال بەهۆی ڕاپۆرتێکی "جەبار فەرمان" کە ئەوسا ڕابەری سیاسی هەرێمەکە، لە ئامر هەرێمی تەجمید کرابوو، ئەمەش بارودۆخی دۆڵی جافەتی ئاڵۆز کرد.ئەم شەرە لە ١٩٨١/٨/٢٣ ڕوویدا.

٤- ڕووداوی چوارەم،کە لە ١٩٨١/٩/٥، هەر لەو کاتانەدا ڕوویدا ، کوشتنی کۆنە جاشێکی تازە پێشمەرگەی حزبی شیوعی بەناوی (عەبدوڵڵا ماویلی)،عەبدوڵڵا لەسەرەتای پێشمەرگا یەتیدا بە دەسیسەی ڕژێم لەگەڵ ٣پێشمەرگەی تر، بۆ جەولە دەچن و لەکاتی ماندووبون و حەوانەوە خەویان لێ دەکەوێ، عەبدوڵڵا لە خەودا چەکی هەر سێکیان لێ دوور دەخاتەوە و ئەوسا دەیانگرێ و دەستیان دەبەستێ و تەسلیم بە ڕژێمیان دەکا و ڕژێمیش هەرسێکیان لە سێدارە دەدا،پێشمەرگە لە سێدارە دراوەکان خەڵکی ناوچەی باڵەکایەتی بوون، و کەس وکاریان پێشمەرگەی یەکێتی بوون لە تۆڵەی کەسەکانی خۆیان عەبدوڵڵا ماویلی دەکوژن ، مەفرەزەیەکی حزبی شیوعیش بە ئامر مەفرەزەیی عەلی کلاشینکۆف" لە دانیشتن ووتووێژدا بە نامەردانە٣ پێشمەرگەی یەکێتی دەکوژن لەکاتی گفتوگۆدا. ئەمەش بارودۆ خەکەی ناوچەی باڵەکایەتی ئاڵۆز کرد. یەکێتی هەوڵی زۆریدا لەگەڵ پاسۆك و حسك و شیوعی چارەسەری کێشەکان بە گفتوگۆ وپێکهێنانی لیژانی هاوبەش بکەن. پاسۆك ژمارەیەکی زۆر کەم چەکداریان هەبوو،پاش ئەو ڕووداوە بە خۆیاندا ڕا نەدەبینی بە هیچ جۆرێك لە یەکێتی نزیك ببنەوە لە سنوری ئێران دوور نەکەوتنەوە . حزبی شیوعی ئامادەی گفتوگۆ بوون ، بەڵام ئامادەی سزادانی عەلی کلاشینکۆف نەبوون . بەڵام حسك ئیعلانی شەڕیان لە دژی یەکێتیدا. و هەوڵی کۆکردنەوەی هێزی خۆیان و پارتی و پاسۆك و شیوعیدا و بڕیاری پەلامار و لێدانی تاك - تاك و

مەفرەزە – مەفرەزەی پەراگەندەی یەکێتیاندا و سەید کاکە کەوتە کێو ماڵکردنی پێشمەرگەکانی یەکێتی لە دەشتی هەولێر و باڵەکایەتی و دۆڵی جافەتی و کار گەیشتە ئەوەی پلانی لێدانی سەرکردایەتیان دانا ، شەڕ لە سنووری ناوچەیەك و دوان دەرچوو و سەرتاسەری کوردستانی گرتەوە و یەکێتی لە (١٩٨١/٩/٨) لە دوو قۆڵەوە لە شاربازێڕەوە بەرەو دۆڵی جافەتی و لە قەڵاتوکانیشەوە بەرەو باڵەکایەتی و دۆڵی خانەقا و ئاکۆیەکی وەرتێ و پاشان خۆشناوەتی و دەشتی هەولێر هێرشیان کردە سەر پێشمەرگەکانی حسك و پارتی و شیوعی و پاش (٣ مانگ) شەڕ و پێکادان، ئەوسا هەموو لایەك گەیشتنە ئەو بڕوایەی، کە دەبێ بە گفتوگۆ چارەسەر بکرێ. کە ئەویش چەند هۆکارێکی کاریگەر هەبو.

## ٨-١.شەهیدبوونی هاوار جەلال.

شەهید هاوار لەدایکبوونی ١٩٥٥ بوو، پاش مردنی سێ برا و خوشکێکمان هاتبووە دنیا. لە باوکم دایکم بیستبوو، کە لە کاتی لەدایکبوونی مندا، کێشە لەسەر ناوەکەم لە نێوان باپیرم و عەلی والی بەگ دا دروست بووە. ئەوکات عەلی والی بەگ (قومیسەر–مفوض) بووە لە مخفەرەکەی تەینال و باوکیشم لەوێ چایخانەی هەبوە، بۆیە عەلی والی بەگ ناوی ناوم، باپیرم ویستویەتی ناوی هاوار لێبنێ، بەڵام ئەو ناوە بەلای عەلی والی بەگەوە خۆش نەبوەو پاشان باپیرمی قەناعەت پێ کردووە، کە لەباتی ئەوەی بەناوی هاواری باوکی باپیرمەوە ناوم بنێ بەناوی (ابراهیم)ی باپیری باپیرمەوە ناوم بنێ.

من زۆر ئارەزووم لەناوی هاوار بوو، بۆیە سووربووم لەسەر ئەوەی، کە من هاوار ناوبنێمو ناوم نا هاوار بەناوی باوکی باپیرمەوە.

شەهید هاوار لەشاری رانیە هاتە دونیاوە و هەر لەرانیەش خوێندنی سەرەتایی تا پۆلی پێنجی تەواوکردو پۆلی شەشەو یەك و دووی ناوەندی لەسلێمانی تەواوکردو پاشان پۆلی سێی ناوەندی دووبارە لە رانیەو پۆلی چوارو پێنجی دواناوەندی لە سلێمانی تەواوکردو پۆلی شەشی دواناوەندی تەواو نەکرد.

شەهید هاوار لە تەمەنێکی زۆر لاویدا کەوتە ناو جیهانی سیاسەتەوە، لەساڵی ۱۹۷۳دا پەیوەندی بەرێکخستنەکانی خوێندکارانەوە کردو لە شەڕی ۱۹۷٤دا چوە ریزی شۆڕش‌و بوو بە پێشمەرگەو چووە خولی فێربونی چەکە قورسەکانی وەك تۆپ و هاوەن بەهەموو جۆرەکانیەوە. لە ئاشبەتاڵ گەرایەوە بۆ رانیە و پاشان بەهۆی چونی شەهید خەلیل جەلال بۆ ناو مەفرەزە سەرەتاییەکان، و گرتنی باوکمان (جەلال مەجید هاوار)و خۆشاردنەوەی دایکم‌و خوشکەکانم، ئەویش و رزگاری براشم چونە سلێمانی‌و لە مالی هاورێیەکی کۆمەڵەدا شاردرانەوە.*

شەهید هاوار لە ۱۹۷٦ ـ ۱۹۷۷ رۆیشتتەوە قوتابخانە بۆ تەواوکردنی پۆلی شەشی زانستی، بەلام بەهۆی گەرانی رژێمی فاشی بەدوای کەس‌و کاری پێشمەرگەدا مەفرەزەی ئەمن دەچنە سانەوی سلێمانی بۆ گرتنی، شەهید هاوار فریای دەربازبوون دەکەوێ. دوای دوو رۆژ واتە لە ۱۹۷۷/۲/۲۲ دا لە رێگەی دۆڵەروتەوە دەگاتە لای مەفرەزەکانی پێشمەرگە و لە شۆرشی نوێدا دەست بە ژیانی پێشمەرگایەتی دەکا.

شەهید هاوار لەپاش ئاشبەتاڵو گەرانەوەی بۆ رانیە، لە رێگەی بەندەوە پەیوەندی بەریزەکانی کۆمەڵەی مارکسی لینینی کوردستان کرد. وەك ئەندامێکی چالاکی کۆمەڵە کاری لەناو خوێندکارانی ئامادەیی رانیەدا کردو چەندین ئەلقەی رۆشنبیری پێکهێنا، کە هەندێکیان لە پاش راپەرین‌و تا ئەم دواییانەش لە دەزگا بالاکانی ی.ن.ك دا کاردەکەن.

شەهید هاوار پاش دوو هەفتە لە دۆڵەروتەوە بە رێگای سنوراو سنوردا دەرواتە قەندیل‌و لەوێ لەگەڵ شەهید خەلیلی برایدا یەکدەگرنەوە.

لەساڵی ۱۹۷۷و ۱۹۷۸ دا وەك کادری کۆمەڵەو لێپرسراوی رێکخستنەکانی کۆمەڵ لە قەڵادزە و رانیەو سەنگەسەر دەستبەکاردەبێ. پاشان دەبێتە لێپرسراوی لیژنەی

---

* پێشتر باسی ئەو هاورێیەی کۆمەڵەم کردوە

ناوچەی یەکێتی لەو ناوچەیە. لەرووی ئەرکی پێشمەرگانەشەوە دەکرێتە فەرماندەی مەفرەزە و پاشان لە ١٩٧٨ دا دەبێتە فەرماندەی کەرت لە هەرێمی رزگاری سەر بە سەرکردایەتی.

شەهید هاوارو شەهید خەلیل جگە لە ئەرکی سەرەکیەکەی خۆیان، ئەرکی پردی پەیوەندی سەرکردایەتی دەرەوەو سەرکردایەتی ناوخۆ دەگرنە ئەستۆ، لە هێڵی سلێمانی – رانیە – سەنگەسەر ئەبوبەکرە –– قەندیل یا نوکان،و خەمخۆری پەیداکردنی ئازوقەی بارەگاکانی سەکردایەتی بوو.

شەهید هاوار کادرێکی وشیارو پێشمەرگەیەکی ئازا و ملتزم بوو، بۆ هەر ناوچەیەك بنێردرایە ئامادەبوونی تەواوی تێدابوو.هەروەها لەرووی کاری رێکخراوەیەوە شارەزا و لێهاتوو بوو، بۆیە چەندین هێڵی رێکخستنی لە رانیە و قەڵادزە و سەنگەسەرو دێهاتەکانی ئەو ناوچانە هەبووە.

لە ساڵی ١٩٨٠ بە لێوەشاوەیی خۆی، کرایە فەرماندەی تیپی قەڵاتوکان و سەر بەسەکردایەتی.

لە ساڵی١٩٧٩ نێردرا بۆ سنوری لقی کرکوك و گەرمیان و ماوەی ٦ مانگ لەوێ کاری رێکخستنی کردو پاشان گوێزرایەوە بۆ سنوری سەرکردایەتی.

شەهید هاوار بەشداری چەندین شەری لە مەڵبەندی ٣ لە گەرمیانو لە دولی خۆشناوەتی و لە دەشتی بەستەستێن کرد.

شەهید هاوار رۆلێکی گرنگی بینی لە هاندانی جەماوەری شاری قەڵادزە بۆ خۆپشاندان و راپەرین بەبۆنەی تێپەربوونی ٨ ساڵ بەسەر بۆردومانی قەڵادزەدا.

نیوەرۆی رۆژی ١٩٨٢/٧/١١ لەبارەگای کاك نەوشیروانەوە ناردیان بدواما گوایە بۆ نیوەرۆی لای ئەو نان بخۆم.

کە چومە ژوورەوە بینیم کۆمەڵێك لە هاورێکانم لەوێ بوون وامزانی ئەوانیش بانگهێشت کراون ، پاشان کاك رەفعەتی مەلا هەندێ قسەی کرد، یەکسەر موچرکێك

به هەموو جەستەم داهات. ووتم:"من خۆم زۆرم لەو باسانە بۆ کەس و کاری شەهیدان کردووە، ریک و راست پێم بڵێن هاوار شەهیدبووە، یا دیسان بریندارە؟".

کاك نەوشیراون یەکسەر ووتی:" بەڵێ. دوێنێ ١٠/٧/ ١٩٨٢ لە بەستەستێن تووشی شەڕبووە لەگەڵ جاشەکانی حەمەی مەلا شەریف و دوای شەرێکی نیوسەعاتی شەهیدبووە و تەرمەکەشی کەوتۆتە دەست ئەوان ،چونکە یەك پێشمەرگەی لەگەڵ بووە، عوسمان برای شێخە کۆل، ئەویش رایکردووە پێش دەستپێکردنی تەقە. بە راستی بۆ من سوێیەکی زۆر گەورەبوو، کۆنە برینەکەی شەهید خەلیلیشی لێ هینامەوە سوێ.

بەڵام پێشمەرگە ناوی خۆی بە خۆیەوەیە، هەردەبێ چاوەروانی شەهیدبوونی لێ بکرێ.

داخی شەهید هاوار بۆ من ئەوەبوو، کە کەوتبووە دەست دوژمن و پاش ئەوەی بە (١٨) جاش هەریەکەیان (٣٠) فیشەکیان بەبێ گیانی لێدابوو، بەبەردیش سەریان پان کردبۆوە. و من ئەو دانپێدانەم لە دەمی مردوو شۆرو مەلای مزگەوتەکەی سەنگەسەر بیست. نەمتوانی وەك شەهید خەلیلی برام خۆم بی شۆم و کفنی بکەم و شەوێك لای خۆم لە بارەگاکەمدا بیهێڵمەوە.

## چەند ڕووداوێکی نوێ لە ساڵی١٩٨١.

**لە ساڵی(١٩٨١) دا چەند ڕووداوێکی کاریگەر لە ڕەوتی شۆڕشی هەردوو پارچەکەی کوردستان ڕوویدا. باشتر وایە لێرەدا باسیان بکەبن.**

– لەمانگی (١٩٨١/٢) دا کۆماری ئیسلامی ئێران، بۆ ناردنی شۆڕشەکەیان بۆ کوردستانی عیراق (تصدیر الثورة) هەوڵیاندا حزبێکی ئیسلامی سەر بە کۆماری ئیسلامی ئێران لە کوردستانی عیراق دروست بکەن بەناوی( لەشکری ئیسلامی

کورد). کۆماری ئیسلامی مەلایەك و شێخێك و زانایەکی "فیل بازی"دەست کەوتبوو، وایزانی بوو هەنگی لە داردا دۆزیوەتەوە، ئەو زاتانە (شێخ قادری سوتکە، مەلا حسێنی ماریونس، زانای فیلزان عەباس شاهین) بوون. هەر یەکەیان خەڵکی شوێنێکی دوور لە یەکتر و بیروڕای جیاواز لە یەکتری بوون ، تەنیا یەك شتیان یەك بوو، ئەویش تەماح و پارە . ئەمانە ناویان لە خۆیان نا (لاك) لە شکری ئیسلامی کوردی . لەشکری ئیسلامی سەرەتا کۆمەڵێ چەکی نوێ و پارەی لە ئێران وەرگرت و هاتنە کوردستان و دەستیان کرد بە دابەشکردنی چەك و موچەی باش و خەیاڵی بۆ ئەو کەسانەی چەکیان بۆ هەڵدەگرتن .

–

**زەمینە بۆ گەشەکردنیان لە بار بوو:**

ا– سەربازێکی زۆری ڕاکردووی شەڕی ئێران و عیراق هەبوو، ئەمانیش پارەی باش و چەکی نوێیان هەبوو.

ب– لەگەڵ یەکێتی وپارتیدا لە هەردوو ناوچەی ژێر دەسەڵاتی هەردووکیان ڕێکەوتبوون، کە نەك هەر دژایەتی هیچیان ناکەن، بەڵکو هاوکاری هەردوولایان دەکەن بە چەك و پارەش .

ج– پارتی و یەکێتیش کۆمەڵێ خەڵکی خۆیان نارد بووە ناویان و مەفرەزە و کەرتیان تیا دروستکرد بوون وەك (خەت مائیل).

د– لەشکر پەیمانی بە یەکێتی دابوو نەخۆش و برینداره خەتەرەکانی یەکێتی بە ناوی خۆیان و کارتی خۆیانەوە بنێرێ بۆ نەخۆشخانەکانی ئێران، ئەمانە لە ماوەیەکی کەمدا زۆر زیادیان کرد.بەڵام لەگەڵ گرژبوون وتێکچوونی نێوان ئێران و یەکێتی و هاندانی ئەمانە لەلایەن ئێرانەوە بۆ دژایەتی کردنی یەکێتی، ئیتر پەیوەندی یەکێتی و لەشکرکەش تێکچوو بە دوو ڕۆژ هەموو لەشکر چەککران.*

* لەچەك کردنی لەشکری ئیسلامیشدا دیسان کۆمەڵە کادرێکی تێکۆشەر و سەر تیپێکی چالاك و ئەندازیارێکی هوشیاری شەهید (سەلاحی مهندس ) بوو.

## دامەزراندنی پارتی دیموکراتی گەلی کوردستان.

لە مانگی (٨١/٧) حزبێکی نوێ دروستبوو بەناوی (پارتی دیموکراتی گەلی کوردستان) کورتیەکەی پارتی گەل بو ئەم حزبە (سامی عبدولرەحمان)پاش موئامەرەکەی (ئیدریس و مەسعود ) لە دەرکردنی لە سکرتێری قیادە موەقەتە ڕۆیشتە دەرەوە.لە دەرەوە لەگەڵ چەند کەسێکی تری تورە لە قیادەی موەقەتە، هەوڵی دروستکردنی ئەو حزبەیدا. پارتی گەل لەبەر ترسی پارتی تا ماوەیەکی زۆر توانای گەڕانەوەیان لە سوریاوە بۆ بادینان نەبوو. بەڵام پاش ئەوەی لە ڕێگەی سوریا و لیبیای دۆستانی ئێران شوێنی خۆی لە ئێراندا کردەوە و دۆستایەتی لەگەڵ دروستکردن، ئەمانیش لەڕێگەی ئێرانەوە گەڕانەوە بەپارەی سوریا و لیبیا و چەکی ئەوان و سەربازی ڕاکردوی شەڕ ئەمانیش ووردە ووردە پەرەیانسەند، پاشان بوون بە ئەندامی بەرەی عیراقی و بەرەی کوردستانی تا دوایێ ڕاپەڕین خۆیان هەڵوەشانەوە و چوونەوە باوەشی دایکەپیرەیان کە پارتی بوو.

## تێکچونی نێوان حزبی دیموکرات و پارتی دیموکراتی کوردستان (ق.م)*.

لە دوای نیوەی یەکەمی ساڵی١٩٨١ تا دەهات نێوانی ئەم دوو حزبە بەرەو تێکچوون وخراپی دەچوو. حزبی دیموکرات هەر لە ساڵی ١٩٧٩وە پاش گەڕانەوەی سەرانیان بۆ ناو ئێران و دروستکردنەوەی تشکیلاتی حزبی و پاشان پێشمەرگانەیان، یەکێتی هەوڵێکی زۆری لەگەڵدان کە دۆستایەتیەکی باشیان لەگەڵدا بمەزرێنێ و هاوکاریشیان بکات،لەڕووی پێکهێنانی هێزی پێشمەرگە وگەلێ شتی تری ڕێکخراوەیی. بەڵام حزبی دیموکرات بەپێچەوانەوە هەمیشە خۆیان دوور دەگرت و (ق.م) یان لە یەکێتی پێ

*١- ژمارە (١) ی کۆمەڵە خولی٢ کانونی دووەمی١٩٨٢ ڕێبەندانی١٣٦٠.

٢- ژمارە (٢) کۆمەڵە خولی٢ شوباتی١٩٨٢ڕەشەمێی ١٣٦٠.

باشتر بوو، لەگەڵ ئەو هەموو خراپکاریەی کە پارتی لەگەڵی دەکردن. هۆی ناکۆکی حزبی دیموکرات لەگەڵ یەکێتی، بوونی کۆمەڵەی ڕەنجدەران لەناو یەکێتی و کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشان بوو، لە کوردستانی ئێران. حزبی دیموکرات لای وابوو، کە کۆمەڵەی ئامۆزا بە نەخشە و پلانکاری کۆمەڵەی ڕەنجدەران دامەزراون و بۆ دژایەتی کردنی ئەوانیش دامەزرێنراوە. حزبی دیموکرات ڕای وابوو، پارتی بارزانی چەند دژایەتیان بکات کاتیە و ئەمانە حزبێکی دەرەکین و هەر دەڕۆنەوە دیوی عیراق، بەڵام کۆمەڵەی زەحمەتکێشان ڕێکخراوێکی ناوەکین و لە کوردستانی ئێراندا شوێنی پێ و پایەگای جەماوەریان هەیە و لە ئایندەدا مەترسیان لەسەر حزبی دیموکرات هەیە. ئەم بۆچوونە هەڵەیەی دیموکرات لە ساڵی (١٩٧٩) وە، تا دوای ناوەڕاستی ساڵی (١٩٨١)ی خایاند، تا بە تەواوی بۆیان ڕوون بویەوە، بە هەڵەداچوون، پاش ئەوەی بۆیان دەرکەوت یەکێتی بە کردەوە هاوکاریان دەکا لە شەڕەکان دژی پاسداری ئێرانی، بەڵام پارتی بارزانی لەگەڵ پاسدارەکان لێیان دەدەن.

بۆیە لە (١٩٨١/٩/١٦) کوڕاسێکیان دەرکرد بە ناوی (خیانەتەکانی قیادەی موەقەتە بە نەتەوەی کورد). بریتی بوو لەم بابەتانە:

١- سەرەتا.

٢- هەڵوێستی خەڵکی کوردستانی ئێران بەرامبەر بزوتنەوەی کوردستانی عیراق بە سەرۆکایەتی بارزانی..

٣- دەرچونی بەیاننامەی (١١ی مارسی١٩٧٠) و هەڵوێستی سەرۆکایەتی بارزانی بەرامبەر بە حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران.

٤- هەڵوێستی پارتی بەرامبەر حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران پاش بڵاوبونەوەی (١١ی مارس.....

٥- هەڵوێستی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بەرامبەر قیادەی موەقەتە دوای سەرکەوتنی شۆڕشی گەلانی ئێران.

٦- هەڵوێستی قیادە بەرامبەر بە حزبی دیموکراتی ئێران و بزووتنەوەی کوردی ئێران چ بووە؟

٧- مەسەلەی دزرانی تەرمی مەلا مستەفا بارزانی....

٨- بۆ هەموو حزب و ڕێکخراوە دیموکرات و پێشکەوتوخواز و دژی ئیمپریالیستەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

ئەم کۆمەڵە بابەتە هەر یەکەیان لەسەر ساڵ و مانگ و بارودۆخی جیاوازی ئێران و کوردستاندا نوسراون پاش شۆڕشی ئیسلامی ئێران تا ساڵی١٩٨١ . یەکێك لە ووتارەکانی کە ( هەڵوێستی حزبی دیموکرات ئێران بەرامبەر قیادەی موەقەت دوای سەرکەوتنی شۆڕشی گەلانی ئێران) ە ، ئەم ووتارە هی کۆبونەوەی چەند قۆڵی حزب و ڕێکخراوە ئێرانی و کوردستانیەکان بووە ، بۆ لێدان و دەرکردنی قیادەی موەقەت لە ساڵی ١٩٧٩ دا تەنها حزبی دیموکرات دژی بووە.

بەلأم بە ووتاری (٨) هەشتەم کە بانگەوازەکەیان بە ناوی (بۆ هەموو حزب و ڕێکخراوە دیموکرات و پێشکەوتوخواز و دژی ئیمپریالیستیەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست) ە، دوایین ووتاری ناو نامیلکەکەیە و داوای هاوکاری دەکات بۆ لێدانی قیادە و ڕیسواکردنیان لە مانگی (١٩٨١/٩) نوسراوە ، کە دژایەتی نێوانیان گەیشت لوتکە.

## ٨-٢. چەند هەوڵێکی نیمچە سەرکەوتوانەی کاتی.

ساڵی ١٩٨٢ساڵێکی نیمچە ئارام و پڕ هەوڵی لێك نزیکبوونەوەی براکان بوو،لە ساڵی ١٩٨١ گرژی و ئاڵۆزی پەیوەندی نێوان حزب و ڕێکخراوەکان گەیشتبووە لوتکە و وتاریکی شەڕ دەوری هەموو لایەکی گرتبوو . شەڕی ناوخۆ شەڕی براکوژی شەڕی پاوانخوازی و شەڕی دەسەلاتی بێ دەسەلات ، زۆربەی هەرە زۆری شەڕەکانیش لەلایەنی یەکێتیەوە و زۆربەی قوربانیەکانی هی کۆمەڵە بوو . جگە لەوەش

فەرماندەی شەڕەکان لە یەکێتیدا زۆربەیان کۆمەڵە بوون . حزبی دیموکرات و حزبی شیوعی و حسك و پاسۆکیش و پارتیش لەناو یەکێتیدا کۆمەڵەیان بە مایەی فیتنە و سەری ڕم دەزانی . کۆمەڵەش بۆ ئەوەی بیسەلمێنێ کە بۆچوونەکانی ئەو لایەنانە هەڵەیە ، لە سەرەتای مانگی (١٩٨٢/٢)* دا لە گۆڤاری وەرزی (کۆمەڵە)دا چەند وتارێکی بڵاوکردەوە ، کە بەشی هەرەزۆری تەرخانکرد بوو ، بۆ بانگەوازی ئاشتبوونەوە و دەست لەناو دەستی یەکتری نان بۆ پێکەوە کارکردن ، بۆ لێدانی دوژمن و گواستنەوەی سەنگەری براکوژی بۆ سەنگەری دژە ڕژێم. بۆیە لە یەکەم هەنگاودا هەوڵدرا لەگەڵ حسك دانیشتن بکرێ ، بە ناوبژیوانی کاك حەمەی حەمە باقی، بۆ ئەو مەبەستە یەکێتی پرۆژەیەکی چەند پێشنیاری ئاشتەواییان لە (١٩٨٢/٣/٩) بۆ حسك نارد . پرۆژەکە پاش نوسینی پێشەکیەکی کورت، کە لە ڕاستیدا ڕەنگدەرەوەی بۆچوونی سەرکردایەتی کۆمەڵە و دارشتنی نەوشیروان بوو ، قۆناغەکانی ئاشتبونەوەی کرد بوو بە دوو قۆناغ:

## - قۆناغی یەکەم.

هەردوولا یەکێتی و حسك بەڵێن بدەن بە یەکتری کە هیچ کامیان لەگەڵ هیچ لایەن و حزبێکی تردا هاوکاری سیاسی و پێشمەرگانە و ڕاگەیاندن نەکەن دژی ئەوی تریان . هیچ کامیان لەسەر حسابی ئەوی تریان بەشداری هیچ بەرەیەك یا هاوپەیمانیەکی دوو قۆلی و زیاتر نەکەن بۆ دژایەتی سیاسی ڕاگەیاندن و پێشمەرگانەی لاکەی تر . ئازادی کاری سیاسی و ڕاگەیاندن و پێشمەرگانە دژی ڕژێمی عیراق ، بۆ هەردوولا فەراهەم بکرێ و ئازادی گەشەکردنی ڕێکخراوەیی و پێشمەرگانە هەبێ بۆ هەردوولا و بەو مەرجەی دژی یەکتری نەبێ . لە هەموو ناوچە و شوێنێکی

---

* کۆمەڵە،ژمارە "٢" خولی "٢"ی شوباتی ١٩٨٢ .

کوردستان تواجدی هەردوولا هەبێ . هەردوولا یەکتری بسەلمێنن هەر کێشەیەکی لابەلا ڕوویدا هەر دوولا ڕێگای دیالۆگ و گفتوگۆی دیموکراتیانە بگرنەبەر و چارەسەری هێمنانەی بکەن . هەر دوولا پێشبڕکێی شەریفانە و دۆستانە بگرنە بەر بۆ چالاکی زیاتر و لێدانی دوژمن و هاوکاریکردنی یەکتری لە چالاکیەکاندا . گرنگترین خاڵی ئەم قۆناغە بریتی بوو لە (هەڵوەشاندنەوە و کار پێ نەکردنی هەموو ئەو بڕیار و ئامۆژگاریانەی ، کە لە هەردوولاوە دەرچوە بۆ دژایەتی کردنی یەکتری ) ئەگەر ئەم قۆناغەیان سەرکەوتنی بە دەستهێنا و ئەو خاڵانە کەوتنە بواری جێبەجێکردن و چاودێریکردن و خۆ بەستنەوەیان لە مەفرەزەیەکەوە تا مەکتەبی سیاسی هەردوولا ، ئەوسا قۆناغی دووەم دەست پێ بکەن .

**ـ قۆناغی دووەم .**

هەوڵدان بۆ یەکخستنی هەموو دامودەزگا گرنگەکان لە ڕووی سەرکردایەتی و بەرنامەی گشتی و هێزی چەکدار و شێوەی بەڕێوەبردنی ناوچە ڕزگارکراوەکان بە جۆرێك هێزی پێشمەرگەی هەردوولا و دارایی هەردوولا و ڕاگەیاندنی هەردوولا یەك بگرێ ، و پاشان بەڕێوەبەرایەتی یەکگرتووی هەر دوولا لە ناوچەکاندا ڕێکبخرێ بە جۆرێ کە نوێنەری دەسەڵاتەکانی خەڵك و شۆڕش بن لە ناوچە ڕزگارکراوەکان بۆ یەکخستنی پەیوەندی نێوان خەڵك و شۆڕش . بە هەمان شێوەش هەوڵ لەگەڵ پاسۆکیش درا و لەگەڵ حزبی شیوعیش و تەنانەت لەگەڵ سامی و لەشکری ئیسلامیش . ئەم پرۆژەیە لەگەڵ هیچیان سەری نەگرت . لێك نزیکبوونەوە و گفتوگۆ و سەردان و جۆرێك لە ئاشتەوایی سەری گرت و ساڵی (١٩٨٢) جگە لە شەڕی سوپای پاسداران و چالاکی دژی هێزەکانی ڕژێمی عیراق پشێوێ و ئاژاوەیەکی ئەوتۆ ڕوویی نەدا. بە پێچەوانەوە سەبارەت بە بەرپابونی خۆپیشاندان و ڕاپەڕینی شارەکان لە یادی٨ ساڵەی بۆردومانی قەڵادزێ ، هەموو لایەنەکان لەسەر پشتیوانی

کردن و هاندانی خۆپیشاندان کۆك بوون و دەتوانم بڵێم ئەو خۆپیشاندانانە وەك هەوێنێك وابوو ، بۆ ئەو ئارامیەی کوا ئەوساکە هەبوو.

### ٨-٣. یادی( ٨ )ساڵەی بۆردومانی قەلآدزە و هەڵچونی جەماوەری.

لە ساڵیادی بۆردومانی قەلآدزەدا لە (١٩٧٤/٤/٢٤)دا،بریاردرا لە هەمان ڕۆژی ساڵی ١٩٨٢ دا بە هاندان و پشتیوانی و ڕێکخستنی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لە قەلآدزە و لەسەر گردی شەهیدەکانی بۆردومان کردنەکە، کە خەڵکێکی زۆر لە مامۆستا و قوتابی و کاسبکاری شاری قەلآدزە لەیادی ئەو شەهیدانەی، کە ژمارەیان پتر لە(١٥٠) شەهید دەبوون، بە بەرزکردنەوەی چەند لافیتەیەك لە گۆڕستانەوە بەرەو ناو شار بە جادەی سەرەکیدا کەوتنە خۆپیشاندان، ڕادیۆکەی خۆمان پێشتر خۆی بۆ ئامادەکرد بوو، لەگەڵ گەیشتنی هەواڵی خۆپیشاندانەکە ڕادیۆکە بە بەرنامە کەوتە هاندان و پشتیوانی خۆپیشاندەران و چەند ووتارێکی شۆڕشگێڕانە و ڕیپۆرتاژێکی بە دەنگی لەسەر بلآوکردەوە و چەندین دروشم و داخوازی گونجاو و کورتە ووتاری و ڕوژێنەرانەشی لە ڕێگەی ( حاکم برایم و هاوار جەلال)ی لێپرسراوی لیژنەی ناوچەی قەلآدزە گەیاندە ڕێکخستنەکانی ناوخۆی کۆمەڵە لە قەلآدزێ و سەنگەسەر و بەستەسێن و تەوەسوران و ڕانیە و پاشان سلێمانی و هەولێر و زۆربەی شار و شارۆچکەو ئۆردوگاکانی کوردستانی گرتەوە و تەنیەوە، لەم خۆپیشاندانانە چەندین کەس شەهید و برینـدار بوون و گیران . لەگەڵ ئەوەی، کە ڕێکخراو وحزبە کوردستانیەکان و حزبی شیوعیش بەشداری لە هاندانی خەڵکی کرد. بەلآم ئەو ڕاستیەکی بەڵگە نەویستەکە، کە هەر لە سەرەتاوە کۆمەڵە نەخشەکەی بۆ کێشاو و ڕابەری کرد تا دیاریکردنی دروشمەکان وردە وردە کشانەوەیان پێکردن، ئەو خۆپیشاندانانە هێندە فراوان و ئیقلیمگیر بوو، ڕژێم ترسی لێ نیشتبوو ، کە ئەو خۆپیشاندانانە ببێتە ڕاپەڕین و جڵەوی لەدەست دەربچێ، جگە لەوەش

داخوازیەکانی خۆپیشاندەران، کە دیسان کۆمەڵە دایرشتبوو، زۆر قورس و قەبە نەبوون، کە ڕژێم لای سەخت بێ جێبەجێ بکات . بەرزترین داخوازیەکانی بریتی بوون لە:

١- بەردانی گیراوەکان لە خۆپیشاندەران.

٢- گەڕانەوەی ڕاگوێزراوەکانی لادێکان بۆ سەر زەوی و زاری خۆیان ، کە کرا بووە ناوچەی قەدەغەکراو.

٣- دەست هەڵگرتنی حکومەت لە ڕاوەدونانی خەڵکی و سیاسەتی تۆقاندن.

ڕژێم کەم تاکورتێ هەندێ هەنگاوی نا بە ناڕاستەوخۆ بۆ جێبەجێکردنیان. ئەو خۆپیشاندانانە هێندە فراوان و بەربڵاو پڕ قوربانی بوو ، کە ناکرێ لە مێژووی شۆڕشی نوێ و کۆمەڵە و کوردا فەرامۆش بکرێن، لەو خۆپیشانانەدا نزیکەی (٢٥تا٣٠ شەهید و ١٥٠-١٦٠بریندار و پتر لە ٦٠٠ گیراو هەبوو کە تا ئەوکاتە بە فراوانترین و بەهێزترین خۆپیشاندانی جەماوەری دەژمێردرێ لە مێژووی شۆڕشی نوێدا.

## پێشڕەوی سوپای پاسداران و تەنگاوی حزبی دیموکرات و هێزی پشتیوان.

سەبارەت بە سەرنەگرتنی هەوڵ و تەقەلای " مام جەلال " و پاشان هاتوچۆی نوێنەرانی شۆڕشی کوردستانی ئێران لەگەڵ کۆماری ئیسلامی ئێران و دروستبوونی ناکۆکی نێوان هەردوو باڵی میانڕۆ و توندڕەوانی سەرانی کۆماری ئیسلامی و شکستی میانڕەوەکان و زاڵبوونی دەسەلاتی توندڕەوەکان، کۆماری ئیسلامی هێرشێکی توند و بەربڵاوی کردە سەر کوردستان و بە خێرایی پێشڕەوی دەکرد و هێزەکانی کوردی و ئێرانی ئۆپۆزسیۆنیش بە تایبەت حزبی دیموکرات و کۆمەڵەی ئامۆزا. لە پاشەکشەیەکی خێرادا بوون ڕووەو سنوری هەردوو پارچەکەی کوردستان، حزبی دیموکرات و کۆمەڵەش نوێنەریان هاتە توژەڵە بۆ بارەگای هاوینەی مام جەلال لە

مانگی (١٩٨٢/٩) به فەرمی داوای یارمەتیان لە یەکێتی و حزبی شیوعی کرد. حزبی شیوعی لە ڕێگەی سکرتێریانەوە (عەزیزمحەمەد) وەڵامیان دانەوە کە ناتوانن بڕیار بدەن دەبێ دراسەی بکەن. (د. قاسملۆ) ووتی: تا ئێوە دراسەی دەکەن ئێمە هەموو شوێنەکانمان دەگیرێ؟

مام جەلال و نەوشیروان وەك نوێنەری یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و کۆمەڵە ئامادەییان دەربڕی بوو بە ناردنی هێز بۆ هاوکاری حزبی دیموکرات، تەنانەت "مام جەلال" ووتبوی: ئامادەین شۆڕشەکەی خۆمان لەم دیو ڕاگرین و هەموو هێزمان بنێرینە لاتان بۆ پشتیوانی کردنتان.

لە ڕاستیدا ئامادە بوونی یەکێتی بۆ هاوکاری شۆڕشی کوردستانی ئێران لەبەر ئەم هۆیانە بوو:

١- لە کوردستانی عیراقدا جۆرە ئارامیەك و نیمچە ڕێکەوتنێکی ناو هێزە کوردستانیەکان هەبوو.

٢- کۆماری ئیسلامی ئێران هەموو پەیوەندیەکی خۆی لەگەڵ یەکێتی بڕیبوو.

٣- ئێران دەستی بەسەر هەزاران پارچە چەکی ئێمە گرتبوو.

٤- شەهید عبدولرەحمان قاسملۆ کەوتبووە نێوانەوە، لە نێوان یەکێتی و حکومەت لە هەنگاوی یەکەمدا لەو کاتەدا هەر هەوڵ و تەقەلا بوو ، بۆ لێك نزیککردنەوە.

٥- حکومەتی ئیسلامی ئێرانی بە پارە و چەك کۆمەڵێ حزب و ڕێکخراوی لە دژی یەکێتی هان ئەدا (لەشکری ئیسلامی ،پاسۆك ،حسك ،پارتی) بۆیە یەکێتیش بڕیاریدا وەك هاوکاری و هەم وەك پشتیوانی شۆڕشی کوردستانی ئێران و هەم وەك تۆڵە سەندنەوە و فشارخستنە سەر کۆماری ئیسلامی (٢٥٠٠) پێشمەرگە بنێرێ بۆ یارمەتیان و مام جەلال خۆشی چووە گوندی (ساوێن) تا لە نزیکەوە سەرپەرشتی هێزەکان بکات .

حزبی شیوعی و حسك وپاسۆك، نەك هەر یارمەتی شۆڕشی كوردستانی ئێرانیان نەدا ، بەڵكو پڕوپاگەندەی خراپیشیان بۆ یەكێتی دەكرد ، گوایە یەكێتی لەگەڵ بەعس ڕێكەوتوە كە شەڕی لەگەلا ڕابگرێ و شەڕی ئێران بكەن . پارتیش بەو هیوایەی لەگەڵ سوپای پاسداراندا پێشرەوی بكا و بێتەوە ناوچەكانی بادینان و حاجی ئۆمەران و ناوچەكانی ژێر دەسەلاتی یەكێتی . بوو بە بەشێكی سوپای پاسداران بۆ لێدانی شۆڕشی كوردستانی ئێران . لەناو كۆمەڵەی ڕەنجدەرانی خۆشمان ، بە ئاشكرا لایەنەكەی كۆمیتەی هەرێمەكان و لە هەموویان زیاتر سالار و تاقمەكەی پێشمەرگەیان هان ئەدا ، كە نەچن و هاوكاری شۆڕشی كوردستانی ئێران نەكەن هاوبیر لەگەڵ بەرەی جوددا.

ئەم هاوكاری و پشتیوانیە ماوەیەكی كورتی چەند مانگی خایاند لە سەرەتای مانگی (١٩٨٢/٩) تا كۆتایی مانگی (١٩٨٢/١١)ی خایاند. ئێران هەموو ناوچەكانی گرتەوە.لە ماوەی ٣ مانگی شەڕدا بە پشتیوانی یەكێتی، حزبی دیموكرات و كۆمەڵە توانیان بارەگا و ئێزگە و دێكۆمێنت و كەلوپەلی بارەگا كانیان دەربازكەن و بیانگەیەننە سەر سنور بە دیوی كوردستانی عیراقدا. لە هەمانكاتیش پاشەكشەیەكی ڕێكوپێك بە هێزەكانیان بكەن نەك بە پەرش و بلاوی.

## ٨-٤. هۆڵی شەهید شەهاب و كۆنفرانسی دووی كۆمەڵە.

كۆمەڵە سەبارەت بە هەندێ هۆی كاریگەر لە گەشەكرنێكی خێرا و بەپێزدا بوو:

١- وەرزنامەی كۆمەڵەی ئۆرگانی ناوەندی كۆمەڵە و زنجیرە بلاوكراوەكانی لەڕووی چۆنایەتیەوە تەوژمێكی پتەوی بە كۆمەڵەدابوو، دیسان هاندەرێكی بە هێزیش بوو، بۆ هوشیار كردنەوەی جەماوەر.

٢- زۆربەی فەرماندە پێشمەرگەییەكان و لێپرسراوەكانی هێزی پێشمەرگە كۆمەڵە بوون، و زۆربەی چالاكیەكانیش لەلایەن ئەوانەوە دەكرا. ئەمەش كاریگەریەكی بە هێزی هەبوو ، لەسەر ڕووكردنە كۆمەڵە لەلایەن جەماوەرەوە.

٣- کادرەکانی کۆمەڵە و ئەندامەکانی لەناو شۆڕشدا وەك ڕابەری سیاسی مەفرەزە و کەرت و تیپەکان و هەرێمەکان بەشداری زۆر چالاکانەی چالاکیەکان و هاوکاری جەماوەریان دەکرد.

٤- ڕێکخستنی شارەکان کە بە شێوەیەکی نویێ ڕێکخرا بونەوە و جۆرێك لە ئۆتۆنۆمی کارکردنیان هەبوو،بە سەرپەرشتی (سەرکردایەتی ڕێکخستنی ناوخۆ) کە ئەوانیش ڕاستەوخۆ پەیوەندیان بە نەوشیروانی سکرتێری کۆمەڵەوە هەبوو. لە ڕێکخستنەکانی هەموو حزبەکانی تری سەر گۆڕەپانی کوردستان بەهێزتر بوون، بەردەوام ئەندامی هوشیار و پێشکەوتو خوازیان دەنارده ناو شۆڕش.

٥- سەربازی ڕاکردوو بە هۆی شەڕی ئێران و عیراق نیشتەجێبونیان لە ناوچە ڕزگارکراوەکان کادرانی کۆمەڵە هەوڵیان دەدا ، کە کەسە هوشیار و نیشتمانپەروەرەکانیان لێ هەڵبژێرن و ڕێکیانخەن . لە ڕاستیدا سەربازە ڕاکردوەکان هەم سودێکی زۆریان هەبوو، کە بەشی هەموو لایەکی دەکرد، بەوەی ببنە پێشمەرگە و جەماوەری حزبەکان، بەلاّم لەلایەکی تریشەوە بەشی زۆریان هێزێکی فشەڵی وورە ڕووخێنەر بوون، لەگەڵ هەر لێبوردنێکدا کە ڕژێمی سەدام دەریدەکرد، بەکۆمەڵی زۆر زۆر دەڕۆیشتنەوە ناو باوەشی حکومەت و تەسلیمدە بوونەوە. حکومەتی عیراقیش وای پیشاندەدا، ئەمانە هەموو پێشمەرگە بوون،پاش ماوەیەك حکومەت هەر بۆ ئەوەی نەبنە کەرەسەیەکی خاوی شۆڕش، فەوجی بۆ کردنەوە لەجیاتی سەربازی کردن لەبەرەکانی شەڕ، ببنە مەعاش خۆری مستەشارەکان (ئامر فەوجە جاشەکان). ئەمانە و چەندین هۆی تر، وای لە کۆمەڵە کرد، بیر لە دروستکردنی هۆڵێکی گەورە بکاتەوە بۆ کۆبونەوەی فراوان و سیمینار گرتن، پاشان بۆ ئەو مەبەستە هۆلێك لەناوزەنگ ، بەناوی " شەهید شەهاب" دورستکرا.

**کۆنفرانسی دووی کۆمەڵە.**

**دوای ئەوە بەهۆی چەندین هۆکارەوە، بیر لە گرتنی کۆنفرانسی دووی کۆمەڵە کرایەوە:**

١- پەرەسەندنی کێشەی ناو کۆمەڵە و بەئاشکرا بەرهەڵستکردنی بیری پارتی پێشڕەوی چینی کرێکارانی کوردستان و کوردستانی بوونی کۆمەڵە.

٢- دەرچوونی نامیلکەی (پارتی پێشڕەوی چینی کرێکارانی کوردستان) لە١/١٢/١٩٨١ و دەرچوونی دژەکەی (چەند سەرنجێکی ڕەخنەگرانە دەربارەی نامیلکەی پارتی پێشڕەوی چینی کرێکارانی کوردستان) لە٥/٢/١٩٨٢، و دەرچونی نامیلکەی (لێدوانێك لەسەر نامیلکەی چەند سەرنجێکی ڕەخنەگرانە) لەلایەن ڕێکخراوی سلێمانی کۆمەڵەوە زنجیرە(٧).

٣- قەبە بوونی هێزی پێشمەرگە لە ڕووی ژمارەوە کە پێویستی بە شێوەیەکی نوێ دەکرد لە دابەش کردنی بەسەر ناوچە و هێزەکاندا.

٤- فراوانکردنی دەسەڵاتی سیاسی وپێشمەرگانەی ناوچە ڕزگارکراوەکان.

٥- دابەشکردنی ئەندامانی سەرکردایەتی بەسەر ناوچە ڕزگارکراوەکان و سەرپەرشتی کردنی هێزەکان لە نزیکەوە.

٦- فراوانکردنی بنکەی سەرکردایەتی بە ژمارە واتە لە جیاتی ئەوەی هەموو سەرکردایەتی لە یەك شوێن و یەك ناوچە بن ،دابەش ببن بەسەر چەند ناوچەیەك و پێکهێنانی چەند بنکەی سەربازی تر .

٧- بۆ لێدوان و هەڵسەنگاندن و بیروڕا دەربڕینی بە کۆمەڵی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە ، لەسەر ئەگەری دروستبوونی زەمینەی ووتووێژ لەگەڵ حکومەت.

٨- بۆ داڕشتنی بەرنامەیەکی نوێی گونجاو بۆ ئایندە سەبارەت بە چۆنیەتی چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوایەتی و کۆمەڵایەتی.

لە مانگی (٨/١٩٨٢)دا بەشداری (٢٢٢) ئەندام کە نوێنەری ڕێکخستنەکانی دەرەوە و ناو شارەکانی کۆمەڵە بوون ، کۆنفرانسی دووی کۆمەڵە لە هۆڵی" شەهید شەهاب" لە

خری ناوزەنگ گیرا . دوای خوێندنەوەی ڕاپۆرتی گشتی وتاری "مام جەلال" ، کۆنفرانس کەوتە لێدوان و تاوتوێکردنی ئەو خالآنەی کە کۆنفرانسی بۆ بەسترا . دوا بەشی کۆنفرانس تەرخانکرا بۆ هەڵبژاردنی سەرکردایەتی کۆمەڵە.

## بەرهەمەکانی کۆنفرانسی دووی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان

١- یەکلایکردنەوەی کێشەی عیراقچێتی و کوردستانی کۆمەڵە.

٢- لە دایکبوونی مەڵبەندەکان کە چوار مەڵبەند بوون .

٣- دانانی یەکەم بەرنامەی پێشکەوتنی کۆمەلآیەتی کە خۆی لە (ئازادیە دیموکراتیەکان، گەشە پێدانی کۆمەلآیەتی،ئاواکردنەوەی کوردستان ) دەنواند.

٤- دانانی بەرنامەی چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوایەتی نەتەوەی کورد.

٥- نیمچە ڕێکەوتنێکی نێوان یەکێتی وپارتی لەسەر ڕێگەدان بە چالاکی کردنی هێزەکانی هەردوولا لە بادینانەوە تا سۆران ، کە بەداخەوە ئەم ڕێکەوتنە زۆر تەمەن کورت بوو .

## .کێشەکەی چەرمەگاولیژنەی لێکۆڵینەوە

دوای دوو - سێجار هاتوچۆی (کاك حەمەی حەمە باقی شاعر) بۆ لای پارتی و ناوبژیکردن ڕۆژی (١٩٨٢/٧/٢٨) بۆ یەکەمجار نوێنەرانی یەکێتی وپارتی لە بارەگای حزبی شیوعی لە پشت ئاشان دانیشتنیان کرد. وەك پیشاندانی نیازچاکی هەردوولا لەسەر چەند خالێکی کاتی و ڕێکەوتن ، کە بریتی بوون لە سێ خالْ:

١- هەردوولا گیروگرفتەکان و ناکۆکی نێوانیان بە گفتوگۆ و ئاشتیانە و دیالۆگ چارەسەر بکەن و پەنا نەبەنە بەر چەك و سەنگەر لە یەکگرتن.

٢- لە خانەقینەوە تاکو زاخۆ ئازاد بێ بۆ چالاکی پێشمەرگانە و سیاسی بۆ هەموو لایەنەکان.

٣- هێزەکانی پارتی و یەکێتی بە ئاگاداری یەکتری بۆیان هەبێ بچنە سنووری ناوچەکانی یەکتری، بەلام بێ دەستێوەردان لە کاروباری یەکتری لە حوکمی ناوچەکاندا، تا زەمینەی پتر لێك نزیکبوونەوە خۆشتر دەبێ و جۆرێکی تر لە تێکەڵاوبوون ئەدۆزرێتەوە. بەپێی ئەم ڕێکەوتنە، بەشێك لە هێزەکانی پارتی چوونە ناوچەی باڵەك و دەشتی هەولێر و ناوچەی شارباژێڕ و سلێمانی. کاتێ کە هێزەکانی یەکێتی خۆیان ئامادەکرد بچنە ناوچەی بادینان وناوچەکانی ژێر دەسەلاتی پارتی، لە ڕێگەی حزبی شیوعیەوە لە (١٩٨٢/١١/٢١)داپارتی ناقایلی خۆی بۆچوونی یەکێتی بۆ بادینان ڕاگەیاند بوو. حزبی شیوعی بە نوێنەرانی یەکێتی ووتبوو : پارتی قایل نیە بە چوونی ئێوە بۆ بادینان و ئەو ڕێکەوتنە مادام لەپشت ئاشان کراوە ڕێکەوتنێکی ناوچەییە و بادینان ناگرێتەوە. لە سەرەتای مانگی (١٩٨٢/١١)دا بو"مام جەلال"ناردی بەدوامدا ئەوکاتە لە(ساوێن )بوو بۆ سەرپەرشتی هێزی پشتیوان پێی ڕاگەیاندم: کە وەك نوێنەری یەکێتی بڕۆم بۆ شارباژێڕ و لەوێوە پێشمەرگە لە (کاك بەکری حاجی سەفەر) وەرگرم ولەگەڵ (نادر هەورامی و یادگاری برازای فەتاح ئاغا و قالە ڕەشدا) بڕۆین بۆ لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانی لەسەر ئەو ڕووداوەی، کە لە نزیك چەرمەگا لە نێوان پێشمەرگەکانی یەکێتی و مەفرەزەیەکی پارتیدا ڕوویداوە، کە بۆتە هۆی کوژرانی چەند پێشمەرگەیەك لە هەردوولا و بردنی چەکەکانی مەفرەزەکەی پارتی لەلایەن پێشمەرگەکانی یەکێتیەوە. مام جەلال دەسەلاتی تا چەك کردن و دەرکردن و زیندانی کردنی پێشمەرگەکانی یەکێتیشی دامێ. گەیشتمە شارباژێڕ لە گوندی چنگیان تووشی (کاك بەکر و نادر هەورامی و حەمە یادگار) بووم . کاك بەکر ٣ پێشمەرگەی دامێ ، نادر هەورامی پێی ووتم : هەر ئەوەندەت لەگەڵە ؟.

ووتم: ئەوە نیە٢٠٠- ٣٠٠ پێشمەرگەی ئێوەم لە گەڵایە. بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەواندا بە جەولە نەڕۆم تا گوندی قزلەر، کاتی یەکگرتنەوەمان لە گوندی قزلەر بۆ ڕۆژی (١٩٨٢/١١/٧)دانا لای ئەوانم بەجێهێشت لەبەر ئەم هۆیانە:

١- ئەوان نزیکی ( ٢٠٠ بۆ ٣٠٠) چەکدار دەبوون، بەلام ئێمە چوار چەکدار بووین.

٢- هێزەکانی ئێمە لە شارباژێڕ و دۆڵی جافەتی، جگە لە کەرتی شەهید (جەلالی حەمەی محە) هەمو چوو بون بۆ یارمەتی شۆڕشی ئێران لەوە دەترسام گێچەڵێکمان پێ بکەن.

٣- لە ڕاستیدا ئەوان تەواو پێچەوانەی مەرجەکانی ڕێکەوتنەکە دەجولانەوە و دەستیان لە کاروباری خەڵکی و هەڵوەشاندنی ئەنجومەنەکان و حاکمیەتی ناوچەکە وەردەدا، گەر لەگەڵیان بوماپە دەبوایە ڕێگریان بکەم ئەوەش بە چوار چەکدار نە دەکرا.

ڕۆژی(١٩٨٢/١١/٧) لە قزلەر یەکمان گرتەوە. من پێشتر لە (١١/٥) گەیشتبووم ، هەوڵمدا پێشمەرگەیەکی ئەوان بیدۆزمەوە ، کە لە شەڕەکەدا بریندار ببوو، دۆزیمەوە و لێکۆڵینەوەم لەگەڵدا کرد. دانی بەوە دانا کە ڕووداوە کە بەو جۆرە بووە:

مەفرەزەکەی پارتی لەگەڵ مەفرەزەیەکی یەکێتی لە چەرمەگا بڕیاریانداوە شەو پێکەوە بچنە سلێمانی و چالاکیەك ئەنجام بدەن.لە ڕێگا فەرماندەی مەفرەزەکەی پارتی بە چەکدارەکانی خۆی ووتوە : کە لە مەفرەزەکەی یەکێتی بدەن و بڕۆن خۆیان تەسلیم بە حکومەت بکەنەوە لەسەر جادەی تاسلوجە - دوکان لە عاستی چەرمەگا چەکدارەکانی هەردوولا کە لە دوو سەیارەدا دەبن، چەکدارەکانی پارتی لە دواوە چەکدارەکانی یەکێتی دەدەنە بەر دەسڕێژی گوللە و چواریان لە پشتەوە دەپێکرێن و دەکوژرێن، چەکدارەکانی تری یەکێتیش دادەبەزن و لەمانەی پارتی دەدەن حەوتیان دەکوژرێن و یەکیان بە برینداری لەناو کوژراوەکاندا خۆی مات دەکا، تا چەکدارەکانی یەکێتی دەڕۆن، ئەمیش لە برینداری خۆی دەگەیەنێتە بناری زێوێ و لەوێوە لە ڕێگەی خەڵکەوە دەگاتە قزلەر، من دەنگی بریندارەکەی پارتیم تەسجیل کرد، تا ئەوان لە ڕۆژی ١٩٨٢/١١/٧ گەیشتن، منیش جوابم بۆ کاك جەلال ناردبوو هەموو* پێشمەرگەکانی کەرتەکەی خۆی و ئەو تاك وتەرا پێشمەرگانەی تریش کە مۆڵەتی پێشوویان وەرگرتبوو کۆبکاتەوە نزیکەی (٥٠)پێشمەرگەیەك دەبون. لە قزلەر داوام لە برادەرانی پارتی کرد بۆ لێکۆڵینەوە دوو ڕێگەمان هەیە:

---

* مەبەست شەهید جەلال محەمەد محییدینە.

١- هاتنی یەکێك لە بەرپرسەکانیان و مەفرەزەیەکی ئەوان و من و مەفرەزەیەکی ئێمەش بۆ چەرمەگا و لێکۆڵینەوە لەگەڵ مەلای مزگەوتەکە، کە ئاگاداری شتن و ناشتنی تەرمی کوژراوەکانی هەردوولا بووە. لەگەڵ چەند کەسێکی تری ناو دێکە وپاشان بانگ کردنی ئەو پێشمەرگانەی یەکێتی، کە لەو شەڕەدا بوون و ماون بۆ لێکۆڵینەوە.

٢- یان بانگکردنی مەلای چەرمەگا و ئەو کەسانەی کە ئاگایان لە ڕووداوەکە بووە، لەگەڵ بانگکردنی پێشمەرگەکانی یەکێتی کە لەو شەڕەدا بوون، ئەو بریندارەی پارتیش، کە لە قزلەر پەنایان دابوو تیماریان دەکرد. برادەرانی پارتی ئامادە نەبوون بۆ لێکۆڵینەوەی مەیدانی، واتە چوون بۆ چەرمەگا. بۆیە ناردمان بە دوای مەلا وپێشمەرگەکانی یەکێتی و دوو پیاوی چەرمەگایش، کە خاوەنی ئەو ماڵانە بوون، هەردوو فەرماندەی مەفرەزەکان پێش ڕۆیشتن لایان حەوابوونەوە. ئەنجام مەلا سوێندی خوارد، کە چوار پێشمەرگەکەی یەکێتی لەپشتەوە پێکرابوون و پێشمەرگەکانی پارتیش لەپێشەوە پێکرابون. ووتیشی: دەتوانن گۆڕەکانیان هەڵدەنەوە، دوو هاوڵاتیەکەش سوێندیان خوارد، کە ئاگاداری ڕووداوەکە بوون و چەکدارەکانی پارتیش دەست پێشکەر بوون، پێشمەرگە بریندارەکەی پارتیشمان هێنا لە بەردەمی ئەوان هەموو ڕاستیەکانی ووت و هەر لەوێش داوای کرد کە تەسلیم بەپارتی نەکرێتەوە. پاش قەناعەتکردن و قایلبوونی "نادر هەورامی و حەمە یادگار" بە ئەنجامی لێکۆڵینەوەکە، بەیانێکمان نووسی و پێکەوە ئیمزامان کرد ، کە تاوان لە کوژراوەکانی ئەوانەوە بووە، بۆیە:

١- پێویست بە سزادانی پێشمەرگەکانی یەکێتی ناکا.

٢- چەکەکانی ئەو مەفرەزەیەی پارتی بدرێتەوە بە پارتی.

٣- ئەم بەیانە لە ئێزگەی هەردوولا بخوێنرێتەوە.

ئێمە لە کۆتایی کارەکاندا بووین ، کە نامەیەك لە سەرکردایەتیەوە هات ، ئاگاداری هێزەکەی پارتی بکەین ، بگەڕێنەوە ناوچەکانی پێشووی خۆیان لەبەر ئەوەی پارتی ڕێگە نادات هێزی یەکێتیش بچێتە بادینان لە ڕۆژی (١٩٨٢/١١/١٥) عەلی بچکۆل و

دەستەی مەڵبەندی(٢) یەکێتی،کە تازە دانرا بوون لەگەڵ هێزی مەڵبەنددا گەیشتنە بەرگەڵو ودەوری مالومە، نامەیەکی سەرکردایەتیشیان بۆ من هێنابوو، کە بە پەلە بگەڕێمەوە سەرکردایەتی . مەڵبەندی (٢) لە ١٩٨٢/١١/٢٥ بە فەرمی ئاگاداری پارتیان کرد، کە لە ناوچەکە بکشێنەوە و کشانەوە شارباژێڕ و لەوێ لەگەڵ هێزی مەڵبەندی (١) بە لێپرسراوی مەلا بەختیار تووشی بەیەکدا هەڵبژان بوون و بو بە سەرەتای کەوتنەوەی شەڕێکی ئیقلیمگیر.

## ٨-٥. دروستبوونی یەکێتی شۆڕشگێڕان.

هەرلە کاتی سەرقاڵی کۆمەڵە بە کۆنفرانسی دوو ،بزووتنەوە دەستکردەکە و هێڵی گشتی لە کۆبونەوەیەکی فراوانی خۆیدا ، کە ناونرا کۆنفرانسی یەکگرتن یەکیانگرت لە ژێر ناوێکی نوێوە کە ناونرا (یەکێتی شۆڕشگێڕان) ، ئەم یەکگرتنە لەسەر داخوازی " مام جەلال" و بە تەقەلای خۆی بوو، "مام جەلال" بۆقوت کردنەوەی هێزێکی بە قەبارە زل وبەتوانا لە بەرامبەر کۆمەڵەدا، هەوڵێکی زۆری بۆ پشتیوانی و پشتگیری کردنیاندا تاڕادەی ناوزەندکردن و بەشداریکردنی لە هەڵبژاردنی سەرکردایەتیەکەیدا بە سکرتێری شۆڕشگێڕان، کۆمەڵە ئەو کارەی بە باشە و بە ئیجابی دانا، چونکە لە هەوی ساری ئەرکەکاندا لە باتی سێ فلیقانە بوو، بە دوو فلیقانە واتە هەر لە (م .س) وە تا بچوکترین ئۆرگانی ناو یەکێتی بە هەموو دەزگاکانیەوە لە باتی ئەوەی لە(٣) کەس ( کۆمەڵە، بزووتنەو، هێڵی گشتی) پێکبێ، لە دوو کەس پێکدەهات واتە (کۆمەڵەو شۆڕشگێڕ)ێك، کە بە ڕاستی تاڕادەیەك هەلی دەسەلات گرتنەدەست لە بەردەم هەڵپەرستان کەم بۆوە. بەلاّم نیگەرانی کۆمەڵە لەوەدا بوو، کە لە حاڵەتی بوونی "مام جەلال" بە سکرتێری شۆڕشگێڕان واتە نەمانی مافی سکرتێری گشتی. گەر یەکێتی لە دوو باڵ پێکهات بێت و هەردووکیشیان سکرتێری خۆیان هەبێ، دەبێ؟:

١- یان مام جەلال دەست لە سکرتێری گشتی هەڵبگرێ و بە هەڵبژاردن و لە ڕێگەی گرتنی کۆنگرەیەکی یەکێتی سکرتێری گشتی هەڵبژێردرێ.

٢- یان سکرتێری گشتی یەکێتی دەوری بێت واتە ٦ مانگ جارێک یا ساڵی جارێک سکرتێری گشتی لە نێوان کۆمەڵە و شۆڕشگێڕاندا ئاڵوگۆڕ بکرێ.
٣- یان دەبێ مام جەلال واز لە سکرتێری شۆڕشگێڕان بهێنێ. دیارە مام جەلال ئەوەی لا باشتر بوو، کە خاڵی(٣) پەسەند بکات،بۆیە(د. فوئاد مەعسوم) بوو بە سکرتێری شۆڕشگێڕان.

## ٨-٦. دامەزراندنی مەڵبەندەکان .

لە باسی کۆنفرانسی دووی کۆمەڵەدا ئاماژەم بەوە کرد، کە یەکێك لە بڕیار و بەرهەمەکانی کۆنفرانسی دووی کۆمەڵە گۆڕینی سیستەمی سیاسی و پێشمەرگانە و ئیدارە و ڕاگەیاندن و پەیوەندی دارایی یەکێتی بوو، لەهەرێمەوە بۆ سیستمی مەڵبەند و هۆکارەکانی. سەرکردایەتی یەکێتی دابەشکرا بە پێنج بەشەوە:
١- سەرکردایەتی گشتی کە بریتی بوون لە (م.س) و دەزگاکانی پێشمەرگایەتی، ڕاگەیاندن ، بەڕێوەبەرایەتی ، دارایی ،پەیوەندیەکان ، کە هەر یەکەیان ئەندامێکی سەرکردایەتی بەرپرس بوو ،پێی دەوترا (مکتب) واتە مەکتەبی ئیعلام ، مەکتەبی عەسکەری ، مەکتەبی دارایی ، مەکتەبی ئیداری، مەکتەبی پەیوەندیەکانی دەرەوە و ناوخۆ.
٢- مەڵبەند پێکهاتبوو لە:
- لێپرسراوی مەڵبەند ، کە ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی بوو.
- لێپرسراوی کاروباری پێشمەرگە و سەرپەرشتی تیپەکان.
- لێپرسراوی کاروباری کۆمەڵایەتی و ئەنجومەنی دێهاتەکان و زیندان و قوتابخانە و نەخۆشخانە و کێشە کۆمەڵایەتیەکان.
- لێپرسراوی سیاسی کە لێپرسراوی ئۆرگانەکانی سیاسی ، واتە ڕابەر سیاسیەکانی دەکرد.

– لێپرسراوی ڕاگەیاندن،لێپرسراو بوو لە دەرکردنی بەیان و بلاوکراوە لە سنوری مەڵبەندەکەی خۆی و ناردنی چالاکی پێشمەرگە بۆ مەکتەبی ڕاگەیاندنی گشتی و بەشی ڕادیۆ.
– لێپرسراوی دارایی بەرپرس بوو لە خەرج و پەیداکردنی داهات بۆ مەڵبەنەکە لە سنوری مەڵبەندەکەی خۆیدا .
سنوری چالاکی و تواجدی ژێر دەسەلاتی یەکێتی کرا بە چوار مەڵبەندەوە:

**مەڵبەندی یەك:**

بارەگاکەی لە حاجی مامەند بوو، پاشان چووە بەلەکجار لە بەری قەرەداغ .
ئەم تیپانە سنوری چالاکیان بەسترا بۆوە ، بەو مەڵبەندەوە:
تیپی (١٥) هەورامان، (١١) شارەزور، (٣١) بەرزنجە،(٣٣) سلێمانی ،(٣٧) شاربازێڕ.

**مەڵبەندی دوو:**

بارەگای لە سەرگەڵو بوو ، ئەم تیپانە و سنوری چالاکیان بەسترابۆوە بەم مەڵبەندەوە:
تیپی (٢١) کەرکوك،(٢٣) سورداش،(٤٧) پیرەمەگرون ،(٥٧) سەگرمە، (٥١) گەرمیان ، (٤٣) ئاسۆس، (٦٨) مامەندە،(٤٤) چەکوچ،(٦١) جوتیاران.

**مەڵبەندی سێ:**

بارەگای لە وەرتێ بوو ، ئەم تیپانە و سنوری چالاکیان بەسترا بۆوە بەم مەڵبەندەوە :
تیپی (١٢)سۆران ، (١٤) ئاکۆ،(٧٤) باڵەك، (٧٧) کۆدۆ،(٧٨) کاروخ، (٦١) کۆڕەش.

**مەڵبەندی چوار:**

بارەگاکەی لە بالیسان بوو،ئەم تیپانە وسنوری چالاکیان بەسترابۆوە بەم مەڵبەندەوە:

تیپی (٨٦)دەشتی هەولێر،(٨٣) هەورێ، (٩١) سەفین،(٩٣) کۆسرەت،(٩٩) بیتوێن.

لە دانانی ئەندامەکانی مەڵبەند و لێپرسراوی مەڵبەندەکان هاوسەنگیەکی عادلانە نەبوو ، لە نێوان کۆمەڵە و شۆڕشگێڕاندا . لێپرسراوی مەڵبەندی یەك و دوو چوار کۆمەڵە بوو . بەس مەڵبەندی سێ شۆڕشگێڕان بوو . لە ئەندام مەڵبەندەکانیشا هەر بەو جۆرە چوار یەك یان سێ یەك بوو . لە سەرەتای مانگی (١٢/١٩٨٢) گەیشتمەوە سەرکردایەتی و ڕاپۆرت و ئەنجامی لێکۆڵینەوەکەمدا بە (م.س)، لە (٥/١٢/١٩٨٢) وەك ئەندامی مەڵبەند و لێپرسراوی دارایی پەیوەندیم بە مەڵبەندەوە کرد .

مەڵبەندی سێ لەم ئەندام مەڵبەندانە پێك هاتبوو:

| | | |
|---|---|---|
| - لێپرسراوی مەڵبەندی- | سەید مەجید | شۆڕشگێڕان. |
| - لێپرسراوی عەسکەری- | ملازم فوئاد | شۆڕشگێڕان. |
| - لێپرسراوی ڕاگەیاندن- | حاجی حەمۆ | کۆمەڵە. |
| - لێپرسراوی سیاسی- | حەمەسیاسی | کۆمەڵە. |
| - لێپرسراوی دارایی - | بەندە | کۆمەڵە. |
| - لێپرسراوی کۆمەڵایەتی- | | کۆمەڵە. |

## گفتوگۆیەکی سەرنەکەوتوەلەیەکی گەورە

لە هاوینی (١٩٨٢)دا دەنگۆی گفتوگۆ لەگەڵ ڕژێم بلاوبۆوە ،لە ڕاستی نە گفتوگۆ هەبوو نە هەنگاویشی بۆ نرا بوو . (د.عبدالرحمن قاسملۆ) زۆری حەز بە هاتنەئارای گفتوگۆی نێوان یەکێتی و ڕژێم دەکرد،و هەر ئەوانیش دەنگۆکەیان بلاوکردبۆوە . (د.قاسملۆ) داوای لەیەکێتی کرد با بەرنامەیەکی خۆی داڕێژێ وبیدا بەو تا ئەویش بگەیێنێتە دەستی سەدام بۆ ئەوەی ببێتە مادەیەك بۆ کار لەسەر کردنی . یەکێتی

داواکانی خۆی بۆ سێ قۆناغی جیاجیا (قۆناغی درێژخایەن–قۆناغی ڕێکەوتن–قۆناغی هەنوکەیی) دا بە دکتۆر قاسملۆ.

**یەکەمیان:** ڕێکەوتنێك کە بۆ هەتاهەتایە سەرگرتوو دەبێ، کە بریتی بێ لە هاوپەیمانێتیەکی ستراتیژی درێژ خایەن لەسەر ئاستی نەتەوەی کورد و نەتەوەی عەرەب، کە دانان بێ بە بوونی هەر دوولا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و هاوپەیمانیەکی نەتەوەیی.

**دووەمیان:** جێبەجێکردنی دەقی بەیانی (١١ی ئازاری ساڵی ١٩٧٠)

**سێهەم:** ڕاگرتنی شەڕ.

حکومەت یەکەمیانی قبوڵ نەبوو، دووەمیشی دانا بوو بۆ پاش گفتوگۆکردن، ئامادەبوو دەسبەجێ سێهەمیان پەسەند بکات، بۆ ئەم مەبەستە بیروڕای گفتوگۆکردن و نەکردنی لەناو سەرکردایەتی یەکێتی دا تاووتوێکرا و لەو کاتەدا دوو بۆچونی جیاواز هەبوو:

١– بۆچوونی مام جەلال، پێی وابوو . گفتوگۆ نەکرێ لەبەر ئەم هۆیانە:

– سەدام جێی بڕوا نیە و هیچیش بە کورد نادا.

– لەوکاتەدا (لیبیا سوریا)دژی سەدام و دۆستی ئێمە بوون و ئۆپۆزسیۆنی عیراقیش دۆستمان بوون، ڕایان وابوو عیراق لەو پەڕی لاوازیدایە و پێویستە کار بکەین بۆ روخاندنی نەك هەڵسانەوەی.

– بەرەی جود لێمان بەبیانو بوون و پاشان ئەوەندەی تریش دەکەونە دژایەتیمان و هەڵلامان لەسەر دروستدەکەن.

– حکومەتی ئێرانی، کە لە چەندین لاوە سەرکەوتنی بە دەستهێنا بوو. دەبووە دوژمنی یەکێتی و بە تەواوی دەکەوینە ناو کەماشەکەوە.

٢– ڕای نەوشیروان و سەرکردایەتی کۆمەڵە بوو، کەپێیان وابوو با گفتوگۆ بکرێ و ڕەنگە سەدام لەو لاوازیەیدا دان بە زۆرترین مافەکانی کوردا بنێ، چونکە:.

– عیراق له بەرەکانی "شوش و دزفول" به خراپی شکاوه و له "خورمشەهر"یش، به شکاوی پاشەکشەی کردوه و ئێران لەپێشرەویدایه بەرەو ناو خاکی عیراق.
– له کوردستانیشەوه پێشرەوی کردوه، تا سەر سنورەکان و ئەگەری هێرشی هەیه له کرماشانەوه بۆ (خانەقین و دیاله) که خۆیان پێیاندەووت (راه کربلا) ڕێگای کەربەلا.
– گەر بتوانین یا حکومەت هەولبدا که پارتی و شیوعی و حسکیش واته جودیش ڕاکێشرێن بۆ گفتوگۆ زەمینەیەکی لەبار دەخولقێ بۆ گەشەکردنمان. به هەرحاڵ لەو دوو لێکدانەوەیەدا لانی یەکەم ڕاستتر دەرچوو، گفتوگۆش ئەمجاره سەری نەگرت و هەلایەکی گەورەش لەسەر یەکێتی دروستبوو، که جود بلاوکەرەوەکەی بوو، گوایه یەکێتی جارێکی تر دەگەڕێتەوه باوەشی حکومەت.

## ٨-٧. گەردەلولی دوای ئارامیەکی کورت.

وەك پێشتر ئاماژەم پێکردوه نزیکەی ساڵێك ناوچه ڕزگارکراوەکانی کوردستان ئارامیەکی ڕێژەیی بەخۆیەوه بینی . ڕاستیەکەی چەند هۆیەك هەبوو ،که ئەو ئارامیه ببێ:
١– ماندوبوونی هەموو لایەنەکان له شەڕ.
٢– ناچارکردنی بەرەی جود به تایبەتی پارتی لەلایەن ئێرانەوه به پەلاماردانی شۆڕشی کوردستانی ئێران به تایبەت حزبی دیموکرات و سەرقاڵبونیان به وانەوه.
٣– سەرقاڵبوونی یەکێتی به شەڕی هێزەکانی ئێران.
بەلام له سەرەتای ساڵی ١٩٨٣وه لەگەڵ ئەو هەموو هەولانەی ( سوریا و لیبیا و ناوزەنگ) دایان بۆ لێك نزیککردنەوەی هەموو دژەکانی سەدام له هێزه کوردی و عەرەبیەکان که بریتی بوون له (١٩) حزب و ڕێکخرا و تاقمی عەرەبی و کوردی، بەلام ئەم هەوڵه له بەردەم بارودۆخی کوردستان و چەند ڕووداوێکی نالەباری نەسازاو لەگەڵ ئەو هەولانه، سەری نەگرت و هەولی (١٩) قۆلی وەك کۆترێکی ئاشتی

باڵ شکاو کەوتە ژێر چەپۆکی تیژی درندەی شەڕ. لە ڕۆژی (٦/٢/١٩٨٣) لە شاری (تەرابلوس)ی ، پایتەختی لیبیا نوێنەری ١٩ حزب و ڕێکخراو و تاقمی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی دژ بە سەدام کۆبونەوە و ڕەشنووسی چەند سەرەتایەکیان مۆر کرد کە پاش ماوەیەکی تر بیکەن بە بەرنامەی بەرەیەکی فراوان.

**سەرەتاکان:**

١-پێکێنانی بەرەیەکی فراوان لە ماوەی یەك مانگدا.

٢- بەرنامەی سیاسی بەرە.

٣- بەرزکردنەوەی دروشمی ڕووخاندنی ڕژێمی عێراق.

٤- دامەزراندنی ڕژێمێکی دیموکراتی، کە گەل سەرپشك بێ لە هەڵبژاردنیان.

٥- مافی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستانی عێراق سەلمێنراو بێ.

٦-هەموو ناکۆکیەکی نێوان لایەنەکانی ئەم ڕێکەوتنە بخرێتە لاوە و بە گفتوگۆی سیاسی و هێمنانە چارەسەر بکرێ.

٧- دەستبەجێ شەری ناوخۆی کوردستان ڕابگیرێ.

## ئەو هۆیانەی بوونە فاکتەری لەباربردنی ئەم هەوڵە پێش لە دایکبوونی:

١-پاشگەزبوونەوەی حزبی شیوعی لەو ئیمزایەی، کە لەسەر پرۆتۆکۆلی ڕێکەوتنەکە کرد بووی و ئەم ڕێکەوتنە فراوانەی کردە قوربانی بەرەی جود، کە لە خۆیان و حسك و پاسۆك و پارتی پێکهاتبوو، بۆ دژایەتی کۆمەڵە و یەکێتی.

٢- شەڕی نێرەگێن: لە شەوی (٥-٦/٢/١٩٨٣) لە گوندی نێرەگێن بە هۆی کوشتنی کادرێکی یەکێتی لە دێی "ئاومالْ" و چەککردنی چەند پێشمەرگەیەك لەلایەن حسکەوە ، شەڕێکی دوو شەو و دوو ڕۆژی لە نیرەگێن لە نێوان حسك و پاسۆك و شیوعی لەلایەك و یەکێتیش لەلایەك ڕوویدا، لە ئەنجامدا کوژرانی (١٩)پێشمەرگە ،

(٩) كوژراو له حسك (٣) له حزبی شوعی (٧) له یـەكێتی لەگـەڵ چـەندین برینـدار و چەككرا و دیلكراوی هەموو لایەكانی لێكەوتەوە.

٣- لـە ڕۆژی (١٩٨٣/٢/٢) هێزێكـی گـەورەی پـارتی بـە سـەركردایەتی (حەسـو میرخـان ژاژۆكـی) بـە هاوكـاری ئێـران هاتنـە سـەر بەرزاییـەكانی بەرامبـەر بارەگاكـانی یـەكێتی لـەناوزەنگ . یـەكێتی بـۆ دەفعـی بـەلاَ و شـەڕ وەفـدێكی نـاردە لایـان ، كـەپێكهاتبون لـە نوێنەری یەكێتی و نوێنەری حزبی شیوعی ، داوایان لە حەسو كرد بكشێنەوە و لـە بـاتی شەڕ هەوڵی ڕێكەوتنی ئاشتیانە بدەن . حەسۆ وەلاَمی دایەوە و وتبووی: ئێمە بـۆ شـەڕی یـەكێتی نـەهاتووین، هـاتووین لێـرەوە پـەلاماری حكومـەتی عیراقـی بـدەین لـە پـشدەر و مەنگوڕ و بیتوێندا . دیار بوو ،حەسو میرخان تەنیا ئاگای لەوە بوو، كە لەگـەڵ هێزەكـەیان بێنە ئەو بەرزاییانە تا فەرمانی تری مسعودیان پێدەگا ، ئاگـاداری ئـەوە نـەبووە، كـە بـۆی نەبووە بە هیچ جۆرێك لەگەڵ یەكێتیدا دابنیشێ یا گفتوگۆ بكات هەر بۆیـەش كـە حەسـۆ، مەسـعودی لـەو دانیـشتنەی خـۆی و نوێنـەری یـەكێتی و شـیوعی ئاگـادار كردبـوەوە، مەسعود ئەم نامەیەی بـۆ حەسـۆ نـارد بـوو : بـرای عـەزیز حەسـۆ میرخـان ژاژۆكـی پاشـی سەلامان: كاغەزا تە گەهەشتە من . هەر چیا تە نڤیسی من زانی ، بە هیچ شێوەیەكی هـەق نە بودگەل ئەوان دانیشن (قەیدی نەبو ابوشوان ومحمود)—(واتە نوێنەرەكانی شیوعی)ئـەما ئەویت دی (واتە یەكێتی) ئەم ڕازی نە بوین،و من بروسكەش كرد بو كـو نـابیّ و د گـەل وان دانیشن ،ئایا چەوا ئەڤ دانیشتنت بوین.ئەزی چاڤری كاك ئیدریسی د كـەم نـە خـۆ ئـەز بـە خۆ دێم بووی منطقی ئەوقوتامن دگەل خوئینای هـەمی وی ئینم،ئەڤسالّ هـەمو قوەتـا خـۆ دی ئینمە منطقا قەلعەدزە و رانیێ .و نوكە مهم ئەوەحەراسەتەكە باشی هەبیت لـوان جیـت حساس برعملیاتا و هیـشت تقـدمی ئـەزبخودهیم انـشاالله.گرتنـا ئەونوقتاسـەری جاسوسـان پشتا دوژمنا شكاند(مەبەستی یەكێتیـە)و ئـەز سوپاسـیا همیادكـەم ڤیـت زەحمەتەكێشای وانشاالله مشایخ مەرتەبەكا مەزن وی دەدن:هەروەكی من گوت باشترین قـوەتی خۆئەڤسال دی ئیخینەڤی منطقی لبەر هەندی پیویست ناكات زێدە تر بچنە ناڤ تفصیلاتا.

**دوعای خۆشیا هنگو لە خودی د خوازم**

**برای هنگو**

**مەسعودبارزانی**

**(١٩٨٣/٢/٢٨)**

٤- بیانوگرتن و شەڕ فرۆشتن بە یەکێتی پاش هاتنی هێزەکانی پارتی بۆ سەری جاسوسان بۆ دووهەم جار و دوای شەڕی نیرەگێن بە ڕێگای ڕاگەیاندن .لە (١٩٨٣/٢/١٦) لیژنەی هەولێری (جود) بلاوکراوەیەکی زۆر توند و جنێو ئامێزیان لە ڕادیوی پارتیەوە بلاوکردەوە و چەند جارێك بلاوکردنەوەکەیان دوپاتکردەوە وپاشان لە (١٩٨٣/٢/٢٤) دا سکرتاریەتی بەرەی جود بەیانێکی توندوتیژی دژی بەیانەکەی (١٩٨٣/٢/٢٠) ی یەکێتی بلاوکردەوە و حزبی شیوعیش یاداشتێکی توندی دا بە یەکێتی.

٥- لە شارباژێڕ لە ڕۆژی (١٩٨٣/٤/١)جەزای عەلی کاتب لێپرسراوی ناوچەی سلێمانی پارتی بە هەڵە و لە ئوتومبیلی عوسمانی قالە منەوەردا کوژرا ، یەکێتی بەو بۆنەیەوە و بەیانێکی لەسەر دەرکرد وسەرەخۆشی لە کەس و کاری کرد و بڕیاریدا ، کە بکوژەکانی محاسەبە بکەن وسزایان بدەن و لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا بکەن جەزا هەم هاوڕێی ملازم عومەرو هەم نەوشیروان بوو، ئەم تاوانە هەڵەیە ئاگری ڕق و قینی پارتی ئەوەندەی تر بەهێز کرد.

لەڕۆژی دووی نیسان هەر لە شارباژێڕ پارتی لە گوندی "گۆڕەدێم" هەشت پێشمەرگەی یەکێتیان لە تۆڵەی جەزادا کوشت و پێشمەرگەیەکی تری یەکێتیش کە ناوی (هەڤاڵ ئەحمەد بەگ) بوو، خزمی جەزا بوو، بێ چەك چووبو بۆ بەشداریکردن لە ناشتن و پرسەی جەزای خزمی، ئەویشیان کوشت. بەو شێوەیە بارودۆخی ئەو ناوچەیە ڕووی لە شەڕێکی ئالۆزکرد و سەرکردایەتی جود فەرمانی بۆ حسك و پاسۆك و پارتی و شیوعی دەرکرد، کە بە هەموو هێزەکانیان لە ناوچەی سلێمانی پەلاماری مەڵبەندی یەکی یەکێتی بدەن،بەلاَم (بەهادین نوری) کە لێپرسراوی ناوچەی سلێمانی حزبی شیوعی بوو، نامەی بۆ مەڵبەند نارد بوو، کە ئێمە ئامادەی شەڕکردن نین و ئامادەین ڕێکەوتنێکی ناوچەییتان لەگەڵدا بکەین، مەلا بەختیار و مەڵبەندی یەکیش بە هەڵیان زانیبوو، کە حزبی شیوعی تەریك کەن لەو شەڕە و ڕێکەوتنیان لەگەڵدا مۆر

کردبوو. ئەم ڕێکەوتنەی مەڵبەندی یەك لەگەڵ شیوعیەکان هەلایەکی گەورەی لە مەڵبەندی (٤)ی یەکێتی و بەرەی جودی ناوچەی هەولێر و سەرکردایەتی جودا نایەوە، گوایە لە مەڵبەندی (٤) شیوعیەکان دەچنە سەر مەڵبەند، کەچی مەڵبەندی یەك لەگەڵ شیوعیەکاندا ڕێك دەکەون . حزبی شیوعی و بەرەی جودیش لەو هەڵوێستەی بەهادین نا ڕازی بوون ئەو بارە گرژ و ئاڵۆزەیە بەهەموو دانیشتوانی ناوچەی شارباژێڕ خاو نەکرایەوە . شەڕی نێوان جود و یەکێتی لە ناوچەی سلێمانیش لە ڕۆژی (١٩٨٣/٤/١٩) دەستی پێکردو، دوو ڕۆژی خایاند هێزەکانی جود شکان و ئاودیوی شاخی سورێن بوون بۆ دیوی ئێران ، دیارە ئەم شەڕە خۆخۆریە براکوژیە بێ خوێن ڕشتن تەواو نەبوو، چەندین لاو و پیاوی خاوەن بیروباوەڕ بە خەبات و کوردایەتی و ڕزگاری کوردستان بوونە قوربانی ئەو شەڕە ناڕەوایە.

٦- شەڕ لە مەڵبەندی چواری یەکێتی لە دۆڵی بالیسان هەڵگیرسا، بەرەی جود بە هەموو هێزەکانی دەشتی هەولێر و شکاوەکانی ناوچەی سلێمانیش لەڕۆژی (١٩٨٣/٤/٢٥) هێرشیان بردە سەر بارەگای مەڵبەندی چواری یەکێتی گیرا و هەموو هێزەکەیان پاشەکشەیان کرد بۆ پشتی دەرەشێر و دەرەدار و دەرەزیوە ، لەو شەڕەدا کادرێکی پێشکەوتوی کۆمەڵە و لێپرسراوی کەرتی ڕێکخستنی ڕەواند (پێشڕەو) وئەحمەد قەنبەری فەرماندەی کەرت و(٧) پێشمەرگەی یەکێتی و(١٥) پێشمەرگەی جودیش کوژران . بە گرتنی مەڵبەندی چوار جادەی سەرەکی نێوان خەلیفان- چوارقوڕنە کەوتە دەست بەرەی جود و سنوری مەڵبەندی (٣)ی یەکێتیش کەوتە ژێر مەترسیەوە.

٧- دوای کشانەودی هێزەکەی مەڵبەندی چوار بۆ سنوری مەڵبەندی سێ، بەهێزی هەردوو مەڵبەند کەوتنە قایمکردنی شوێنە سەختەکانی ناوچەی مەڵبەندەکە من لەگەڵ پێشمەرگە وەرتێیەکاندا، کە زۆر چاپوك و خێرا لە ڕۆیشتن و شاخەوان و ئازا بوون، چووین بۆ دێی مەلەکان کە کەرتەکەی "عەلی نەبی" لێ بوو، کە ناسرابوو بە

دەبابەکەی یەکێتی، ( حەمە سیاسی و حەسەن کوێستانی) تیپەکانیان کۆکردەوە و ئەوانیش دۆڵی خانەقا وپشتی کارۆخ و زینوی ئەستێروکان و کۆڵانی خاڵ خدریان قایمکرد، دۆڵی گوڵان سپێردرایە (محەمەدی کاك هەمزە و،پڵنگان بە سوارئاغا،) ئەو شوێنانەی کە بۆ هێزی مەڵبەندی چوار دانرا بوون ، بە فەرماندەیی (مەلازم سمکۆ دزەیی) خۆی هەڵات و بەرەی شەڕ و فەرماندەییەکەی بەجێهێشت و خۆی گەیاندە لای (عەزیز بەگ) لە پڵنگان .بەو شێوەیە بەر بە هێرش و پەلاماری بەرەی جود گیرا و نەیانتوانی پێشڕەوی بەرەو مەڵبەندی سێ بکەن.*

ئەو هۆیانەی کە باسمکردن هەمویان پێکەوە بوونە فاکتەری خۆشکردنی شەڕێکی سەخت و خوێناوی ناسراوبە شەری قەرناقە و پشتئاشان.

## شەڕی یەکەمی قرناقە و پشتئاشان.

دوای ڕووداوەکانی نێرەگێن و ناوچەی سلێمانی و هاتنی هێزی پارتی بۆ سەری جاسوسان بەرامبەر بارەگاکانی یەکێتی و کوشتنی (شەماڵ و سەربازی) کە فەرماندەی تیپ و جێگری فەرماندەی تیپی کۆسرەت بوون لە باداوان لەگەڵ(٥) پێشمەرگەی

* نەوشیروان لە (پەنجەکان یەکتری دەشکێنن)لاپەڕە–٢٨٨–دا لە بڕگەی ٢ دەڵێ :(ئازاد هەورامی"مان نارد بۆ سازدانی پاشماوەی هێزەکانی مەڵبەندی سێ، ئەمە دوورە لە ڕاستیەوە چونکە هێزەکانی مەڵبەندی سێ هیچ شکستێکیان نەخوارد بوو تا پاشماوەیان کۆ بکرێتەوە. بە پێچەوانەوە کە (ئازاد هەورامی) گەیشت هێزەکانی مەڵبەندی سێ هەموویان دابەشکرا بوون بەسەر بەرەکاندا وبە ڕەیان پێشڕەوی جود گرتبوو، جگە لەوەی کە ئازاد پیاوێکی عەسکەری نەبوو، شارەزایی لەشەڕدا نەبوو. لەلاپەڕە (٢٩٠)دا دەڵێ: ( نامەیەکی زۆرم لە ڕێکخراوە نهێنیەکان و ڕۆشنبیرانی شارەوە بۆ دەهات، کە من نەچم بۆ شەڕ، چونکە ئەترسان لە من لە شەڕێکدا بکوژرێم و کۆمەڵەش تووشی سەرگەردانی ببێ) . سەیرە نەوشیروان وا بیر بکاتەوە، کە بە کوژرانی ئەو، کۆمەڵە تووشی سەرگەردانی ببوایە. کۆمەڵە ئەو هەموو سەرکردانەی شەهید بوون سەرگەردان نەبوو، بەڵام ڕێکەوتنێکی نا ئومێدی و قین لەدڵانەی بەرامبەر کۆمەڵە، نەوشیروان کۆمەڵەی کردە قوربانی ئارەزوە قیناوییەکانی خۆی.

تـری یەکێتیـدا لـە کـەمینێکی کتـوپڕدا و شـەڕەکانی مەڵبەنـدی یـەکی سـلێمانی، مەڵبەنـدی چـواری دەشـتی هـەولێر، سـەرکردایەتی یـەکێتی کۆبونەوەیـەکی سـەرکردایەتی کـرد بـۆ هەڵسەنگاندنی ئـەو بارودۆخـە کـە بـە ڕاسـتی بـۆ یـەکێتی بارودۆخێکی نا هەموار بوو.

١- لەلایەکـەوە سـنوری ئێرانـی لێـداخرا بـوو، بـەهۆی یارمـەتی یـەکێتی بۆ حزبـی دیموکرات و کۆمەڵەی ئامۆزا.

٢- لەلایەکی ترەوە لە زۆر شـوێنەوە حکومـەتی بـەعس هێرشـەکانی زیـاتر بـۆ سـەر ناوچەکانی یەکێتی تەرخانکرد بوو.

٣-بـەرەی جـود (حسك وشـیوعی وپاسـۆك وپـارتی) لـە هـەموو لایەکـەوە گـەمارۆی هێزەکانی یەکێتیاندا و شارێگای سەنگەسەر،خانەقا، ڕەواندوز (جـادەی هـاملتون) و ڕێگای خەلیفان چوارقونەیان گرتبوو، بە نیازی گرتنی مەڵبەندی سێ و دۆڵی ئاکۆیـان و قەڵاتوکان بون بۆ دابڕانی سەرکردایەتی لە هەولێرو باڵەکایەتی و قەڵادزە و ڕانیە.

٤- دانانی نەخشەی جود بۆ گرتنی سەرکردایەتی یەکێتی.

ئەمانە هەمووی وایکرد کە دوو بیروڕا لەو کۆبونەوەیەدا بێتە پێشەوە:

یەکـەمیان: بـەردەوام بـوون لـە شـەڕە ناوچـەییەکان لـە خـوارەوە دانیـشتن لەگـەڵ سەرکردایەتیان لە سەرەوە.

دووەمیان: یان شەڕێکی یەکلاکەرەوە و لێدانی سـەرکردایەتی جـود و شـکاندنی ئـەو ئەڵقەی گەمارۆیە. دووهەمیان ڕای "نەوشـیروان" و ئەنـدامانی سـەرکردایەتی کۆمەڵـە بوو ، بە زۆربەی دەنگ پەسەند کرا، ڕۆژی (١٩٨٣/٤/٢٩) هەموو هێزە کۆکراوەکـانی یەکێتی لە " زەڵێ" وە بە ڕێکـەوتن، ئـەو ڕۆژە لـە ڕەبایـەکانی پـشتی سێوەیسەوە هێزەکە درایە بەرهاوەن و (٥) کەس کوژران لەوانە فەرمانـدەی تیـپ (حەمیـد نانـەوا کەرکوکی) ناسراو بە بێستون ، هەر ئەو ڕۆژە لە ئەنجامی هاوان بارینەکەی ڕژێم (٧)

کوژراو پتر لە(٢٠) بریندداربوون . پاش تێپەڕبونی هێزەکە لە گردی ڕمکان ، بارەگاکەی شیوعیەکانیش کە لە بەرزاییەکانی دامێنی شاخی گەلاڵی بوون ، ئەوانیش تەقەیان لەپاشماوەی هێزەکەی یەکێتی کرد و(ووریای مام قادر) کە کادری کۆمەڵە بوو،کوژرا و (غەریب سەعید)کە کۆمەڵە بوو بریندار بوو.

ڕۆژی (١٩٨٣/٥/١) هێرش کرایە سەر ڕەبایە و بارەگاکانی جود لە دەوروبەری دۆڵی قڕناقە و پشتئاشان هەموو سەربەرزایی و ڕەبایەکانیان گیران و ڕۆژی(١٩٨٣/٥/٢) پەلاماری بارەگای سەرکردایەتیاندا لە چەند سەعاتێکی کەم بارەگاکانی سەرکردایەتی حسك وپاسۆك و شیوعی گیران. سەرانی هەر سێ حزبەکە بە پەرش و بلاوی بە قەندیلدا هەڵگەڕان و ئاوای دیوی ئێران بوون، جگە لە سێ ئەندامی سەرکردایەتی شیوعیەکان (کەریم ئەحمەد جێگری سکرتێر و مەلا ئەحمەد بانی خێلانی مەسئول عەسکەری حزبی شیوعی و ئەندامی (م.س)، قادر ڕەشید ناسکە (ئەبو شوان) لێپرسراوی حزبی شیوعی سلێمانی) کە لە ڕاکردندا ڕێگەیان لێ تێکچوو بوو، لەناکا ولە دێیەکدا ڕۆژی (١٩٨٣/٥/٣) کەوتنە دەست چەند پێشمەرگەیەکی تیپی بیتوێن لەوانە (سەربەست جیهاد و عەبدوڵلا ڕانیێی– ناسراو بە عەبدوڵلای هەمینە شۆڕ)ئەوانیش هێنا بوویان بۆلای (ئەحمەد مەولود) وئەویش بە سەلامەتی لەگەڵ(٤٧) گیراوی تری شیوعیەکان تەسلیمی مەڵبەندی سێیان کردن.

## قوتابخانەکەی خانەقا و بە کلاّو پێوان.

ڕۆژی(١٩٨٣/٥/٣) نیوەڕۆ لەناو ژووری قوتابخانەکەی خانەقا، لەدانیشتنی نێوان نەوشیروان و مەڵبەندی سێ و نێوان کەریم ئەحمەد و مەلا ئەحمەد و قادر ڕەشید، نەوشیروان پێی ووتن: سێ نامەمان بۆ ناردن ، دووان بە بروسکە و نامەیەك بە دەستی کە مەڵبەندی سێ بۆی ناردن، ڕۆژی (١٩٨٣/٤/٢٧) ، کە ئێمە شەڕمان لەگەڵ حزبی شیوعی نیە تکامان وایە وەك ناتوانن لە ناوبژیکردندا سەرکەوتوو بن لە

شەڕدا بەشداری مەکەن و ئێمە شەڕمان ناوێ، بەلأم ئێوە نەوەلأمی نامەکانمانتان دایەوە و نە بێلایەن بوون، بەپێچەوانەوە هەر لە ڕێگەماندا لە قەلأتوکانەوە هێزەکەتان داینە بەر دەسترێژ و هاوەن. کەریم ئەحمەد ئینکاری کرد و ووتی: هیچ نامەیەکمان پێ نەگەیشتووە، منیش پێم ووتن : بەڵێ من خۆم نامەکەم بۆ ناردن و بە تایبەتی و تەتەرەکە دڵنیای کردین، کە دابووی بە " کاك مەلا ئەحمەد". سەید مجیدیش هەر لەو دانیشتنە پشتڕاستی کردەوە و بەڵێ نامەکان بە مەلا ئەحمەد گەیشتووە، مەلا ئەحمەد نەیتوانی نکولی لێ بکات، ووتی: بەڵێ نامەکانتان گەیشتەلای من.

کەریم ئەحمەد ڕووی کردە مەلا ئەحمەد و پێی ووت: ئەی بۆ لە منتان شاردۆتەوە، ئاخر کەستان.....تان بە کلاوی من نەپێوا بۆیە وامان لێ هات.

**ئەنجامەکانی شەڕەکان.**

١- کوژرانی پتر لە (٤٠) پێشمەرگە و کادری سیاسی و عەسکەری یەکێتی کە لە٨٥٪ ی کۆمەڵە بوون.

٢- کوژرانی پتر لە(١٥٠)پێشمەرگە و کادری سیاسی و عەسکەری بەرەی جود.

٣- بریندار بوونی پتر لە(٢٠٠)پێشمەرگەی هەموو لایەنەکان.

٤- ساردبونەوە و دلڕەش بوون و تەسلیمبونەوەی پتر لە (٤٠٠) چەکدار کە لە ٩٠٪ ی چەکدارەکان جود بوون.

٥- پتر لە(٦) مانگ کات بە شەڕی ناوخۆ و براکوژی بە فیڕۆ چوو،جگە لەوەی ، کە برینێکی قوڵی کردە جەستەی شۆڕشی نوێ و لایەنەکان ، کە لەوکاتەدا کە ڕژێمی عیراقی لە بارودۆخێکی خراپی سەربازیدا بوو بە هۆی شەڕی ئێران و تێشکانەکانی لە خاکی ئێراندا.

٦- بە فیڕۆچـونی تەقەمەنیـەکی زۆری هەمـەجۆر و پـارە وپـولێکی زۆر لـە هـەموو لایەنەکان کە ئەگەر ئەو تەقەمەنی و پارانە بۆ چالاکی ولێدانی ڕژێمی بـەعس تـەرخان بکرایـە بەشـی دوو سـاڵی چـالاکی بـەردەوامی هـەموو لایەنـەکانی دەکـرد و زیـانی زۆریشی بە دوژمن دەگەیاند ، من ئەوکاتە بەرپرسی بەشی دارایی بووم لە مەڵبەنـدی سێ کە چاودێری و بەڕێوەبردنی زیندان بەشێکی ئەرکی من بوو. هەموو گیراوەکـانی حزبی شـیوعی کـە ژمارەیـان (٤٧) کـەس بـوون لـەو ژمارەیـەدا (٥)یـان ژن بـوون . گیراوەکانی حسکیش (٧) کەس بـوون، لـەناو مزگـەوتی گـەورەی وەرتـێ دا، دامـان نابوون ، خواردنی سێ ژەمەیان لە هی پێشمەرگەکانی خۆمان وخۆمان باشتر بـوو ، پێنج ڕادیۆم بۆ دابین کرد بوون هەرچی کتێبی باش و بڵاوکراوەی خۆمان هەبوو ، بۆم برد بوون . ڕۆژانە سەردانم دەکـردن بـۆ چـاککردنی کـەم و کوڕیـەکانیان، ڕۆژانـە جگـەرە بەسـەر جگـەرە کێـشەکانیاندا دابەشـدەکرا. دوو ڕۆژ دوای گیرانـی کـەریم ئەحمەد و مەلائەحمد و قادر ڕەشید بە مەفرەزەیەکی مەڵبەنـدی سـێدا نێـردران بـۆ سەرکردایەتی بۆ لای مام جەلال.

پاش گەیشتنی کەریم ئەحمەد و ئەوان بە سەرکردایەتی ، ڕێکەوتننامەیـەکیان لەگـەڵ "مام جەلال"دا مۆرکرد:

١- شەڕی نێوان هەردوولا یەکسەر لە هەموو ناوچەکان ڕابگیرێ.

٢- هەموو دیلەکان ئازاد بکرێن و بگەڕێنەوە ناوچەکانی خۆیان.

بەیانی ئەم ڕێکەوتنە لەگەڵ ئەوەی لـە ڕووی ئیعلامیـەوە بـۆ یـەکێتی سـودی زۆر بوو ، چونکە بەرپەرچی ئەو ئیعلامانەی بەرەی جود بە تایبەتی هـەلای شـیوعیەکان بوو . بەلام بۆ حزبی شیوعی هەر زۆر بـە کـەڵك بـوو ، یەکـسەر پـاش بڵاوبونـەوەی بەیانەکە بروسکەمان بۆ هات، کە هەموو دیلەکانیان بەردەین، بەرماندان و وولاخمـان بۆ ئەوانە گرت، کە نەیانئەتوانی بڕۆن و لە مالیەی مەڵبەند (١٠) دە دیناریشمان دایە هەر یەکێکیان. دەرچوونی ئەم بەیانە هاوبەشە، هەلایەکی گەورەی لە نێوان سەرانی حزبـی شـیوعیدا نایـەوە، سـەرکردایەتی حزبـی شـیوعی بـەیانێکی لـە دژی ئـەو ڕێکەوتننامەیە دەرکرد و وای پیشاندا کە کەریم ئەحمەد و مەلائەحمدی بانی خێلانـی

به دیلی و له ژێر فشاردا ئەو ڕێکەوتننامەیان مۆر کردووه ،لەلایەکی تریشەوە هەلاّی لەلای بەرەی جود پەیدا کرد ، کە چۆن حزبی شیوعی ئەندامی بەرەی جود بەبێ لایەنەکانی تر لەگەڵ یەکێتیدا ڕێك دەکەوێ؟.

## - شەڕەو دێت و یەخەت دەگرێ
## ئەگەر نەیکەیت خوا ئەتگری

ئەمە پەندێکی پێشینانە و هەندێجار ڕاست دەرئەچێ ، دوای ئەو هەموو شەڕو کوشتار و هیلاکی و ماندو بوونە، لە مانگی (١٩٨٣/٥) وە هێزەکانی بەرەی جود بەرەو ئێران و هێزەکانی یەکێتیش، کە دیسان بە ڕاشکاوی یەوە دەڵێم لە٧٥٪ ی کۆمەڵە بوون بەرەو دۆڵی بالیسان و"مام جەلال" یش لەناوزەنگەوە بارەگای گوێزایەوە دۆڵی بالیسان و گوندی زیخان لە (١٩٨٣/٦/٢١) مام جەلال بارەگای لە گوندی خەتی دانا . حکومەتی ئێرانی هێزەکانی لە پێشڕەویدا بوون لە قۆڵی حاجی ئۆمەرانەوە و سەری کۆدۆ ولوتکەی گرد مەندیلی گرت. هاو زەمان هەموو هێزەکانی بەرەی جودیشی بێزار کردبوو، کە بێنەوە دیوی عیراق بە تایبەتی پارتی بۆ گرتنی ناوچەکە لەگەڵ سوپای پاسداراندا. لە (١٩٨٣/٧/٢٢) ئێران پێشڕەوی کرد وپارتیش لەگەڵ بەرەی جود هاتنەوە قەندیل و زنجیرە چیای "بیبە"یان گرت و مەترسیان خستە سەر جادەی سەنگەسەر و دۆڵی خانەقا حاجی ئۆمەران، وپاشان هەموو بەرزاییەکانی شاخەکانی بەری سەرووی جادەی خانەقایان گرت ، بەو نیازەی بپەڕنەوە بەری خوارووی جادەکە و هەموو دۆڵی شەهیدان و کونەکۆتر و کەندەبوکە و وەرتێش کۆنترۆڵ کەن . جارێکی تر هێزەکانی یەکێتی کۆبونەوە ولە ڕۆژی (١٩٨٣/٨/١٣)تا(١٩٨٣/٩/١) بە شەڕ و قنگەشەڕ شکستێکی تریان بە هێزەکانی جود دا ، و دووبارە شکانەوە . بەلاّم ئەم جارە شکستی گەورە بەر پارتی کەوت و (٣) فەرماندەی خاوەن ئەزمون و شەڕکەر و قالبووی شۆڕشیان بەرکەوت (حەسو میرخان ژاژۆکی کوژرا حەسو میرخان دۆلەمەڕی بریندار بوو، عبدالرحیم عبدالحکیم کوژرا ، لە گەڵ پتر لە (٥٠) چەکدار ،و لە یەکێتیش دوو فەرمانەی دیسان ئازا و بە

ئەزمون وشارەزا کوژران،نازم حەمە سلێمان کە فەرماندەیەکی تێکۆشەری شۆڕشی ئەیلول و شۆڕشی نوێش بوو،ئەحمەد مەولود سەرتیپێکی ئازا و قارەمان لەگەڵ زیاتر لە (١٠)پێشمەرگە کوژران. ئەم شەرە ناسرا بوو ، بە شەڕی دووەمی جود یا شەڕی دووەمی قەرناقەو پشتئاشان.

## دانانی بارەگا لە دۆڵی ئاکۆیەتی.

دوای تەواوبوونی شەڕەکانی یەکەمی بەرەی جود،سەبارەت بە ڕەفتاری مەزاجی نەوشیروان لەگەڵ ئەو سەرکەوتنانەش کە مەڵبەندی سێ بە دەستی هێنا بوو، و مەڵبەندی چوار تیا شکا بوو، بە بڕیاری خۆی مەڵبەندی سێ هەموو ئەندامەکانی و لێپرسراوەکەشی گۆڕان ولابران و کەسانی تری بۆ دانا. خۆم و مەفرەزەکەم چووینە (دارەبەن) لەلای ماڵی ئەرسەلانی کاك هەمزەوە خەیمەیەکمان هەڵدا، تا مانگی(٨٣/١٠) و پاشان پێشمەرگەکانم لە بارەگای کەرتی ڕێکخستنی ڕانیە دانا و خۆشم ژورێکی چۆڵم ڕێکخست و لە نزیك کەرت تیا بووم. لە شەڕی دوومی بەرەی (جود) دا سەردانی نەوشیروانم کرد و داوام لێکرد ئامادەم هەر کارێك بە من بسپێردرێ ،دیار وپێویستی بە من نەبوو، دوای ڕۆژێ گەڕامەوە بارەگای کەرت.لەو ماوەیەدا بێ کار بووم بە هەڵمزانی دەستم کرد بەپاکنوسی، ڕەشنوسەکەی فەرهەنگی سیاسی و لە مانگی (١٩٨٤/١) چاپکرا و بلاْوکرایەوە بە تیراژی (٥٠٠ دانە) لە چاپخانەی کۆمەڵە.

لە رۆژی ١٩٨٣/٩/٥ لەگەڵ پێشمەرگەی مەفرەزەکە، کە ماوەیەکی زۆر بوو، لە مەڵبەندی سێ و دۆڵی ئاکۆیەتی بووین و هەمووشیان خەڵکی سلێمانی بوون، حەزیان کرد سەردانێکی مەڵبەندی دوو بکەین و لە وێوە بەشکم چاویان بە کەس وکار بکەوێ، بەرەو بناری کوسرەت ڕۆیشتین و پاشان بەهۆی بەلەمی ماسی گرەکانەوە پەڕینەوە بۆ گوندی هەنجیرەو لەوێشەوە بە دۆڵی سیدەرا بەرەو قومرغان و قەرانگۆی و سەرگەڵو ڕۆیشتین .لە ئاستی قومرغان، نەوزاد حەسەن برایم، کوڕی

حەسەنی بلە بەهار دواکەوت دوو پێشمەرگەم نارد بە دوایا، یەکیان هاتەوە. ووتی : نەوزاد ئەڵێ ناتوانم بڕۆم و تەخت لەسەر ئەرزەکە کەوتوە.

گەڕامەوە سەری ووتم : ڕێکەوە.

ووتی : ناتوانم .

ووتم : بە جێت ئەهێڵین .

ووتی : ئەژنۆم نیە بڕۆم.

دیاربوو لە برسا نەیئەتوانی دوای ئەوەی لە قومرغان یەك – دوو نانمان هێنا و خواردی و کەوتەوە سەرپێ، نزیکەی(١٥) ڕۆژ لە قزلەر و سەرگەڵو وگاپیلۆن و گەڕەدێ وئەو ناوە ماینەوە، هەموو کەس وکاریان بینی و گەڕاینەوە گوندی هەنجیرە هەواڵمان زانی پێشمەرگە لە موڵگای جاشەکانی ئەنوەر بەگی بێتواتەیان داوە.

## ٨-٨. لێدانی موڵگای جاشەتی بێتواتە و داهێنانی ڕەفتارێکی نەفرەت لێکراو.

لەو ماوەیەی کە هەندێ لە بارەگاکانی سەرکردایەتی لە ناوزەنگ گوێزایانەوە و ئەو ناوەیان کەمێ سووك کرد، بەشێکیان چوونە لای مەرگە و ئاوەژی و بەشێکی هاتنە وەرتێ و "مام جەلال"یش بارەگای خۆی بردە بۆتێ دۆڵی گولان ، ئەنوەر بەگی بێتواتەی سەرۆك جاش زۆر لەوە دەترسا کە فراوانبوونی مەڵبەندی چوار وە بوونی دکتۆر. کەمال خۆشناو بەلێپرسراوی مەڵبەند و هاتنی مام جەلال بۆ ئەو ناوچەیە بە تایبەتی دوای شکاندنی بەرەی جود ، زۆر لەوە دەترسا کە جێی پێ لێژ بێ و ناوچەکەی لە دەست دەرچێ . ئەنوەر بەگ لەگەڵ ئەوەی سەرۆك جاشی حکومەت بوو، بەلام لوغمێکی شاردراوەی پارتی بوو، لەو ناوچەیە دژی یەکێتی. لە تێشکانی بەرەی جوددا زۆربەی ئەوانەی کە تەسلیم بە ڕژێم بوونەوە لەپارتیەکان چوونە لای ئەنوەر بەگ وبە چەکەکانی پارتی بوون بە جاشی ئەنوەر بەگ، ویستی

دەستپێشکەری بکات و پەلکێشی هێزی ڕژێم بکات لە چوار قورنەوە بەرەو خەلیفان بە دۆڵی خۆشناوەتیدا لەگەڵ ڕژێم پێکەوە لە یەکێتی بدەن، سوپای ڕژێم لە (١٩٨٣/١٠/١٤) لە چوارقورنەوە هێرشی کرد و تا میرگەسەر وپاش شەڕێکی کورت، میرگەسەریشی گرت کە دەیڕوانی بەسەر بارەگای مەڵبەندی چواردا هاوکات جاشەکانی ئەنوەر بەگیش بە شەر و پەلامار ڕۆژی (١٩٨٣/١٠/١٦) پەلاماری ئەوبەری جادەیاندا و سەرشاخی (نوسەك)یان گرت و تیپی (٩٢) كە (دانای ئەحمەد مەجید) سەر تیپی بوو، لەگەڵ تیپی(٩٩) (عەبدوڵڵای مام عەلی)سەر تیپی بوو، ئەوێیان پێسپێردرا بوو، شکان، بەگرتنی نوسەك لەلایەن جاشەکانەوە هەموو گوندەکانی (چێوەی سەروو، چێوەی خواروو،سوێرە،سەردۆڵ، نێوە) کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئەنوەر بەگ هەر ئەو ڕۆژە جاشەکان سەر لوتکەی مۆتەشیان گرت و بەو جۆرە هەموو گوندەکانی بێتواتە ،هەرتەل، زیوە،سەروچاوە،شکارتە،نواوە، دواوە، ئەندێك، ئەنگۆز، بنێوە،چیوەکان،سوێرە،سەردۆڵ،وەری، مەلۆك،میرگەسەر) بەو جۆرە زۆربەی زۆری ناوچەی خۆشناوەتی کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئەنوەر بەگ. ئەنوەر بەگیش، بە زۆر هەموو پیاوەکانی چەکدارکردن و بە شۆفڵ و بلدۆزەر سەنگەری لە دەوری دێیەکان پێ لێدان ،"مام جەلال" ئەم کارەی ئەنوەر بەگی بەپلانێکی جود لەلایەك و ڕژێم لە لایەکی تر ئەزانی، جگە لەوەی کە بە پێشوازیەکی دژە کرداری دانا بڕیاریدا خۆی سەرکردایەتی هێرش و پەلاماری مولگای ئەنوەر بەگ بکا . "مام جەلال" بۆ سەرکەوتنی نەخشەی شەڕەکە بڕیاریدا، سود لە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە وەربگرێ و کە لە ناو بێتواتە و هەرتەل و زیوەدا بوون. ڕێکخستنی کۆمەڵە زانیاریەکی تەواویان لەسەر شوێن و سەنگەرەکان و ژمارەیان و جۆری چەکەکانی جاشەکان گەیاندە مام جەلال، بەو پێیە مام جەلال نەخشەی شەڕەکەی بەو جۆرە دانا:

١- بەرەی شاخی هەورێ، بە سەرپەرشتی (شەوکەتی حاجی موشیر) و هێزەکانی مەڵبەندی (٤) و پەلاماردانی (نێوە ،چێوە ،سەردۆڵ ،مێرگەسەر).
٢- بەرەی شاخی شیری بە سەرپەرشتی "حەسەن کوێستانی"و هێزەکانی مەڵبەندی(٣) و پەلاماردانی (دەرەزیوە ،دەرە هەرتەل بۆ ئابلۆقەدانی بێتواتە.
٣- بەرەی شاخی ماکۆك لەپشت دۆڵی شاورێ ، بە سەرپەرشتی"مام جەلال" خۆی و کەرتەکانی شاورێ بەسەرپەرشتی (عەلی نەبی) کەرتی چواری جەباری بەسەرپەرشتی (مامەڕیشە)،کەرتی سەگرمە بە سەرپەرشتی (حەمە ڕەش) و چەند کەرتێکی تری هەرێمی ١٤ی سوارئاغا.
ڕۆژانی ٢٠-١٩٨٢/١٠/٢١)لە هەر سێ قۆڵەکەوە پەلامارياندا و لە هەموو لایەکەوە دوژمنیان شکاند و بێتواتە گیرا و ئەنوەربەگ گەیشتە ڕانیە. بەم سەرکەوتنە، هەم ڕژێمی بەعس لە ناوچەکەدا نەما و هەم تابوری پێنجەمی پارتی تەفروتونا بوو.

**لەم شەڕەدا ئەم دەستکەوتانەی تیا بوو.**

١- گرتنی زیاتر لە( ١٥٠٠) هەزار و پێنج سەد چەکی سوك.
٢- گرتنی (١٠٠)سەد ڕەشاش.
٣- گرتنی (٢) دوو هاوەنی١٢٠ملم.
٤- گرتنی زیاتر لە (٥٠)پەنجا (ئارِ ،بی ،جی) وگولە ئارپی جی.
٥- سەدان هەزار فیشەك.

**دەسکەوتی مەعنەوی.**

١- پاککردنەوەی ناوچەیەکی فراوانی زیاتر لە (٣٠) گوند.
٢- گرتنی لوتکە و بەرزایی و شاخی زۆر بەرز و عاسی و زاڵ بەسەر دۆڵی خۆشناوەتی و دۆڵە ڕەقە و دۆڵی شاوور و هەردوو مەڵبەندی(٣،٤)دا.

٣- بەرزبونـەوەی وورەی جـەماوەری ناوچـەکە ، لـە وەرتـێ وە تـا ڕانیـە و لـە خەلیفانەوە تا چوارقوڕنە.

## زیانەکانی.

١- کـوژرانی ژمارەیـەکی زۆر لەوانـەی ، کـە بـە زۆری ئـەنوەر بـەگ چـەکی پـێ هەلگرتبوون، پێشتر یارمەتیدەر و نانده‌ر و حەوێنەری پێشمەرگە بوون،بە تایبەتی لە قۆلّی (هەورێ) و شەوکەتی حاجی موشیرەوە ، کە بە حـەق و ناحـەق بـە شـەڕکەر و خۆتەسلیمکەرەوە دەستیان لێ نەپارێزرا.

٢- شەهید بوونی چەند پێشمەرگەیەك.

٣- لـە دەستـچونی سـامانێکی نەتـەوەیی لـە ڕەز و بـاخ و خانوبـەرە و نـاو مـالّ و مەڕومالاَتێکی زۆر بە سوتاندن و تالآن کردن و دزین وشوێن ونکردن.

### دوو ڕەفتاری ناپەسەند

١- کوشتنی بە ناحەق و دیل.

٢- تالآن و دزی لە خۆ و خەلّکی.

بۆیەکەم جاربوپێشمەرگەی یەکێتی پەلاماری ڕەبایا یان جاش بدا و تەسلیمبوەکان کە دەستیان بەرزکردبێتەوە واتە دیل، بیان کوژن، بە ڕاستی لـە گونـدی (نێـوە)کـە، کـەوتبوە قـۆلّی یەکـەمی شـەڕەکە (شـەوکەتی حـاجی موشـیر) فەرمانـدەیی دەکرد،قەسـابخانەیان دانـا ، شـەڕکەرو تـا شـەڕ کەروخۆڕاگروخۆتەسـلیم کـەریان بـە یەکەوە کوشت تەنیا لەودێیە(٤٠)چـەکداری تیـاکوژرا، ئەودێیـە پـێش هـاتنی سوپای ڕژێـم و بـە زۆرچـەك پێهـەلگرتنیان لەلایـەن (ئەنوەربـەگ)ەوە، جێگـای حەوانـەوە و نوستن وخواردنی پێشمەرگە بوو، جێگای بڕوای پێـشمەرگەبون بـە درێـژایی شـۆڕش نانده‌ر و یارمەتی دەری شۆڕش بون. کەچی بـەوجۆرە بـە ناحـەق قڕیـان تێخستن و

هەرچی کەل وپەل و ماڵی پەزمەنە کراوی چەند ساڵەی ژیانیشیان هەبوو نەما.واتە بەسەر و ماڵ و داروبەردەوە ئەنفالکران. لە هەندێ گوندی تریش ئەوکارە روویدا بەڵام بەو جۆرە سەرومڕ نەبوو.

تاڵانکردن و دزین : ئەمەشیان بەو ئاشکرایی و بەو فراوانیە هێشتا لەناو یەکێتیدا رووی نەدابوو. لە هەندێ شوێن هەندێ فەرماندەی مەفرەزە یان کەرت یان تیپ جاروبار و بە کەمی لە شەڕەکاندا ئەگەر چەکیان دەستکەوتایە، هەندێ چەکیان لادەدا و لە ناردنی هەواڵی چالاکیەکان، باسی ئەو چەکانەیان نەدەکرد، بۆ مەسرەفی پێشمەرگەکان دەیانفرۆشتەوە. بەڵام ئەمجارەو لەم شەڕەدا ، نەك هەر چەکیان حەشاردا ، بەڵکو:

- دەیان فەرشی ماڵانیان دزی و ئاودیویان کرد.
- دەیان دەرگای ماڵی چۆڵیان شکاند و بە نرخ وبێ نرخیان بردن و ئاودیویان کرد.
- دەیان مریشك و کەڵەشێریان کوشت وسەربڕی .
- دەیان سەرمەڕ وبزن و گاومانگاو گوێرەکەیان برد وسەربڕی و ئاودیویان کرد .

تەنانەت دەستیان لە ماڵەکانی ئەندامەکانی کۆمەڵەش نە پاراست کە تا ڕۆژی سەرکەوتن هەواڵیان لێ وەر دەگرتن ، ماڵەکانی دۆستەکانی یەکێتیشیان تاڵان کرد ، دەیان قاتی ڕانکوچۆغەی شاڵ و چەندین پارچەی ئاڵتونی ژنان تاڵانکرا و دزرا و ئاودیو کرا .

بە ڕای من ئەوشەڕە گەوهەری پێشمەرگە و لێپرسراوی دەروون پیس و دز و گەندەڵ و شەڕە خۆری دەرخست . لێ نە پێچانەوە لێکۆڵینەوە نەکردن لەو کەسانە و سزادانیان، دواتریش دەسخۆشی سەرکەوتن لێکردنیان ، بووە هۆی دروستبوونی ڕەفتاری نا جوامێرانە، لەوێوە نەریتی ڕاو ڕووت وشڕەخۆری ودزی وگەندەڵی دەستی پێکرد . دوای ئەو شەڕە و لە چەندین شەڕی تریشدا ئەو ڕەفتارە دووبارە بۆوە و لە ڕاپەڕین و دوای ڕاپەڕینیش و لە سەردەمی حوکمڕانی خۆشمان دابوە کارێکی شیاو و

مایەی ڕێزلێنان، و بردنی تەلار و باڵەخانە بە ئاسماندا تێر نەبوون لە خانویەك و دووان وسیان و تەلارێك و دەیان، و سەیارەیەك و دەیان و ژنێك و دوان وسیانی شەرعی و ناشەرعی هەر ئەو چاوپۆشیە بوو بە ماكی دەستبە سەراگرتنی دەیان و سەدان دۆنم زەوی ، دەیان پارچە زەوی ئاڵتونی لە جەرگەی شارەكان . تەنانەت دەست بە سەراگرتنی گردەكانی ناو شاری سلێمانی و شوێن و هاوینە هەوارەكان "مام جەلال"لەبەر ئەوەی خۆی سەركردایەتی ئەوشەڕەی كرد و بەو ئەنجامە گەیشت زۆرپێی ناخۆش بوو، لیژنەیەكی دانا بۆ لێكۆڵینەوە یەكێك لە ئەندامەكان من بووم ، زۆر شتمان دۆزیەوە و درایەوە بە خاوەنەكانیان . بەلاّم دە ئەوەندەش نەدۆزرایەوە بە دۆزراو و نەدۆزراوەكانەوە ، هیچ كام لە دز و تالأنكەر و ڕاو و ڕوتكەران سزا نەدران سزایەكی عادیلانە. سیان چوارێك بۆ ماوەیەكی كەم چەك كران ، بەلاّم كەس دەرنەكرا و كەس ڕیسوا نەكرا ، كەس زیندانی نەكرا و كەسیش لە لێپرسراوێتیەكەی لانەبرا و هەندێكیان پلەشیان بەرزكرایەوە.

ئەو ڕەفتارانە بوونە هۆی:

١- دروستبوونی ڕق و قینی دانیشتوانی ئەو گوندانە لە یەكێتی ، كە تا دوای گفتوگۆ و شەڕ بونەوەش لەگەڵ ڕژێم زۆر بەیان نە گەڕانەوە ناوچەكە.

٢- لە شەڕبونەوەدا زۆربەی دۆستە كۆنەكانی خۆمان پێش شەڕی بێتواتە بوون بە جاش و دژایەتیان ئەكردین.

٣- نەمان و لەكەداركردنی ڕەونەقی ئەو سەركەوتنە گەورەیە.

# بەشی نۆیەم:
# مفاوەزە - دانوستاندن- گفتوگۆ.

## - مفاوەزە - دانوستاندن- گفتوگۆ.

دانوستاندن وەك حەتمیەتێکی مێژوویی لە هەلومەرجی لە بارولەکات و شوێنی گونجاودا، یاسای پێکەوە ژیانی دوو دژە ، دوو دژی هاوکێشە نەبوو ، لە هێز و دەسەلآتدا لە ڕووی سیاسی و ئابوری وسەربازی ولە گەوهەری هێزی مەعنەویدا . واتە پێکەوە ژیانی دوو لایەکە هەم دژ بە یەکن وهەم پێکیشەوە ناچاری گوریس کێشەکی دەبن لە پێکەوە ژیانیش و دژایەتی کردنیشدا . دانوستاندن ئەو فاکتەرەیە کە لە پرۆسەی خەملانی کێشەیەکی دیاریکراودا سەرئەنجامێك دەدا بە دەستەوە ، ئەو سەرئەنجامەش بە قازانجی هەردوولای کێشەکەیە ، زۆرجار وا هەست دەکرێ ، کە دانوستاندن هەر بە سودی لایەنی بەهێزە و دوران وملکەچی بەشی لایەنی لاوازە ، بەلآم ئەم بۆچوونە هەرگیز ناگونجێ لەگەلّ یاسای دانوستاندندا ، بەلکو ڕاستی لە ئەنجامی دانوستاندندا خۆی لە نرخی مادی و مەعنەویەکەشدا دەبینێ ، دانوستاندن هەرگیز لە نێوانی دوولایەنی مافپەروەر و بڕوا بوو بە یەکسانی وەك یەکی دوولا دوو ولآت و دوو نەتەوە ناکرێ ، چونکە لەوهەلومەرجەدا ئەو دوولایەنە هەرچی بە خۆیانی ڕەوا ببینن بەلایەکەی تریشی ڕەوا دەبینن . کەواتە بێ دانوستاندن هەردوولا یەکتری دەسەلمێنن . دیسانەوە دانوستاندن لە لایەنێکی بەهێزە و دەسەلآتدار ، بەلآم بڕوا بوو بە مافی بەرامبەری بچوك و بێ دەسەلآت ومرۆڤ وگەلان و نێوانی لایەنی لاواز و بێ دەسەلآت و مافخوراودا ناکرێ ، چونکە لایەنی دەسەلآتدار هەر لە بڕوای خۆیەوە بە مافی بەرامبەر هەموو مافەکانی بێ دانوستاندن وکێشمەکێش دەسەلمێنێ. کەواتە دانوستاندن لە نێوان دوولای دژ بەیەکدا ڕوودەدا، کە لە ئەنجامدا بە هەولّ و بە تێپەڕبوون بە چەندین شێوازی شەڕەنگێزی دەگەنە

ئەو ڕاستیەی، کە هیچیان ئەوی تریانی پێ لەناو ناچێ ، ئەوسا ڕێگەی دانوستاندن دەگرنەبەر، هیچ دانوستاندنێك بێ دەسکەوت نیە، بەلآم لانی کەم ولانی زۆری داخوازیەکان و دەسکەوتەکان دەوەستێتە سەر هەلومەرجی دانوستاندنەکە، ئەگەر لایەنێکی کەم دەسەلآت لە ڕووی تەرازووی هێز وپارە و چەکەوە کەوتە دانوستاندن لەگەڵ بەرامبەر بە هێز و دەسەلآتدارەکەوە لە پارە وچەك و هێزەوە مانای وانیە کە ئەوە تەسلیمبوون وملکەچ کردن و دەسهەڵگرتنە لە مافەکانی، با دانوستاندن لە نێوان دوو کەسدا هەڵسەنگێنین ، کە یەکیان بالآبەرزێکی چوار شانەی بە هێزی خاوەن پشت و تایەفە و عەشیرەت ، کە دانوستاندن کەوتە نێوانیانەوە، بێگومان لاوازە بێ کەسەکە سەرکەوتوە ، چونکە ئەو بێ هێزە هەر بە دروستبوونی دانوستاندن ژیانی خۆی دەپارێزێ و مافی بوونی دەبێ . بەلآم گەر دانوستاندن نەکا، لە ناویش دەچێ و ژیانیشی لە کیس دەچێ ، کە ژیانی خۆی گەورەترین دەسکەوتە، ماکیافیلی"لای وایە ، کە سیاسەتی سەرکەوتو ، ئەوەیە کە مرۆف پەنا بەرێتە بەر هەردوو ڕێ و شوێنی مرۆڤانە و ئاژەلآنە ، واتە بزانێ چۆن لەنگەری نێوان فێڵبازی و شالآو بردن ڕابگرێ. چونکە پێوانەی بنچینەیی بۆ هەڵسەنگاندنی سیاسەتی ڕاست- سەرکەوتنە". *

دەیدە باش دەڵێ :" پیاوی بێ دەسەلآت بە لە سەرخۆیی و فێڵزانی بەسەر دوژمنە دەسەلآتدارەکەیدا سەر دەکەوێ ، فێڵزانی و لەسەرخۆیی ڕێوی سواری کۆڵی فیل دەکا، مار لە کون دێنێتە دەرێ و یاری پێ دەکا، شێر لەناو تابوت دەنێ ، ڕێ لە زیانی ئاگر و لافاو و ڕەشەبا دەگرێ ". *

پاش سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەر، یەکێتی سۆڤیەت لە هەموو لایەکەوە بەهێزی دوژمن گەمارۆدرا بوو، لەناو خۆشیدا هێزە سوپاییەکەی، کە هی سەردەمی قەیسەر

---

* کتێبی میر ، لاپەرە ١٧.

* کتێبی کلیله و دمنه،لاپەرە١٧٢.

بوو ، تووشی داتەپین و پچڕانی شیرازە ببوو ، هیوای پاراستنی دەوڵەتی پرۆلیتاری بە شەڕ لێنە دەکرا . بۆیە لینین لە (٢٦/ئۆکتۆبەری /١٩١٧ بەیانێکی ئاشتی ڕاگەیاند کە لە دوو دێڕیدا.

دەڵێ: "پێویستە لەسەر حکومەتی کرێکاران و جوتیاران ، داوا لە هەموو گەلان و دەوڵەتانی شەڕکەر بکا هەر ئێستا و بێ دواکەوتن دەست بە دانوساندن بکەن لە پێناو ڕێکەوتنێکی دیموکراتی و عادلانەدا".*.

دیسانەوە لینین دەڵێ :" ئەوە تاوانە بە بیانوی بەرگریکردن لە نیشتمان بکەوینە شەڕێکی نا بەرامبەری خۆتڕێنەوە، لەگەڵ دوژمنێکی زۆر بەهێزتر و ئامادەتر لە ئێمە بۆ شەڕ هەتا کۆتایی، ئێمە لە پێناو بەرگری لە گەل و نیشتمان و دەسکەوتەکان ناچارین ، بە قایلبوون بە ئاشتییەکی زاڵمانە و بێ ویژدانانە ، نەك بۆ ئەوەی خۆمان تەسلیم بە ئیمپریالیزم و دوژمنان بکەین ، بەڵکو بۆ ئەوەی هەلێك و دەرفەتێك بۆ خۆمان هەڵخەین ، کە بتوانین جارێکی تر بە هوشیاریەکی زیاتر و شارەزاییەکی باشتر خۆمان ئامادەی شەڕ بکەینەوە . بەڵام بە شێوەیەکی لێبڕاوانەتر و هونەرێکی نوێتری جەنگ".*

ووتوێژ خۆی لە خۆیدا هەر خەبات و تێکۆشانە ، بەڵام بە شێوەی بەرهەمێکی خەملاوی ناو پرۆسەی خەبات ، خەبات بە پەیدابوونی هەستی نیشتمانپەروەری یا چینایەتی یا نەتەوایەتی و خەملینی ئەو هەستە دەستپێدەکا لە پێناو بەدیهێنانی ئامانجەکان ، خەبات بە هەموو جۆرەکانیەوە (نا قایلی دەربڕین)، داواکاری پێشکەش کردن ، مانگرتن ، خۆپیشاندان ، خەباتی چەکداری ، بە شێوەی پارتیزانی ، بەرگریکردن ، هێرشبردن ، شەڕی ڕووبەڕووی بەرەیی ، شەڕی شار ، شەڕی شاخ ، شەڕی کوتوپڕی و بڕینەرەوە ، شەڕی دریژخایەن ، دانوستاندن) ئەمانە هەمویان

---

* لینین، مرسوم السلام،٢٦/اوکتوبر/١٩١٧، مجلد٣٥،لاپەرە١٣.

* لینین،سەرچاوەی پێشوو،لاپەرە ٢٩٥.

ڕێبازن دەگیرێتەبەر بۆ گەیشتن بە ئامانج ، چونکە هیچ کام لەم شێوانە ، ئامانج نین ، بەڵکو هۆن بۆ گەیشتن بە ئامانج ، کە نابێ بە یەکێك لەمانەوە پەیوەست بین و وەك شتێکی پیرۆز تەماشای کەین . ئامانج لە دوو حاڵەتدا بەدی دێ، یا لە حاڵەتی نەمان و ڕامالینی لایەنی زلهێز و دەسەلاتدار و بە شەڕ و پاشان ناچارکردنی بۆ دانوستاندن ؛ یان بە ڕێگای دانوستاندنی پاش قفڵ بوونی شێوازەکانی تر، هەر چەند تەرازوی هێزەکانی هەردوولای دژ وەك یەك نەبن، بەڵام هەر هەڵبژاردن و گرتنەبەری ڕێگای دانوستاندن لەلایەن دەسەلاتدارە کەوە مانای لاوازی دەگەیەنێ و ناچارە ، بۆیە ئەو ڕێگایە پەسەند دەکا لەلایەك و سەلماندنی بوونی لایەنە لاوازەکەی بەرامبەر وڕیشیەتی لە لایەکی ترەوە ، ئەو سەلماندنانەش بە دەسکەوتێك بۆ لایەنە لاوازەکە دادەنرێ و دەبێتە پەیژەی سەرکەوتنی . بۆ بە دەستهێنانی دەسکەوتی باشتر و پتر . کەواتە دانوستاندن هونەری بەکارهێنانی سیاسەتە لە هەلومەرجی ئاشتییدا ، کە بە زمانی فەرهەنگی سیاسی پێی ئەوترێ دبلۆماسیەت.

## ٩-١. کورد و دانوستاندن.

خەباتی گەلی کوردستان و ململانێی توندوتیژی لەگەڵ داگیرکەراندا ، دەگەڕێتەوە بۆ پتر لە ٤٥٠ ساڵ لەمەوبەر و لە شێوەی جۆرا وجۆردا خۆی نواندوە . لە شەڕی قرم لە نێوان ڕووسەکان و تورکەکاندا کە لە (١٨٥٣-١٨٥٦) بوو، ئەم شەڕە هەلومەرجێکی باشی ڕەخساند بۆ ڕاپەڕینی کورد لە تورکیا و شۆڕشێکی پان و پۆڕ لە ساڵی ( ١٨٧٧-١٨٨٠ ) دەستی پێکرد ، کە بە سەرکردایەتی (شێخ عبیدوڵلا). لە ساڵی(١٨٧٩) دەوڵەتی عوسمانی(سمیح پاشا)ی نارده لای شێخ عبیدوڵلا بۆ ووتوێژ ، پاش هەوڵێکی زۆر گەیشتنە یەك و سمیح پاشای بە دەستی بە تاڵ ناردەوە ، و یەکسەر کەوتە پەیوەندیکردن بە ڕووسەکانەوە لە ڕێگەی کۆنسوڵی ڕوسی لە شاری وان ، کە دەبوایە درێژەی بە گفتوگۆ بدایە ، لەگەڵ پەیوەندیکردن بە کۆنسوڵی ڕوسی

پەیوەندی بە ئینگلیزەکانیشەوە کرد ، لە ڕێگەی (بێکر – بەکر پاشا) ی کۆنسۆل لەشاری وان ، کە لە هەردوو پەنابردنەکەدا بێ ئەنجام بوو. شێخ عبیدوللا شۆڕشەکەی پەرەیسەند و فراوان بوو. لە (ئەیلولی/١٨٨٠)دا ، پەلی هاویشت بۆ کوردستانی ئێران و لە ماوەیەکی کورتدا جگە لە شاری ئیلام و کرماشان دەسەلاتی تا تەورێز ڕۆیشت .*

شای ئێران لە ڕێگەی حاکمی تەورێزەوە داوای لە (عەبدولقادری شێخ عبیدوللا ) کرد، کە ئامادەن بۆ ووتوێژ و دانوستاندن و ئامادەن دان بە دەسەلاتی (شێخ عبیدوللا ) بنێن لە ورمێ وسنەدا . شیخ عبیدوللا ئەم فرسەتەی ڕەت کردەوە و ئامادەی دانوستاندن نەبوو ، شای ئێران پەنای بردە بەر قەیسەری ڕوسی لە ڕێگەی (زینوفیف) ی باڵیۆزی ڕوسی لە شاری تاران و داوای یارمەتی لێکرد ، کە هێز بنێرێتە سەر سنوری ئازربێجانی خواروو . واتە تەورێز بپارێزێ ، ڕوسیاش لەو کاتەدا، زۆر مەبەستی بوو ، کە یارمەتی" شا" بدات . چونکە لە فراوان بوونی دەسەلاتی ئینگلیز دە ترسا لە کوردستاندا و ئەو شۆڕشەی شێخ عبیدوللا ی بە دەسیسەی ئینگلیز دەزانی".*

لە (١٨٨٠/١٠/١٨) قەیسەری ڕووس هێزی پاڵپشتی بۆ شا نارد و دەوڵەتی عوسمانیش ئەم هەلەی قۆزتەوە ، کە بەهێزی هەر سێکیان واتە (ئێران و ڕووس و عوسمانی) پەلاماری هێزەکانی (شیخ عبیدوللا)یانداو لە کۆتایی مانگی (١٨٨٠/١١) شکاندیان و کۆتایی بەو شۆڕشە هات. بە کورد قرانێکی بێ بەزەییانە لە شاری ورمێ بە فەرمانی (تیمورپاشا خان) پاشان لە سابلاغیش ئەنجامیدا.*

مەبەست لەم نمونەیە ڕەتکردنەوەی دانوستاندنە ، لەلایەن شێخ عبیدوللاوە ،کە ڕەنگە بە دانوستاندنەکە هەندێ لە دەسکەوتەکانی لە دەست بدایە ، نەك هەمووی.

---

* ن.أ.خەلەفین، خەبات لە ڕێی کوردستاندا ، لاپەرە،١٨٤.

* ن،أ، خەلەفین، خەبات لە ڕێی کوردستاندا ،لاپەرە،١٨٥.

* ئارشیفی سیاسەتی دەرەوەی ڕوسیا، بلأوکراوەی ژمارە٤٠، فایلی١٢٠٢، لاپەرە١٣٧.

**نموونەی دووهەمی: ڕەتکردنەوەی دانوستاندن،نمونەکەی شێخ مەحمودی نمره.**

له تەموزی(١٩٢٢)دا (ئەدمۆنز) نوێنەری ئینگلیز لە عیراق لەگەڵ حکومەتی عیراق داوایان له شێخ مەحمود کرد ، بۆ دانوستاندن سەبارەت بە حکومەتێکی کوردی بچێته بەغدا . لە ڕۆژی (١٩٢٢/٧/١٢)دا ، نوێنەری بالآی ئینگلیز (ئەدمۆنز) لە بەغداوه ڕایگەیاند کە دەوڵەتی بریتانیا و حکومەتی عیراق دان بە مافی سەربەخۆیی و ناوخۆیی کوردەکاندا دەنێن لە سنور و چوارچێوەی وولاتی عیراقدا . حکومەتی عیراق دەیەوێ لەناو وولاتی عیراقدا ، حکومەتی کورد پێکبێ ، بۆ ئەم مەبەستە پێویستە نوێنەری کوردەکان بێنە شاری بەغدا و لەبارەی مەسەلەی ئابوری، سیاسی له مابەینی عیراق و ئینگلیز و کوردەکان باس بکرێ.* بەلآم شێخ مەحمود هیچ وەلآمێکی ئەو داخوازیەی نەدایەوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە شێخ کەوتە تەقەلای قایلکردنی (سمایل خانی سمکۆ و سەید تەها) ڕاوێژکاری کە لەگەڵ شێخ مەحمودا هاوکاری تورکەکان بکەن بۆ لێدانی ئینگلیز . شێخ مەحمود پەیوەندیکرد بە کۆلۆنێل (عەلی شەفیق و ئەلیاس ئۆزدمیری تورك) لە باتی ئەوەی ئەو هەلی دانوستاندنه بقۆزێتەوە و لە کیسی نەدا .

شێخ مەحمود به زوویی لەگەڵ کۆلۆنێل عەلی شەفیق و ئەلیاس ئۆزدمیری تورك ، پەیوەندی کرد و ڕایگەیاند کە دەیەوێ بۆ تورك فیداکاری بکا دژی ئینگلیز و تەنیا داوای مافی نەتەوایەتی "ناوخۆیی– ئۆتۆنۆمی " بۆ کورد بکا و دەست لە داواکردنی مافی سەربەستی گشتی هەڵگرێ و لەگەڵ حکومەتی تورکیا هاوکاری بکا دژی ئینگلیز.* پاش ڕەتکردنەوەی ئەو داخوازی دانوستاندنه ، ئینگلیز و عیراق لە١٩/ ١٩٢٣/١/ بڕیاری لێدانی حکومەتەکەی شێخیاندا و لە(١٩٢٣/٢/٢١) ئینزاری شێخیان کرد ، کە دەبێ بچێ بۆ بەغدا ، بەلآم نەچوو،و لە (٢/٢٢) بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی

---

* کریس کۆچێرا ، مێژوی کورد لە سەدەی ١٩–٢٠،لاپەرە ١٢٣.

* کریس کۆچێرا، سەرچاوەی پێشوو ، لاپەرە،١٢٢.

حکومەتەکەیان دەرکرد و شێخیان لە مەلیکی خست ، کە حکومەتەکەی تەنها (٥)مانگی خایاند . لێرەدا دەردەکەوێ ، کە دانوستاندن چ گرنگیەکی بە نرخی سیاسی، مێژووی دبلۆماسی هەیە و بە لە دەستدانی چ زیانێکی گەورەی لێ دەکەوێتەوە. کورد گوتەنی: (کردە پەشیمان بە، نەك نەکردە پەشیمان).

هەڵەکانی سیاسەتی شێخ و هەندێ لە ڕاویژکارانی بەهۆی نە شارەزاییان لە سیاسەت و هەڵسەنگاندنی بارودۆخی ئەوساکە:

١- دەوڵەتی عوسمانی بڕیاری مەرگی حەتمی لەسەر درابوو ، و لەناوخۆشیا لە هەمو ڕوویەکی سیاسی و ئابوری وسوپایی وکۆمەلآیەتیەوە هەڵتەکا و داوەشاو بوو، کەڵکی پشت پێ بەستنی پێوە نەما بوو، واتە ئەسپێکی دۆڕاوی مەیدانی ململانێی نێوان دەوڵەتان بوو.

٢- هاوپەیمانەکان(ئینگلیز - فەرەنسا - ڕووسیا - یۆنان -و ئەوانی تریش) لە بەهێزی ودەسەلآتداریێتی دابوون و سەرکەوتنیان مسۆگەر بوو.

٣- سیاسەتی ئەوسای دەوڵەتانی هاوپەیمانان بریتی بوو، لە پارچەپارچەکردنی دەوڵەتی عوسمانی و دروستکردنی چەند دەوڵەتێکی نەتەوەیی سەربەخۆ و جیا لە دەوڵەتی عوسمانی.

٤- تێکەڵکردنی دین لەگەڵ سیاسەتدا هەڵەیەکی کوشندە بوو، هەر لەبەر ئەوەی لەگەڵ تورك هاودین بوون وئیسلام بوون و کوردیش ئیسلام بوو هاوپەیمانیان لەگەڵ تورك لاباشتر بوو ، نەك لەگەڵ ئینگلیزێکی کافر و بێ دیندا.

**نمونەی سێهەم**: کە نمونەیەکی مێژوویی سەرکەوتوی شۆڕشی کورد بوو، نمونەی مهاباد بوو، کە لە ڕواڵەتدا تەواو لەگەڵ دوو نمونەکەی ترمان جووتە لە هەر سێ حاڵەتەکەدا هەر ڕووخانی هیواو ئاواتی پێکهێنانی دەوڵەتێکی نەتەوەیی و کوردستانی کورد بووە . بەلآم لە جەوهەردا ئەمیان نمونەیەکی جیاوازە لە ئەوانی تر

، ئەم نمونەیەیان گەرچی پاش(١١) مانگ و چەند ڕۆژێك كۆمار لە ناوەڕاستی ( كانونی یەكەمی١٩٤٦) بە گەیشتنی سوپای ئێران بۆ شاری مياندواو، كۆماری مهاباد ڕووخا ، بەلآم شوێن دەستی بە مێژووی گەلی كورد و ئازەر و ئێران و كوردستان و دەوڵەتانیشەوە بەجێهێشت، كە لە سايەی دبلۆماسيەتی (قازی محمد)و ڕاوێژكاريانەوە بەدی هات وخۆی لە برِوابوونی حكومەتەكەدا دەنواند بە پرۆسەی دانوستاندن لەگەڵ (قوام السلطنةی سەرەك وەزيران ئێران وپەيوەندی دانوستاندن لەگەڵ (ملحقی عسكری امريكی ) لە تاران (ئارچ ورۆزفيلد) وبانگهێشتكردنی بۆ مهاباد لە مانگی (١٩٤٦/٩) وپاشان پەيوەندی دانوستاندن لەگەڵ يەكێتی سۆڤيەت و بوونی نوێنەری وەزارەتی بازرگانی سۆڤيەت (ئەسدۆف) لە مهاباد تارۆژی پێش ڕووخانی كۆمار . قازی درێغی نەكرد لە پەيوەندی و دانوستاندن لەگەڵ حكومەتی تاران و حكومەتی ئازربايجان و سۆڤيەت و ئينگليز و ئەمريكا . هەر بۆيەش كۆماری مهابادی (١١ مانگ)تەمەن لە ئەرشيفی وولآتانی خاوەن ئەرشيفدا ، بۆتە ئەزمونێك و خەرمانێك لە مێژوی گەلی كورد .

**نمونەی چوارەم**: شۆڕشی ئەيلول و دانوستاندنەكان.

يەكەم داواكاری گەلی كورد لە خوارووی كوردستان بە شێوەی دبلۆماسيانە بە ياداشتێك لە لايەن پارتی ديموكراتی كوردستانەوە درا بە (عبدالكريم قاسم) ولانی زۆر كەمی مافەكانی تيا داوا كرد بوو. لە ڕۆژنامەی خەبات ئۆرگانی ناوەندی پارتی ديموكراتی كوردستان لە ڕۆژی (١٩٦١/٤/١٧ دا) بەم شێوەی خوارەوە بلآوكراوەتەوە.

**دانوستاندنی يەكەم**: لە ڕێگەی گەياندنی ياداشتێكەوە بوو، لە كاتی هەڵگيرسانی شۆڕشی ئەيلول لە (١٩٦١/٩/١١)دا كە داخوازيەكانی ناوياداشتەكە بريتی بوون لە.

١– به ڕەسمی ناساندنی حوکمی لامەرکەزی بۆ گەلی کورد لە چوارچێوەی عیراقدا ، کە لەم بەڕێوە بەرایەتیانە پێکبێت.
– بەڕێوەبەرایەتی ناوخۆ واتە(پۆلیس ، ئەمن ، وپارێزگا)کورد بەڕێوەی ببا.
– بەڕێوەبەرایەتی دادگا.
– بەڕێوەبەرایەتی شارەوانی.
– بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەوفێرکردن.

٢– زمانی کوردی لەگەڵ زمانی عەرەبی، زمانی فەرمی بێ لە کوردستان.
٣– خوێندن بە زمانی کوردی بێت.
٤– وەستاندنی هێرش وبۆردومان کردنی کوردستان.
٥– چەککردنی جاشەکان(ئەوسا زۆر کەم ونوێ بوون ) .ئەم ناوە واتە "جاش" لەو ناوەوە هاتبوو ، کە لە سەردەمی پاشایەتیدا لەو پۆلیسانە نرا بوون ، کە بۆ ماوەیەکی کاتی چەند مانگێ ئەکران بە پۆلیس بۆ لێدانی کەسە عاسیەکان لە حکومەت .وەك (مەجید شانشینی وخولە پیزە و فەتاحی حاجی)پێیان ئەوترا (جاش پۆلیس).
٦– ئازادی سیاسی ودیموکراتی واتە ئیجازەدان بە حزبەکان و ڕێکخراوەکان. ئەم یاداشتە لەگەڵ ئەوەی کە خواستەکان کەم و بچوك بوون.
بەڵام لە ڕاستیدا بۆ ئەو کاتە ئەم سوودانەیان هەبوو .
١– خەڵکی هوشیارکردەوە بە تایبەتی عەرەبەکان لە پروپاگەندە بێ بنەماکانی حزبی شیوعی کە دەیانکرد وەك:
– ئەمە هەڵسانی چەکداری عەشایەری دەرەبەگە وکۆنەپەرستانەیە و دژی ( اصلاحی زراعی)یە.

– ئەمە شەڕی بە کرێگیراوان و نۆکەرانی ئیمپریالیزمە دژی سەروەری و یەکپارچەیی خاکی عیراق.

– ئەمە شەڕی نەتەوەپەرستە توندڕەوە بەکرێگیراوەکانە بۆ جیاکردنەوەی کوردستان.

٢– هۆشداریەك بوو ، درا بە گۆی ئۆپۆزسیۆنەکانی ئەوسای عەرەبی دژی عبدالکریم وەك (ناصریەکان ، بەعسیەکان، قەومیەکانی عەرەبی، دیموکراتیەکانیش) کە ئەوەتا کورد جیابونەوەی ناوی لە عیراق و ئەو هۆشداریە دەرگای لە بەردەم گفتوگۆی نێوان پارتی ئەو حزبە عەرەبیانە کردەوە .

٣– هەنگاوی یەکەمی زەمینەسازی و ڕاهێنانی جەماوەری کوردستان بوو ،بە لامەرکەزی و تەکانێك بوو ، بۆ پەرەپێدانی خواستەکانی کورد.

٤– شکاندنی ئەو ئابلوقە ئیعلامیەی ، کە لەسەر شۆرشی ئەیلول هەبوو، کە بەهۆی ئەو دەرفەتەی دانوستاندنەی ،کە دەست کورد کەوت هەواڵی شۆرشی بە دنیای دەرەوەدا بلاوبۆوە.

**دانوستاندنی دووهەم** : (١٩٦٣/٢/١٩) لەگەڵ حکومەتی عبدالسلام عارف و بەعسدا: ئەم دانوستاندنە ئەنجامی ڕووخانی قاسم وهاتنی عارف و بەعسیەکان بۆ سەر حوکم لە (٦٣/٢/٨)دا کە پێش هاتنە سەرحوکمیان لە ڕێی (تایەر یەحیاوە) پەیوەندیان بە پارتیەوە هەبوو . یەکەم دانیشتن لە (٦٣/٢/١٩) لە بەغدا کراو. دووهەم دانیشتن لە (٦٣/٣/٣) لە کانی ماران سەر بە چوارقوڕنە کرا لە دەشتی بیتوێن.*

---

* بۆ زانیار زیاتر لەسەر دانوستاندنی ١٩٦٣/٣/١٩ سەیری:

١– ئیبراهیم جەلال، خوارووی کوردستان و شۆرشی ئەیلول، لاپەرە ١٠٢،بکە.

2– جرجیس فتح اللة، العراق فی عهد قاسم، لاپەرە ٨٤٤،بکە.

## داخوازیەکانی شۆڕش

١- دانی حوکمی زاتی بە کورد،( هێشتا باش ئەو جۆرە حوکمە لە داخوازیەکەدا گەلاڵە نەکرا بوو.

٢- سنوری حوکمی زاتی کوردستان ( سلێمانی، هەولێر، کەرکوك، ناوچە کوردیەکانی سەر لیوای موسل) دیاری بکرێ.

٣- هێزی پێشمەرگەی کوردستان وەك بەشێکی سوپای عیراقی دانی پیا بنرێ و لەژێر فەرمانەدەیی بەغدا بێ ،بەلاّم سنوری کارکردنی کوردستان بێ بۆ پارێزگاریکردنی سنور.

٤- بەرێوەبەرایەتی پۆلیسی کوردستان هەبێ.

٥- کورد بەشی هەبێ لە داهاتی نەوتدا.

گەرچی ئەم دانوستاندنە لەسەر داوای (مەلا مستەفا) و پێچەوانەی داواکاریەکانی مەکتەبی سیاسی بوون ، بەلاّم ئەمەش تەکانێکی باشتر بوو ، بۆ خواستەکانی شۆڕش لە چاو ئەوەی پێشوتریان ، چونکە ڕژێم لەم دانوستاندنەدا ئامادەی جێبەجێکردنی ئەم خالاّنە بوو:

أ- دان نان بە حوکمی لامەرکەزی کورد واتە ئەوەی قاسم نەیکرد.

(کریس کۆچێرا) دەڵێ: لە (١٩٦٣/٣/١٢) حکومەتی عیراقی یەکلایەنە بڕیاری دانی لامەرکەزی بە کوردەکان ڕاگەیاند.*

ب- ئەم دانوستاندنە بووە هۆی پشتیوانی کردنی کورد لەلایەن دوو دەوڵەتی عەرەبیەوە کە (میسرو جەزائیر ) بوون.

ج- داننان بە لامەرکەزی واتە داننان بوو، بە مافی نەتەوەیەك لە عیراقدا کە چەند مافێکی جیاوازیان هەبێ .

---

* کریس کۆچێرا، کورد لە سەدەی١٩ - ٢٠ ،لاپەڕە،٣٦١.

د- ئەم دانوستاندنە یەکێك بوو، لە هۆکانی سەرنەگرتنی وحدەی نێوان ( عیراق- میسر-سوریا).

هـ - دانوستاندن بووە هۆی دەست بە تاڵبوونی بەعسیەکان بۆ لێدانی شیوعیەکان و چونی شیوعیەکانیش بۆ پاڵ شۆڕش و لەسەرهەڵدانی یەکێتی سۆڤیەت و منغولیای میللی، لەسەر مەسەلەی کورد، کە هێندەی تر شۆڕشی ئەیلول و خواستەکانی کوردی بە دنیای دەرەوە ناساند ودۆستی لە بەرەی سۆشیالیستیدا بە هۆی سۆڤیەتەوە بوو پەیدا کرد.*

**دانوستاندنی سێهەم** :ووتووێژی (١٩٦٤/٢/١٠) لە نێوان بارزانی و حکومەتی عبدالسلام عارف و دووپارچە بوونی پارتی(جەلالی و مەلایی).

**چوارەم:** ووتووێژی مانگی (١٩٦٦/٤) لە نێوان باسکی جەلالی وحکومەتی بەزاز.

**پێنجەم:** ووتووێژی (١٩٦٦/٧/٦) لە نێوان باسکی مەلایی وحکومەتی بەزاز.

**شەشەم:** ووتووێژی مانگی(١٩٦٨/٥)لە نێوان باسکی مەلایی وحکومەتی بەعس و احمد حسن بکر. ئەم چوار دانوستاندنەی لە ١٩٦٤ تا١٩٦٨) کە لە کاتی جیاجیادا

---

* لە (١٩٦٣/٥/٦) رۆژنامەی "پراڤدا" ووتارێکی درێژی لەسەر مەسەلەی کورد و ئۆتۆنۆمی بلاوکردەوە .لە (١٩٦٣/٦/٣) مەنغولیای میللی بە ڕەسمی داوای لە نەتەوە یەکگرتوەکان کردکە مەسەلەی کورد وەك مەسەلەی کات باس بکرێ.لە مانگی(٦٣/٥)لیژنەی مەرکەزی حزبی شیوعی سۆڤیەت بە ڕەسمی ناڕەزایی سەبارەت بە کوشتاری بە کۆمەڵی کوردولەلایەن عیراقەوە دەربڕی.بەلام" لە کیمیا بارانی هەڵەبجەدا لە(١٩٨٨) شەڤەرنادزەی وەزیری دەرەوەی سۆڤیەت لە لەندەن ڕایگەیاند کە کوردە پەنابەرەکانی وولاتانی دەرەوە ڕاست ناکەن وعیراق کیمیاوی بەکارنەهێنا" لە (٦٣/٥/٩)گرۆمیکۆی وەزیری دەرەوەی سۆڤیەت یاداشتێکی دا بەعیراق کە دەڵێ:(پێویستە عیراق ئەوە بزانێ کە کاول کردنی کوردستان دەبێتە هۆی دەستێوەردانی دەوڵەتانی تری دونیا لە کاروباری ناوخۆی عیراق(کریس کۆچێرا، ل٣٧٤)

کراون . بەلأم هەموویان لە گەرمەی ناکۆکی و کێشەی نێوان ، جەلالی و مەلاییدا کراون ، لە ڕاستیدا بۆ بە دەسهێنانی هیچ دەسکەوتێکی سیاسی ، نەتەوەیی، ئەوتۆ نەبوون، ئەوەندەی کە بۆ خۆ بەهێزکردنی لایەك و لێدان و لاوازکردن و لەناوبردنی لاکەی تر کردوویانە وحکومەتەکانی عیراقیش ئەوهەل و مەرجە ئاڵۆز و خراپەی کوردیان بە هەلزانیوە تا بکەونە گەمەی وەخت بە سەربردن و هاندان و بەهێزکردنی جارێك جەلالی دژی مەلایی و جارێکی ترمەلایی دژی جەلالی.

**حەوتەم**: دانوستاندنی (١٩٦٩/١٢/١٩) کە بە بەیانی (١١ی ئازاری١٩٧٠) بە ئەنجام گەیشت.*

## نمونەی پێنجەم : شۆڕشی نوێ و دانوستاندن.

لە شۆڕشی نوێشدا دوو- سێجار ڕژێمی سەدام هەوڵیدا دەرگای دانوستاندن لەگەڵ (حسك وپارتی ویەکێتی )دا بکاتەوە ، بەلأم هەموو جارەکان بە بیانوی شەڕی عیراق-ئیران دەیویست دانوستاندنەکان تەنیا لەسەر ڕاگرتنی شەڕی نێوان کورد و عیراق بکرێ تا دانوستاندنی کۆتایی ساڵی ١٩٨٣-١٩٨٤ ، ئەوەی کە پێی دەوترێ دانوستاندنی ساڵی (١٩٨٤). سەرەتاکەی دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆژی (١٩٨٢/١٠/١٣) کە یەکەم دانیشتنی نێوان یەکێتی بە نوێنەرایەتی(مام جەلال ونەوشیروان )ونوێنەرانی حکومەتی سەدام ( عقید احسان) لێپرسراوی موخابەراتی کەرکوك و لێپرسراوی موخابەراتی هەولێر و ناوبژیکردنی د. قاسملۆ لە بارەگای حزبی دیموکرات لە (گۆڕە شێر) کرا ، کە یەکەم دانیشتن بوو ، تەنیا دەم و دو تاقیکردنەوە بوو.

---

* بۆ زانیاری تەواو لەسەر ئەم دانوستاندنە سەیری (خواروی کوردستان و شۆڕشی ئەیلول،چاپی سێهەم، سلێمانی لاپەڕە(٢٥٠-٣٦٥) بکە.

لە رۆژی ١٩٨٢/٢/١٣ ، بۆ جاری دووهەم هەمان نوێنەرەکانی حکومەت لە ڕێگەی قەڵادزەوە بەناوبژیوانی (د.قاسملۆ) لە ناوزەنگ دانیشتنیان لەگەڵ یەکێتی کرد، دیسان کۆبونەوەکە زۆر نهێنی و تەنیا "مام جەلال و نەوشیروان و د.قاسملۆ" بەشداربوون، نوێنەرەکانی ڕژێم هیچیان پێ نەبوو، دیسان هەر بۆدەم و دو تاقی کردنەوە هاتبوون، و بۆ ئەوەش هاتبوون، کە پەیوەندی ڕژێم بە پارتیەوە رابگەیەنن. یەکێتی پێی باش بوو، ئەم پەیوەندیە بە نهێنی نەبێ. بۆیە مام جەلال لە نامەیەکدا ناوەڕۆکی گفتوگۆکەی بۆ (کەریم ئەحمەد) جێگری سکرتێری حزبی شیوعی نارد.

## کۆمەڵە و بۆچوونی لەسەر ئەو دانوستاندنە.

کۆمەڵە سەنگێکی قورس و ڕۆڵێکی سەرەکی لە هەموو بڕیارەکانی یەکێتیدا هەبوو، هەر بۆیە پرسی پێدە کرا و بیروڕاکانی بە هەند و گرنگ وەردەگیرا . لەسەر داوای کۆمەڵە سەرکردایەتی یەکێتی کۆبونەوەی خۆی کرد و چەند بڕیارێکی گرنگی تیادرا.

١- بڵاوکردنەوەی سەرکردایەتی لە ناوزەنگ و چوونە ناو سنوری مەڵبەندەکان.

٢- گۆڕینی دروشمی دیموکراتی بۆعیراق وئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان- بە دیموکراتی بۆ عیراق و مافی چارەی خۆنوسین بۆ گەلی کورد.

٣- گۆڕینی دروشمی دەنگی شۆڕشی عیراق لە کوردستانەوە ، بۆ دەنگی گەلی کوردستان لە ئیزگەی یەکێتی.

٤- بەشێنەیی و لەسەرخۆ پرس و ڕاکردن بە ڕێکخستنەکانی یەکێتی شۆڕشگێڕان و کۆمەڵە: کە تازە یەکێتی شۆڕشگێڕان لە یەککگرتنی بزووتنەوە و هێڵی گشتی لە دایک ببوو .

لە مانگی (١٩٨٣/٨)دا ،سەرکردایەتی کۆمەڵە ، دوای کۆبونەوەکەی یەکێتی کۆبونەوەیەکی خۆی کرد و بڕیاردرا ، کە دەزگای ڕێکخستنی کۆمەڵە هەڵسێ بە جەولەیەکی دوور و درێژ بەسەر کەرتەکانی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەدا بۆ (٣) مەبەست.

**١- خۆسازدان بۆ گرتنی کۆنفرانسی سێ و هەڵبژاردنی ئەندام کەرتەکان.**
**٢- هەڵبژاردنی نوێنەرانی کۆنفرانس لەناو کەرتەکان.**
**٣- پرس وڕا کردن بە کەرتەکان و کۆنفرانسی کەرتەکان سەبارەت بە کردن یان نەکردنی دانوستاندن.**

لە پاش گەڕانەوەی نوێنەرانی ڕژێم بە ماوەیەك ، فەرەیدون عەبدولقادر وەك نوێنەری یەکێتی لە ڕێگەی (د.قاسملۆ)وە، لە مانگی (١٩٨٣/١١) ، چوو بۆ بەغدا بۆ تاقیکردنەوەی هەڵوێستی ڕژێم ، لە بەغدا فەرەیدون، بەرزان تکریتی وتارق عەزیزی دیبوو، لە پاڵ موجامەلەدا تارق تەهدیدی یەکێتی کردبوو : ( ئەگەر لەگەڵمان ڕێك نەکەون و شەڕمان لەگەڵ بکەن ، دوای تەواوبوونمان لە شەڕی ئێران بە هەموو سوپا و توانای عەسکەری عیراقیەوە دێینە سەرتان و تایەك ساڵ و سەد هەزار کوژراوتان بۆ دادەنێین و خاکتان بە توورەکە دەبێژین وتەدمیرتان دەکەین) . هێشتا شەڕی نێوان یەکێتی و ڕژێم هەر بەردەوام بوو، لەگەڵ ئەو هاتوچۆیانەشدا .مانگی (١٩٨٣/١٠) مام جەلال سەرکردایەتی و کادرە سیاسی وعەسکەریە پێشکەوتوەکانی کۆکردەوە سەبارەت بە ڕا و بۆچونیان لەسەر ئەوەی دانوستاندن بکرێ یان نەکرێ و هەموو لەسەر کردنی دانوستاندن بوون ، جگە لە یەك - دوو ئەندامی سەرکردایەتی و خودی " مام جەلال" خۆشی کە لەگەڵ نە کردنیدا بوون . لە کۆتایی ئەو مانگەدا وەڵامی دەزگای ڕێکخستنی کۆمەڵەش لەو ڕاپرسیانەی کردبوویان لەناو کەرتەکانی کۆمەڵە و ڕێکخستنەکانی گەڕایەوە سەرکردایەتی کۆمەڵە ، کە هەموو لەگەڵ بوونی دابوون ، دیسان جگە لە دوو- سێ ئەندامی کۆنی سەرکردایەتی کۆمەڵە هەمان ئەنجامی ئەو ڕاپرسیە بە " مام جەلال " گەیەندرا. لە ناوەڕاستی مانگی (١٩٨٣/١١) بە فەرمی بڕیاری دەستپێکردنی دانوستاندن درا.

لە ڕۆژی (١٩٨٣/١٢/٢) بڕیاری ڕاگرتنی شەڕ ، لە هەردوولاوە درا و ئاگاداری هەر چوار مەڵبەندەکان و تیپەکان و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵە و لقەکانی شۆڕشگێڕان کرا و

لەهەمان ڕۆژ سەدام حسێنیش فەرمانی بە هەموو هێزە چەکدارەکانی عیراقدا ، کە شەڕ ڕاگیرا . لە هەفتەی یەکەمی مانگی (١٩٨٣/١٢) دوو کۆپتەر هاتنە گوندی(زیخان)، د. قاسملۆ و یەك نوێنەری ڕژێمیان تیا بوو، لەگەڵ نوێنەرەکانی یەکێتی بە سەرکردایەتی " مام جەلال " سواری کۆپتەر بوون و چوون بۆ بەغدا . بڕیار بوو نوێنەرەکانی یەکێتی"مام جەلال" ودوو لە کۆمەڵە ( فەرەیدون و مولازم عومەر) دوو لە شۆڕشگێڕان و(د.خدر مەعسوم و عومەر عەزیز بن، بەڵام لە پڕ و لەوکاتەی کۆپتەرەکان ئامادە بوون بۆ فڕین مەلا بەختیار خۆی تێخست ، ئەمە لای هەمووان دیاردەیەکی سەیر بوو.

## داخوازیەکانی یەکێتی و دانوستاندن.

**یەکێتیی نیشتمانی کوردستان بۆ دەستپێکردن و ئەنجامدانی دانوساندنەکە ، چەند داخوازییەکی ڕەوای هەبوو ، لەوانە:**

١- جێبەجێکردنی حوکمی زاتی و دیاریکردنی دەسەڵاتەکانی دامودەزگاکانی لە کوردستان.

٢- دەسەڵاتەکانی حکومەتی ناوەند لە کوردستان.

٣- دیاریکردنی سنوری جوگرافی ناوچەی حوکمی زاتی بە کەرکوکەوە.

٤- ئاسایی کردنەوە و گەڕانەوەی ناوچە دابڕا و تەعریب کرا وچۆڵکرا و ڕاگوێزراوەکان بۆ دۆخی پێش ئازاری ١٩٧٠.

٥- دەسەڵاتی کورد لە دامودەزگاکانی حکومەتی ناوەنددا.

سەدام لە یەکەم گفتوگۆیدا لەگەڵ " مام جەلال" لەسەر خواستەکانی وەفدی یەکێتی قایل ببوو، کە دەکرێ دانوستاندنیان لەسەر بکرێ ، جگە لە کەرکوك ، کە بە هیچ جۆرێك ئامادە نیە دانوستاندنی لەسەر بکاو. دەبێ کەرکوك شارێکی عیراقی

بێ . یەکەم بەرهەمی ئەم جەولەیەی دانوستاندن ، پێکهێنانی لیژنەی هاوکاری (لجنە التنسیق)بوو، کە لیژنەیەکی ناوەندی لە کەرکوك و چەند لقێکی لە سلێمانی و هەولێر و سنوری مەڵبەندەکان هەبێ . ئەم لیژنەیە لە نوێنەرانی یەکێتی و حکومەت پێکهاتبوو بۆ:

– ڕێکخستنی پەیوەندیەکانی نێوان یەکێتی و حکومەت بۆ هەر کارێك کە بێتە پێشەوە.

– چاودێریکردنی پاراستنی ئاسایش و ڕاگرتنی شەر و نە بەزاندنی بڕیاری شەڕ ڕاگرتن.

– بە پیرەوە چوونی ئەو کێشانەی کە لە ملاونەولا دروست دەبن بەهۆی ئیلتزام نەکردنی پێشمەرگە یان چەکدارەکانی ڕژێم بە ڕاگرتنی شەڕەوە.

–بۆ گەیاندنی بیروڕاکانی هەردوولا لە ڕێگەی لیژنەی تەنسیقی ناوەندەوە بە یەکتری و ئامادە کاری هاتوچۆکان . دوای گەڕانەوەی "مام جەلال" ، بنکەکانی سەرکردایەتی ومام جەلال لە لەسەر جادەی گوندی زیخان بوو ، لەوێ نەمان وچوون بۆ بەری مەرگە بۆ گوندی ئاوەژێ.

## دژەکانی گفتوگۆ و دانوستاندنی یەکێتی.

**لە وەرگرتنی بڕیاری گفتوگۆ و دانوساندن لەگەڵ ڕژێمی بەعس، لەلایەن یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، بە پێی ئەو بارودۆخەی ئەوسای کوردستان و ئەو ململانێی وشەر و سەنگەرگرتنەی ئەو سەردەمە، بێگومان کۆمەڵێك لایەن و حزب ورێکخراو کەسایەتی لە دژی ئەو دانوساندنە و گفتوگۆیە وەستانەوە. بریتی بوون لە:**

١– هەموو حزب و لایەنە عیراقیەکانی ناو جوقد(١٨)حزب و ڕێکخراوەکانی ئۆپۆزسیۆنی عیراقی بوون.

٢– هەموو حزبەکانی بەرەی جود ( پارتی ، شیوعی، حسك، پاسۆك)

٣– حکومەتەکانی سوریا و لیبیا و ئێران و تورکیا.( بە تایبەت تورکیا رۆلێکی زۆر نیگەتیڤی گێرا، ئەویش بەهۆی پەیوەندییە پتەوەکانی لەگەڵ رژێمی ئەوسای عیراق ).

٤– زۆربەی کوردەکانی دەرەوەی وولآت ، بە تایبەتی ئەورووپا لە ئەندامەکانی یەکێتیش.

٥– لەناو یەکێتیش تاك و تەرای کادران بە تایبەتی ئەوانەی سەر بە تاقمی عیراقچی ناو کۆمەڵە بوون.

## خولی دووهەمی گفتوگۆ و دانوستاندن.

لە رۆژی (١٩٨٤/١/٢٥) خولی دووەمی دانوسـاندن لە نێوان نوێنەری یەکێتی نەوشیروان مسەفا و نوێنەری رژێم بە سەرۆکایەتی( فازیل بەراك ) ئەنجامدرا.

لە رۆژی (١٩٨٤/١/٢٦) وەفدی یەکێتی لەگەڵ (تارق عزیز و ئەندامەکانیان ) نەگەیشتنە هیچ ئەنجامێك و بە دەستی بەتاڵ گەڕانەوە ، تەنیا دەسکەوتێك بەردانی زۆربەی گیراوەکان و هەندێ سەیارە و فەردەیەك پارە بوو.

دوایی گەرانەوەی وەفدەکە لە رۆژی ١٩٨٤/٢/٢ ئەو شتانەیان لەگەڵ خۆیان بردیانەوە بۆ گوندی ئاوەژێ . دوای ئەم خولە ، کۆمەڵێ گرفت و کێشە هاتە بەردەم دانوستاندن و بۆ ماوەی چەند مانگێگ هاتوچۆ و گفتوگۆ ڕاگیرا . **لە دوایدا باسی دەکەم.**

## خولی سێهەمی دانوستاندن.

لە ڕۆژی (١٩٨٤/٧/٢٥) نوێنەرانی یەکێتی بە سەرۆکایەتی (د. فوئاد مەعسوم ) چوونە بەغدا و لەگەڵ نوێنەرانی حکومەت بە سەرۆکایەتی (علی حسن مجید) کۆبونەوە ، ئەم خولە نزیکەی یەك مانگی خایاند و هەشت دانیشتنیان کرد و لەسەر چەند خاڵێك ڕێکەوتبوون لەسەر چەند خاڵێکیش ناکۆك بوون.

**ئەوانەی لەسەری ڕێکەوتبوون:**

- ئاسایی کردنەوەی باروودۆخی کوردستان بە کەرکوکیشەوە ، لە ڕوی دیموگرافیەوە نەك جوگرافیەوە.
- دەسەلاتەکانی ئۆتۆنۆمی کوردستان.

**ئەوانەش کە لەسەری ڕێکنەکەوتن.**

- سنوری جوگرافی ناوچەی ئۆتۆنۆمی، کە ڕژێم قایل نەبوو بە هیچ جۆرێك کەرکوك و هەموو ناوچە نەوتیەکان بخریتە ناوسنوری ئۆتۆنۆمی.
- ناوچە ئاویەکان وەك زێی گەورە و بچوك و کەنداوەکان دەبێ لە ژێر دەسەلات و بەڕێوە بەرایەتی حکومەتدا بێ.
- بەشی کورد و دەسەلات لەناوحکومەتی ناوەنددا ، ئەمەش بەسترابویەوە بە بوونی یەکێتی بە ئەندامی پەیمانی نیشتمانی بەرەی نەتەوەیی پێشکەوتوخواز ( میثاق الجبهة الوطنية القومية التقدمية). واتە پڕکردنەوەی شوێنە بە تاڵەکەی حزبی/شیوعی بە یەکێتی.
- جۆری پەیوەندی دەسەلاتی ئۆتۆنۆمی بە حکومەتی ناوەندەوە ( کە یەکێتی داوای ئازادی و دەسەلاتی تەواوی ئەنجومەنی تەشریعی و تەنفیزی ئۆتۆنۆمی دەکرد ، لە بەڕێوەبردنی ناوچەی ئۆتۆنۆمدا ، بێ دەستێوەردان وخۆتێهەڵقورتاندن یان وصایەتی زۆرەملێ و خواستی حکومەتی ناوەند).

بەلام سەرانی بەعس وا ڕاهاتبوون، کە سەرکردایەتیەکەیان بە تایبەت سەدام بڕیاردەر و خاوەن دەسەلاتی ڕەها و وردودرشتی هەموو دامودەزگا حزب و بەرەیی وحکومی وئۆتۆنۆمیش بێ .

## خولی چوارەمی دانوستاندن و ڕۆڵی تورکیا لە تێکدانی.

لە ڕۆژی.(٢٥/٩/١٩٨٤) نوێنەرانی یەکێتی بە سەرۆکایەتی "مام جەلال" بە نیازی ئیمزاکردنی بەڵگەکان و تەواوکردن و چارەسەرکردنی ئەو خاڵانە بوو ، کە لە خولی سێیەمدا کێشەیان لەسەر بووە ، و ئیمزای ڕێکەوتنی یەکجاری و بەیانی بڵاوکردنەوەی دوایی ئەنجام بدەن.

## خاڵەکانی ڕێکەوتن لەم خولەدا جگە لەوانەی پێشوو.

– هەڵگرتنی بەشداربوونی یەکێتی لە بەرەی نیشتمانی بۆ ئاییندە و پەلە لێنەکردنی.

– یەکێتی ناوی هەڵبژاردەکانی خۆی بۆ ئەنجومەنی نیشتمانی عیراق و وەزارەتەکان لەماوەی هەفتەیەکدا ئامادە بکات . بە تایبەت لەوکاتەی شانۆگەری هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نیشمانی عیراقی لە ئارادا بوو، یەکێتی ناوەکانی لسیتەکەی خۆی لە کەسانی ئەکادیمی و ناسراوی کورد و سەربەخۆ ئامادەکرد ، نەك لە کادر و ئەندامانی سەرکردایەتی و ڕێکخستنەکانی خۆی. هیوایەکی زۆر هەبوو، لەم خولەدا هەموو شتێك ببڕێتەوە ، ئەگەر بۆ ماوەی چەند ساڵێکیش بێ ، کورد لە ئاگری شەڕی ناو خۆ و ئێران و عیراق بە دووردەخات ، بەڵام دەستێوەردانی تورکیا هەموو ڕیسەکەی کرد بە خوری و لەو کاتەدا سەرۆکی ئەرکانی سوپای تورکیا چوو بۆ بەغدا و لە سەدامی گەیاند بوو، نابێ لەگەڵ کوردەکان لەم دانوستاندنەدا ڕێبکەون وبیانویەك بدۆزنەوە بۆ ڕێنەکەوتن . بۆ سەدام تای تەرازوی تورکیا قورستر بوو، لە تای تەرازوی کورد لەو هەلومەرجەی شەڕی عیراق – ئێراندا. چونکە:

١– تەنیا دەرچونی نەوتی عیراق بۆ بازاڕەکانی نەوتی جیهانی دەرگای تورکیا بوو، نەوتیش بۆ درێژەدان بە شەڕ گەورەترین، گەر نەڵێم تەنیا تاکە سەرچاوە بوو.

٢– تورکیا گەورەترین دەرگای هاوردەی کەلوپەل و یەدەگی پێویست بۆ شەڕ بۆ عیراق بوو . بۆیە لەو کاتەی کە (عزت دوری ) لەگەڵ ( مام جەلال) بڕیاری بڵاوکردنەوەی ڕێکەوتنەکەیاندا بەڵام ئەوکاتەی لەمبارەیەوە پرس بە سەدام دەکرێ ،سەدام بە عزت دوری دەڵێ : تا میپاقی بەرە ئیمزانەکەن هیچ بڵاونەکەنەوە .

**٩-٢.كۆتایی هاتن بە دانوستاندن.**

ڕۆژی (١٩٨٤/١١/١٤) شاندی دانوستاندنی یەکێتی بێ هیوا گەڕانەوە .دوای ئەو گەرانەوەیە ، بۆ دروستکردنی کۆسپ لە بەردەم دەست پێکردنەوەی گفتوگۆ، یەکێتی دەسکاری کۆمەڵێ بەندی ناو میپاقەکەی بەرەکەی بەعسی کرد و لە ڕێگەی لیژنەی تەنسیقی کەرکوکەوە بۆ بەعسی ناردەوە ، بەعس بەو دەسکاریە لەوە گەیشت کە دانوستاندن بە بنبەست گەیشتووە . لە رۆژی (١٩٨٤/١/١٥)یەکێتی بەیانی وەستاندن و راگرتنی گفتوگۆی لەگەڵ رژێمی بەعس ڕاگەیاند.

زۆرجار وەك گەمەی سیاسی بۆ دەرنەخستنی هۆکارەکانی شکستێك یا ناچاریەك هۆکار و فاکتەرە سەرەکی و ڕاستیەکان نە لە ڕاگەیاندن ونە لە بەیانەکانیشدا باس ناکرێن و بە پەردەی هەڵوێست و فرۆشتن دادەپۆشرێن ، هەم لای یەکێتی وهەم لای رژێمیش هۆکارە ڕاستیەکانی پاڵ پێوەنەر بو دەست پێکردنی دانوستاندنیان لە ڕاگەیاندندا باس نەکردوە . بۆ نمونە : پەیامنێری رۆژنامەی (السفیر) لە ١٩٨٨/٩/١٤ ژمارە (٥٠٧٥) پرسیارێك لە"مام جەلال"دەکا: بۆ ئامادەبوون بۆ گفتوگۆ لەگەڵ عێراق ، پێتان وا نەبوو ، کە شکانی سوپای عێراق هەلی باشتری بۆ ئێوە هەڵدەخست بۆ فشار خستنە سەر بەغدا؟

مام جەلال: "بە پێچەوانەوە ئێمە بۆیە گفتوگۆمان قبوڵ کردوە چونکە عێراق لە پەلاماری ئێراندا تێکشکاوە و ناچارکراوە بە پاشەکشێ کردن ، و گەیشتۆتە قۆناغی پاشەکشەوە دەرچوون لە قۆناغی شەڕفرۆشی و پەلاماردان ،و لەوماوەیە ئێران کەوتبووە پەلاماردان و داگیرکردن بە مەبەستی داگیرکردنی عێراق و بنیاتنانی کۆماری ئیسلامی عیراقی.....و ئێمە مافی داگیرکردنی عێراق بە هیچ کەس نادەین....بۆیە دانوستاندنمان لەگەڵ کرد".

بەڵام کە سەفیر پرسیاری لێدەکا ئەی لە (١٩٨١دا) دانوستاندنتان کرد لەگەڵ حکومەتی عیراق، داخۆ ئەوکاتە عیراق پەلاماردەر و داگیرکەر بوو ؟

مام جەلال دەڵێ: " ئەوکاتەش من خۆم نامەیەکم بۆ سەدام نوسی وەك پشتگیریەك بۆ کۆنگرەی سەرانی عەرەبی لە بەغدا، کە دژی (کامپ دیڤید) بوو ، لە نامەکەمدا ووتومە ئەگەر عیراق بە ڕاستیەتی لە بە هێزکردنی بەرەی ڕۆژهەڵات، ئەوا ئێمە ئامادەین لەلایەنی خۆمانەوە شەڕ ڕاگرین تا سوپای عیراق دەسبەتاڵ بێ بۆ بەرەی ڕۆژهەڵاتی ( واتە لێدانی ئیسرائیل ) وکە پەلاماری ئێرانیشیاندا پێمان ووتن: شوێنی شیاوی سوپای عیراقی ڕووباری ئوردنە نەك ڕووباری ئوردن لە ئەهواز . بۆیە داوای گفتوگۆمان کرد ، تا کوردەکان تاوانبار نەکرێن بە خەنجەر وەشاندن لە پشتەوە لە سوپای عیراقی لە کاتی شەڕی لەگەڵ ئێراندا.*

## هەلومەرج و فاکتەرەکانی ئامادە بونی ڕژێم بۆ دانوستاندن.

**ئەمانەی خوارەوە هەندێ لەو هەلومەج و فاکتەرانەن.**

١- عیراق لە شەڕێکی درێژخایەن و خوێن لەبەر ڕۆیشتن دابوو لەگەڵ ئێران ، بە لایەنی کەم پێویستی بەبێ لایەن کردنی بەرەیەکی تری شەڕ هەبوو، ئەویش بەرەی کوردستان بوو.

٢- عیراق دەیویست بە دانوستاندن لەگەڵ کوردا ، بەرەیەکی فراوانی شەڕی بۆ بکرێتەوە لە کوردستانەوە پەلاماری هێزەکانی ئێرانی بدا بۆ کەمکردنەوەی فشار لەسەر خواروی عیراق.

٣- عیراق لە نزیکبونەوەی ئێران و یەکێتی ئەترسا ، کە دەبوە هۆی پەلاماردانی هێزەکانی عیراقی لە کوردستانەوە و لە خواروی عیراقیشەوە.

٤- ڕاوێژکارەکانی عیراقی لە سۆڤیەتەوە تا ئەمریکا بە پەسەندیان ئەزانی کە عیراق لەگەڵ کورد دانوستاندن بکات ، تا بتوانێ لە یەك بەرەوە شەڕی لافاوی شیعیزم و ئیسلامیزمی ئێرانی بکا، تاکو زیاتر پەرەنەسەنێ و روونەکاتە عیراقیش .

---

* جلال الطالباني، حول القظية الكردية في العراق،ص٩٩.

٥- دەوڵەتانی عەرەبی جگە لە سوریا هاندەر بوون بۆ دانوستاندنی عیراق لەگەڵ کوردا بۆ بەربەستکردنی مەترسی بڵاوبونەوەی حوکمی فیندامینتالستی ئێرانی.
٦- سەبارەت بەبوونی بنکە و بارەگا و هێزەکانی ئۆپۆزسیۆنی کوردستانی ئێران ، لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی یەکێتیدا و پەیوەندی دۆستانەیان لەگەڵ حکومەتی سەدام و هاوکاریکردنیان لەلایەن سەدامەوە ، حکومەتی سەدام دەیویست لە ڕێگەی دانوستاندن و ڕێکەوتن لەگەڵ یەکێتی هێزی ئۆپۆزسیۆنی کوردی و ئێرانی و یەکێتی وخۆشی بەرەیەکی فراوانی شەڕ لەناو کوردستانی ئێراندا بەرامبەر کۆماری ئیسلامی بکاتەوە.

## هەلومەرج و فاکتەرەکانی پەسەندکردنی دانوستاندن لەلایەن یەکێتیەوە.

**چەند فاکتەرێك وایان لە یەکێتی کرد ، تا دانوساندن بکات. لەوانە:**

١- داخراوی هەموو دەروازەکانی پەیوەندی یەکێتی بە دەرەوە ، ئێران ، تورکیا ، عیراق ، کە لەو کاتەدا یەکێتی زۆر پێویستی بە هاوکاری هەبوو.
٢- گرژیەکی ئێجگار ئاڵۆزی نێوان یەکێتی و کۆماری ئیسلامی ئێرانی و دژایەتیکردنی یەکێتی لەلایەن ئێرانەوە بە هۆی داڵدەدانی ئۆپۆزسیۆنی کوردستانی ئێرانی ( حزبی دیموکرات و کۆمەڵە وحزبە ئێرانیەکان ) وبەشداریکردنی یەکێتی لە شەڕی دژ بە هێرشی ئێران بۆ سەر ڕۆژهەڵاتی کوردستان.
٣- بەرەی جود سەبارەت بەو شەڕە ناوخۆییانەی ، کە لەگەڵ یەکێتیدا کرابوو، بە هیچ جۆرێك ئامادەی ڕێکەوتن و دانیشتن نەبوون لەگەڵ یەکێتی و ببوونە جێی مەترسی بۆ سەر یەکێتی ، بەتایبەتی کە هەر چوار حزبەکەی جود (پارتی ، حسك ، شیوعی ، پاسۆك) بارەگاکانیان لەناو ئێراندا بوو، هەمیشە دەیانتوانی لەگەڵ هێزی ئێرانی و بە فشاری ئەوان مەترسی لەسەر یەکێتی لە سنورەکان ولە قولآیش دروست بکەن.

٤- سەبارەت بە تێپەڕبوونی چوار ساڵ بەسەر شەڕی ئێران وعێراق ، یەکێتی بە هەلی زانی کە داوای ڕژێم بۆ دانوستاندن ڕەت نەکاتەوەو، لای وابوو ، عێراق هیلاکە لەم شەڕەدا و ئێستا لە هەموو کاتێکی تر ئامادەی جێبەجێکردنی زۆرترین داواکانی کوردە.

٥- یەکێتی سەبارەت بە شەڕەکانی ناوخۆ و بارودۆخی ئابوری و جوگرافی خراپی پێویستی بە پشویەك بۆ هێزە ماندوەکەی هەبوو ، کە لە ڕێگەی دانوستاندنەوە هەم پشویەك بدا ، هەم کەمێك لە قورسایی باری خراپی دارایی سوك کات ، کە لە ڕێگەی کردنەوەی دەرگای پەیوەندی لەگەڵ ڕژێم و پەیوەندی بە جەماوەری شارەکانی کوردستانەوە دەیتوانی چارەسەریان بکات.*

٦- گەمارۆدراوی لەلایەن بەرەی جودەوە لەناو کوردستاندا، کە پێویستی بە دەرفەتێك بوو، ئەلقەی ئەو گەمارۆیەش بشکێنێ.

## دژەکانی دانوستاندن.

١- سوریا و لیبیا ناکۆك بوون لەگەڵ عێراق.

٢- بەرەی (١٩) قۆڵی کە یەکێتیش ئەندامێکی بوو.

٣- بەرەی جود "پارتی ، حسك ، شیوعی ، پاسۆك".

٤- ناقابلی برادەرانی ناوخۆ ، لەناو سەرکردایەتی کۆمەڵە و شۆڕشگێڕان، کە بە جاشایەتیان دەزانی، کەچی دوای شەڕبونەوە هەندێکیان مەیدانی شۆڕشیان چۆڵکرد و بوون بە دژە یەکێتی وەك( مەلا بەختیار ، شێخ علی ، مامۆستا پشکۆ ، دکتۆر هەژار ، سالار عزیز ، ئاراسی حەمەلاو ، بابەعلی" چەندانی تر. لەناو شۆڕشگێڕان ( سەربەست

---

* لەگەڵ ئەوەی یەکێتی هەوڵی زۆریدا لە ڕێگەی سوریا و لیبیا و فەلەستینیەکانەوە ئەلقەی ئابلۆقەی ئێرانی بشکێ ئێران و دژی یەکێتی نەبێ و سنوری لێ نەداو ناوچەکانی بداتەوە،بەلاَم ئێران گوێی نەدایە ناوبژیکەران ، تەنانەت(معمر قذافی و حافظ اسد) لە نامەیە کدا بۆ (خامنئی) هوشیاریان کردبۆوە ، کە یەکێتی ناچار نەکەن بڕوا لەگەڵ عێراقیشدا شەڕ ڕابگرێ و ڕێبکەوێ.

بامەڕنی، پێشەوا تاڵەبانی ، عومەر عەزیز "حاکم عومەر" ، سمکۆ دزەیی ، ئیحسان وەلاشی ، سوارەی عباس ئاغا) چەندانی تر.

٥- هەندێ لە کوردەکانی دەرەوە، کە چەند ئەندامێکی سەرکردایەتی یەکێتیشیان تێدا بوو ، لە وانە (د.فوئاد مەعسوم ، د.عومەر شێخ موس ، فازیل کەریم "مامۆستا جەعفەر") بەشێکی تری کوردەکانی سەر بە خوێندکاران (ئەکسا- AKSA).

کۆمەڵێکی تری عیراقچی بە ناوی (دەستەیەك ڕۆشنبیری کورد)لەدەرەوەی وولات. *

## سودەکانی دانوستاندنەکە. *

١- حەسانەوەی هێزەکانی یەکێتی لە ماوەی ئەو ساڵەدا.

٢- نەبوونی هیچ چالاکیەك دژی ڕژێمی عیراقی لەو ساڵەدا ، بۆ ئێرانی سەلماند کە یەکێتی ئەو هێزە سەرەکیەی گۆڕەپانی کوردستانە ، کە دەبێ حسابی بۆ بکات و ئەو هێزە لاوازە نیە، کە بەرەی جود تێیان گەیاندوون ، ئەم سودە دواتر ڕۆڵی گێرا.

---

* بلاوکراوەی ژمارە(٣) ،ئاشتبوونەوەی گشتی ،" ئایا سەرکردایەتی کۆمەڵە دژی موفاوەزاتە؟" دەستەیەك ڕۆشنبیری کورد لە دەرەوەی وولات ، سەرەتای سێپتەمبەری ١٩٨٤. بە تایبەتی لە شەڕی (١٩) ڕۆژەدا کە پاشان (ڕەفسنجانی) ووتبوی: بە درێژایی شەڕمان کوردستانی ئێراندا ئەوندەی شەڕی ١٩ ڕۆژەمان لێ نەکوژرا بوو.

* بە پێچەوانەوە ڕژێم لە ماوەی دانوستاندندا پەیوەندی بە چەند فەرماندەی تیپ و کەرتەوە کرد بوو. سازیکردبوون بۆچونە پاڵ ڕژێم لە کاتی شەڕکردنەوەدا و لەکاتی دانوستاندنیشدا تابوری پێنجەم بن لەناو یەکێتی دا.

**بۆ نموونە:**

١- هەر لەگەڵ دروستبوونەوەی شەڕ ، ئەوەی پێی دەوترا هەرێمی (١٤)، کە گەورەترین تیپی سەر بە مەڵبەندی(٣) بوو،(١٢) کەرتی هەبوو ، هەمووشیان بەسەر تیپەکەشیانەوە کە سوار ئاغا بوو، تەسلیمی ڕژێم بوونەوە.

٢- تۆقان و ترسانی هەندێ لە ئەندام مەڵبەندەکەی (٣) و دوو ـ سێ سەرتیپی سەر بە مەڵبەندەکە ، کە بە شەڕ دروستبونەوە ، مەڵبەندیان بەجێهێشت و تیپەکەشیان هەڵوەشا وەك:(سمکۆ دزەیی وسەربەست بامەڕنی) کە شۆڕشیان بەجێهێشت و ڕوویان کردە ئێران و پاشان ئەوروپا و لە ئەورووپاش بوون بە دوژمنی مام جەلال و نەوشیروان و کۆمەڵە و ترسنۆکی خۆیان بە توندوتیژی نەوشیروان و مام جەلالدا دەپۆشی.

٣- یەکێتی بۆ جەماوەری دەرخست و سەلماندی ، کە لە بڕیاردان سەربەخۆیە و پابەندی هیچ لایەك و بەکرێگیراوی هیچ دەوڵەتێك نیە.

٤- بەرەی "جود" لەوە گەیشتن ، کە بە هەموو هێزیانەوە لە ماوەی ئەو ساڵەدا بە هاوکاری ئێرانیش نەیانتوانی چالاکی ئەنجام دەن ، ئەمەش وای لێکردن ، کە دوای شەڕبوونەوە ئامادەی دانوستاندن و ڕێکەوتن بن لەگەڵ یەکێتیدا.

٥- لەماوەی دانوستاندندا جەماوەری کوردستان فشاری ڕژێمیان لەسەر نەما و ترس و گرتن و کوژرانی بەرەکانی شەڕیان لەسەر نەما، و هەمووسەربازە ڕاکردوەکان لە کوردستاندا پارێزراو بوون ، جگە لەوەی کە یەکێتیش هێزەکەی لەو ماوەیەدا هەم بە ژمارە زیادی کرد و هەم پۆشتە و پەرداخیش بوونەوە.

## کێشە لابەلاییەکانی کاتی دانوستاندن.

١- **کێشەی جاش**: حکومەتی عیراقی ئامادە نەبوو، لە کاتی دانوستاندندا جاشەکان هەڵوەشێنێتەوە. بە گووتەی خۆیان ئەوان جاشی کوردیان لە دژی شۆڕش کردوە بە هێزێکی گەورە، تا لە ڕێکەوتنیان لەگەڵ شۆڕش دڵنیا نەبن ، هێزی جاش هەڵناوەشێننەوە بۆ ئەوەی:

ا- لە هەڵوەشاندنەوەیاندا نەچنە ناو شۆڕش.

ب- بۆ ئەوەی لە هەڵوەشاندنەوەیاندا بێ بڕواییان تیا دروست نەبێ بەرامبەر ڕژێم.

## هێزی جاش لە سێ جۆرە کەس و لایەن پێکهاتبوون.

ا- ئەوانەی کە لە بەرەکانی شەڕ هەڵاتبوون و لە باتی سەربازی دەبوونە جاش لای مستەشار و دەرەبەگ و خائینەکانی کورد ، ئەم بەشە زۆربەی هەرەزۆریان بۆ ڕزگاربوون لە بەرەکانی شەر و نەگرتنیان لەلایەن ڕژێم و دانیشتنیشیان لە ماڵی خۆیان ببوون بە جاش و بەشێکی زۆریشیان موچەکانیان موستەشار و سەرۆك

جاشەکان  دەیانخوارد و بە مانەیان دەووت: جاشی میللی "سوپای میللی – جیش الشعب".

ب– ئەو عەشیرەت و تیرە و تایەفانەی ، کە بە بنەماڵە دژی شۆڕشی کورد بوون ، یان بەهۆی دژایەتیان و دوژمنایەتیان لەگەڵ ئەو تیرە و تایەفە و عەشرەتانەی لەگەڵ شۆڕش بوون لە دژی ئەوانە دەچوونە بەرەی حکومەتەوە ، بۆ ئەوەی لە پەنا حکومەتدا لە شەڕی دوژمنەکەیان پارێزراو بن ، ئەم بەشە سەبارەت بە کۆنیان لە جاشایەتیدا هەر لە شۆڕشی ئەیلولەوە  تا شۆڕشی نوێ ، خاوەنی ئەزموونێکی زۆری شەڕ و شەڕی پارتیزانی بوون.

ج– ئەو پارتیانەی کە پارتی دیموکراتی کوردستان لە دژی یەکێتی ناردبوونیە ناو حکومەت و تەنیا شەڕی یەکێتی پێ دەکردن ، ئەم بەشە جاشە گەلی درندەتر و کاسەلیسی بەشی جاشی حکومەت بوون ، و هەر لە دوو بەشەکەی تر، پتر زیانیان بە شۆڕش و یەکێتی دەگەیاند . لە ماوەی دانوستاندندا جاش یەکێك لە گرفت وکۆسپەکانی بەردەم ڕێکەوتن بوون ، کە لەو ماوەیەدا  چەندین  پێشمەرگەی قارەمان و دوو فەرماندەی ناسراوی  شۆڕش و گەلەکەمان و کۆمەڵەیان شەهید کرد لەوانە: ( مامەڕیشە وسەید کەریم ).جاش لە دوو سەرەوە  دەیانویست دانوستاندن تێکبدەن:

لە سەرێکەوە: جاش پارتیەکان کە بە بڕیاری پارتی دیموکراتی کوردستان دەیانویست کێشە و ئاژاوە دروستکەن بۆ دوو مەبەست:

ا– بۆ لێدان و کوشتنی پێشمەرگە و فەرماندەکانی یەکێتی لە خافڵیا.

ب– بۆ تێکدان وهەڵوەشاندنەوەی گفتوگۆ.

لەسەری دووهەمیشەوە : بە گشتی جاشەکان لە هەڵوەشاندنەوەی خۆیان دەترسان ، بۆیە  هەوڵی تێکدانی گفتوگۆیان دەدا.

## کێشەی سەربازی ڕاکردو.

بەپێی یاسای سەربازی عیراقی ، هەر سەربازێك لە بەرەکانی شەڕدا ، ڕای بکردایە جاری یەکەم گەر بگیرایە حوکم دەدرا و پاشان دەنێرایەوە بەرەکانی شەڕ ، وگەر بۆ جاری دووهەم ڕای بکردایە و بگیرایە گوللەباران دەکرا . لەکاتی دانوستاندندا سەربازێکی زۆری کورد لە بەرەکانی شەڕ ڕایانکرد بوو ، بەشێکیان دەچوونە دێهاتە ڕزگارکراوەکانی ژێر دەسەلاتی یەکێتی و بە ئاشکرا و بێ ترس لە شارەکاندا دەخولانەوە ، کاتێکیش دەگیران کەسوکاریان پەنایان دەهێنایە بەر یەکێتی تا بەرەلایانکەن . تەنانەت لە سلێمانی ( ٩ ) سەربازی ڕاکرد و گیران و گوللەباران کران و ئەم کارە بووە هۆی دروستبوونی کێشەیەکی گەورە لە نێوان یەکێتی وحکومەت.

٣- کێشەی پێشمەرگەی پابەند نەبوو بە سەرەتاکانی دانوستاندن و پەلاماردانی جاش و سەرباز و هاتوچۆی نەشیاو بە شارەکاندا و جێهێشتنی سنوری ناوچەکانی خۆیان.

## هەڵەکانی یەکێتی لەکاتی دانوستاندندا.

١- لە ماوەی دانوستاندندا کە نزیکەی ساڵێکی خایاند، یەکێتی هیچ نەخشەسەکی نەبوو ، بۆ پەیوەندیکردن بە جاش و جیش الشعبی و مەفرەزەکانی ئەمن و موخابەرات و ئیستخباراتە کوردەکان، بۆ دڵنیاکردن و دڵنەوایی کردنیان لە لێبوردنیان لە کاتی سەرکەوتنی دانوستاندن و هەوڵدان بۆ ڕاکێشانیان بۆ بەرەی شۆڕش ، یان لانی کەم هاندانیان بۆ چەك دانان و بۆ وازهێنان.

٢- شوێنی گفتوگۆ و کاتی گفتوگۆ لە خولەکانی دانوستاندندا لەلایەن حکومەتەوە دیاری دەکرا و تەنانەت شوێنی حەوانەوەی نوێنەرەکانیش هەر لەلایەن حکومەتەوە دیاری دەکرا ، کە دەبووە هۆی نەمانی ئازادی بیرکردنەوە و بیروڕا گۆڕینەوەی نوێنەرەکانی یەکێتی و زۆرجار جاسوسی کردنیش بەسەریانەوە.

٣- هەر خولەی تاقمێکی جیاواز ، لە خولەکەی پێشوو دەکرانە نوێنەر بۆ گفتوگۆکە . ئەمەش کاریگەری خراپی لەسەر ڕەوتی گفتوگۆکان هەبوو ، چونکە ئەو زانیاریەی کە نوێنەرانی خولی یەکەم لە گفتوگۆدا پەیایان دەکرد ، نوێنەرانی خولی دووهەم نەیان بوو، لەلایەکی تریشەوە گەر گۆڕانەکان لەبەر هۆی هونەری گفتوگۆ یان یاسایی یان دبلۆماسی و توانای فکری بوایە .

بە هەرحاڵ بەڵام گۆڕینی نوێنەرەکان لەبەر ئارەزووی نەدی و بدیانەی ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی بوو، بۆ:

ا- چون بۆ بەغدا و ماوەیەك دووركەوتنەوە لە شاخ و بارەگاكانیان.

ب- پشودانێك لە كۆشك و شوێنە خۆشەكانی حەوانەوە.

ج- سود وەرگرتن لەو دیاریانەی كە حكومەت ئەیدا بە نوێنەرەكان.

د- بۆ خۆ پێوەبادان و ڕەسم گرتن بەوەی کە ئەندام و نوێنەری بەشداربووی دانوستاندن بوون.

٤- پێش هەر خولێکی دانوستاندن و پاش گەڕانەوەش ، کۆبونەوەکانی سەرکردایەتی یەکێتی بۆدەستنیشانکردنی خاڵەکانی گفتوگۆ یان ووردەکاریەکانی و یان کەم و کوڕیەکان دەکرا ، هەموو نهێنیەکانی ناو کۆبونەوە دەبرایە دەرەوە و سەرتاپای ڕەوتی خولەکە دەکەوتە بەردەم دۆست و دوژمنان ، بە ئاسانی پلانی دوژمنان بۆ تێکدانی دانوستاندن کاری دەکرد.

٥- بێ ئیلتیزامی چەند ئەندامێکی سەرکردایەتی یەکێتی و کۆمەڵە بە ڕای زۆرینە و بڕیاری سەرکردایەتی سەبارەت بە دەستپێکردنی دانوستاندن.

بۆنمونە: مەلابەختیار لە لایەکەوە لە کۆبونەوەی سەرکردایەتیدا لەگەڵ دانوستاندن بوو. لە یەکەم خولی گفتوگۆدا بە زۆر خۆی کرد بە نوێنەر و لەگەڵ سەدام حسین دا وێنەی گرت و دیارەکانی ئەو فاشیەشی قبوڵکرد ، کەچی لەولاوە کادر و پێشمەرگەی

هاندەدا دژی دانوستاندن بن و هەوڵی دەدا وورده وورده بەرەیەکی فراوانی دژ بە یەکێتی لەناو یەکێتیدا پێکبێنێ.

## من وپێشوی دانوستاندن.

هەر لە دوای ئاڵوگۆڕەکانی ئەندامانی مەڵبەندی (٣) لە مانگی (١٩٨٣/٧) وە، من بێکار بووم هەم لەناو ئۆرگانەکانی یەکێتی و هەم لەناو ئۆرگانەکانی کۆمەڵەش . پێشمەرگەی مەفرەزەکەی خۆم دابوو بە کەرتی ڕێکخستنی کۆمەڵەی ڕانیە، ئەوان بارەگاکەیان لە گوندی "دارەبەن" بوو، خۆشم ژوورێکی بەتاڵی سواغ نەدرا و نە لە ناوەوە و نە لە دەرەوەی ، کەمی دوور لە بارەگای کەرتم پاککردەوە و لەناوەوە بە نایلۆن بنمیچەکە و هەموو دیوارەکانیم داپۆشی و تەنانەت ئەرزی ژوورەکەم هەر بە نایلۆن داپۆشی ، و بە نایلۆنیش لە ناوەوە ژوورەکەم کرد بە دوو بەشەوە بەشێکی بەردەرگاکەیم کرد بە شوێنی داری سووتاندن و زۆپا و کەرەسەی چا و خواردن ، بەشەکەی تریش جێم تیا داخستبوو بۆ خەوتن و دانیشتن و نووسین.

لەو ماوەیەدا توانیم دەست بە تەواوکردنی هەندێ لە نوسین و بەهەمەکانم بکەم ، کە پێشتر کارم تێدا کردبوون، لەوانە:

ا- کتێبی "فەرهەنگی سیاسی"م تەواو کرد.

ب- وەرگێڕانی نامیلکە یان کتێبی "مەتیریالیزمی دیالکتیکت" بە زمانێکی سادە.

ج- نامیلکە یان کتێبی "کادر کێیە وچۆن پەروەردە دە کرێ ؟ " تەواوکرد. بە هاوکاری ولە ڕێگەی چاپخانەی کۆمەڵە ، بۆ شانسی من ئەوانیش هاتبوونە دۆڵی ئاکۆیەتی بە چاپ گەیەندران.

- فەرهەنگی سیاسی بە تیراژی ٥٠٠ دانە لە مانگی (١٩٨٤/١) چاپکرا.

- ماتیریالیزمی دیالکتیك بە تیراژی ١٠٠٠ دانە هەر لە مانگی(١٩٨٤/١) چاپکرا.

– کادرکێ یەو چۆن پەروەردە دەکرێ ؟، چاپکردنەکەی دواکەوت بۆ مانگی (١٩٨٥/٨) کە بە ناوی (هاوارە)وە، نوسیبووم . پاشان بوو بە دەرسێکی دەورەی کادران لەکاتی دانوستاندندا. برادەرانی عراقچی بە هەڵیانزانی کە بکەونە پڕوپاگەندە کردن بۆ دووشت:

ا– بۆ دژایەتیکردنی دانوستاندنەکە.

ب– بۆ برەودان بە تەیاری عراقچێتی لەناو کۆمەڵە.

بابەتی کوردستانی بوونی کۆمەڵە و عراقی بوونی کۆمەڵە ببووە سەرەباس و بابەتی دەمە تەقێ شەوان و کۆبونەوەکانی ناو کادر و ئەندام و پێشمەرگەکانی کەرتەکانی ڕێکخستنی ڕانیە و قەڵادزە و کۆیە و خۆشناوەتی لە سنورەکانی مەڵبەندی (٣–٤) تا ئەو کاتەش ناوەندی کۆمەڵە و سەرکردایەتی کۆمەڵە و دەزگای ڕێکخستنی کۆمەڵە ، هیچ ڕوونکردنەوەیەکی فکری و سیاسییان لەسەر ئەو ناکۆکیە وەك نامیلکەیەك و بە تێروتەسەلی لەسەر بڵاونەکردبۆوە . ئەویشم بە هەلزانی و سەرجەم جیاوازی فکری و تیوری و سیاسی و ئابوری و کلتوریەکانی نێوان ئەو دوولایەنەی ناو کۆمەڵەم لە نامیلکەیەکی (٢٤) لاپەڕەیی لەژێر ناوی (کۆمەڵەی ڕەنجدەران بۆ کوردستانیە؟) نوسی ، لە مانگی (١٩٨٤/٦) بە تیراژی(١٠٠٠) دانە ، لە چاپخانەی مەڵبەندی سێ چاپکرا و پاشان لە چاپخانەی کۆمەڵە بۆجاری دووەم (١٠٠٠)دانەی لێ چاپ کرایەوە. دیسان چاپخانەی مەڵبەندی (چوار) بۆ جاری سێیەم ١٠٠٠دانەییان لێ چاپ کردوە.

لەسەر ئەم نامیلکەیە ڕاپۆرتێکی نارەزایی توندی دوورو درێژم لەسەر نوسرا لەلایەن (مەلابەختیار و ئازاد هەورامی ) وەك سەرکردایەتی درا بە مەکتەب سیاسی تاکو بڕیار لەسەر کۆکردنەوەی ئەو نامیلکەیە بدەن و محاسەبەی مەڵبەندی (٣–٤) بکەن لەسەر چاپکردنی و داواشیان لە ناوەندی کۆمەڵە کرد ، کە بانگ بکرێم بۆ محاسەبە و نامیلکەکەش کۆ بکرێتەوە وقەدەغەش بکرێ . نە مەکتەبی سیاسی و نە ناوەندی کۆمەڵە گوێیان نە دایە ڕاپۆرتەکە و بە پێچەوانەوە نەوشیروان وەڵامی دابوونەوە : دەستی برایم خۆش بێ.

## ٩-٣. كۆنفرانسی سێ كۆمەڵە و وەرچەرخانێكی ڕێكخراوەیی.

لەدوای تێپەربوونی (٢٣) مانگ بەسەر كۆنفرانسی دووەم ، گەلێ گۆڕانكاری بەسەر یەكێتی وشۆڕش و كۆمەڵەو ناوچەكە و دەوروبەر وكوردستاندا هاتبوون. لەو ماوەیەدا یەكێتی دووچاری دوو شەڕی گەورەی جود هاتبوو، گەرچی لە ڕووی پێوانەی شەڕەوە سەركەوتنی بە دەست هێنابوو،بەلآم دوژمنیشی بۆ زیاتر كردبوو، وەك سۆڤیەت و ولآتانی تری سۆسیالیستی. شۆڕش پێی نابووە قۆناغی فراوانبوون و پاوانخوازی و پاشان هەنگاونان بۆ دانوستاندن لەگەڵ ڕژێم . كۆمەڵە لەگەڵ ئەوەی لەڕووی چەندایەتی و چۆنایەتی فكریشەوە گەشەی كرد بوو ، بەلآم لەناو ڕیزەكانیدا تووشی ململانێ و ئاڵۆزی وناكۆكی ناوخۆ ببوو. ڕیز بەندیەكانی دۆست ودوژمنان جێ گۆڕكەی تیا ببوو ، بە دۆستی كاتی و هەنوكەیی لایەنێكی دانوستاندن، بەلآم ئێرانێكی كۆماری ئیسلامی لەسەرەتاوە دۆست و دوژمنی دوژمن ، بوو بە دوژمنێكی كاتی سەرسەخت وجێی مەترسی بۆ سەر شۆڕش . باڵەكانی ناو یەكێتی گۆڕانی تیاببوو ، هێڵی گشتی و بزووتنەوە یەكیان گرتبوو، ڕێكخراوێكی نوێیان پێكهێنا بە ناوی (یەكێتی شۆڕشگێڕان) كە كاركردن لەگەڵ ئەم باڵەی یەكێتی جیاواز بوو ، لە كاركردن لەگەڵ دوو باڵی تری جیاوازی ناو یەكێتی. ئەمانە هەمووی و لەگەڵیاندا قۆناغی دانوستاندن و درێژە كێشانی بۆ ماوەی پتر لە ساڵێك و پەیدابونی مقۆمقۆی جیاجیا لەملاو ئەولا و دژایەتیكردنی و هەوڵی تێكدانی، ئەمانە هەموویان بە كۆمەڵ ، ئەو بارودۆخە بابەتیە و فاكتەری گرتنی كۆنفرانس بوون، هەروەها پشێویەكانی ناو كۆمەڵە و پیاچونەوەیەكی شێوەی كاری ڕێكخراوەیی و هاوپەیمانێتی لەناو یەكێتیدا فاكتەرە خۆییەكەی گرتنی كۆنفرانس بوو. كۆنفرانسی سێ لە هاوین و لە ڕۆژی ٢٠ی تەمموزی ١٩٨٤ لە گوندی "كانی سێوە" لە بناری پیرەمەگرونی دۆڵی"مێرگەپان" گیرا. لەو كۆنفرانسەدا (٢٨٧) ئەندام و١١چاودێر بەشداریان كرد . كە (٦٥) ئەندامی لە ژمارەی نوێنەرانی كۆنفرانسی دوو، زیاتر بوو . كە كۆنفرانسی تەنها (٢٢٢) ئەندام بوون.

له کۆنفرانسی (٣)دا ، ژمارەی نوێنەرانی ڕێکخستنی شارەکان زۆرتر بوو، لە هی دوو، ئەویش بەهۆی هەلومەرجی دانوستاندن و ئازادی و ئاسانی زیاتری هاتووچۆ هاتبوە ئاراوە . سەرەتای کۆنفرانس بە خوێندنەوەی ڕاپۆرتی سیاسی کۆمەڵە لەلایەن "نەوشیروان"ەوە دەستی بە کارەکانی کرد ، کە زۆربەی ئەو گۆڕانکاریە سیاسی و ڕێکخراوەیی و ئیعلامیەی بەسەر کۆمەڵەدا هاتبوو لە نێوان دوو کۆنفرانسدا تیا ڕەنگی دابۆوە . پاشان ڕاپۆرتی دەزگای ڕێکخستن سەبارەت بە بارودۆخی ڕێکخراوەی کۆمەڵە خوێنرایەوە ، دوای ئەوە مام جەلال ڕاپۆرتی خۆی خوێندەوە ، لە ڕاپۆرتەکەیدا زیاتر سەبارەت بە یەکێتی و ڕیزەکانی ناویەکێتی و ڕۆڵی کۆمەڵە لەناو یەکێتی و دەربارەی شەڕ فرۆشتنەکانی بەرەی (جود) و ڕەوتی دانوستاندن بوو. میوانەکان (د.قاسملو سکرتێری حزبی دیموکرات و"ئیبراهیم عەلی زادە" سکرتێری کۆمەڵەی ئامۆزا و نوێنەری سازمانی حزبی کۆمۆنیستی ئێران)هەر یەکەو وتارێکیان خوێندەوە وهیوای سەرکەوتنی کۆنفرانسی سێیان خواست.

## کۆنفرانس لەسەر چەند تەوەرێك دوا:

١- سەبارەت بە دانوستاندن : کۆنفرانس پاش هەڵسەنگاندنی ڕژێم و لێکدانەوەی چینایەتی و ئایدیۆلۆژی و جۆری حوکم و حاکمیەتیەکەی و ناڕاستگۆیی لە دانوستاندن ، بەڵام ڕای کۆنفرانس وابوو ، کە تا دوا هەنگاو دانوستاندنی لەگەڵ نە پەسێنرێ ، ئەویش لەبەر ڕۆشنایی سوودەکانی ئەوکاتەی دانوستاندن.

٢-گفتوگۆی تێروتەسەل لەسەر یەك ڕیزی کۆمەڵە و کوردستانی کۆمەڵە و پابەندبوونی عیراقچیە توندڕەوەکان بە بڕیار و بیروبۆچوونەکانی زۆرینە و کۆنفرانس کرا ، پاشان دوارۆژ دانرا بۆ هەڵبژاردنی سەرکردایەتی ، کە ئەم ناوانە دەرچوون (نەوشیروان مستەفا ،ملازم عومەر، ئازاد عەبدولمەجید ، مەلابەختیار ، جەبار فەرمان ، فەرەیدون عەبدولقادر ، کۆسرەت ڕەسول ، قادر حاجی عەلی ) وئیحتیاتەکان ( د.خەسرەو خاڵ ، عومەر فەتاح ، دلێر ئەحمەد شوکری ،حەسەن کوێستانی ،محەمەد تۆفیق ڕەحیم ).*

* گەر بە وردی سەیری چۆنیەتی بە ڕێوەبردن و ئەنجامی دەرچوونی ئەندامەکان بکرێ ، دەبینرێ کە چۆن دەست خراوەتە بیناقاقای دیموکراتیەتی هەڵبژاردن و پلاندانان بۆ دروست بوونی سەرکردایەتیەك کە

**دوای تـەواوبونی کـۆنفرانس گۆڕانکاریـەکی کـوت و پـڕ و چـاوەڕواننەکراو بەسـەر مەڵبەندەکان داهات.**

١- خوالێخۆشبوو جەبار فەرمان بوو بە لێپرسراوی مەڵبەندی یەك.

٢- قادری حاجی عەلی بوو بە لێپرسراوی مەڵبەندی دوو.

٣- کۆسرەت ڕەسول عەلی بوو بە لێپرسراوی مەڵبەندی چوار.

٤- حەمەی فەرەج بوو بە لێپرسراوی مەڵبەندی سێ ، بەڵام حەسەن کوێستانی بـوو بە لێپرسراوی عەسکەری و دەسەڵاتداری یەکەمی مەڵبەندەکە.

واتە مەڵبەنـدەکانیش لـە دەسـەڵاتی تونـدڕەوانی عیراقـچیەکان و کوتلـەی سـجن بـە دەرکران .

**د یسان گۆڕانکاری بەسەر ڕێکخراوەکانی کۆمەڵەشدا هات.**

١- ئەبوشـەهاب بـوو بـە لێپرسـراوی ڕێکخـراوی یـەك ، کـە لـە کەسـە نزیکـەکانی نەوشیروان بوو،

٢- مامۆستا محسن بوو بە لێپرسراوی ڕێکخراوی دوو . پاش ماوەیەکی کـورت منیـان کرد بە لێپرسراوی ، جگە لەوەی تا سەر ئێسقان دژی عیراقچێتی بووم ، لەگـەڵ هـیچ تەکەتولێکی تردا نەبووم .

٣- شەهید عەبدولرەزاق کرایە لێپرسراوی ڕێکخراوی سێ . ئەویش هـەر کۆمەڵەیـەکی دڵسۆز و سـەر بـە هـیچ لایـەك نـەبوو. ئەندامـە نوێیـەکانی سـەرکردایەتی ( کۆسـرەت

---

هەم لە باڵی عیراقچیەکان و هەم لە باڵی تاقمی سجن بدرێت و سەرکردایەتی پڕاوپڕ لە خەتی نەوشیروانی دەرچێ: ئەوکاتە (فەرەیدون ، حەمە تۆفیق ، حەسەن کوێستانی ، دلێری ئەحمەد شوکری ، جەبار فەرمان) لە پەیڕەوانی نەوشیروان و هەمووشیان قەرزاری بوون بە هەڵبژاردنیان بە بزاف و بڕیار و هەوڵی نەوشیروان بۆ سەرکردایەتی . پاشان کۆنفرانس سوپاسی لیژنەی سەرپەرشتی کردنی کرد ، کە بریتی بوون لەم هاوڕێیانە:( کاکە عەبە ، بەندە ، ئازاد هەورامی ، قادری حاجی عەلی ، جەبارفەرمان)

رەسول ، قادری حاجی عەلی ، عومەر فەتاح ، د.خەسرەو ، دلێر ئەحمەد شوکری ) لە دوای سەر نەگرتنی دانوستاندن هاتنە دەرەوە بۆ ناو شۆڕش ، بەڵام زۆر خێرا و بە پشتیواتی " نەوشیروان و مام جەلال " شوێنی خۆیان کردەوە . لەم کۆنفرانسەوە بۆ کۆمەڵە دەرکەوت کە ، مەلا بەختیار و سالار و چەند کەسێکی تری کادری پێشکەوتوو، لەناو وولات و فازیل کەریم ئەحمەد"مامۆستاجەعفەر" لە دەرەوە بە هاوکاری هەندێ لایەن ، کە دواتر لە باسی ئاشتی دا باسی دەکەین ، ئەمانەن خەریکی پلانن لە کۆمەڵە بە ناوی کۆمەڵەوە ، هەر بۆیەش کەسیان نەخرانە شوێنە هەستیارەکانی کۆمەڵە و یەکێتی.

## ٩-٤. کۆنفرانسی یەکێتی شۆڕشگێڕان.

هەر لە دوای کۆنفرانسی کۆمەڵە لە "مێرگەپان" یەکسەر کۆنفرانسی شۆڕشگێڕانیش لەو شوێنە کرا، هۆی سەرەکی بەستنی کۆنفرانسەکە:

١- هەڵبژاردنی سەرکردایەتیان.

٢- یەکلاکردنەوەی شوێنی"مام جەلال" ، چونکە تا ئەوکاتەش دوای یەکگرتنی هێڵی گشتی و بزوتنەوە و پێکهاتنی یەکێتی شۆڕشگێڕان ، مام جەلالیان هەر بە سکرتێر ناو زەند کرا بوو ، و ئەمەش کێشەی لای کۆمەڵە دروستکرد بوو ، کە نابێ سکرتێری شۆڕشگێڕان سکرتێری گشتی بێت، لە مانگی (١٩٨٤/٨)دا کۆنفرانس بەسەرکەوتویی و هەڵبژاردنی ئەم هەڤاڵانە تەواو بوو:

١- دکتۆر فوئاد مەعسوم سکرتیر

٢- مامۆستا نازم.

٣- پێشەوا تاڵەبانی.

٤- شەوکەتی حاجی موشیر.

٥- سەربەست بامەڕنی.

٦- عومەرعەزیز.

٧- دکتۆر کەمال فوئاد.

٨- دکتۆر خدر مەعسوم.

٩- شێخ دارای حەفید.

١٠- عەلی حەمەسالەح .

١١- شێخ محەمەد سەرگەڵو.

١٢- حەمەی فەرەج.

بەوجۆرە "مام جەلال" وازی لە سکرتێری شۆڕشگێڕان هێناو د.فوئادمەعسوم بوو بە سکرتێر.

## دەستپێکردنەوەی شەڕ و هەڵتەکانی مەڵبەندی سێ.

یەکەم دەسکە گوڵی چالاکی دوای نەمانی گفتوگۆ بریتی بوو ، لە داستانەکەی شەدەڵە کە بە داستانی ئازادکردنی شاخی "چەرماوەند" ناسراوە . ئەم شاخە شاخێکی دوورودرێژە لە دوکانەوە دەست پێدەکات هەتا دەگاتە پشتی عەربەت و پێچەکەی بەرزنجە . هەر لوتکەیە و ناوێکی هەیە، لە دوکان بە" سارا" ناسراوە ، لە پشتی سورداش بە "کونێلە" ناسراوە ، چونکە کونێکی گەورە بە لوتکەی شاخەکەوەیە ، لە پشتی سەرگەڵو بە "دابان" ناسراوە و لە پشتی یاخسەمەڕ بە "هەلاج" ناسراوە لە پشتی چوخماخ بە "قوتەی بوك" ناسراوە و لەولاتر سەر ئەم لوتکانە هەمووی ڕەبایەی پێوە بوو، لە" شەدەڵە"شدا و لەوبەریش بە شاخی "پیرەمەگرونەوە" چەند ڕەبایەیەکی پێوە بوو ، کە سەرجەم دۆڵی جافایەتیان لەبەر دەست دابوو، بڕیار درا ئەو زنجیرە شاخەی چەرماوەند و سەری پیرەمەگرون و موڵگای عەسکەری شەدەڵە بگیرێت . شەڕەکە بە سەرپەرشتی مولازم عومەر و مەکتەب عەسکەری و تیپەکانی مەڵبەندی یەك و ڕێکخراوی کۆمەڵە بە سەرپەرشتی (جەبار فەرمان) و یەك دوو تیپی مەڵبەندی چوار.

له بەرە بەیانی (١٩٨٥/٢/١٤) لە بەفر بارینێکی زۆردا شەڕ دەستی پێکرد و لەماوەی چەند سەعاتێکدا هەموو ڕەبایەکان و مۆڵگای سەربازیەکەی شەدەڵەش گیرا . دواجار شەڕەکانی دەشتی هەولێر و گوندە تەعریبکراوەکانی گەرمیان و ناوچەی کۆیە و عەسکەر و شەڕەکانی شاخی ماکۆك و مەڵبەندی-٣-لە هەموو شەڕەکاندا سەرکەوتن بۆ پێشمەرگە بوو، جگە لە مەڵبەندی(٣) کە سەرباز و جاش هەموو ناوچە و لوتکە هەستیارە گرنگەکانیان گرت ، هۆی گرتنی شاخی ماکۆك کلاَوی دێوانە و پاشان شاخی شیشاریشیان گرت واتە دەسەلاَتیان بەسەر هەردوو دیوی دۆڵی بالیسان و دۆڵە ڕەقەو دۆڵی شاوریش دا دەشکا ، هۆی شکانی سەرەکی پێشمەرگە لە مەڵبەندی سێ ڕاکردن و بە جێهێشتنی ماکۆك لەسەرەتاوە کە فەرماندەی تیپەکە (مولازم سمکۆ دزەیی) ئامر کەرتی بەر پرسیش ئیحسان وللاشی بوو ، کە بووە هۆی تەسلیم بوونی تیپەکەیان و پاشان بوون بە جاش ، دیسان تەسلیمبوونی کەرتی (١٢)ی تیپەکەی سوارئاغا لە دۆڵی ئاکۆیەتی و تەسلیمبوونی خۆشی وەك سەرتیپ و سەرۆك عەشیرەتیش . چوونی نەوشیروان بۆ سنوری مەڵبەندی(٣) هەڕەشە و گوڕەشەکانی کاریگەری خراپی کردە سەر پێشمەرگەکانی مەڵبەندەکە و پەیتا پەیتا لە ترسی هەڕەشەکانی نەوشیروان دەستە دەستە تەسلیم بە ڕژێم دەبونەوە* ، تا وایلێهات مەڵبەندی سێ بەقەد ژمارەی دوو تیپ پێشمەرگەی مایەوە . ئەو ڕێگا سەرەکیەی نێوان مەڵبەندی(٤) و ناوزەنگ کەوتە ژێر دەسەلاَتی حکومەتەوە، هەر بۆیەش یەکیتی بارەگاکانی ناوزەنگی ووردە ووردە چۆلکرد بۆ ئاوەژی و پاشان دۆڵی جافەتی . پاش ڕزگارکردنی چەرماوەند ، ئەوێ کردە شوێنی بارەگاکانی خۆی لەسەرگەڵو بەرگەڵو ویاخسەمەرو هەڵەدن وچوخماخ.

---

* نەوشیروان(خولانەوە لە بازنەدا):"لە "تۆپزاوای" کۆیە کە لایداوەتە ماڵێك لە خاوەن ماڵەکەی پرسیوە دەنگ وباس چیە؟ کابرا وەلاَمیداوەتەوە: دەنگ وباس چیە؟ دەڵێن نەوشیروانی.....چووە مەڵبەندی (٣) و مەڵبەندەکەی بە تەسلیم کردنەوە داوە و گەڕاوەتەوە". لاپەڕە ٩٤

## هەلپەرستی لە ئاشتی و شەڕدا.

پێشەکی داوای لێبوردن لە سەرجەم هەڤاڵانی یەکێتی شۆڕشگێڕانی هەڵوەشاوە دەکەم ، کە ئەم بەشەی هەلپەرستی تاڕادەیەك هەندێ لە هەڤاڵانی ئەوسای ئەوان دەگرێتەوەو و دەبوایە لە کاتی خۆیدا سەرکردایەتیان بە بەیانێك هەل پەرستی ئەو هەڤاڵانەی شۆڕشگێڕانیان تاوانبار بکردایە و جارێکی تر بە هیچ جۆرێك ئامادە نەبوونایە کاریان پێ بسپێرنەوە . لە کاتی دانوستاندن و پانی جادەکەدا ، و گوایە بە هێزکردنی سەرکردایەتی شۆڕشگێڕان هەندێ کەسایەتیان لە پڕێکەوە کردە سەرکردایەتی و بەرپرس بەسەر دەیان بگرە و سەدان تێکۆشەری هوشیار و شارەزای خەباتی سیاسی و چەکداری شۆڕشگێڕان ، بەلاَم هەر کە شەڕ دەستی پێکردەوە ، ئەو هەلپەرستانەی کاتی ئاشتی و هاتنە پێشەوەیان بۆ سەرکردایەتی ، بێ وورەو ڕووخاو یەکسەر لەسەرکردایەتیەوە بۆ ئێران بە نیازی چوونە دەرەوە و ئەورووپا ڕێیان گرتەبەر.

ا- ئەندامی مەڵبەندی(٣) سمکۆ دزەیی.

ب- ئەندامی(م.س) یەکێتی و سەرکردایەتی شۆڕشگێران - سەربەست بامەڕنی.

ج- ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی وشۆڕشگێڕان - پێشەوا تاڵەبانی.

د- ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی و شۆڕشگێڕان و لیژنەی تەنسیقی مەرکەزی - عومەر عەزیز لە گوندی "مالومە" توشی ( سەربەست و پێشەوا و عومەرعەزیز) بووم ، کە خواحافیزیان لە"مام جەلال" کردبوو ،و مام جەلال زۆر بە دلگرانیەوە ڕووی لێوەرگێڕا بوون دەڕۆیشتن بۆ ئێران . داوام لێکردن کە جوان نیە شەڕ دەستی پێکردۆتەوە ئێوە شۆڕش بەجێدەهێڵن، سەربەست هیچی نەووت ، پێشەوا ووتی : من" برایم جەلال" نیم . عومەر عەزیز ووتی: ئەوەی بە تۆ دەکرێ بە من ناکرێ .

چەند هەوڵیان لەگەڵ درا نە گەڕانەوە چوونە ئێران ، ئێران ئەوسا لەگەڵ یەکێتیدا زۆر ناکۆك و دژ بوو، ئەمانەیان گرتبوو "حاجی مستەفەوی" کە لێپرسراوی قەرارگا و ئیتلاعاتی ناوچەی ڕەزاییە بوو ، ئەوانەی ناچار کرد بوون کە شت بڵێن، ئەمانەش هەرچی زانیارییێکی سیاسی و عەسکەریان لەسەر یەکێتی هەبوو، دابویانە ئێران ، بە تایبەت سەربەست لە هەموویان زیاتر پێیدابوون . واتە وەك ئەوەی ئێران بۆ ماوەیەکی دوور ودرێژ جاسوسی خۆی لەناو یەکێتیدا چاندبێ . ئەمەش کاتێ زانرا ، کە پەیوەندی نێوان ئێران و یەکێتی دروستبویەوە . حاجی مستەفەوی وێنەی ڕاپۆرتەکانی ئەوانەی بە دەستی خۆی دابوو بە "مام جەلال" ئێستاش لەم کاتی نوسینەوەیەی ئەم بەشەی مێژوو، سەربەست بامەڕنی جێگری وەزیرە لە بەغدا لە وەزارەتی ناوەند(مرکز) . عومەر عەزیز ئەندامی پەرلەمانی عیراقە لەسەر لیستی هاوپەیمانی کوردستان– لیستی یەکێتی . سمکۆ دزەیی بە پلەی جنرال موچەخۆرە.

دووەم هەلپەرستی: گوێزانەوەی سەنگەر لە پێشمەرگایەتی وخەبات و تێکۆشانی نیشتمان پەروەریەوە، بۆ سەنگەری جاشایەتی و خیانەت و نیشتمان فرۆشی و شەڕی میللەت کردن . ئەم دیاردەیە لە بۆچوونی ئەوانە دەگرێتەوە، کە بە بیستنی ناوی خۆیان لەناو خەڵکدا دەگۆڕێن بوغرا دەبن، دەبنە دوو کەس لە یەك لاشەدا ، بزێو بێ ئیلتزام و لە خۆ ڕازی و پاشان هەلپەرست دەردەچن . لەناو یەکێتیدا گەلێ فەرماندەی پێشمەرگانەی قارەمانی تیا هەڵکەوت و بێ گۆڕان تا ڕاپەڕین درێژەیان بە خەباتدا، بەڵام دوای ڕاپەڕین جەماوەر دەزانێ؟؟؟. بەڵام چەند فەرماندەیەکی ئازا و لێهاتوو ، مەغرور و لاسار، دوای شەڕبونەوە سەنگەریان گۆڕی ، لە پێشمەرگایەتیەوە بۆ جاشایەتی و شەڕی هاوڕێ پێشمەرگەکانی خۆیان کرد و زیانی زۆریان لە شۆڕش و لە یەکێتیدا ، سیانیان کوژران ، یەکیان گەڕایەوە ناو یەکێتی و لە شەڕا شەهید بوو، یەکیشیان تا ڕاپەڕین جاشایەتی کرد و پاشان وەك بەرزەکی بانان بۆی دەرچوو ، ئێستا بە پارەی یەکێتی بەڵێندەرە.

## ٩-٥. ناوبزێکردن و پیاو خراپ دەرچوون.

دوا دوایییەکانی دانوستاندن لەگەڵ ڕژێم بوو، ڕۆژێك "مام جەلال" ناردی بە دوامداو پێی ووتم: (حزبی دیموکرات و کۆمەڵە لە هەورامان لە یەکیان داوە و ژمارەیەکی زۆری کۆمەڵە کوژراون. (کۆمەڵەش دەیەوێ تۆڵە بکاتەوە و ئێمە کەوتوینەتە ناوبژیان ،و داوامان لە هەردوولایان کردوە کە لیژنەیەکی سێ قۆڵی "حزبی دیموکرات و کۆمەڵەی زەحمەتکێشان ویەکێتی" پێکبێنین بۆ لێکۆلینەوە، هەرلایەك خەتابار بوو، لەسەر ڕاپۆرتی نوێنەرەکانی یەکێتی ئەولا بە پۆزش بهێننەوە و داوای لێبوردن بکەن و قەرەبوی بێ خەتا بکەنەوە و محاسەبەی خەتابارەکانیش بکەن. لای ئێمەوە تۆ وجەمیل هەورامیمان داناوە لەبەر ئەوەی تۆ شارەزای لێکۆلینەوەی و جەمیل هەورامیش خەڵکی ناوچەکەیە و شارەزایە بە لەهجەی هەورامی).

ئێمە هەندێ زانیاری سەرەتاییمان لەسەر ڕووداوەکە لە مام جەلال وەرگرت ، کە هەر دوولایان دابویانێ . لە ناوەڕاستی مانگی(١٢/١٩٨٤) من و جەمیل هەورامی لەگەڵ نوێنەرەکانی حزبی دیموکرات (مستەفای شەلماشی) برای مەلا ئاوارە و ئەندامی سەرکردایەتی حزبی دیموکرات و(مامۆستا گۆران) یاساناس و ئەندامی پێشکەوتووی حزبی دیموکرات لە لاندکرۆزەرێکی ئەوان لە گاپیلۆنەوە بەرەو سلێمانی و هەڵەبجە و تەوێڵە و پاشان بەلا ڕێدا بەرەو شوشمەی خواروو ڕۆیشتن. ئەو کاتە شەڕی قورسی نێوان ئێران- عیراق بوو ، بە فرۆکە تۆپ بارانکردن و شەڕە تۆپ لە یەکتریان دەدا . شوێنی لێکۆڵینەوە مەیدانیەکەش کەوتبووە نێوان ڕەبایەکانی عیراقی و ئێرانی لە شۆشمەی خواروو سەرو و نەوسو . نوێنەرەکانی سازمانی کۆمەڵەی زەحمەتکێشانی شاخەی کوردستان- دوو ڕۆژ دوای ئێمە گەیشتن و لە شۆشمە یەکمان گرتەوە . نوێنەرەکانیان ئەمانە بوون: (فاروقی بابە میری، فاتحی شێخ الاسلام ) ئەمانیش ئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵە و یاساناس و ئەندامی پێشکەوتوی کۆمەڵە بوون. لەرۆژی (١٧/١٢/١٩٨٤) دەستمان بە لیکۆڵینەوەیەکی مەیدانی چڕوپڕ کرد. سەرەتا

کەوتینە لێکۆڵینەوە لە دانیشتوانی دێکان بێ بەشداریکردنی نوێنەری دیموکرات و کۆمەڵە ، هەر چیەکمان لێ وەردەگرتن بە تەسجیلی کاسێتی بچوك تەسجیلمان دەکرد و خاڵە گرنگەکانیشمان دەنوسیەوە . ئەو پرسیارانەمان لە خەڵکی دەکرد .

–ئەم شەڕە کەی ڕوویدا؟

– لە کوێ ڕوویدا؟

– شەو یان ڕۆژ ڕوویدا ؟ لە چ کاتێکی شەو یان ڕۆژ بوو؟

– کێ دەستپێشکەر بوو؟

– چەند کەس کوژران ؟ چەند ژن چەند پیاو؟ تەرمەکانیان لە کوێن؟ لە کام لا زیاتر کوژراوە ؟ ناوی کوژراوەکان؟ چۆنتان بینی بە درێژی باسی شەڕەکە بکەن؟.

کاك جەمیل چونکە هەورامی دەزانی و بە هەورامی ئاخاوتنی لەگەڵ دەکردن زیاتر ئەو لەگەڵیان دەدوا ، من پرسیارەکانم دەکرد و ئەویش بە هەورامی ئەی ووتەوە. شێوەی دووهەمی لێکۆڵینەوەکەمان هەوڵمان دەدا لە شەودا بیکەین، بۆ ئەوەی پاش لێکۆڵینەوە بتوانین ئیستفادە لە تاریکی شەو بکەین بۆ گوێ هەڵخستن لە دەرەوە لە پەنای دیوار و پەنجەرەکانیان ، کە زۆرسودمان لە شێوەیە وەگرت ، چونکە خەڵکەکە لە هەردولا دەترسان بە تایبەتی لە حزبی دیموکرات و فەرماندەی هێزی شاهۆیان– حکیمی رزایی کە زۆر توند و بێ بەزەیی بوو، بۆیە لە ژوورەوە زۆر شتیان نەدەدا بە دەستەوە، بەڵام دوای چوونە دەرەوەمان لەناو خۆیاندا دەیان کرد بە قرە لە نێوانیاندا ڕاستیەکانمان بۆ دەرکەوت .

بۆ نموونە: پاش(١٠) ڕۆژ لێکۆڵینەوە و هەوڵدان بۆ زانینی شوێنی مەیتە کوژراوەکانی کۆمەڵە ، هیچ سۆراغێکمان دەست نەکەوت ، تا لە ڕۆژی (١٩٨٤/١٢/٢٩) شەو خۆمان کرد بە ماڵێکدا ماڵەکە دوو کوڕیان هەبوو سەر بە دیموکرات و ئەوی تریشیان سەر بە کۆمەڵە بوو، برا بچوکەکە سەر بە کۆمەڵە بوو، ئەیویست شتمان بۆ ڕوون کاتەوە، بەڵام هەم باوکی وهەم براگەورەکەی چاویان لێ بز ئەکردەوە نەدەوێرا هیچ بڵێ ، کە

ڕۆیشتینە دەرەوە پاش تۆزێ گەڕاینەوە بەر پەنجەرەکەیان گوێمان لە شەڕیان بوو، کوڕە بچوکەکە دەیووت: والله سا دەچم دەیاندۆزمەوە پێیان ئەڵێم کە شوێنی مەیتەکان وا لەوبەر پردەکەی ئاواییەوە لەسەر جادەکە بە گردەکەی بەری ڕۆژەوە . ئەوانیش هەڕەشەیان لێدە کرد. ئێمە ڕۆیشتین ئەم زانیاریە بۆ ئێمە زۆر بوو ، وەك هەموو شەوەکانی تر کە هەموومان شەو لە مزگەوت ئەنوستین و تا درەنگ بە قسەی خۆش ونوکتەوە ئەمان بردە سەر و ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانی خۆشمان بە کەسیان نەدەوت . ئەو شەوەمان بە نوکتە و قسەی خۆش بردە سەر. (حەکیمی ڕەزایی) باسی منالی خۆی کرد کە شێخێك چۆتە دێیەکەیان و زکری کردوە و حالی لێهاتوە، پەلاماری منالێکی (٧–٨) سالەی چلمنی داوە و قوتی داوە و پاش نیو سەعاتێك منالەکەی لەسکیەوە هێناوەتە دەرەوە. بەلام چلمەکەی نەما بوو، لوتی منالەکە پاك بوبۆوە . بۆ بەیانی ئاگاداری نوێنەرەکانی دیموکرات و کۆمەڵەمان کرد کە لەگەڵمان بێن و لە خەڵکمان پرسی دوای پردەکە و گردەکەی بە ڕۆژە کامەیە ، تا سەر پردەکە یەك و دووانی هاتن و ئامازەیان بۆ شوێنەکە کرد، بەلام پێیان ووتین : کە لە پردەکە بەوبەرەوە هەمووی بە ئەلغام چێنراوە. من ڕۆیشتم بەرەو کەندەکە کە ڕوانیم لە پالیا شوێن هەلتۆقیوێك دیارە، بانگی برادەرانم کرد کە بێن ئەو گلە هەلدەینەوە ، نوێنەرانی حزبی دیموکرات ووتیان: ئەلغام ڕێژکراوە دوای هەلدانەوەی دەرکەوت هەموو کوژراوەکان بە جلەکانیانەوە خراونەتە یەك چالەوە و جلەکانیشیان هەمووی شوێن گوللە و هەموشیانبە دەست بەستراوەی لە پشتەوە لێاندرا بوو، بۆمان دەرکەوت هەموویان کوژراوی کۆمەلە بوون و لە ئەنجامەکەش دەرکەوت کە پێش کوشتنی ئەمان کەکۆمەلە بوون، لە شوێنێکی تر کۆمەلەکان (٣) دیموکراتیان کوشتوە ئەم مەفرەزەیەی کۆمەلە ئاگایان لە هیچ نەبووە ، لە نەوسود هێزێکی شاهۆ بە فەرماندەی حەکیمی ڕەزایی چونەتە سەریان بۆ مزگەوت و لە مزگەوتەکە چەکیان کردوون و بەدەست بەستراوی و دیلی دەریان هێناون و بردویانن بۆ پەنا گردە

براوەکە و هەر(٨)یان ، کە سیانیان ژن بوون لە پشتەوە گوللەبارانیان کردوون . ئـەم زانیاریانەمان لە خەڵکی نەوسود، پاش دۆزینـەوەی تەرمـەکان وەرگـرت . هـەر لـەوێ دوای دۆزینەوەی تەرمەکان خـەریك بـوو ، لـە نێـوان کۆمەڵـە و دیمـوکرات بتەقێتـەوە لێکۆڵینـەوە تـا (١٩٨٥/١/١٠) ی خایانـد. دانوسـتاندن نـەما بـوو ، مـن و جـەمیل کـە گەڕاینەوە دابەش بووین ، من لەگەڵ نوێنەرەکانی حزبی دیموکرات و بـە سـەیارەکەی ئەوان و جەمیلیش لەگەڵ نوێنەرانی کۆمەڵە و بە سـەیارەکەی ئـەوان گەڕاینـەوە دۆلی جافەتی، لەگەڵ کاك جەمیل پێکەوە لەسەر ڕۆشنایی زانیاریەکان و لێکۆڵینەوەکـەمان ڕاپـۆرتێکی تێروتەسـەلمان دا بـە مـام جـەلال و لـە کۆتـایی ڕاپۆرتەکـەشمان هوشـداریەکمان نووسـی بـوو، کـە ئەگـەر حزبـی دیمـوکرات حـەکیمی ڕەزایـی و ئـەو پێشمەرگانەی بانگ نەکا وسزایان نەدا و دان بە هەڵەی پێشمەرگەکانی خۆیاندا نەنێ، لە ماوەیەکی کەمدا گەورەترین کارەسات وشەڕی ناوخۆیان دروست دەبێ.

## مام جەلال ئەنجامی ڕاپۆرتەکەی ئێمەی دابوو بە هەردوولا.

ئەوکاتە د.عبدالرحمن قاسملۆ لە ئەوروپا بوو، مەلا عەبدوڵڵای حـەیاکی جێگـری بـوو. مەلا عەبدوڵڵا بە لێکۆڵینەوەکە قایل نەبوو. وتبووی:" ئەم لێکۆڵینەوەیە عادیلانە نیە ، چونکە شوێن دەستی برایمی پێـوە دیـارە ، کـە خـۆی کۆمەڵـەی عیراقـە و دۆسـتی نزیکی کۆمەڵەی ئێرانە و وەختی خۆشی لە (٧٩-٨٠)دا کاری لەگەڵ کردوون".

سـەرانی کۆمەڵـەش گلـەییان لای مـام جـەلال کردبـوو، گوایـە ئێمـە (مـن و جـەمیل) غەدرمان لێکردوون و مافی تەواوی خۆیمان نەداوە بە لێکۆڵینەوەکە . سەر ئەنجام نـە حزبی دیموکرات سزای بکوژەکانی خۆیدا و نە کۆمەڵـەش دەسـتی لـە تۆڵەکردنـەوەی کوژراوەکانی هەڵگرت و بۆیە بڵێسەی هەڵگیرسانی شەڕێکی گـەورەی نێوانیـان کـە تـا چەند ساڵێك درێژەی کێشا.

**٩-٦. گوێزانەوەی بارەگای ڕێکخراوی سلێمانی.**

لەدوای داستانی شەدەڵە بارەگای ڕێکخراومان لە گوندی نۆدێ وەگوێزرایەوە بۆ گوندی یاخسەمەڕ. ئەوکاتەی کە لە نۆدێ بووین لە(٣) ئەندام پێکهاتبوو،(موحسن عەلی ئەکبەر– لێپرسراوی ڕێکخراو، هەڵۆ ئەحمەد کوردە – ئەندام و بەندەش ئەندام) ، مامۆستا موحسن یەکێك بوو ، لە کادرە چالاك و باوەڕپێکراوەکانی ئاش و ئەڵقەی پەیوەندی نێوان مەلابەختیار و سالارعەزیز بوو ، کە ئەوسا سالار لای جود بوو بە هیوای چوونە دەرەوەی وولآت بوو، مامۆستا موحسن سودی لە کادرە سەربەخۆیەکانی کۆمەڵە لە شارباژێڕ وەرگرت ، یەك – دوو نامەم دەستکەوت بە هۆی بەکر فتاحەوە کە ئەویش لێپرسراوی کەرتی ڕێکخستنی شارباژێڕ بوو ، لە یەکێ لەکادرەکانی دەست کەوتبوو.

نامەکان هی سالارعەزیز بوو بۆ مەلابەختیار ناردبوون کورتەی ئەم باسانەی تیا بوو:

١– چەند بکرێ مەلابەختیار هەوڵی ڕاکێشانی سەرتیپ و تیپەکانی دۆستی خۆی بدا بۆ لای ئاش.

٢– ئالآی شۆڕش وەك ئۆرگانی ڕێکخستنەکانی خۆیان دەرکەن و بەردەوام بن لەسەری.

٣– سالار هەوڵبدات ئالآی شۆڕش ببێتە ڕێکخراوێکی ناو بەرەی جودەوە هاوکاری و یارمەتی لە ئێران وەرگرن.

٤– سالار لە پەیوەندیدا بێ لەگەڵ فازیل کەریم ئەحمەد لە ئەڵمانیا بۆ ئەوەی فازیل پەیوەندی بکا بە کوردە ئاوارەکانی دەرەوەی وولآت بە تایبەتی دژەکانی کۆمەڵەو یەکێتی ، هەوڵی پەیداکردنی دۆست و پشتیوان لە دەرەوە بدەن.

٥– پاش ئەوەی سالار دەچێتە دەرەوە لەگەڵ فازیل کەریم هەوڵی برینی یارمەتی ودۆستایەتی و پەیوەندی سوریا و لیبیا بدەن لەگەڵ یەکێتیدا و ئەو سەرچاوەی یارمەتیە بۆ خۆیان مسۆگەر بکەن.

٦- هەرکات مەلابەختیار توانی زۆربەی تیپەکانی یەکێتی بەلای خۆیاندا ڕاکێشێ نەخشە دابنێ بۆ جیابوونەوە لە یەکێتی و پاشان لێدانی . بە مامۆستا موحسن عەلیم ووت :ئەمانە بۆ تۆ هاتون؟ ماموستا موحسن ئینکاری کرد . نامەکانم ناردە لای نەوشیروان و داواشم کرد کە موحسن لە لێپرسراوی ڕێکخراو لابەرن ، ناوەندی کۆمەڵە و نەوشیروان ماموستا محسنیان بانگکرد بۆ ناوەند. لە ئاوەژی و لەوێ هێشتیانەوە دوای ئەوەی بڕیاری دابوو، کە واز لە ئاش بێنێ . لە ئاوەژی کردیان بە ئەندامی دەزگای ڕێکخستنی کۆمەڵە و لە ڕێکخراو و ناوچەکە دوریان خستەوە. لە مانگی(١٩٨٥/٤)بارەگای ڕێکخراومان گوێزایەوە بۆ گوندی یاخسەمەر ، لە زەویەکانی بناری شاخی چەرماوەند کەپر و خەیمەمان هەڵدا ، بڕیار هات کە شۆڕش حاجی بووە ئەندامی ڕێکخراو من بە شێوەی کارتی لێپرسراوی ڕێکخراوەکەبم . ڕێکخراوی سلێمانی سنورێکی فراوانی ڕێکخستنی هەبوو ، کەرتەکانی ڕێکخستنی ماوەت، دوکان، سورداش، سەرچنار، بازیان و ڕانیە سەر بەو ڕێکخراوەیە بوون . واتە سنوری مەڵبەندی(١) ی سلێمانی . لەو ماوەیە لە ڕێگەی تۆڕەکانی ڕێکخستنەوە هەوڵماندا دەدا ، چەند بکرێ زانیاریمان لەسەر ئاش بۆ کۆکەنەوە. لە مانگی(١٩٨٥/٦) مام جەلال جوابی بۆ ناردین کە دێتە سەردانمان، ئیمەش خۆمان بۆ میوانداریەکی شایستە ئامادەکرد . بارەگای مەکتەبی سیاسی و ناوەندی کۆمەڵە و دەزگای ڕێکخستنی کۆمەڵە و سەرکردایەتی شۆڕشگێڕان تا ئەوکاتە لەبەری مەرگە و ئاوەژی بوون ،ئەو ناوچەیە دوای شەڕ بونەوە حەوانەوەی تیا نەدەکرا. مام جەلال بڕیاری گوێزانەوەی دابوو. شەوکەتی حاجی موشیر باسی شوێنی کەپر و خەیمەکەی ئێمەی بۆ کرد بوو، کە چەند قایم و نزیکە لە هەموو مەڵبەندەکانەوە. مام جەلال لە ڕۆژی (١٩٨٥/٦/٢١) بە سەردان بۆ تەماشاکردنی شوێنەکەمان هاتەلامان و شوێنەکەی زۆر بە دڵ بوو، دوای خزمەتکردن مام جەلال ووتی:( برایم هاتووین خوازبێنیەکت لێدەکەین، ئەویش ئەم جێگایەیە ). منیش ووتم: پێشکەشە. بەڵام ئەگەر نەلێم باشە ، چیم پێدەکرێ؟).

پاشان ڕووی کرده ئەندامانی مەکتەب سیاسی کە لە گەڵیدا بوون.ووتی:( لەم شۆڕشە تا ئێستا هەموو شتێك بە دەست ئێوە بوو، با ئەم جارە دابەشکردنی جێگای دەزگاکانی عەسکەری و دارایی و پەیوەندیەکان و ڕاگەیاندن بەدەست من بێ).

منیش ووتم:( جەنابی مام جەلال، چاکترە بڵێ لەم شۆڕشە هەموو شتێك بە دەست منە با دابەشکردنی جێگای دەزگاکانیش هەر بە دەست من بێ). جا بە ڕاستیش هەروا بوو ، ئێمەی ڕێکخراو ئەوێمان بەجێهێشت و چوینە چوخماخ . مەکتەب عەسکەری چووە هەڵەدن . دەزگای دارایی چووە سەر ئاوەڕێژەکەی نێوان یاخسەمەڕ و چوخماخ . دەزگای ڕاگەیاندن چووە بەرگەڵو لەگەڵ بارەگای نەوشیروان‌دا ڕاگەیاندنی کۆمەڵە چووە چالاوا.

# بەشی دەیەم: ئالای شۆرش(ئاش).

## ١٠-١ ئالآی شۆڕش ( ئاش ).

لە بەشەکانی پێشودا و بە تایبەتی لە ململانێکانی ناو هەناوی کۆمەڵەدا زۆرم لەسەر باس کردوە . ئالآی شۆڕش یان ئاش یا بەرەی عیراقچیەتی لەناو کۆمەڵەدا هەر لە سەرەتای دامەزراندنی کۆمەڵەوە سەریهەڵدا بوو بە ماکو خۆرکەی رێگر لە گەشە کردن و بەهێز بوونی کۆمەڵە و بنەمای ناکۆکی .........دور لە هەموو سەرەتایەکانی کاری سیاسی و ........ هەست بە بەرپرسیارێتی بەرامبەر نەتەوە و نیشتمان . هەر لە ١٩٧٢وە یەك دووانێك لە باڵی عیراقچێتی ناو کۆمەڵە بە پێچەوانەی هاورێیەکانی تریان کە زۆر بە میدنەیانە لە کۆمەڵە کشانەوە. ئەمانە دەستیان لە کۆمەڵە هەڵنەگرت تا ساڵی١٩٧٥و ئالآکەی عیراقچێتیان بە کۆمیتەی هەرێمەکان سپارد و کۆمیتەی هەرێمەکانیش بە دزی و بە ئاشکرا ئەمانیش کەوتنە کنەکردن لەناو کۆمەڵە و یەکێتی بەشێوەیەکی دوور لە هەموو مورالێکی سیاسی . هەر لە کۆنفرانسی یەکەوە ، جگە لە مەلابەختیار کەسی تریان دەرنەچوون ، ئیتر وازیان لە کارکردن هێناو ، فازیل کەریم سەری خۆی هەڵگرت و چوو بۆ ئەڵمانیا و لەوێش تا ڕاپەڕین هەر دژایەتی کۆمەڵە و یەکێتی دەکرد و دوو نامیلکەی دەرکرد بە ناوی (مانگ گیران – ماسیە گەورەکان ماسیە بچوکەکان ئەخۆن ) .سالار عەزیزیش چووە گوندی پارەزان و لەوێ بارەگای دانا ، و نە ئەوان ئیستقالەیان لە یەکێتی وکۆمەڵە کرد ، و نە کۆمەڵە و یەکێتیش ئەوانی لە ڕیزەکانی خۆی دەرکرد، سالار و مەلابەختیار لە ١٩٨٠بە دواوە تاکو شەڕبوونەوە ١٩٨٥هەرچی توانایەکیان هەبوو خستیانە کار بۆ:

١- پڕوپاگەندەی ناڕاست بۆ کۆمەڵە و یەکێتی زۆر بە فراوانی بە دەمی لە کۆڕ وکۆبونەوەکان و لەناو تیپەکانی پێشمەرگە و کادران و ڕابەرە سیاسیەکان ، و بە نوسین و بەیان بلأوکردنەوە بە دزی و دەرکردنی ئالآی شۆڕش بە دزی ، پڕوپاگەندەکانیان زیاتر تۆمەتی ناڕەوا و ناڕاست دروستکردن بۆ سەرکردە و کادرە

پێشکەوتوەکانی کۆمەڵـە و یـەکێتی، پڕوپاگەنـدە کـردن لـەکاتی دانوسـتاندندا کـە کۆمەڵە و یەکێتی بوون بە جاشی حکومـەت ، لـەکاتی یارمـەتی شۆڕشـی کوردسـتانی ئێران کە یەکێتی کۆمەڵە بێ هودە و بە فیتی عیراق پێشمەرگە لـە ئێرانـدا بـە کوشـت ئـەدەن ، ئەمانـە هـەمووی بـۆ بـێ وورەکردنـی پێـشمەرگە و ڕووخانـدنیان و ئینجـا هاندانیان بۆ تەسلیمبونەوە تەنانەت بوون بە جاشیش هەر لـەناو یـەکێتی و کۆمەڵـەدا نەبن.

٢- باوەش گرتنەوە بۆ ئەو کەسانەی کە لەسەر بێ ئیلتزامـی محاسـەبە دەکـران یـان هەڵەیەکی کوشندەیان کرد بوو ، یان تاقەتیان چوو بوو، دەشیان کردنەوە بە دوژمنی یەکێتی و کۆمەڵە.

٣- هەوڵـدان بـۆ توندوتیـژ کردنـی شـەڕەکانی نێـوان یـەکێتی و جـود و پاشـان خۆنزیککردنـەوە لـە جـود قەناعـەت پـێ هێنانیـان ، کـە یـەکێتی پـاش دانوسـتاندن هەڵدەوەرین یا لـە سـاحەکە نـامێنن لەگـەڵیان ڕێـك مەکـەون .لـە دوای ڕێکـەوتن ئـەم ڕاستیانە ئاشکرا بوو.

٤- بەشداری کۆبوونەوەکانی سەرکردایەتیان دەکرد و هەموو نهێنیەکانیان بە سـودی خۆیـان دەبـردە دەرەوە وبـۆ هانـدانی پێـشمەرگە و ئـەو بڕیـارەی بیـان زانیایـە پێشمەرگەی پێ تووشی پرتە و بۆڵە دەبێ ئەوەنـدەی تـر بـە لایـەنی خراپـە ، تـرش وخوێیان پێوە دەکرد ، ئەوسا ئاوی گۆی پێشمەرگەیان پێدا دەدا.

٥- ئیشکردنیان بە دوو فلیقانەیی، لە ژێرەوەکاریان دژی یەکێتی و کۆمەڵـە دەکـرد و پڕوپاگەندەیان لە دژی دەکرد و لە ڕووبـەڕووش سـوێندی کوردسـتانی بـوونی خۆیـان دەخوارد کە لە کەڵە ئەنگۆسـتی پێیـە و تـا تـەپڵی سـەریان کوردسـتانین و سـوێندی ئیلتزام کردنیان بە بڕیارەکانی کۆمەڵەوە دەخوارد.

٦- هەرچی زانیاریەکیان لەسەر یەکێتی وکۆمەڵە وبڕیـارە نهێنیـەکانی سـەرکردایەتی کۆمەڵە و یـەکێتی هـەبوو، بـە تایبـەتی ئەوانـەی دژ بـە ئێـران یـا سـوریا یـا لیبیـا یـا

فەلەستینیەکان هەبوو بە زیادەڕۆیشەوە دەیاندا بە ئێران وسوریاو لیبیاو فەلەستینیەکان . مەلابەختیاریش دوای کۆنفرانسی سێ بریاریدا یان(م.س) و ناوەندی کۆمەڵەیی یان لێپرسراوی یەکێك لە مەڵبەندەکان بە تایبەتی مەڵبەندی(١-٢)بێ ، یا ئیش ناکات ؟ ئەویش چووە قەرەداغ و لە گوندی تەکیە دانیشت و بارەگای کردەوە و دەستی کرد بە چاپکردنی ئاڵای شۆڕش و ووتارەکانی دژی کۆمەڵە و یەکێتی و بە دزیەوە بڵاوی دەکردەوە .

لە رۆژی (١/٤/١٩٨٥) سەرکردایەتی یەکێتی وکۆمەڵە ناردیان بە دوایا وهاتە یاخسەمەر مام جەلال و نەوشیروان داوایان لێکرد، خۆیان ئاشکراکەن ، گەر رێکخراو یا حزبن بابێن ببن بە باڵێك لەناو یەکێتیدا، مەلابەختیار ووتبووی ئێمە چەند تاقمێکین و هێشتا لەسەر بەرنامەیەکی یەکگرتو رێك نەکەوتوین، دەرۆمەوە کۆبونەوەیەکی خۆمان دەکەین وخۆمان لەسەر بەرنامەیەك رێکدەخەین ئەوسا دێینەوە لاتان، بەلاّم کە رۆیشت لە باتی خۆرێکخستن و گەڕانەوە، کەوتە هەڵپەی پەیوەندی بە تیپەکانەوە. مەلابەختیار لە ڕاستیدا سیاسیەکی موراهق بوو، ناوی خۆی بیستبۆوە، هەموو ئەوانەی کە هاورێی بوون یا خۆشیان ئەویست، ئەو وای دەزانی تا تەوقی سەریان عیراقچین خۆی بە میراتگر وجێنشینی ئارام دەزانی، خۆشەویستی خەڵکی بۆ ئارام بۆ سودی خۆی بەکاردەهێنا، کە چووە قەرەداغ، واڕۆیشت وەك ئارام بنە و بارەگای بنکەی سور لەوێ دادەنێ و لەوێوە پەلاماری سەرگەڵو یاخسەمەڕ دەدا. لە رێگەی بڵاوکراوەی ئاڵای شۆڕشەوە کەوتنە هێرشی ڕاگەیاندن بۆ سەر کۆمەڵە، کۆمەڵەش لە مانگی(٩/١٩٨٥) وبە رێگەی ڕاگەیاندن کەوتە ئاشکراکردن و هەڵتەکاندنی بنەما فکریەکان و مەرامەکانیان لەو دژایەتی کردنەی یەکێتی وکۆمەڵە، کە نیوەی پتری لەسەر پلەو پایەی (م.س) و ناوەندی کۆمەڵە بوو، مەلابەختیار لە مانگی تشرینی یەکەمی ٩٨٥٠ ، نامەی بۆ چەندین سەرتیپ نوسی بوو، کە کۆمەڵە و یەکێتی ناتوانن ئەرکی ئەم قۆناغەی خەبات

جێبەجێ بکەن، بۆیە بچنە بەری قەرەداغ و پەیوەندی بەوەوە بکەن جگە لە( جەمالی حەمەی خواکەرەم) هەموو سەرتیپەکانی تر کە مەلابەختیار بە مـاڵی خـۆی و دۆسـتی هەرەنزیکی خۆی دەزانین نامەکانیان ناردە ناوەندی کۆمەڵە. دوای ئەوە دەرکەوت کە ئەمانە ڕێکخستنێکی تازەن بە نـاوی ئاشـەوە سـەرکردایەتی لـق و شـانە و بەرنامـەی تایبەت و ئۆرگانی ناوەندی خۆیان هەیە و لە ژێرەوە دەیانویست بەشی هەرەگەورەی هێـزی پێـشمەرگەی یـەکێتیش بـۆ خۆیـان دابرکـەن. سـەرکردایەتی یـەکێتی لـەرۆژی (١٩٨٥/١٠/٢٩) زۆر بـە نهێنـی و بـە بەشـداری ژمارەیـەکی زۆر کـەمی(م.س) بڕیـاری گرتنـی مەلابـەختیار و شـێخ عـەلی و زینـەدین "پـشکۆ" یانـدا و لـە شـەوی(١-١٩٨٥/١١/٢) بە فەرمانـدەی شـەوکەتی حـاجی موشـیر و چـەند کەسـێکی هاوڕێکـانی مەلابەختیار وەك ( ڕۆستەم، وەهاب، حـامی حـاجی خالیـد، شـێخ جەعفـەر) کـە هـەر چواریان سـەرتیپ بـوون ، نامـەی مەلابـەختیاریان بـۆ چـوو بـوو ، مەلابـەختیار ١٠٠٪ بەهی خۆی دەزانین . مەلا بەختیاریان لـە ماڵەکـەی خـۆی بـە کۆمـەڵێك دیکۆمێنـت و چاپەمەنیەوە گرت .

هەر لە بەرەبەیانی هەمان ڕۆژ واتە (١٩٨٥/١١/٢) مامۆستا پشکۆ و شێخ عەلیشیان لە گوندی مالومە گیران، سەرتیپ ( جـەمالی حەمـەی خواکـەرەم و جـەلالی حەمـەی محیێدین ) بە چەند پێشمەرگەیەکەوە، چوونە دیـوی ئێـران بـۆ لای بـەرەی جـود. سەرکردایەتی کۆمەڵە جگە لەو سیانە هەموو مـەفرەزە و پێـشمەرگەی بارەگاکانیـانی ئێزندا.

### ١٠-١. مەلابەختیار و لێکۆڵینەوە.

دوای گرتنی ئەو سیانە (نەبەز-مەحمودی جگەر یان خولـە جگـەر) ئـەویش گـیرا بـە تۆمەتی ئەوەی گوایە ئاش ناردبێتیان بـۆ کوشـتنی مـام جـەلال ، ئەمانـە دابەشـکران مەلابەختیار کونە تەیارەیەکی بۆ دروستکرا وەك زیندانیش ، لە هەڵـەدن شـێخ عـەلی

برایە ژوورێکی دەزگای دارایی و مامۆستا پشکۆ لەیاخسەمەڕ لای ڕێکخراوی کۆمەڵە دانرا و نەبەزیش هەرلای ڕێکخراو دانرا ، لیژنەیەکی لێکۆڵینەوەیان بۆ دانرا کەپێکهاتبوون لە (د.خەسرەو خاڵ ، حەمە تۆفیق ڕەحیم ، بەندە) هەر لە سەرەتاوە مەلابەختیار (د.خەسرەو )ی، ڕەفز کرد بەو بیانوی ئەوی د.خەسرەو تازەیە لە کۆمەڵە چۆن دەبێ لێکۆڵینەوەی لەگەڵ بکات پاش یەك- دوو دانیشتن لەگەڵیا حەمە تۆفیقیش خۆی لێ کێشایەوە بە بیانوی ئەوەی تاقەتی ئەو بەزمەی نەبوو ، تەنیا من مامەوە ، پاشان (د.کریم)یان دانا من قبوڵم نەکرد هەر بە تەنیا لێکۆڵینەوەم لەگەڵ هەر چواریان کرد ، دەرکەوت نەبەز هیچی لەسەر نەبوو پاش یەك — دوو مانگ بەردرا . لەو لێکۆڵینەوانەی من لەگەڵ ئەوانەم کرد ، هەموویان دانیان بەوەدانا کە لەناو کۆمەڵەدا بە دزییەوە ڕێکخستنی تریان دروستکردووە ، نەك بۆ لێدانی کۆمەڵە ، بەڵکو بۆ ئەوەی وەك ڕێکخراوێکی جیا ئەمانیش بچنە ناو یەکێتیەوە ، بەڵام دوایی دانیان بەوەش دانا کە ویستویانە ڕیزەکانی کۆمەڵە و یەکێتی هەڵوەشێنن و خۆیان سەرکردایەتی شۆڕش بگرنە دەست . شێخ عەلی و مەلابەختیار نکولیان لێدەکرد . بۆیە دواتر بڕیاری کۆتایی لەبارەی لێکۆلینەوەکە خرایە دوای گرتنی پلنیۆم . سەرکردایەتی کۆمەڵە بڕیاریدا پیلنیۆمێك بگیرێ بۆ دوابڕیاردان لەسەر ئەو سیانە بە تایبەتی کە یەکیان تا ئەو کاتەش "مەلا بەختیار" ئەندامی سەرکردایەتی بوو، دوانەکەی تریش لە ئەندامە کۆنەکانی کۆمەڵە و کادرە پێشکەوتوەکانی کۆمەڵە بوون ، شێخ عەلی لە ساڵی١٩٧١ من خۆم پەیوەندیم پێوە کرد و بۆتە کۆمەڵە ویەکێك بوو لە بەرپرسە سیاسیەکانی یەکەم مەفرەزەی سەرەتایی لە ناوچەی هەڵەبجە. بۆیە هێندە ئاسان نەبوو بڕیاردان لەسەرچارەنوسیان بدەین ،پێویستی بە ڕای پیلنیۆم یان کۆنفرانس دەکرد.

**پلنیۆم.**

ڕۆژی(١٠/١٢/١٩٨٥)پیلنیۆم لە بەرگەلۆ دەستی پێکرد، بە ئامادەبوونی ٦٠ ئەندامی پیلنیۆم کە هەموو ئەندامانی ناوەندی و دەزگای ڕێکخستن و ڕێکخراوەکان و مەڵبەندەکان و ئەندامانی پێشکەوتوی کۆمەڵە بوون، لەو پیلنیۆمە ، ڕابوردو و نەخشە و پلانی ئاش و مەبەستی ڕێکخراوەکەیان بە ووردی و ڕوونی باسکرا و پاشان دوو بۆچون ودوو بڕیار هاتە ئاراوە.

– سەبارەت بەو تاوانە گەورەیەی کە مەلا بەختیار ، وەك ئەندامێکی سەرکردایەتی کۆمەڵە کردویەتی و ویستویەتی پلانی هەڵتەکاندنی کۆمەڵە و یەکێتی جێبەجێ بکا. حوکمی گوللە باران کردنی بەسەردا بدرێ.

– سەبارەت بە ڕابوردووی وماندوبوونی و تێکۆشانی لە کۆمەڵە و یەکێتیشدا حوکمی هەڵواسینی سیاسی (اعدامی سیاسی) بدرێت واتە نەکوژرێ بەڵکو ماوەیەکی زۆر بە بەندی بمێنێتەوە وپاشان لە کۆمەڵە و یەکێتی وشۆڕش دەربکرێ ، چونکە ئەگەر گوللەباران بکرێ ڕەنگە پێچەوانە تەفسیری بۆ بکرێ و بەقارەمان ناوببرێ ، ئەوانەی لەگەڵ ڕای یەکەم بوون زورینەی هەرەزۆری ئەندامان بوون. وئەوانەی کە لەگەڵ ڕای دووەم بوون و پێشنیاری نەوشیروان خۆی و چەند کەسێکی تر بوون ، کە نامەوێ ناویان بڵێم.*

---

* لە ساڵی ١٩٩٦دا نەوشیروان هاتە شاری نۆرینبێرگ لە ئەڵمانیا ،منیش لەو شارە دەژیام لە ئێوارە دانیشتنێکدا لەگەڵ ئەحمەد بەرواری ومام ڕۆستەم و کەمال سەرگەلۆیی داوای دەسنوسەکانی مەلا بەختیار و شێخ عەلی ومامۆستا پشکۆی لێکردم و وەعدی دامێ کە ئەگەر بیدەمێ وکۆپی دەکا ودەم داتەوە. من ئەوەندە لە هاوڕێیەتی ئەو و خۆم دڵنیابووم ،کە بڕوام بە بەڵێنەکانی هەبوو. بەڵام نە ئەو بۆی ناردمەوە و نەمنیش داوام لێکردەوە ،چونکە لەوکاتە پێویستیم پێی نەبوو ، و بڕواشم وابوو پیاوێکی ڕاستگۆ و خاوەن قسەی خۆیەتی وهەر کاتێ داوام لێکرد ئەمداتەوە. شەوی (٨/٣/٢٠٠٨) لە نوسینەوەی ئەم کتێبەدا گەیشتمە ئەو شوێنەی کە ئاماژەم بەم دیکۆمێنتەدا و کاتژمێر٢٠/٩شەو تەلەفۆنم بۆ نەوشیروان کرد ، لە پێشا شوعلەخانی خێزانی قسەی کرد و پاشان داوای نەوشیروانم کرد وهاتە سەر تەلەفۆن دوای چاك و

پاش رونکردنەوەیەکی وورد و دیسانەوە خرایەوە دەنگدان و ئەمجارەیان بڕیار درا کە بڕیاری دووەمی بەسەردا جێبەجێ بکرێ، ڕۆژەکانی پیلنیۆم هەموو تۆپ بارانێکی زۆرسەخت بوو لە سەرگەڵو بەرگەڵو من داوایەکم لە نەوشیروان کرد کە تا(١٠) ڕۆژ بینینی مەلابەختیار قەدەغە بکرێ بۆ ئەوەی ئاگاداری بڕیاری پیلنیۆم نەبێ ، ڕۆژی (١٩٨٥/١٢/١٥) چووم لای و بە پێچەوانەوە بڕیاری پیلنیۆمم پێ ڕاگەیاند لەگەڵ بیستنی ووشەی گوللە بارانکردن ، دەستی گرت بە چاویەوە و بە گریانەوە ووتی : کەواتە (زیلان بێ باوك ئەبێ)؟ئینجا ووتی:(ئەی ئەگەر هەموو شتەکان بڵێم؟.پێم ووت : سبەینێ وەڵامت ئەدەمەوە.

بۆ ڕۆژی ١٩٨٥/١٢/١٦ چومە لای و پرسی: وەڵام :چیە؟:

ووتم:لە گوللەباران دەتبورن و ماوەیەك زیندانی ئەبی و پاشان دەردەکرێ لە کۆمەڵە و یەکێتیەوە ئازاد دەکرێی لە کوێ ئەبی ئەتوانی؟.

ووتی: دەباشە تەسجیلت هێناوە داینێ و فەرموو بنوسە.

---

چۆنی داوای نامەکانم لێکرد؟ زۆر بە توورەیی ووتی :ناتدەمەوە، پاشان ووتی: نەماوە، پاشان دوای هەندێ گفتوگۆ. ووتی : کە تۆ داوتە بە من هەمووی سێ– چوار مانگ بەسەر نامەکەدا تێپەڕی بوو ، ئەم هەموو ساڵەی بەسەردا ڕۆیشتوە، نەماوە.

پاشان پێم ووت : کە من نامەکانم دایە تۆ١٠ ساڵ بەسەریا تێپەڕی بوو.

ووتی: علی کل، نایدەمەوە لەگەڵ هەموو کاسێتەکان لای خۆمە بڕۆ چی ئەکەی بیکە.

پێم ووت: ناچارم بنووسم کە تۆ وەعدەکەت نەبردە سەر و داگیرت کردوە.

ووتی: کەیفی خۆتە چی ئەنوسی؟ بنوسە؟ حەز ئەکەی جنێوم پێ بە.

من پێمووت: خۆت ئەمناسی من ئەو بێ مورالآنە نیم.

ووتی: بەرێ واللە دنیاکە وای لێهاتوە بڕوام بە کەس نەماوە.؟

پێم ووت: عاجز نابی ئەم گفتوگۆیانەمان بنوسم.

ووتی: نەخێر چیت لە دەست دێ بیکەو بینوسە .

ئەوانەم هەڵگرتوە بۆ کاتێ کە پێویستیم پێی دەبێ. من کە دەمزانی نامداتەوە ، چونکە پێشتر سەلاح رەشید ڕاسپاردرا بوو بمداتەوە ، بۆیە هەموو قسەکانم تەسجیل کرد.

ووتم: نا فەرموو  بە دەست خەتی خۆت وەڵامی ئەم پرسیارانەم بدەرەوە و بە نوسین بینوسە؟.

مەلا بەختیار نەك هەر وەڵامی هەموو پرسیارەکانی منی بە نوسین دایەوە، بەڵکو کەوتە نوسینی ناوی هەموو ئەندام لق و شانە و ڕێکخستنەکانی ئاش. نەختێ دامام و پاشان ووتم: کاك بەختیار سەرکردەی پرولیتاریا بۆ ڕزگارکردنی گیانی خۆی قوربانی بە ڕێکخراوەکەی وئەندامان دەدا بەو جۆرە؟. بەس نەبوو لە شارا دەست ڕژێم نە کەوتی خۆ کۆمەڵەت بە هەڵتەکاندن ئەدا. دوای تەواوبوونی هەموو پرسیارەکان و وەڵامەکان بەدەستی خۆیی ودەنگی خۆی بردم بۆلای مامۆستا پشکۆ پیشانمدا کە ئەو وەڵامانە ڕاستن؟ ئەویش ووتی: بەڵێ ڕاستن. و ئیمزای کرد لەسەر وەڵامەکان پاش ئەو بردمە لای شێخ عەلی"خولە کەشکۆڵ" وپیشانمدا و ووتم :ئەو وەڵامانەی مەلابەختیار ڕاستن ، کە خوێندیەوە.

ووتی: خۆ بەڕاستی ئەمە خەتی مەلابەختیارە دەك داوەشێی سەرکردەی پرۆلیتاری عەیار چەپ.

پاشان ووتی: نەخێر هیچ ڕاست نین ومن ئیمزای ناکەم  و بڕواش ناکەم ئەمە وەڵامی ئەوبێ؟

بۆ ڕۆژی (١٩٨٥/١٢/١٧) هەر سێکیانم لە شوێنەکەی مەلا بەختیار کۆکردەوە و دووبارە پرسیارەکانم پێکەوە لێکردنەوە، ئەم جارە هەرسێکیان وەڵامی پرسیارەکانیان دایەوە هەر یەکەیان وەڵامی چەند پرسیارێکیان نوسیوە و لەسەر دوالاپەڕەش ئیمزایان کرد وەك لە دیکۆمینتەکەدا دەبینرێ.* دوای داننان بە هەڵە و

---

* بۆ کۆمیتەی سەرپەرشتی ئاڵای شۆڕشی بەرێز

پاش سڵاو.

پاش ئەو هەموو ململانێو ناکۆکیو دژایەتیانەی پێشومان لەناو کۆمەڵەدا، دواتریش تاوانی خۆ اعلان کردنمان وەکو ئاڵای شۆڕش بەرامبەر بە کۆمەڵەو یەکێتی وەکو جیابونەوە لێیان، گەیشتینە ئەو

قەناعەتەی هەموو ئەو کارە ناراستانەی پێشووی ناو کۆمەڵەمان و کردەوەکانی ئەم دوایەشمان ئیدانە بکەین و بە تاوانیان بزانین بەرامبەر بە کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان و بزوتنەوەی کرێکارانی کوردستان‌و شۆڕشی رزگاری خوازانەی گەلەکەمان. بۆیە بڕیارماندا کەچی تر لەمەودوا لەگەڵ ئێوەدا کار نەکەین واز لە سیاسەت بهێنین‌و هەموو پەیوەندیەکی خۆمان لە گەڵتاندا ببڕین لەبەر ئەم هۆیە فیکری سیاسیانەی خوارەوە:

أ ـ ئەو شێوە کارکردنەی کە ئێمە مومارەسەمان کرد لەناو کۆمەڵە و یەکێتیدا، پاشان پەیوەندی کردنمان لەگەڵ ئاڵای شۆڕش‌و نە پساندنی پەیوەندی حیزبی لەگەڵ کۆمەڵە بەرەسمی، واقعەکە سەلماندی کە ئەو شێوە کارە ناشەرعی و نادروست بووە و ئێمە بەش بەحاڵی خۆمان لێی پەشیمانین، وە دەرکەوت لەناو شۆڕشی گەلەکەماندا لە کوردستانی عیراقدا تەئسیری سەلبی زۆری بووە لەسەر بزوتنەوەی کرێکاران و یەکێتی ریزەکانیان و مارکسیەکان، بۆیە پاشگەزبونەوەمان و دوورکەوتنەوەمان لە قازانجی شۆڕشدایە، چونکە رێبەرایەتی بەرگری شۆڕشگێڕانە کە مەسەلەی سەرەکیە بەهێزێکی وەك یەکێتی نیشتمانی کوردستان دەکرێ نەك بە چەند ئەڵقەیەکی بچوکی بێ هێز، بە راستی دەبوایە باشتر رەچاوی واقعی خەباتی گەلەکەمان و شۆڕشەکەی بکەین. تەنانەت ئەگەر قەناعەتی فکری و تایبەتی و جیاوازیشمان بوبێ، راستتر وابوو لە رێگەی ئسوڵی حیزبایەتیەوە وەك شەخس خۆمان دوورخستبایەتەوە لە کۆمەڵە و یەکێتی، چونکە ئەبوایە بمانزانیبایە ئەم کارانەی ئێمە، بە حوکمی مەرکەزمان لەناو شۆڕش‌و کۆمەڵەدا دەبێتە مایەی کێشەو گیرگرفتی ئاوا کە گیانی بەرەنگاری لاواز دەکات و ئەویش سەرئەنجامی ئەو سیاسەتە هەڵەیەی کە ئێمە گرتبومانە بەر.

ب ـ کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان وەك رێکخراوێکی مارکسی لینینی شۆڕشگێڕی ئەساسی تۆری خەبات، یەکێتی نیشتمانی کوردستانیش وەك لایەنێکی نیشتمان پەروەری رزگاری خوازی کاریگەرو باڵادەست، شۆڕشیش وەك بڕبڕەی پشتی گەلەکەمان و بزوتنەوەی نیشتمانی لە عیراقدا دژی فاشستەکان. ئەرکی سەرشانی هەموو کەس‌و لایەنێکی شۆڕشگێڕ و دیموکراسی و چەپێکە، ئەمڕۆ دریغی نەکات لە پشتیوانی‌و دۆستایەتی کردنیان، کارێکی وا نەکەن لە بەرامبەر دوژمندا لاواز بێت چونکە لاوازکردنیان دەبێتە هۆی پاشککەوتنی سەرکەوتنی جوڵانەوەی رزگاری خوازانەی کوردستان، ئەمە راستیەکە تا دێت ڕووداوەکان باشتر دەیسەلمێنن، بۆیە لەمەوبەر کارەکانی ئێمە کە پێچەوانەی ئەو راستیانەی سەرەوە بوبێ ئیدانەیان دەکەین، بە تایبەت پاش ئیلتیزام کردنمان بە ئاڵای شۆڕشەوە.

ج ـ خۆتان دەزانن هەڵوێستمان بەرامبەر نوسراوەکانی کاك سالار و م. جەعفەر بە توندی رەت کردنەوەیان بووە، چونکە بە گیانێکی دوژمنکارانەو ناراست بەرامبەر کۆمەڵە و یەکێتی نوسراون، ئێستاش هەمان هەڵوێستی ئیدانەکردنمان هەیە. سەبارەت بە هاندانی لایەن و دەوڵەتەکانی ناوچەکە بۆ دوورکەوتنەوە لە

یەکێتی و دژایەتی کردنیان هەر لەلایەن ئەو برادەرانەوە بە تاوان و خیانەت لە قەڵەم دەدەین. لە کاتێکدا پێویست بوو بە پێچەوانەوە دۆست و پشتیوان و ئیمکانیەتی بۆ شۆڕش و جوڵانەوەی گەلەکەمان زیاد بکرێ و هەڵی نزیك خستنەوە و یەك خستنەوەی لایەنەکانی ئۆپۆزسیۆنی سیاسی ـ چەکداری کۆری خەبات بەمەش بۆ نەهێشتنی شەڕی ناوخۆ. وە ئێمەش دەبوو پێش وەخت لەم بارەیەوە ململانێکانمان لەگەڵ ئەو برادەرانە یەك لا بکردایەتەوە.

د ـ هەر کە گەیشتینە قەناعەتی بێ هیوایی لە کۆمەڵە لە رووی ئسوڵی حیزبایەتیەوە پێش وەخت دەبوو ئستیقالەی رەسمیمان لە کۆمەڵە بکردایە لە پاشان بیرمان لە چونە ناو لایەنێکی تر بکردایەتەوە.

کارکردنمان بە چەشنی (تسلل) تاوانێکی تەنزیمی و سیاسی گەورە بوو، کارێکی ناشەرعی بوو، زیانی بۆ هەردوولا هەبوو، بۆیە لەو شێوە کارە پەشیمانین، بە توندی رەخنەی لێدەگرین، وە بە پێویستیشی دەزانین هەوڵدەن ئەو شێوە کارکردنە بنبڕ بکرێ و هەر کەسە لای خۆیەوە چاوی پێدا بگێڕێ و پاشماوەکانی نەهێڵێ تا چیکە نەبێتە زیان بۆ کۆمەڵە و شۆڕش.

هەر دەربارەی کەرت و پێوەندکردنی هێزی پێشمەرگەی کوردستان، هەر چەندە ئێمە بە کارێکی نالەبار و تاوانمان زانیبێ، بەڵام شێوەی سراعەکە و سیاسەتەکە، دەرکەوت هەر بۆ ئەوەی دەبرد. بۆیە دیسان دژی بیناکردنەوەی هێزی (پ. م) کوردستانین. وە هەموو تەقەلایەك بۆ ئەو مەبەستە، واتە جیاکردنەوەی هێزی پ. م کوردستان بە خیانەت و تاوان دەزانین، وە بە توندی لایەنگیری یەکێتی ریزەکانی و گیانی برایەتی و هاورێیەتی راستەقینەین لە ریزەکانیدا. دەست هەڵگرتن لەو جۆرە سراع و سیاسەتە تاقە زامنی رەوانەوەی ئەو مەترسیەیە کە ئەبێتە هۆی لاوازکردنی شۆڕش و قوڵکردنەوەی ئەو کێشە نا مەبدەئیانەی پێشوو، بۆیە هیوامان وایە هەر کەسێکیش بە هۆی کێشەکانی ئەم دواییە و لە ژێر تەئسیری ئەو وەزعە سیاسیەدا تووشی دوورەپەرێزی و لادان و دوورکەوتنەوە بووە لە یەکێتی و هێزی پ. م و کۆمەڵە، وەك پێویست دان بە هەڵەکانی خۆیاندا بنێن و بگەرێنەوە ناو هێزی پ. م و براکانی خۆیان لە یەکێتیدا. چونکە ئەم واقعە هەرگیز بەرگەی جیابوونەوە و شەڕی ناوخۆ و زیادرکردنی لەشکرکێشی ناگرێت، وە هەر ئەوەش جەرگی دوژمن دەبرێ و دڵی میللەتەکەمان خۆش دەکات. ئێمە لەلایەن خۆمانەوە لەو جۆرە سراعە کە ئەم ئەنجامەی دا بە دەستەوە پەشیمانین و هیوادارین هەموو برایەکی تریش ئەم هەڵوێستە وەرگرێ و چیکە درێژە بەو سیاسەتە هەڵەیە نەدات.

برایان...

ئەوەی لە سەرەوە نوسیومانە پوختەی هەلوێست و راو قەناعەتی ئێمەیە سەبارەت بە ئاڵای شۆڕش‌و سەرجەم مەسەلە سیاسیەکان، بە بروای تەواوەوە دوور لە هەموو تەئسیرێکی ئەم یان ئەو، لە کاتی گرتنماندا لەلایەن یەکێتی و کۆمەڵەوە، لە جەوێکی زۆر هێمن و ئارام و دیموکراسیانەدا، بێ هیچ زۆری‌و

فشاریَ. بۆیە دیسان دوپاتی ئەکەینەوە ئیتر ئێمە کە لە خوارەوە ئیمزامان کردووە هیچ جۆرە ئیلتیزامێکمان پێکەوە نەماوە و نامێنێ وە ئیتر وەکو کوردێکی بێ لایەن و دڵسۆزو دوور لە ژیانی سیاسی، دوور لە کوردستانی عیراق ژیان دەبەینە سەر، بۆ ئەم مەبەستەش داوامان لە کۆمەڵە و یەکێتی کردووە یارمەتی چونە دەرەوەمان لە هەموو بارێکەوە بۆ مەیسەر بکەن، ئەوانیش بە سوپاسەوە گفتیان پێ داوین.. وە ماندوو بونی چەند ساڵی رابوردویان بە گیانێکی مەسئولانەوە رەچاو کردووە، سەرەرای ئەو هەموو ناکۆکی و دژایەتی کردنەمان لە ماوەیەکی دیاری کراودا بەرامبەریان.

| | | |
|---|---|---|
| ئیمزا | ئیمزا | ئیمزا |
| پشکۆ | بەختیار | شێخ عەلی |

<u>تێبینی:دەقی ئەو نامەیەم لە ژمارە(٦)ی گۆڤاری(ململانێ)ی،رۆژی ٢٠١٠/٩/٢٦ دەستکەوت. نازانم چۆن لەو گۆڤارە بلاوبۆتەوە؟؟؟</u>

هەر لەسەر ئەو بابەتە ئەو دوو خالە دەخەمەروو:

١- دوای دان پێنانەکانی مەلابەختیار و پشکۆ وشێخ عەلی، ئەو چاودێریە قورسەیان لەسەر نەما (پشکۆ لە مەکتەب عەسکەری بوو، لەگەڵ پێشمەرگەکان بەردەوام لە حەوشەکە بوو کە بیناکە قوتابخانەی هەڵەدن بوو ، مەلا بەختیار لە سکرتاریەتی مام جەلال لای ئەبو شەهاب لە خانودا بوو کەپریشی لەبەردەم خانوەکە بۆ کرا بوو بە رۆژ بە زۆری ئەبرایە ژێر ئەو کەپرە. شیخ عەلی لە دەزگای دارایی بوو. مەلا بەختیار لە مانگی (١٩٨٦/٥)شەو فرسەتی هێنا بوو بە یارمەتی رووناکی ژنی و ملازم عومەر رای کرد بوو دوای(٣)شەو و رۆژ نەیتوانی بوو بگاتە سەرچناری سلێمانی کە (ئاراسی حەمەلاو، ئامر مەفرەزەی جاش و بابەعەلی چاوەرێیان دەکرد، لەناو رەز و بەردەکانی قزلەردا گیرا بۆوە.

٢- بۆ مێژوو ئەڵێم لە هەموو ماوەی سجن بوونی ئەوسیانە هەرگیز سوکایەتی بەکەسیان نەکراوە، لە کەسیان نەدراوە ، جگە لە دووجار، جارێك (د.کەریم سوکایەتی بەشێخ عەلی کرد بوو ، کە زانیم نەمهێشت د. کەریم کۆیی بچێتەوە بەوناوەدا و لای مام جەلال شکاتم لێکرد، جارێکیش پاش راکردن و گرتنەوەکەی مەلابەختیار ، وەستا عەبدول حەرەسەکەی مەلا بەختیار سوکایەتی پێکرد بوو ، ئەویش لەبەر ئەوەی لە راکردنەکەی مەلا بەختیاردا مام جەلال بریاری دابوو گەر مەلا بەختیار دەست نەکەوێتەوە

تاوانەکانیان پەیوەندیان بە منەوە نەما و درانە سکرتاریەتی مام جەلال کە ئەبو شەهاب بەرپرسیان بوو بە گرتنی مەلا بەختیار دیارە ئاش پەرش و بڵاوبوون . بەلاَم لەناو نەچون ، پاشان لە ڕێگەی ڕووناکی شێخ جەناب و عیماد ئەحمدەوە جارێکی تر کۆکرانەوە و ڕێکخرانەوە و لێپرسراوەکانیان چوونە لای بارەگاکانی بەرەی جود لە ئێران . بەلاَم هیچ کاردانەوە و کاریگەریەکی توندیان لەسەر یەکێتی نەما ، جگە لە ڕۆیشتن وچەك دانان و تەسلیم بوونەوەی چەند کادرێکی کەمی پێشمەرگانە و چەند پێشمەرگەیەك و ریزەکانی کۆمەڵە بۆ هەتا دوا هەناسەی کۆمەڵە لە تەکەتولی عیراقچێتی ڕزگاری بوو، سالار عەزیز دوای ئەوەی چووە پارەزان و پاشان چووە ئێران و لەوێوە چووە دەرەوە لە نیسانی ساڵی ١٩٨٥ بە عەرەبی نامیلکەیەکی لە ژێر ناوی (لم یعد الصمت ممکنا) لە ولاَتی سویدیەوە ، بەناو کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی دەرکرد.*

لەو نامیلکەیەدا پێشەکیەکەی بە هێرش بردنە سەر مام جەلال ونەوشیروان دەست پێدەکات تالاپەرە(٨) لەلاپەرە هەشتەوە باسی ڕۆڵی ئارام دەکا و پاشان کوژرانی و تاوانی کوشتنە کەی دراوەتە پاڵ سەرکردایەتی ڕاسترەوی یەکێتی.

لەلاپەرە(١١) هۆی سەرکەوتنی نەوشیروان دەگەڕێنێتەوە بۆ ( استشهاد) ( الرفیق شهاب و جعفر) ئەو هاوڕێ شەهاب و جەعفەرەی ، کە سالار خۆی لە بەیانی شوباتی١٩٧٦بە ( انتهازی وانهزامی ومعترف ومنحرف)ناوی بردن.

---

وەستا عەبدول لە باتی ئەو زیندانی بکرێ ، مام جەلال سوکایەتی زۆری بە وەستا عەبدول کرد بوو، بەلاَم برادەرانی ئاش پڕوپاگەندەیەکی زۆریان لەسەر من کرد بوو ، گوایە لەکاتی لێکۆڵینەوەدا من سوکایەتیم پێکردون . تەنانەت لە قوتابخانە لە سلێمانی قوتابی کەس وکاری ئەوانە هەڕەشەیان لە کچەکانی من کرد بوو.

* من پێموایە ئەو نوسینە عەرەبیە ، نوسینی فازل کەریم بوو.

لەلاپەڕە (١٧) وە باسی پلانەکانی نەوشیروان و کوشتنی خەڵکی بێتاوان لەلایەن نەوشیروانەوە دەکات.

لەلاپەڕە(٢٨ تا ٣٤) وپاشان باسی دانوستاندن دەکا، کە یەکێتی و کۆمەڵە خۆیان بە سەدام فرۆشتووە . لەوێشەوە باسی شەڕی یەکەم و دووەمی جود دەکا تادوالاپەڕەی کەلاپەڕە(٥٠)یە. ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەوەیە کە نامیلکەکەی بەناوی کۆمەڵەی ڕەنجدەران دەرکردوە و ئەو مافەی بەخۆیداوە، کە ئەو کۆمەڵەیە و کۆمەڵەش ئەوە(الشعب انا و انا الشعب اجمعه).

## ١٠-٢. دژەکانی دوێنێ دۆستەکانی ئەمڕۆ.

بە دەستپێکردنەوەی شەڕ ، پاڵەپەستۆیەکی زۆر کەوتە سەر یەکێتی ، یەکێتی هیچ چارە و دەرەتانێکی نەبوو، جگە لە هێرش و پەلاماری فراوان و بەرپەرچدانەوەی پەلامارەکانی ڕژێم ، هەموو دەرگاکان داخرا بوون.

## دژەکانی یەکێتی کە لە ئێراندا بوون.

**ئاش:** دوای ڕۆیشتنیان لەناو یەکێتی و چوونە ئێران و لە پاڵ "جود" خۆیان گرتەوە، جود ئێرانیان وا تێگەیاند بوو، کە دروستبوونەوەی شەڕیان لەگەڵ عیراق و بە جیابوونەوەی ئەمان، یەکێتی تووشی شکست ولاوازی بووە و هێزەکانی وورەیان نەماوە و دیاردەی تەسلیمبوونەوە و چەکدانان لەناویاندا پەرەی سەندوە و لەم نزیکانە هەڵدەوەشێن.

**پارتی** : وای لە ئێران گەیان بوو ، کە ئەو شەڕە سەختانەی یەکێتی لەگەڵ ڕژێمی عیراقی ڕاست نیە و چاو دراوە لەگەڵ جەماوەر و هەڵخەلەتاندنی خەڵکە ، ئەگینا یەکێتی وبەعس یەك شتن.

**پاسۆك**: كاتی خۆی پێش گفتوگۆی یەكێتی ، پرۆژەی دروستكردنی بەرەیەكی دا بوو بە جود كە یەكێتی ڕاكێشنە ناو ئەو بەرەیەوە بۆ ئەوەی نەكەوێتە دانوستاندن لەگەڵ ڕژێم . بەلاّم هیچ لایەكیان پەسەندیان نەكرد ( لە بەشی بەرەی كوردستانیدا باسی دەكەم) ئەمانە هەڵوێستیان مام ناوەندی بوو، حەزیان دەكرد لە شەڕبوونەوەدا پرۆژە كۆنەكەیان زیندوكەنەوە ، بەلاّم نە ئەو سەنگە وكاریگەرەیان لەناو "جود" دا هەبوو، نە لەگەڵ ئێرانیش زۆر بە یەكداچو بوون كاریگەریان هەبوو.

**حزبی شیوعی**: لەناو ئێراندا بەناوی(ئەفرادی بارزانی) ناسرا بوون، نەك وەك شیوعی . بۆیە جگە لەوەی هیچ پەیوەندیەكی ڕاستەوخۆیان لەگەڵ ئێران نەبو، و كاریگەریان نەبو نەشیاندەویست یەكێتی لە ئەڵقەی ئابڵوقەی جود دەرباز بێ.

**حسك**: تەنیا ئەمان لەناو بەرەی جود دا بە نەمانی دانوستاندن و شەڕبونەوە و دەست وەشاندنەكانی یەكێتی، لە هەمویان جیاوازتر هەوڵیاندا بۆ نزیككردنەوەی یەكێتی و ئێران لەیەكتری . ئەمان جگە لەوەی قورسایی خۆیان لەناو جود هەبوو، هێندەی پارتیش لە كۆماری ئیسلامی و بەتایبەت لە ئیتلاعاتەوە نزیك بوون و قسەیان لای كار بەدەستەكانی ئیتلاعاتی ئێرانی دەڕۆیشت . حسك تەنیا لایەنی جود بوو ، كە حەقیقەتی توانا و هێز و قەبارەی یەكێتی بە ئێرانیەكان ووت بوو، كەوتە نێوان یەكێتی و بەرپرسە خواروەكانی ئیتلاعات ، كە بەرپرسی ناوچەكانی كوردستانی ئێران بوون ، ڕۆژی (١٩٨٦/٤/١٨) وەفدێكی حسك كە پێك هاتبوون لە ( شێخ محەمەد شاكەڵی و حەمەی حاجی مەحمود) هەردووكیان سەركردایەتی حسك بوون ،هاتنە بارەگای (م.س) یەكێتی لە یاخسەمەڕ . ئەمە یەكەم هەنگاوی ئاشتبوونەوەی حسك و یەكێتی بوو ، و یەكەم هەنگاوی دروستكردنی پەتی پەیوەندی نێوان ئێران و یەكێتی بوو، دیسانەوە یەكەم هەنگاوی شكاندنی ئەڵقەی

ئابلۆقەی جود لەسەر یەکێتی و پێکهێنانی بەرەی کوردستانی بوو . لێرەوە هاتوچۆی بەردەوامی نوێنەرانی دەستپێکرد و نوێنەرانی یەکێتیش بۆ لای حسك بۆ ئەوەی ئێرانیەکان لەوە بگەن ، کە یەکێتی دەیەوێ گفتوگۆ بکات و لە هێزەکانی یەکێتی نەترسن ، چونکە پارتی و ئاش وایان لە ئێرانیەکان گەیاند بوو ، کە یەکێتی پیاوی بەعسە و هەر چ ئێرانیەکیان دەستکەوێ تەسلیمی عیراقی دەکەن (حەمەی حاجی مەحمود) هەندێ لە فەرماندەکانی ئێرانی هێنایە ناو هێزەکانی یەکێتی لە شاربازێڕ ئیتر دەرگای هاتوچۆی نێوان نوێنەرانی ئێرانی و یەکێتی بۆ لای یەکتری کرایەوە.

## دانوستاندنی یەکێتی لەگەڵ ئێران

لە نێوان ئێران و یەکێتیدا هاتوچۆیەکی زۆرکرا، بەڵام هەمووی لەو ئاستەدا نەبوو، کە خاوەن بڕیار و دانوستاندنی سیاسی بن ،تا ئەو کاتەی کە لە مانگی (١٩٨٦/٧) نوێنەرێکی ئیتلاعاتی ئێرانی لەگەڵ سلێمانی قەسابدا هاتن بۆ یاخسەمەڕ و لەگەڵ سەرکردایەتی یەکێتی گفتوگۆی ئاساییان کرد و نوێنەرەکەی ئێران دیارە بە توجیهی ئیتلاعات ، گەشتێکی بە ناوچەکانی دوکان و سورداش و ئەزمر تا نزیك سلێمانی کرد و هێزەکانی یەکێتی و بنکەکانی یەکێتی لە نزیك بە هێڵی تەماسی هێزەکانی ڕژێمی عیراقی بینی و زانیاری خۆی کۆکرد بۆوە. پرسیاری سەرنج ڕاکێشی ئەو کار بەدەستە ، تاقیکردنەوەی نیەتی یەکێتی بوو، بۆ ئاشتبوونەوەیان لەگەڵ پارتی . دوای ئەم نوێنەرە دەستەیە نوێنەرانی تر هاتن ، کە دەوری حەوت کەسێك دەبوون ، ئەمانە لەسەر ئاستی بالاتری نوێنەرەکانی تر بوون، ئەمانە لە سەرەتای مانگی(١٩٨٦/٨) هاتن ، ئەمانە جگە لەوەی کە لەگەڵ مام جەلال گفتوگۆیان کرد ، لەگەڵ تیپی ٢١ی کەرکوك و تیپەکەی (مامە غەفە و ڕێبان) گەشتێکی چەند ڕۆژیان بۆ ناوچەکانی شوان و شێخ بزینی و عەسکەر و نزیك کەرکوك وگەرمیان کرد ، لە گەشتەکەیان ، وەك خۆیان پاش گەشتەکە باسیان کرد بوو، بۆ ئەم مەبەستانە کرد بوویان:

ئایا یەکێتی کافرن ودژی مزگەوت ومەلا و نوێژ و ئیسلامەتین . بۆیان دەرکەوت بوو کە بە پێچەوانەوە بۆ هەر دێیەك چوو بوون ، لە پێشا چوونە مزگەوت.

- ئایا بوونی هێز و بنکەکانی هێزی پێشمەرگەی یەکێتی لە نزیك ڕەبایە و مەعەسکەرەکانی ڕژێم بۆ زانیاری گۆڕینەوەیە یان لە بێباکی و چالاکی پێشمەرگەکانە.

- بۆ ئەوەی بزانن هێزەکانی یەکێتی لە سنوری ئێرانەوە تا قولایی چەند ، چالاکی دژی هێزەکانی ڕژێمی عیراقی دەکەن.

- بۆ ئەوەی قەبارەی یەکێتی و چۆنیەتی فراوانی ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی یەکێتی بزانن ، دوای گەڕانەوەی ئەم نوێنەرانە ئینجا بەشێوەی فەرمی دانوستاندنی نێوان یەکێتی و حکومەتی ئێران دەستی پێکرد.

## هەلومەرجە ڕەخساوەکانی یەکێتی.

١- نەمانی ئەلتەرناتیڤی یەکێتی لای حکومەتی ئێرانی ، دوای شەڕی جودی یەکەم و دووەم و شەڕی بێتواتە و دەستپێکردنی گفتوگۆی نێوان یەکێتی و ڕژێمی عیراقی پتر بوونی دەسەلاتی چەکداری نەمانی بەرەی جود لە کوردستانی عیراقدا. بوونی هێزێکی گەورەی وەك یەکێتی لەسەر گۆڕەپانی کوردستانی عیراق بۆ لێدانی هێزەکانی ڕژێمی عیراقی و پاراستنی سنوری هەردوو دیوی کوردستان لە هێرش و پەلاماری هێزی عیراقی بۆ ئێران زۆر پێویست بوو ، بەتایبەتی پاش تاقیکردنەوەی هێز و دەسەلات و توانای یەکێتی لە لێدانی کەرکوکدا لە شەوی(١٠-١١/١٠/١٩٨٦)دا بە ناوی (فتح)ی یەك لە ناراستی زانیاریەکانی ئاش و پارتی گەیشت بەرامبەر یەکێتی.

٢- حکومەتی عیراق لە شەڕا لە قۆناغی هێرش و پەلاماردا نەما بوو ، بەڵکو کشابۆوە ناو خاکی عیراق و لەناو خاکی عیراقیشدا کەوتبووە ، بەرگریکردن لە خۆی. ئێران لای وابوو کە شکانی هێزی عیراقی سەرەتای بەرەو پێشەوەچونی خۆیەتی و کاتی ئەوەیە

، کە نەخشەی گرتنی بەسرا و عەمارە دابنێ و لە کرماشانەوە بەرەو نەجەف و کەربەلای (راهی کربلا) بکاتەوە بەناو کوردستاندا. بۆیە پێویستی بە کردنەوەی بەرەیەکی فراوانی شەڕ بوو لە کوردستانەوە لەگەڵ عیراقدا، ئەو بەرەیەشی بەبێ یەکێتی بۆ نە دەکرایەوە بۆیە ئێران بە مەرجی زۆر سەخیانەش ئامادەی ڕێکەوتن بوو لەگەڵ یەکێتیدا.

٣- دوای نەمانی گفتوگۆی یەکێتی لەگەڵ عیراق ، دەبوایە شەڕێکی سەخت و بەرەیی لەگەڵ ڕژێم بکا ، تا ناوچەکانی لە پەلامارەکانی ڕژێم بپارێزێ ، بۆ ئەمەش پێویستی بە پارە و تەقەمەنی و چەك وکەلوپەل و پێویستیەکانی شۆڕش هەبوو، کە نزیکەی ٢/٣ ی سەر زەمینی کوردستانی عیراقی لە ژێردەست دابوو.

## مەرجەکانی کۆماری ئیسلامی بۆ ڕێکەوتن.

**یەکەم : ئۆپۆزسیۆنی کوردی و ئێرانی لە سنوری یەکێتیدا.**

- دەرکردنی هێزە سیاسی و چەکداریەکانی کوردی و ئێرانی لە ناوچە ڕزگار کراوەکانی یەکێتیدا.
- تاوانبارکردنی ڕابەرایەتی شۆڕشی کوردستانی لە شەڕکردنیان لەگەڵ کۆماری ئیسلامی
- لێدانیان و گرتنیان و ڕاونانیان بۆ ناو ئێران و تەسلیم کردنەوەیان بە ئێران.

**دووەم: گفتوگۆ لەگەڵ عیراق.**

تاوانبارکردنی هەموو جۆرە تاکتیکێکی ئۆپۆزسیۆنی عیراقی لە گفتوگۆکردن لەگەڵ ڕژێمی عیراقی لەسەر ئەو سەرەتایەی ، کە ڕژێمی عیراقی ڕژێمێکی کافرە و نابێ لەگەڵ کافر ڕێکەوتن بکرێ.*

---

* کەچی خۆیان و لە ژیانی خومەینی و بە نا بەدڵی خومەینی و لە پشت هەموو ئوپۆزیسیۆنی کوردی و عراقی ڕێکەوتننامەیان لەگەڵ حکومەتی عراق مۆرکرد.

## وەلامی یەکێتی بۆ مەرجەکانی ئێران.

**یەکەم:** یەکێتی بە هیچ جۆرێك نە شۆڕشی کوردستانی ئێران ونە ئۆپۆزسیۆنی کوردی ئێرانی و ئێرانیش تاوانبار ناکات ، ولێشیان نادا و نایـانگرێ و تەسلیمی ئێرانیـشیان ناکات.

**دووەم:** ئێمە ناتوانین ئەو کوردانە دەرکەین یا ڕاوبنێین ، چونکە کورد لـە ئێـران و لـە عیراق بە چەندین هۆکاری کۆمەلآیەتی و نەتەوایەتیەوە بە یەکەوە بەسـتراونەتەوە و کەسوکاری یەکن .

**سـێهەم:** گفتوگـۆش لەگـەڵ بەغـدا ، ئێمـە ووتومانـە و دەیڵـێین کـە ئێمـە هێزێکـی نیشتمانپەروەری سەربەخۆین و بارودۆخی تایبەتی خۆمان هەیە و ئەو بارودۆخەی کە گفتوگۆی لەگەڵ عیراق دورسـتکرد ، بـارودۆخی سـەپاندنی گفتوگـۆی سیاسـی بـوو ، هەڵە نەبوو تا تاوانبار بکرێ.**

## ڕێکەوتنی هەردوولا لە دانوستاندندا لەسەر ئەم خالآنە :

١- ناوزەندکردنی ڕژێمی عیراقی بە دوژمنی هاوبەشـی ئێـران و شۆڕشـی کوردسـتانی عیراق ، لەو ڕووەوەی کـە عـیراق لـە هـەردوو شـەڕەکەدا دەستپێـشکەر بـوو لـە شـەڕ هەڵگیرساندن.

٢- دیـاریکردنی بەرژەوەنـدی هاوبەشـی هـەردوولا لـە هـەلگرتنی دروشمـی ڕووخـانی ڕژێمی عیراقی وکارکردن بۆ بنیاتنـانی حـوکمێکی دیمـوکراتی لـە عـیراق ، کـە گـەلانی عیراق خۆیان چارەنوسی خۆیان و ئاینـدەی عـیراق دیـاری بکـەن . واتـە " پێویـستی خەباتی هاوبـەش لـە پێنـاو حـوکمێکی عیراقـی گـەلی سـەربەخۆ و پاراسـتنی یـەکێتی خاکی عیراق لە بەرامبەر چاوتێبڕینی دەرەوە.*

---

** جلال الطالبانی، حول القضیة الکردیة فی العراق-تشرین الثانی١٩٨٨،ص٩٠.

* لە چاو تێبڕینی دەرەوە ، مەبەست لە تورکیا بوو ، ئەو کاتە تورکیا چاوەڕێی تێشکانی عیراق بوو تا پەلاماری کوردستانی عیراق بدا و وولایەتی موسلی کۆن زیندوو بکاتەوە لە عیراقی دڕاوی شەڕی بپچڕێ ،

٣- پشتگیری تەواوی ئێران بۆ خەباتی گەلی کورد و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد دژی سیاسەتەکانی رژێمی عیراقی ، کە بە سێ کوچکەی بەعس ناسراوە( راگواستن- بەعەرەبکردن- بە بەعسی کردن)ی کورد و کوردستان ئەو پشتگیریەش لە رێگەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە دەبێ.

٤- حکومەتی ئێران وشۆرشی کوردستانی عیراق هاوپەیمانی یەك بن لە شەر و لە ئاشتیدا ، واتە هیچ کامیان پەیمانی ئاشتی لەگەڵ دوژمنی هاوبەشدا ، بێ لایەنی دووەم مۆر نەکەن. **

٥- گەلی کورد لە چوارچێوەی کۆماری عیراقی سەبەخۆی ئایندەدا مافی خۆی لە چوارچێوەی ئۆتۆنۆمی یا فیدرالی دا بەکاربێنێ لەناو سنوری یەکێتی خاکی عیراقدا.

٦- دیاریکردنی نوێنەری هەردوولا و شوێنی کارکردنیان لە ئێران و لە کوردستان. ***

٧- یەکێتی زامنی ئەوە بکا ، کە ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی دەست لە هاتوچۆکەرانی کۆماری ئیسلامی ئێرانی نەوەشێنن و لە سنوریشەوە پەلاماری هێزەکانی ئێرانی نەدەن بەرامبەر بەوەش هێزەکانی ئێرانی ودامودەزگاکانیان دەست لە هێزەکانی

---

و مەبەستیش لە سەربەستی گەلانی عیراق لە دیاریکردنی چارەنوسی خۆیان ، پاراستنی سەربەخۆیی عیراق وگەلانی عیراق بوو لە سەرکەوتنی ئێران لە شەردا.

* ئەم خاڵە بەدەمی بوو، نەخرایە ناو پرۆتۆکۆڵەکەوە لەبەر ئەوە ئێران قایل نەبوو، ئەم خاڵە بە نوسین بێ

** مەکتەبی پەیوەندی ئیرانی لە یاخسەمەر کرایەوە ، کە بەپرسەکەی (حاجی موستەفەوی) بوو، لە کاتێکدا کە بارەگای سەرکردایەتی کۆمەڵەی ئامۆزاش لە مالومە بوو، بارەگای حزبی دیموکراتیش لە گەورەدێی دۆڵی جافەتی بوون. هاتوچۆی هەمووشیان بەسەریەکەوە بوو، و زۆرجاریش لە هاتوچۆدا تووشی یەك دەبوون، و مەکتەبی پەیوەندی یەکێتیش لە سەرەتاوە لە کرماشان و پاشان لە تاران و ورمێ و سەردەشت کرانەوە و بەرپرسیان (د.فوئاد مەعسوم) بوو.

ئۆپۆزسیۆنی ئێرانی لە ناوچەکانی یەکێتیدا نەوەشێنن و پلانـی لێدانی سـەرانیان بـۆ دادەنەنێن.

٨- ئێران بە چەك وئازوقە ودەرمان و دکتـۆر و خەسـتەخانە و عیلاجـی برینـداران و هاتوچـۆی نوێنـەرانی لـە ئێرانـەوە بـۆ دەرەوە یارمـەتی یـەکێتی بـدات ، و ڕێگـە بـدا ڕاگەیاندنی یەکێتی لە ئێرانەوە بچێتە دەرەوە لێرەدا گەر بـە وورد سـەیری خاڵـەکانی پرۆتۆکۆڵی ڕێکەوتنی یەکێتی و ئێران بکەین ، خوێنەر بۆی دەردەکەوێ کـە یـەکێتی تا چەند سور بووە لەسەر هەڵوێستی سیاسی خـۆی لەسـەر پاراسـتنی سەربەسـتی و سەربەخۆیی خـۆی لـە بڕوابـوونی تـەواوی بـە کوردسـتانیەت و دیـاریکردنی ئاینـدەی عیراق. **لەوانە:**

١- یەکێتی نیشتمانی کوردستان بە بڕوا بـوونی تـەواوی بـە سـەرەتاکانی( سـتراتیژی کوردستانی) و پاراستنی سەربەخۆیی سیاسی ڕێکخراوەیی و پێشمەرگایەتی و دەست وەرنەدانە کاروباری پارچەکانی تری کوردستان و پشتگیریکردنیان لە کـاتی پێویـست و داوای خۆیان ، سوربوون لـە سەربەسـتی و سـەربەخۆیی عـیراق لـە دیـاری کردنـی چارەنوسی خۆیان ، لـە کاتێکـدا لـە دوای ڕووخـانی بـەعس ، ئێـران داوای بنیاتنـانی کۆمارێکی ئیسلامی عیراقی دەکرد.

٢- یەکێتی بە ڕێکەوتنی لەگەڵ ئێران لەگەڵ ئەوەی کە خاڵی هاوبەشیان هەبوو خاڵی ناکۆکیشیان هەبوو ،کە هەرگیز یەکێتی مساومەی لەسەر مبادی نەکرد.

- ئێران بڕوای بە کۆمـارێکی ئیـسلامی ونـاردنی شۆڕشـی ئێـران ( تـصدیر الثـورة ) و پاشان ئیسلامیزم هەبوو . بەڵام یەکێتی بڕوای بە پاراستنی مافی وڵاتان و گەلان لـە دیاریکردنی جۆری حوکمی خۆیان ومافی چارەنوسیان هەبوو.

- ئێران بڕوای بە هیچ جۆرە پەیوەندیەك لەگەڵ وڵاتە شـیوعی و سۆشیالیـستەکانی جیهان نەبوو ، بەڵام یەکێتی نەك هەر بڕوای بەو پەیوەندیە هەبوو ، بەڵکو کاریشی بۆ دروستکردنی ئەو پەیوەندیە دەکرد.

– یەکێتی بڕوای بە جموجۆڵی دبلۆماسی خۆی و ناساندنی کێشەکەی بە هەموو وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاوایی و ئەمریکاش هەبوو . بەڵام ئێرانی دوژمنی سەرسەختی ئەمریکا و ناحەزی ووڵاتانی سۆسیالیستی بوو. واتە(نە شەرقی و نە غەربی جمهوری ئیسلامی)

– ئێران دوژمن و پەلاماردەر و لەناو بەری شۆڕشی کوردستانی ئێران بوو ، بەڵام یەکێتی پەنادەر و هاوکاریکەر و پارێزەری گیانی سیاسی حزب و ڕێکخراوە کوردی و ئێرانیەکانی ئۆپۆزسیۆنی بوو. هەرگیز مساوەمەشی لەسەر نەکردن.

٣– باشترین بەڵگەی سەربەخۆیی یەکێتی خۆی لە ڕێکەوتنەکەی نێوان ئێران و عیراقی مانگی(٥/١٩٨٨)دا، ڕەنگیدایەوە، کە نەبووە پاشکۆی ئەو ڕێکەوتنە و ئاشبەتاڵی ساڵی١٩٧٥ ڕووی نەدایەوە، لە دوای چالاکیە هاوبەشەکەی ئێران و یەکێتی لە لێدانی چاڵە نەوتەکان و بۆریە نەوتەکانی (زەمبور، جبل بۆر، بابەگوڕگوڕ) لێدانی دامودەزگا عەسکەرییەکانی ڕژێم لە کەرکوك و ئۆردوگای چەمچەمال وقەرەهەنجیر کە لە شەوی ١٠ لەسەر ١١/١٠/١٩٨٦دا کرا بە"فتحی یەك" ناوبرا. تەنیا ٥٠ چەکداری فەنی و شارەزای بەکارهێنانی چەکەکانی ئێرانی تیا بوو، بەڵام (٣٠٠٠) سێ هەزار پێشمەرگەی یەکێتی بەشداری کرد، کەچی ئێران ئەو سەرکەوتنە گەورەیەی بۆ خۆی و هێزەکانی خۆی بلاوکردەوە . دوای ئەو چالاکیە حکومەتی ئیسلامی ئێران لە ناوەڕاستی مانگی١٠/١٩٨٦، مام جەلالیان بانگهێشت ئێران کرد و پرتۆکۆڵی ڕێکەوتنەکەیان لە مانگی(١٠/١٩٨٦) مۆر کرد.

## کاردانەوەی ئەو ڕێکەوتنە لەسەر عیراق.

ڕژێمی عیراقی بەو ڕێکەوتنەی نێوان ئێران و یەکێتی باش دەزانی ، بە تایبەتی لە حاجی ئۆمەرانەوە تاپەنای خانەقین سنوری ئێران و عیراق لە ژێر دەسەڵاتی یەکێتیدا بوو، بە ئاسانی چەك و تفاقی شەڕ و تەنانەت ئێران ئەیتوانێ تۆپ و دەبابە و چەکی

قورسیش بە ئاسانی لەو سنورەوە بیگەیەنێتە قولآیی ژووروی عـیراق وەك كـەركوك و دیالە و شارەكانی تری كوردستان. جگە لەوەش رژێمی عیراق دەیزانی بە كردنـەوەی بەرەیـەكی شـەڕی وافـراوان و دوور و درێـژ كاریگـەری زۆر خراپـی دەبـێ لەسـەر بارودۆخی شەڕەكە ، چونكە ئـەم پەیوەندیـەی یـەكێتی و ئێـران زۆر جیاواز بـوو لـە پەیوەنـدی یـەكێتی سـوریا، یارمـەتی سـوریا زۆر بـە سـتەم و بـە چـەندین ڕێگـای مەترسیدار و لە ژێردەسەلآت وكۆنترۆڵی عیراق دەگەیشتنە یەكێتی.

## بۆ عیراق كەوتە پەلەكردن لە دانان و نەخشە و پلانەكانی؟.

**بەهۆی چەند فاكتەرێكەوە بوو لەوانە:**

- هەوڵدان بۆ دابڕینی یەكێتی لە ئێران ، بە هێرش بردنە سەر سنورەكان لە چوارتا و ماوەت قەلآدزێ و حـاجی ئۆمـەران ، بەمەبەسـتی بڕینـی ڕێگـای سـنورەكان و پچڕانی ناوچەكانی یەكێتی لە سنوری ئێران.
- ئابلۆقـەدانی ناوچـەكانی سـەركردایەتی یـەكێتی و دابڕینـی لـە ناوچـەكانی تـر و مەڵبەندەكانی (١/٤/٣)ولێدانی یەكێتی لەسەریەوە.
- دوای پـەلاماردانی سـەركردایەتی ، ئینجـا پـەلاماری مەڵبەنـدی(١)سـلێمانی و گەرمیان وكەركوك وپاشان مەڵبەندی(٤)ی هەولێر بدات.
- ئەگەر هێرشی توندی ئێران لە خوارو و ناوەڕاستی عێراقەوە زۆری بـۆ هێنـا ، بـۆ ڕاگرتنی شەڕەكە لەو ئاستەدا ، خۆی بۆ ڕاگرتنی شەڕ لەگەڵ ئێران ئامادە بكـات و بە هەموو هێزیەوە خۆی تەرخانكا بۆ لێدانی دوژمنی ناوخۆی بە تایبـەتی ، كـە بـەو ڕێكەوتنـەی ئێـران و یـەكێتی یـەكگرتنی ڕیزەكـانی هـەموو حزبـە كوردستانیەكان لە بەرەیەكی كوردستانیدا هاتەدی.
- ڕژێمی عیراق لە قۆڵی سلێمانیەوە نەخشەی گرتنی ڕێگای قەیوان – ماوەتی دانـا و هێرشەكانی لە ناوەڕاستی مانگی١٩٨٦/٨، لەم قۆلانەوە دەستپێكرد:

١- قۆڵی ڕانیه - قەڵادزە بەرەو ناوچەی مەرگە و سیروان و شاخی ئاسۆس بۆ گرتنی ڕێگای مەرگە وشاخەکانی ئاسۆس وکورکور و بەستنەوە بە سەفرە و زەروونەوە تا ڕێگای کشانەوەی یەکێتی لەو قۆڵەوە بەرەو ئێران ببڕێ.

٢- لە قۆڵی دوکانەوە بەرەو ڕکاوا و تۆپزاوا وجوبلاخ و شارستێن و سیدەر و گرتنی دۆڵی جافەتی و لێکدانەوەی ئەودۆڵە بە جادەی قەیوان - ماوەت.

٣- لە قۆڵی دوکانەوە بەرەو زنجیرە شاخی سارا و کەپرەو کونتێ و قەمچوغە و سورداش وشەدەڵە و دۆڵی مێرگەپان و گرتنەوەی شاخی چەرماوەندی پشتی بەرگەڵو وسەرگەڵو هەڵەدن و یاخسەمەر و چوخماخ بەستنەوەی بە ڕێگای قەیوان ماوەتەوە.

٤- لە سارداوی سلێمانیەوە بەرەو سەری قەیوان و دۆڵەڕووت و جادەی ماوەت و گرتنی قەیوانی گەورە و بچوك و موکەبە و کارێزە و کاپیلۆن و گەڕەدێ و کونەماسی و دۆلبیشك و ماوەت و لێکدانەوەی لەگەڵ هێڵەکەی سەفرە و زەرون.

واتە ئابلۆقەدانی سەرجەم بنکەکانی سەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسی و بارەگای مام جەلال ومەکتەبەکانی عەسکەری ، دارایی، کۆمەلایەتی و ناوەندی کۆمەڵە و ڕاگەیاندن و سەرکردایەتی شۆڕشگێڕان و ڕێکخراوەکان و هێزەکانی سەرکردایەتی. کە هەموویان کەوتبوونە ناو ئەو ئەڵقەیەی ئابلۆقەیەوە ، کە ڕژێم نەخشەی بۆ کێشا بوو، لە گوندەکانی بەرگەڵو، سەرگەڵو، هەڵەدن ، یاخسەمەر ، چوخماخ ، مالومە، چالاوە ، گەورەدێ ، گەڕەدێ.

یەکێتی هەموو هێزەکانی مەڵبەندی(٢) ونیوەی تیپەکانی مەڵبەندی (٤/٣/١)ی بەکارهێنا بۆ شکانەوەی هێرش وپەلامارەکانی ڕژێم لە هەموو قۆڵەکانەوە بە تایبەتی هێرشە زۆر گەورەکەی ڕێگای قەیوان - ماوەت ودۆڵەڕووت . ئەم شەڕانە وەك چاوشارکێی لێهاتبوو ، ئەو شوێنانەی ڕژێم بەڕۆژ دەیگرتن ، بە شەو پێشمەرگە ئەیگرتنەوە . شەڕەکە درێژەی کێشا نزیکەی(٢) مانگی خایاند، لەو ماوەیەدا یەکێتی پێشبینی خۆی بۆ چۆڵکردن کرد ، کەوتە گوێزانەوەی دەزگای دارایی و دەزگای ڕاگەیاندن و ڕاگەیاندنی کومەڵە و دانانی ئیزگەیەکی یەدەگ لە دۆڵەتوو. لە ڕاستیدا بە

پێویستم نەزانی لەم کتێبەدا باسی شەڕ و چالاکیەکانی پێشمەرگە شەڕ وکوژراو و گرتن و کۆمەڵێ بابەتی تر بکەم ، کە پەیوەندی بە کاروباری پێشمەرگانەوە هەبێ جگە لە پێشەکی شەڕەکانی جودی یەکەم و دووەم یان کارەساتی هەکاری یان شەڕی بێتواتە ئەویش لەبەر ئەوەی زۆر کەسایەتی پێشمەرگەی شۆڕشی نوێ و تا دوای راپەڕین لە مەفرەزە سەرەتاییەکان و ساڵەکانی(٧٨/٧٧/٧٦) وە کاری پێشمەرگانەیان کردوە و لە پێشمەرگەییەوە بۆ فەرماندەی مەفرەزە و سەروتر تا لێپرسراوی عەسکەری مەڵبەندەکان و مەکتەبی عەسکەری و سەرکردایەتی یەکێتیش رۆیشتون ، ئەو بەڕێزانە درێخیان لە نوسینەوەی شەڕەکان و چالاکیەکان و دەسکەوتەکان و نوسینی ناوچەکان ودێهاتەکان نەکردووە و هەریەك بە پێی توانای خۆی یادەوەریەکانی خۆی نوسیوەتەوە و بێ سودیش نەبون ، بەڵکو بە پێچەوانەوە هەر یەکەیان بۆشاییەکی مێژووی گەلی کورد و شۆڕشی نوێ و یەکێتی و کۆمەڵە و شۆڕشگێڕان و بزووتنەوە و حسك و پارتی و پاسۆك و حزبی شیوعی و پارتی گەل وئەوانی تری پڕکردۆتەوە. هەیە بە شێوەی سەرد وگێڕانەوە ، هەیە قۆناغ بەندی کردوە ، هەیە زۆربێ لایەنە و، هەیە کەم ، هەیە ئەکادیمیانە بە لێکۆڵینەوە وسەرچاوە و دیکومینت ، هەیە بە بیری تیژی خۆی نوسیوەتیەو یان باسی لێوەکردووە.

## ١٠-٣. دوایین کارم لە شۆڕشدا لەناو وڵات.

دوای تەواوبوونی لێکۆڵینەوەکانی مەلا بەختیار و ئەوان و لەسەر داوای مام جەلال لە ڕێکخراوی کۆمەڵەوە گوێزرامەوە بۆ ئەندامی مەکتەب عەسکەری ، ئەو جێگۆرکێیەم زۆر پێناخۆش بوو ، لەبەر ئەم هۆیانە:

١- حەزم زۆر لە کاری ڕێکخستن وڕێکخراوەیی بوو، هەم ئەزمون و شارەزایشم لەو کارە هەبوو.

٢- کە ئاڵوگۆڕ لە مەکتەبی عەسکەریدا کرا بوو، هەندێ کەسی تیا دانرا بوون بە ڕاستی شایستەی فەرماندەی مەفرەزەش نەبوون؟ هەندێکیشیان پیاوی عەسکەری

وئەکادیمی عەسکەری وهەندێ قاڵبوی پێشمەرگانە بوون. لە ناشایستەکان (مولازم فوئاد هەولێری، قەلأتی بوو لە پارتیەوە بۆ یەکێتی وپاشان بۆ حسك وجارێکی تر بۆ یەکێتی بازبازێنی کرد بوو، هەر جارەش کۆمەڵێ چەکی لایەنەکەی دەبردو دەیفرۆشت و هەرگیز عەسکەریش نەبوو . لە شایستەکانیش (مولازم شێردڵ حەوێزی، سەلاح چاوشین، عەلی بچکۆل)بوون . ئەم ئاڵوگۆڕەی لە مەکتەبی عەسکەری کرا بوو ، پەیوەندی بەتورە بوون و وازهێنانی(مولازم عومەر) لە مەکتەبی عەسکەری لەسەر مەلا بەختیار هەبوو.

٣- مام جەلال خۆی ڕاستەوخۆ بوو بە لێپرسراوی(م.ع) من ئەزمونی زۆر و کۆنی ئیشکردنم لەگەڵ مام جەلال هەبوو ، حەزم نەدەکرد لە دەزگایەکدا کار بکەم کە تەماسی ڕاستەوخۆی بە مام جەلالەوە هەبێ . لە (م.س)وە تا پێشمەرگەی مەفرەزە ودەستەکەی خۆی.

٤- ماوەی پتر لە١٠ ساڵ لەناو شۆڕشی نوێ و ٧ سالیش شۆڕشی ئەیلولدا بووم ، بەلأم هەرگیز داوای کاری عەسکەریم نەکردوە و نەش کراوم، جگە لەو شەڕانەی کە بە ناچاری تووشم هاتبێ بەشداریم تیا کرد بێ . هەر بۆیەش چوومە لای ناوەندی کۆمەڵە و نا قایلبوونی خۆم پێ ووتن ، نەوشیروان ووتی: مام جەلال سور بووە لەسەر داواکەی و لە دابەشکردنی کارەکانی (م.ع) کاری لێپرسراوی سیاسی هێزی پێشمەرگەی بۆ دیاری کردویت . لە ناوەڕاستی مانگی(١٩٨٦/٥) چوومە (م.ع) و مام جەلال یەکەم کۆبونەوەی بە هەموومان کرد و پێی ڕاگەیاندین کە هەموومان هەر یەکە لە کاری خۆیدا سەربەخۆیە و بۆتان هەیە هەر چ پێشنیار و داوایەك و گلەییەکیشتان هەبێ ئازادانە لە گەڵمدا بدوێن ومنیش بەڵێنتان ئەدەمێ پشتیوانی سەرکەوتنتان بکەم ، هەر لەو کۆبونەوەیە (کاك عەلی بچکۆل) دەمی کردەوە پێشنیار بکا ، هێشتا قسەکانی ڕستەیەکی تەواو نەکرد بوو مام جەلال بەسەریدا تەقیەوە . ئێمە هەموومان بێدەنگ ومن لای خۆمەوە زۆر دەمێ بوو لەوە گەیشتبووم ، کە مام جەلال بەرپرس

بوو، کەس هیچ نیە. کۆبونەوە زۆر بە کورتی تەواو بوو ، چونکە مام جەلال هەموو قسەکانی خۆی کرد و ئێمەش کەسمان یەك ووشەشمان نەووت . دوای کۆبونەوە بە منی ووت: بمێنەرەوە ، مامەوە و پێی ووتم:" تۆ ئیشەکەی خۆت باش دەزانی کە لێپرسراوی سیاسی هێزی پێشمەرگەی کوردستانی ، ئەو کارە هی ئاستی ئەندامی مەکتەب سیاسیە. ئەرکەکانی تۆ دوو شتە:

١- جەولەیەك بدە بەناو مەڵبەندو تیپەکاندا بۆ بینینی لێپرسراوی سیاسی مەڵبەندەکان و رابەری سیاسی تیپەکان و زانینی کێشەکانیان ، چ لەگەڵ سەرتیپەکان و چ لەگەڵ پێشمەرگەکان؟.

٢- دوای تەواوکردنی ئەو کارەت ، کە گەڕایتەوە کار بۆ دەرکردنی گۆڤارێکی تایبەت بۆ ناو هێزی پێشمەرگە دەکەیت ، لە (١٩٨٦/٦/١) لە مەڵبەندی(٢) وە کە لە خۆمانەوە نزیك بوو، دەستم بە کارەکەم کرد ، پاشان چووم بۆ مەڵبەندی(٣) و دواتر بۆ مەڵبەندی(٤) و پاشان بۆ بەری قەرەداغ و بۆ مەڵبەندی(١) ئەوکاتەی چوومە مەڵبەندی یەك مەڵبەند هێرشیان کرد بووە سەر ناحیەی سەنگاو و گرتبوویان، هەواڵ وا گەیشت بووە مام جەلال ، کە دوای گرتنی سەنگا و ناحیەکە تالآنکراوە بە ماڵی خەڵکەکانیشەوە ، سامان گەرمیانی کە لەگەڵ رۆستەم مەسئول عەسکەری مەڵبەندەکە بوون ، سامان عاجز ببوو چوو بووە سەرکردایەتی و لە ریگەی (ئەبوشەهاب- ئیحسان) راپۆرتێکی دوور و درێژی دابوو بە مام جەلال من ، کە چوومە مەڵبەندەکە و کۆبونەوەیەکم لەگەڵ مەڵبەند کرد ، لەسەر راپۆرتی رابەر سیاسیەکان و پاشان تایبەت لەگەڵ (کاك شەوکەتی حاجی موشیر)دانیشتم و ئاگادارم کرد ، کە هەوڵدەن شتەکانیان بگێڕنەوە بۆ خەڵکەکە، یان بە لیستەیەك بیدەنە (م.س) و وەعدی دا وا بکات. هێشتا لە مەڵبەندەکەیان بووم ، مام جەلال بروسکەی بۆ کرد بوون کە ( شەوکەتی حاجی موشیر و ئاوات عەبدولغفور و مامۆستا ساڵەح و رۆستەم) بچنە سەرکردایەتی، من پێش ئەوان گەڕامەوە سەرکردایەتی و راپۆرتی

سیاسی خۆم ، كە پەیوەندی بە كارەكەمەوە هەبوو سەبارەت بە ڕای ڕابەر سیاسیەكان و خواستەكانیان و گلەییەكانیان و كێشەكانیان لەگەڵ هەندێ لەسەر تیپەكان دا بە مام جەلال ، لە عەسردا مام جەلال داوای كرد بچمە لای (مامۆستا نازم ، قادری حاجی عەلی ، عەلی بچكۆل ، شێردڵ حەوێزی) لە لابوون . مام جەلال ووتی:
" ئەمە ڕاپۆرتی جەولەكەتە ؟"
ووتم: بەڵێ.
ووتی: ئەم ڕاپۆرتەم قبوڵ نیە ، ئەمەوێ ڕاپۆرتێكم بۆ بنوسی كێ پیاو خراپی كردوە ؟ كێ دزی كردوە ؟ كێ....كردوە ؟ كێ تالآنی كردوە ؟.
منیش پێم ووت: (ئەوە كاری من نیەو من پەیوەندیم بە دزی و.....تالآنی كەسەوە نیە . بەڕێزت سەدان كەس لە هەموو ناوچەكان نامەت بۆ دەنێرن و هەموو شتێكت بۆ دەنوسن كە زانیاری ئەوان لە ڕاپۆرتی من زۆر زیاتر دەبێ؟.
مام جەلال توڕە بوو، ووتی: دەبێ بینووسی .
ووتم : من ڕاپۆرت لەوانە نانوسم ، چونكە ئیشی من نیە.
مام جەلال زۆر توڕە بوو، ووتی: واللە یان ئەو ڕاپۆرتە دەنوسی یان من سكرتێری گشتی نابم یان تۆ لەم شۆڕشەدا نابی.
مانگی (١٩٨٦/٧) لە دەزگای دارایی بووم ، عەسر بوو، شەهید شەوكەتی حاجی موشیر و ئاوات عەبدولغفور ومامۆستا ساڵەح و ڕۆستەم )هاتنە ژوورەوە، دوای سەلام و بەخێرهاتن، شەوكەت ڕووی كردە من، ووتی: "كەم خزمەتمان كردی؟ تۆ بەڵێنت بە ئێمە نەدا كە شتەكان بگێڕینەوە ڕاپۆرتمان لەسەر نەنوسی؟".
مامۆستا نازم دانیشبوو، من وەڵامی شەوكەتم نەدایەوە، مامۆستا نازم تەواوی گفتوگۆی نێوانی من ومام جەلالی بۆ باسكردن، ئەوسا هەر چواریان داوای لێبوردنیان لێكردم ، بۆ بەیانی هەر چواریان چوون بۆ لای مام جەلال، هەموو سەركردایەتی و بارەگاكان و تەنانەت پێشمەرگەكانی سكرتاریەتی مام جەلال وایان دەزانی مام جەلال

چەكیان دەكا و دەریاندەكا، بە پێچەوانەوە هەر چواریانی بۆنـانی نیـوەڕۆ لای خـۆی دەعوەت كرد ویەكی ڕادیۆیەكی (S.S.B) و دەمانچەیەكی چواردەخۆری دانیّ ، عەسر گەڕانەوە دەزگای دارایی. من دوو ڕۆژ دوای چوونی ئەوان بۆ لای مام جەلال و لەسەر ئەوەی ڕاپـۆرتم لەسـەر نەنوسـن بڕیـاری نـەمانم لـە (م.ع) دەرچـوو، پـاش(١) هەفتە مام جەلال ناردی مەفرەزەكەم چەك كـەن و چـەكەكان هـی ڕێكخـراوی كۆمەڵـە بوو، ڕێكخـراو ڕێگـەی پێـدام ، كـە بـە مەفرەزەكـەوە لەگـەڵ خۆمـدا بیبـەم بـۆ(م.ع) چەكەكانم دا بە ناوەندی كۆمەڵە و ناوەندیش(٢) پێشمەرگەی بێ چەكەوە لەلا دانـام ، لە مانگی (١٩٨٦/٧) تامانگی (١٩٨٦/١٠) بێكار لە خانویـەكی چـۆڵ لـە یاخـسەمەر و پاشان لەناو خەیمەیەكدا لە نێوان یاخسەمەڕ و چوخماخ بووم ، لەوماوەیەدا چەندجار (م.س)ئاگاداریان كردم ، كە مام جەلال بڕیاریداوە بمینێریّ بۆ خـارج ، مـن قایـل نـە دەبووم ، دواجار فەرەیدون عەبدولقادر هاتەلام ، ووتی:" مام جەلال بـە هـیچ جـۆریّ قایـل نیـە بمێنیتـەوە، ئێمـە و مـام جـەلال بڕیارمانـداوە لەگـەڵ .د.خەسـرەو خـاڵ ، د.كمال خۆشناو بتنێرینە دەرەوە، لەبـەر ئـەوەی هێرشـەكان زۆر تونـدن وتـۆش دوو برات شەهید بووە، باوكت جاش بە سەیارە لێیانداوە ، با تۆشیان لە دەست نەچیت ، تۆ دەنێرین بـۆ ئـەڵمانیا ، د.خەسـرەو بـۆ سـوریا، د.كمـال خۆشـناو بـۆ لیبیـا ، وەك نوێنــەری ســەركردایەتی بــۆ "كاروبــاری پەیوەندییــەكان"مــن بــڕوام بــە بەڵگــە وبۆچوونەكانیان نەبوو ، چونكە:

١-من زمانی ئینگلیزی وزمانی ئەڵمانیم نەدەزانی ، تا كاری پەیوەندییەكان بكەم.

٢- من هیچ تەماحێكم لە خارجدا نەبوو لەبەر ئەوەی:

- لاوێك یا گەنجێك نەبووم حەز بە خەیاڵی ئەورووپا بكەم.
- كورە دەوڵەمەندێك نەبووم پارەكانی باوكم لە دەرەوەسەرفكەم.
- هیچ پارەیەكی شۆڕشم نەبرد بوو ، لە دەرەوە خەرجی كەم.

– له ته‌مه‌نیشدا له‌و ته‌مه‌نه نه‌بوم ، که ئاره‌زووی خوێندن وه‌رگرتنی شه‌هاده‌م هه‌بێ.

– خاوه‌نی سێ منداڵیش بووم، له پۆله‌کانی سێی ناوه‌ندی ویه‌کی ناوه‌ندی و پێنجی سه‌ره‌تایی بوون و سه‌ریان لێده‌شێوا.

به فه‌ره‌یدونم ووت: "هه‌ر سورن له‌سه‌ر شۆڕش به ده‌رکردنم و هیچ ڕێزێك بۆ گۆڕی ئه‌و دوو شه‌هیده‌ی په‌یمانه‌که‌ی نێوانمان ناده‌ن، کاتی خۆی دامان به‌یه‌ك ، که‌ که‌سمان شۆڕش به‌جێ نه‌هێڵین؟".

فه‌ره‌یدون ووتی:ئه‌وه بڕیاره گه‌ر ده‌ته‌وێ وه‌ڵام بۆ شوکری ومناڵه‌کان بنێره با بێنه یاخسه‌مه‌ڕ و پێکه‌وه بڕۆنه سه‌رده‌شت و له وێشه‌وه بۆ تاران ،و مام جه‌لال، د.که‌مال فوئادی ڕاسپاردوه که ڤیزه‌ی ئه‌ڵمانیای ڕۆژهه‌ڵاتتان بۆ وه‌ربگرێ و کاك ره‌فعه‌تیش له تاران لیزه پاستان بۆبکا.*

## چونمان بۆ تاران و گه‌ڕانه‌وه‌م بۆ یاخسه‌مه‌ڕ.

ماوه‌ی دوو– سێ مانگ له سه‌رده‌شت ماینه‌وه و پاشان چووین بۆ ڕه‌زاییه بۆ سه‌ردانی ماڵی ئه‌بوشه‌هاب فه‌ره‌یدون و پاکیزیش هاتن بۆ ماڵی ئه‌بوشه‌هاب. گه‌ڵ فه‌ره‌یدون چووین بۆ ڕاژان فه‌ره‌یدون نوێنه‌ر بوو بۆ گفتوگۆ له‌سه‌ر ووردەكاریه‌کانی ڕێکه‌وتنی مام جه‌لال و ئیدریس بارزانی له (١٩٨٦/١١/٨) له‌گه‌ڵ سه‌رکردایه‌تی

---

* له(٨٦/١٠/١٢)ناردم به‌دوای مناڵه‌کانمدا، ئه‌م کاره گرفتێکی خێزانی بۆ دروست کردم ، که شوکری نه‌یده‌ویست بڕۆین بۆ ده‌ره‌وه و منیش ناچار بووم ئه‌بێ بڕۆین.

له (٨٦/١٠/٢٩) له ژێر تۆپبارانی به تیندا به سه‌فره و زه‌رووندا به‌ره‌و سه‌رده‌شت ڕۆیشتین و پاشان د.خه‌سره‌و، د.کمال وشێرکۆ بێکه‌سیش هاتنه سه‌رده‌شت و نه‌وشیروانیش دواتر هات بوو چوو بوو بۆ تاران.

پارتیدا. بەیانی هێشتا هەتاو هەڵنە هاتبوو بڕیار بوو ئێمە بڕۆین و ماڵی ئەبوشەهاب و فەرەیدون ومنیش لە ماڵی ئەبوشەهاب بچینە دەرەوە، بۆ ئەوەی لە بۆمبارانی فڕۆکەی عیراقی دوور بین، من و فەرەیدون لە ڕەزاییە دەرچووین بەرەو ڕاژان، هێشتا ماوەیەکمان مابوو بگەینە ڕاژان، خەڵکێکی زۆرمان لەم بەروئەوبەری ڕێگاکە بینی بە لە خۆدان و گریانەوە بەرەو ڕاژان دەچوون، پرسیارمانکرد، ووتیان: ئەمشەو ئیدریس بارزانی بە وەستانی دڵ مردوە. هێشتا نەگەیشتبووینە ڕاژان گوێمان لە زرمە و ناڵەی بۆمبابارانی ناو ڕەزاییە بوو، لە باتی گفتوگۆ چووین بۆ تەعزیە ، کە گەڕاینەوە ڕەزاییە ، بۆمبا لە خانوەکەی ئەبوشەهابی دابوو ، قاتی سەرەوەی داتەپاند بوو ، پڕوپاگەندەی ڕژێمی عیراقی دوای ئەوە بلاوی کردەوە کە ئیدریس بارزانییان بە تۆپ باران کوشتووە. لە مانگی(١٩٨٧/٣) کاك ڕەفعەت جوابی ناردین بچینە تاران وچاوەڕیی هاتنی ڤیزەکەمان بکەین. لە (١٩٨٧/٤/١٢) کاك ڕەفعەت خەبەری دامێ، بچمە ئوتێل پارس، ئەوسا ڕەفعەت لێپرسراوی مەکتەبی پەیوەندی یەکێتی بوو لە تاران. کە چووم کاك ڕەفعەت ووتی: ڤیزەکانتان هاتوە دەتوانن بڕۆن ، بەلام بروسکەیەکی بە پەلەی مام جەلالیش هاتووە، کە هەر ئەمڕۆ بگەڕێتەوە سەردەشت و لە وێشەوە بۆ بنێوخەلەف ، مامۆستا نازم ببینە تا هەموو کارئاسانیەکت بۆ بکات بچیتەوە یاخسەمەڕ بۆ لای مام جەلال هەر ئەو ڕۆژە لە تێرمیناڵەوە بە ڕێکەوتم بۆ سەر دەشت، لە سەردەشتەوە چوومە بنێو خەڵەف ، چوومەلای مامۆستانازم و ڕاسپاردەکەی مام جەلال و ڕەفعەتم پێگەیاند ، ماموستا نازم ووتی: من هیچم پێناکرێ ، چونکە هەموو ڕێگاکان گیراون و تۆش لە من شارەزاتری لەم ناوچەیە و قەلادزێ وسەنگەسەریش ، بە هەر حاڵ لە ڕێگەی مەلا حەسەنی حزبی دیموکراتەوە ، کە بارەگایان لە سونی بوو ، لەگەڵ ڕژێمی عیراق کۆك بوون، بە سەیارەی ئەوان تا قەلادزە و لەوێشەوە چوومە سوڵتانە دێ وبەشەو لە زێی سندولان پەڕیمەوە، هەر بەشەو بەسەر ئاسۆس کەوتم ئاودیوی مەرگە بووم و لە وێشەوە بەرەو بەرگەڵو و

یاخسەمەڕ . مام جەلال زەرفێکی گەورەی دیکۆمێنتی دامێ ، بۆ ئەوەی لەگەڵ خۆما بیبەمە ئەڵمانیا و بیدەم بە نەوشیروان ، دیکۆمێنتەکان هی ناردنی ئەو چەردە پارەیە بوو ، کە (حەمە میرزای) محاسیبی بانکی ڕافیدەینی بەغداد بە وەجبە وەجبە ڕەوانەی سویدی کرد بوو ، بۆ سەر حسابی یەکێتی ، کە (د. عومەرشێخموس) لەوێ وەری بگرێ ، بەڵام حکومەتی عیراقی دوای ڕاکردنی (حەمە میرزا) بۆ یاخسەمەڕ بە یاسا ،ئەو پارەیەی لە بانکی سوید هەڵپەسارد بوو ، دەبوایە ئەو دێکۆمێنتانە ببرایانەتە سوید تا لەوێ لە ڕێگەی پارێزەرەوە پارەکەی دەست کەوتایە.

ڕۆژی١٤/٤/١٩٨٧ فڕۆکەکانی ڕژێم دۆڵی جافەتیان بە گازی کیمیاوی بۆردومان کرد ،بەڵام زۆر بە کەمی قوربانیمان بەخشی، ئەوکاتە گەرمە و کۆتایی داستانی ڕزگاری بوو ، هەموو مەڵبەندەکان بەشداریان لە ڕزگار کردنی ئەوناوچانەی کرد ، کەوا ڕژێم بە شەش مانگ و بە سەدان هەزار جاش و سەرباز و دەیان کۆپتەر و فڕۆکەی جەنگی و تۆپ و دەبابە گرتبووی ، پێشمەرگە لەو داستانەدا هەموو ناوچەکانیان لە دوکانەوە تا چوارتا وسلێمانی هەموویان لە (٩/٤تا ١٤/٤/١٩٨٧) ڕزگار کرد.*

پاش بەجێهێنانی ئەرکەکانم گەڕامەوە تاران و ڕۆژی(١/٥/١٩٨٧) گەیشتینە بەرلینی ڕۆژهەڵات ، ئەو ڕۆژە جەژنی کرێکاران بوو، لە بەرلین ئاهەنگی ئەو جەژنە دەگێڕدرا . لە ڕۆژی(٣/٥/٨٧) د.کەمال فوئاد بەدواماندا هات و سەعات هەشت شەو لەگەڵ خۆی بردینی بۆ بەرلینی ڕۆژئاوا ، کە هەموو سنورەکەیان (٢٠) مەتر نەفەق بوو ، لەوێ نەوشیروان وسەلاح ڕەشید لە قاوەخانەیەك چاوەڕێیان دەکردین . پاش ئەوەی دێکۆمێنتەکانم دا بە نەوشیروان ، ئێمەیان برد بۆ شوێنێك پێیان دەگوت:" کەمپی پەنابەر،لاگەر".

---

* ڕۆژی ١٤/٤/ ١٩٧٨، کە بە چەکی کیکیاوی لە ناوچەکانی سەرکردایەتی درا، خۆم لەگەڵ سەلاح چاوشین لەوێ بووم.سەلاح ووتی: ئەم حکومەتە کەرە؟ وائەزانێ بەو کیمیاویە دەمانکوژێ. نازانێ ئێمە وەك مێشولەی مەلاریا ئەوەندەمان"دی،دی،تی" پیاکراوە مەناعەمان بەرامبەر هەموو کیمیاویەك وەرگرتوە.

### ٤-١٠. ڕێکەوتنی بەرەی جود و یەکێتی.

دوای نزیکەی (١٠) ساڵ شەڕی ناوخۆ لە شۆڕشی نوێدا ، لە ماوەی (٦) مانگدا هەم بە هەوڵی هەموو لایەنەکان وهەم بە شەقی زەمانە ئاشتیەك و ڕێکەوتنێکی ناولایەنەکان چی بوو ، تا بەرەیەکی کوردستانی هاوخەباتی ڕاستی تیا لە دایکبوو، بەر لەوەی بێمە سەر باسی مێژووی ڕێکەوتنەکان و چۆنیەتی ڕێکەوتنەکان ، بە پێویستی دەزانم هەندێ لەسەر فاکتەرە کاریگەرەکانی شەڕی براکان شەڕی ناوخۆ شەڕی کورد بە کورد بە کوشتدان شەڕی براکوژی وخۆکوژی باس بکەم:

### فاکتەرە ناوەکیەکانی دروستکەری شەڕ لە ڕووی سیاسیەوە.

١- لە دوای ئاشبەتالی ساڵی ١٩٧٥بۆشاییەکی سیاسی و پێشمەرگانە لە کوردستاندا دروست بوو، بێ هیوایی دڵ و دەروون وبیری هەموو کوردێکی داگیرکرد بوو ، مۆتەکەی ڕەفتار و سیاسەتی شۆڤێنیانە وفاشیانەی بەعسیان چۆکی لەسەر سنگی هەموو کوردێکدا دابوو . ساڵێك دوای ئاشبەتاڵ یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بە دەستپێشکەری کۆمەڵەی مارکسی – لینینی کوردستان ، پەردەی ترس و بێدەنگی دادڕی و بانگی شۆڕشی نوێی بەگوێی جەماوەری کوردستان وبەعسیە فاشیەکان دا.

لە مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٧٦ تاکو سەرەتای ساڵی ١٩٧٨ تاکە هێز و دەسەڵاتی چەکداری کوردستان بوو . ئەم دەستپێشکەریەی بە سەروەریەکی گەورەی خۆی دەزانی و هەر بۆیەش ناوی لێنا (شۆڕشی نوێ) و هەرگیز بە ئەڵقەیەکی شۆڕشی ئەیلولی نە دەزانی . کۆمەڵە کە ناوکی شۆڕشی نوێ بوو، خاوەنی مەفرەزە سەرەتاییەکانی پڕوپاگەندەی چەکداری (مفارز الدعایە المسلحە) بوو ، لەلایەك و یەکێتیش لەسەر بنەمایەکی شۆڕشگێڕی ودیموکراتی خۆی دارشتبوو . وەك خۆی لە یەکێتی نیشتمانی بۆچی– الأتحادالوطنی الکردستانی –لماذا؟ دا ، دەڵێ: "لم یکن الأتحاد الوطنی الکردستانی ولیدا لأستعجال و الأرتجال ، بل کان حصیلة أختمار فکرة

ثورية واقعية من طبيعة الحركة التحررية للشعب الكردى التى توجد منها تيارات و أتجاهات ديموقراطية و تقدمية و يسارية عديدة لايستطيع حزب واحد أستعابها جميعاً....... هذه المستلزمات التى يجمعها القانون العلمى العام الذى يقول بوجوب ، وجود حزب طليعى و أتحاد وطنى القومى الشعب الديمقراطية، و جيش الشعبى ، على أن يقودها مثل هذا الحزب الطليعى". *

هەرواش کۆمەڵەش بە هەمان بۆچوونی ، خۆی بە حزبی پێشڕەو و یەکێتی بە بەرەی یەککگرتوو پێشمەرگەی بە سوپای یەککگرتو، بیری دەکردەوە . ئەوەتا کۆمەڵەش لە بڵاوکراوەی "ئالأی شۆڕشی ژمارەیەك" و بەیانی (کۆمەڵەی مارکسی –لینینی کوردستانی عیراق– کۆمیتەی هەرێمەکان لە ڕۆژی١٩٧٦/٩/٢٥دا ، دەڵێ: " بەم جۆرە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان وەك شێوە بەرەیەکی نیشتمانی بە ڕابەرایەتی کۆمەڵەمان....و گەشەکردنی هەر دووکیشیان و بردنیان بەرەو هێنانەدی پارتی پێشڕەوی ڕاستەقینە، و بەرەی نیشتمانی ڕاستەقینەو....هێنانەدی هێزی چەکداری شۆڕشگێڕی ....موتوربە کراو بە بیروباوەڕی (م.ل) بۆ لە دایکبوونی حزبی پێشڕەو...."** ئا لەم ڕوانگەیەوە یەکێتی وکۆمەڵە "سەرەتا پیرۆزەکانی سەرکەوتنی شۆڕشی ڕزگاریخوازی کردبووە قبلەنمای خەباتی سیاسی وچەکداریەکەی کەبریتی بوون لە:

١ـ پارتی پێشڕەو .

٢ ـ بەرەی یەککگرتو.

٣ ـ سوپای یەککگرتوی شۆڕشگێڕی.

---

* الأتحاد الوطنى الكردستانى– لماذا؟، تشرين الثانى١٩٧٥.

** نوسێنەرەکانی هاوڕێ ئارام بە بۆنەی یادی دووساڵەی شەهیدبونی– ناوەندی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان – عیراق، ١٩٨٠/١/٣١،لاپەڕە٥٤.

وای لــە یــەکێتی و کۆمەڵــە کردبــوو ، کــەوا بزانــێ پیــشڕەوی حــزب خــۆی لــە دەستپێشکەری مەفرەزە دروستکردن و هەڵگرتنی تیز و تیـوری (م.ل) دادەنـوێنێ ، بۆیە بەردەوام لە دیدگای خۆ بە پارتی پێشڕەو دەیڕوانیە حزب و هێزە سیاسیەکانی تر ، کە دەبوایە هەموویان خۆیان لەناو جوغزی سیاسەتی ئەو تیز و تیۆرەکانی ئەودا بخولانایەتــەوە، دیــارە ئــەو جــۆرە بیرکردنەوەیــە لــە سیاســەت و شۆڕشــدا لــەو بارودۆخەی کوردستاندا ، لوتی بەر سێ بەردی گەورەتر لە بەردی ئەلحەد دەکەوت:

– شۆڕشـی کوردســتان وخــەباتی گــەلی کــورد ، خــەباتی قۆنــاغی ســەرمایەداری و هەڵتەکانی ژێرخانی ئەو قۆناغە و داڕشتنی بنەمایەکی ئابوری نوێ نەبوو، تا شۆڕشـی چینایەتی و پرۆلیتاری تیـا بـەرپا بکـرێ و پـارتی پێشڕە و ڕابـەری چـین و ووتوێـژە ڕەنجدەرو شۆڕشگێڕەکانی تر بکات.

– قۆناغی شۆڕشـی نـوێ کوردسـتان ، قۆنـاغی ڕزگـاری و نیـشتمانی وسەربەسـتی و نەتەوەیی بوو ، بۆ بەدەستهێنانی مـافی چارەی خۆنوسـین ، واتـە قۆنـاغی شۆڕشـی دیموکراتی بوو، کە لە ڕاستیدا تیز و تیوری پارتی پێشڕەو ، وبەستنەوەی هەموو هێز و حزبەکانی تر بە پاشکۆی سیاسەت و بە بۆچوونی خۆیەوە ، پێچەوانەی بنەماکانی شۆڕشـی دیمـوکراتین ، کـە ڕێگـە بـەبوونی فرەحزبـی و فرەڕێکخراوەیـی و ئـازادی و سەربەخۆی خۆیان لە سیاسەت و بیرکردنەوە و بەرنامەیان دەدا ، نەك لە فاقـەدانیان بە فاقەی پێشڕەوی.

– لە ڕووی فەرهەنگیەوە نە یەکێتی و نە کۆمەڵە و نە هیچ کام لە حزبەکانی تـر لـەو ئاستە هوشـیاریەدا نـەبوون ، کـە پێشڕەوایەتی پـڕبـە پێـستی خـۆی بـەکاربێنن بـۆ یەکگرتنی هەموو حزبەکان و هەموو ڕیزەکانی گەل ، بۆ یەکپێگرتنی هەموو دروشـم و ئامانج و خواستەکانی شۆڕش ، بۆ داڕشـتنی نەخـشەی دووری هاوبـەش بـۆ ئاینـدەی شۆڕش، بۆ یەکپێگرتنی هێزی پێشمەرگەی کوردستان و بە یەك چـاو سـەیرکردنیان ، وەك یــەکیان لــە مــاف وئەرکـدا ، بـۆ لابـەلا کردنــەوەی و چارەســەری کێـشەکانی

چینایەتی وکۆمەڵایەتی و فکری و سیاسی نێوانیـان بـە ڕێگـای دیـالۆگی برایانـە ، بـۆ تێگەیشتن لە مانا و ناوەڕۆك وگەوهەری ناکۆکی ، ناکۆکی سەرەکی ناکۆکی لاوەکـی. بەڵکو وا لە پێشڕەوایەتی گەیشت بوون ، کە دەبێ کوێخا و میر محی و برا گەورەبن.
٢- پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان ، خۆیـان بـە پاشمـاوەی یـان درێـژکراوەی پـارتی دیموکراتی کوردستانی چلەکان و پاش ئاشبەتاڵ و قیادەی مورقەتە دەزانی ، خۆیان بە خاوەن و میراتگری شۆڕشی ئەیلول و ئەم شۆڕشـە نوێیـەش دەزانـی ، کـە ناویـان لێنا بوو "شۆڕشی گوڵان" ، کوڕانی مەلا مستەفا، خۆیان بە میراتگری مەلا مـستەفا و ڕێبـازی بـارزانی و خـاوەنی کوردسـتان و شـۆڕش و بـاوکی میللـەتی کـورد دەزانـی . ئەمانیش لایان وا بوو تا یەك کەس لەو بنەماڵەیە بمێنێ ، دەبێ سیاسـەت وشـۆڕش و ڕابەر و پیـشڕەوایەتی بـە فـەرمانی ئـەوان و بـە سـەرکردایەتی ئـەوان بـەڕێوە بـبرێ. هەمیشە هەر سەرۆکی کـورد و بـاوکی کـورد و ڕابـەری کـورد بـن . دیـارە بـەو جـۆرە بیرکردنەوەیە ئەمانیش قایل نەبوون ، کـە ئەلتـەرناتیڤیان بـۆ پەیـدا ببـێ . ئـەمانیش تووشی ئینتەلای پێشڕەوایەتی ببوون و ئەمانیش نەیاندەتوانی خۆیان لـەو نەخۆشـیە ڕزگارکەن . بەڵام ئەمانیش نەیاندەتوانی ببنە پارتێکی پێشڕەو چونکە:
- دەبێ پارتی پێشڕەو متمانەی زۆربەی هەرەزۆری جەماوەری گەل بەدەسـت بێنـێ ، بەڵام ئەمان لە کوردستانی ئێران و تورکیا وعیراقیشدا متمانەی زۆربـەی هـەرەزۆری گەلی کوردیان لە دەستدا بوو.
١- لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان : بەجێ هێشتنی قازی محەمەد و ڕاکردنیان بۆ سـۆڤیەت لێدانی سـەرانی حزبـی دیمـوکرات وکوشـتن و تەسـلیمکردنەوەیان بـە شـای ئێـران لـە شەستەکاندا ، هاوکاریکردنی سوپای پاسداران بۆ لێدانی کۆمەڵە و حزبی دیموکرات لە کۆتایی حەفتاکان و سەرەتاکانی هەشتاکان وحوکمی خومەیینیدا.
٢- لە باکوری کوردستان : سەبارەت بە کارەساتی هەکاری و هاوکاری لەگەڵ میـت ، پاشان لێدانی(پ.ك.ك) لە هەولێر وبادینان لە نەوەدەکان.

٣= له خوارووی کوردستان : شەڕی جەلالی و مەلایی، لێدانی هێزەکانی یەکێتی لەناو تورکیا و لەناو ئێران ئاشبەتاڵی ساڵی ١٩٧٥، پێشڕەوایەتی ڕاستی خۆی لە ناونیشان و تێز و تیور وئایدیای جۆرا وجۆردا نانوێنێ ، پێشڕەوایەتی خۆی لە ڕادەی فیداکاری و خۆنەویستی و فەراهەمکردنی پێویستیەکانی زۆرینەی هەرەزۆری جەماوەردا دەنوێنێ، خۆی لە سووتان بۆ بەرژەوەندی گەل و وولاتدا دەنوێنێ، خۆی لە بە تەنگەوە هاتن و بە پیرەوە چوونی خواست و ویست و بە دیهێنانی داخوازیەکانی گەلدا دەنوێنێ، کە حزبەکە بەدی دەهێنێ ، نەك ئەو شکستانەی کە بەسەر شۆڕش وگەل و وولاتەکەیاندا دەهێنن.

٣- حزبی شیوعی عیراقی: ئەمانیش دانیان بە ڕاستی قەبارەی خۆیاندا لە عیراق و کوردستان نەدەنا، هەر بە خەیاڵی ساڵانی(٥٩-٦٠-٦١) سەیری قەبارەی خۆیان دەکرد، و لە تراویلکەی حوکم گرتنە دەست و ڕیش سپێتی و خۆ بە پێشڕەوی هەموو پرۆلیتارای عیراق و کوردستان زانین، لە خەوی غەفلەتدا گیریان خوارد بوو، تووشی نەخۆشی سەفاو مەڕواکردن لە نێوان ڕژێم و یەکێتی و پارتی ببوون ، ئەمانیش تا بۆیان لوا ، لەگەڵ ڕژێم چەند ساڵێ هەڵیانکرد و پاشان، کە چەقۆی بەعس گەیشتە سەر ملیان ئەوسا هاتنە سەر شۆڕشێکی حازر و ئامادە و دانپیانرا و ناوچەیەکی پان وفراوان و ڕزگارکراو. ئەمانیش لەو ڕووەوەی کە سەر بە سیاسەتی سۆڤیەتی و خۆیان بە نوێنەری سۆڤیەت لە عیراق و نوێنەری گەلانی عیراقیش لەلای سۆڤیەت دەزانی ، خۆیان بە پێشڕەو دەزانی و پێیان وابوو، دەبێ هەموو حزبەکانی تر ملکەچی فەرمانی ڕیش سپێتی ئەمان بن .و لە باتی ئەوەی بە ئەمری واقع قایل بن و هەوڵی یەکخستنی ڕیزەکان و حزبەکان بدەن، بە پێچەوانەوە هەوڵی زیاترکردنی، ناکۆکی نێوان حزبەکانیان دەدا، تا خۆیان لەو بۆشاییە سود وەرگرن و بە ناو پێشڕەوین. ئەمانیش تا بینە قاقا نوقمی تێز و تیوری سۆشیالیست و زانستی و شکودوگمایی ببوون ، بۆیە نەیاندەتوانی لێکۆڵینەوەیەکی ووردی قۆناغەکەی شۆڕش و بارودۆخی

نەتەوەیی کورد و داگیرکاری و ڕاگوێزراوی شار و شارۆچکە و گوندی کوردستان و قەبارە و توانای پرۆلیتاریا و جیاوازی قۆناغی مێژوویی پرۆلیتاریای عیراق و هی کوردستان بکەن، تا بە پێوەری ئەو لێکۆڵینەوەیە و لێکدانەوەیە ، مامەڵە لەگەڵ شۆڕش و حزبەکان و بارودۆخەکە بکەن . بە پێچەوانەوە هەوڵیاندەدا لەسەر توند کردنی ناکۆکیەکانی نێوان حزبەکان بژین و(سوئی أستفادە)بکەن.

٤- حزبی سۆسیالیستی کوردستان (حسك): ئەمانیش پاش جیابونەوەیان لە یەکێتی. دیارە هەموو جیابونەوەیەك سەر ئەنجامی پێکەوە نەگونجان و نە گەیشتنە یەکتر سەبارەت بە نا یەکسانی بوونیان لەگەڵ کۆمەڵە لە ماف ودەسەلأتدا، سەبارەت بە جیاوازی لە بیر و بۆچوون و لە ماکی جیاوازی بەرژەوەندی چینایەتی، سەبارەت بە پیروزناسین و زانینی بەرژەوەندی حزبی ، سەر ئەنجامی جێگۆرکەکردنی دژایەتی بۆ شوێنی دۆستایەتی لێکترازان دروست دەبێ ، سەبارەت بەوەی کە جیابونەوەکەیان لەسەر بنەمای سەرەتاکانی دیموکراتیەت و مافی چارەنوس دیاریکردن و هاوکاری و هاوسەنگەری خەبات لە دەرەوەی یەکێتی و کارکردن پێکەوە لە شێوە بەرەی نەبوو،بەڵکو لەسەر بنەمای لێك زویر بوون ودژایەتیکردن و هەوڵدان بۆ خۆ بەهێزکردن لەسەر حسابی هێزی چەکداری یەکێتی و دەسەلأت بەسەر ناوچەکاندا و پاوانکاری بوو، ئەمانیش لە دەرون و قولایی چاسەتەکاندا ماکی شەڕ و شۆڕیان تیا ڕوا بوو ، چەکەرەی کردبوو.

٥- شەڕی ئێران وعیراق: ئەمەش کارێکی وای کرد بوو ، زەمینەی قەبە بوون و بەهێز بوونی چەندایەتی (نەك چۆنایەتی) بۆ هەموو لایەك ڕەخساند بوو:

ا- سەربازێکی ڕاکردووی یەکجار زۆر لە شەڕەکانی عیراق - ئێران ، هێزێکی مرۆیی زۆر و کەرەسەیەکی مرۆیی باشی ڕەخساند بوو ، کە بەشی هەموو لایەکی دەکرد.

ب- پانی مەیدانەکە و کێشانەوەی ٩٠٪ ڕەبایە و سەربازگەکانی ڕژێمی عیراقی بۆ شەڕی ئێران ، مەیدانی تەراتێنی بۆ هەموو لایەنەکان فراوان کرد بوو.

ج- ئەو دوو هۆیەی سەرەوە ، وای لە هەموو لایەك كرد بوو ، كە هەوڵی پاوانكردنی ناوچەی گەورە و فراوان بدەن بۆ بەخێوكردنی هێزەكانیان و حەوانەوەیان لەسەر ماڵ و خۆراك و بژێوی و سكی جوتیاری دێهاتەكان و خۆبادانیش بەسەریاندا و بەناوی بەرگری لە كوردستان كردن.

د- بارودۆخەكە ئەوەندەی لەبار و یارمەتدەری بیركردنەوە لەخۆ بەهێزكردن و قەبەكردن وخۆ بە كوێخا زانین بوو، نیو ئەوەندە یارمەتیدەری نزیكبوونەوە لە یەكتر و پشتی یەكترگرتن وكەمكردنەوەی قورسایی و ئەرك و ئەزیەتی سەر جوتیاران و دێهاتی كوردستان نەبوو. واتە شەقی زەمانە هێشتا نە هاتبووەكایەوە ، تا بەر پشتەملی هەموو لایەك بكەوێ.

٦- لێدەركردنی وورده حساباتی دوو بەرەكی و براكوژی ساڵانی شەستەكانی نێوان جەلالی ومەلایی ، بەهۆی سەركردایەتی كردنی پارتی لەلایەن كورانی بارزانی و سەركردایەتی كردنی یەكێتیش لەلایەن مام جەلال تاڵەبانیەوە..

٧- نەریتی خۆبەزلزانینی پاشماوەی شۆڕشی ئەیلول لەناو پێشمەرگە و فەرماندەی مەفرەزە و تا فەرماندەی مەڵبەند و لق و سەركردایەتی ، لەناو هەموو لایەنەكاندا بێ جیاوازی ، هەر پێشمەرگە و فەرماندەیەك.لەهەر ناوچەیەك بوایە خۆی بە كوێخا و دەمڕاستی ئەو ناوچەیە دەزانی و هیچ حسابێكی بۆ بوونی بەرامبەرەكەی نەكردوە ، ئەم هۆیە لە هۆیە هەرەگرنگ و ناوەكیەكانی دروستبوونی لێكدان و تەنینەوەی شەڕی نێوان لایەنەكان بووە.

٧- دیارە كە پێشمەرگە و لێپرسراوانی هیچ كام لەلایەنە سیاسیەكان لە وولاتێكی تر و لە گەلێكی تر و كیشوەرێكی ترەوە نەهاتوون ، هەموویان خەڵكی دێهاتەكان و شارەكانن و هەمووشیان تیرە و تایەفە و عەشیرەتیان هەیە و لەناو هەموو گوند و عەشرەتیشا ، كێشەی كۆمەڵایەتی بووە و ناكۆكی كۆمەڵایەتی زەوی و ئاویان لە نێواندا بووە، پێشمەرگەی هەموو لایەنەكانیشیان بووە و جاشیشیان بووە ، و هەر

کاتێك یەکێك لە حزبەکان هەڵسا بن بە لێکۆڵینەوە لە کێشەیەکی نێوان جوتیاران و سزای هەر لایەکیان دابێ خێرا چوەتە پاڵ حزبێکی تر بۆ:

ا- خۆپاراستن لە سزادان.

ب- بۆ تۆڵە کردنەوە لە پەنا حزبەکەدا.

٨- پاك وپیس لێدەرکردن لە پەنای شۆڕش وحزب بە چەکی پێشمەرگایەتی ، ئەم حاڵەتە زیاتر خۆی لە دوژمنایەتی تایبەتی نێوان دوو کەس یان دوو تایەفە یان عەشیرەتدا دەنواند ، کە لە پەنا و لە پاڵ و بە چەکی حزبەکان تۆڵەیان لە یەکتر دەکردەوە.

٩- هێزە سیاسیەکان بۆ قەبەکردنی قەبارەی چەکداری و سیاسی و ڕێکخراوەیی خۆیان، هەرگیز ئامادەی لێکۆڵینەوە و سزادانی کەس و تایەفە و تیرەی تاوانبار نەبوون، نە بادا لەو حزبە ببنەوە و بچنە لای حزبێکی تر، گەر پیاوکوژیش بوونایە، حزبەکەی تر بە خۆشیەوە وەری دەگرتن من بەدرێژایی ١٩ساڵ پێشمەرگەیی و٥٠ ساڵ سیاسەتکردن ، نەمدی ڕۆژێك حزبێك لەسەر کار و کردەوەی بێ ڕەوشتی ، دزی ، ڕاو ورِوت ، ڕێگری، پیاوکوژی یان ژنکوژی ، ئەندامێکی خۆی بانگ کردبێ وبەسزای گەل و شۆڕشی گەیاند بێ بەلاَم دەیانم بینیوە لەسەر جیاوازی بیروڕا و ڕقەبەرایەتی شەخسی و ڕەخنەگرتن ، بە دڵ نەبوون، پاکتاوی لەشی(تصفیەی جسدی)کراوە و کوژراوە و شوێن وونکراوە.

١٠- نەبوونی سەرچاوەیەکی دیاریکراوی تێر وتەسەل و بێ جیاوازی ، بۆ دابینکردنی پێویستیە داراییەکان لە دابینکردنی خۆراك و بەرگ و فیشەك و زەخیرەی شەڕ و چالاکی، جگە لە دانیشتوانی گوندەکان و دەوڵەمەندی شارەکان ، کە هەموو لایەك بتوانن درێژە بە بوونی خۆیان و هێزەکانیان بدەن.*

---

* حەمە خانی حاجی دارای زەڕایەنیش کە شەهید سیروان(فەیسەڵ تاڵەبانی و٧پێشمەرگەی تری شەهید کرد ، یەکێك بوو، لەو بروا پێکراوانی پارتی ودرترین جاشی ڕژێم.

ئەمەش هۆیەکی بەگژداچوون و پێکهەڵپرژانی مەفرەزەی لایەنە جیاجیاکان بووە، بۆ نموونە زۆربەی هەرەزۆری شەڕەکانی لایەنەکان لەناو خۆیاندا لەم شوێنانەدا بووە:

ا- ناوچە ڕانەگوێزراوەکانی وەك دەشتی هەولێر، دەشتی بیتوێن ، دەشتی کۆیە ، دەشتی شارەزوور، دەشتی بازیان ، شاربازێڕ ودۆڵی جافەتی.

ب- هەرگیز لەو ناوچانەی ، کە دەسەلاتبوونی ڕەهای یەك لایەنی تیا بوو بێ ، شەڕ ڕووی نەداوە، وەك ناوچەی قەرەداغ ، گەرمیان ، ناوچەکانی کەلار وکفری ، کە تەماسیان لەگەڵ سنووری ڕژێم هەبووە و هیچ کام لە حزبەکان جگە لە یەکێتی بوونیان لەوێ نەبووە، یان بادینان ، کە جگە لە پارتی دەسەلاتی هیچ لایەن وحزبێکی تری بەسەرەوە نەبووە و ئەو حزبانەی لەوێش بووبن ، هەموویان ڕێزی دەسەلاتدرای پارتیان گرتوە و وەك میوانێکی دالدەدار و ڕەفتاریان کردووە.

ج- یان ناوچە چۆڵکراو و سوتاو و ڕاگوێزراوەکان ، کە جگە لە مێشولەی هاوینان و قوڕ و چلپاو یان بەفر و سەهۆڵبەندانی زستانان ، هیچی تری تیا دەست نەکەوتوە، بە دەگمەن نەبێ شەڕی تیا نەکراوە.

## فاکتەرە دەرەکیەکانی یارمەتیدەری شەڕی براکوژی.

### ا- ڕژێمی بەعسی فاشی عیراقی.

ا- ناردنی پیاوی خۆیان لە کوردە خۆفرۆشەکانی ناو موخابەرات وئیستخبارات و ئەمن بۆ ناو یەکێك لە حزبەکان وهاندانی بۆ فرسەت هێنان و کوشتنی فەرماندەیەکی پێشمەرگەی لایەکی تر بۆ هەڵگیرساندنی ئاگری شەڕی نێوانیان..

ب- دامەزراندنی بنکەی دانوستاندن هەرجارە لەگەڵ یەکێك لە حزبەکان بۆ زیاتر هاندانی حزبەکانی تر لەلایەنی دانوستاندنەکە.

ج- چاوپۆشینی حکومەت لە لایەنگری جاشە دڕەکانی خۆی بۆ یەکێك لە حزبەکان و لێدان و دژایەتیکردنی حزبێکی تری ناو شۆڕش . نموونەی خۆفرۆشان و چڵکاوخۆران (قالە فەرەج ، تەحسین شاوەیس ، سالە خەیات ، هەباسی بایزی بالواغا، حەمەی مەلا شەریف ، عەبدولمەلیك عەلی عوسمان ، ئەنوەر بەگی بێتواتە ،قاسم ئاغا) و دەیانی تری لەو بابەتانە ، کە هەر یەکەیان لە(٥٠) چەکدارەوە تا(٥٠٠)چەکدار و بگرە زیاتریشیان لەگەڵ بووە و دەستیان بە خوێنی دەیان کادر و سەرکردە و سەدان پێشمەرگەی یەکێتی و حسك و شیوعی سوربووە. بەڵام ئەندام و جێی باوەڕی پارتی دیموکراتی کوردستان بوون و،...*ڕۆژی ٣١ی ئابی ساڵی ١٩٩٦باشترین بەڵگەی ڕۆڵی ڕژێمی عیراقییە بۆ خۆشکردنی شەڕی ناوخۆ و یارمەتیدانی پارتی بۆ لێدانی یەکێتی ، و لە بەرامبەردا هەڵکردنی ئاڵای عیراقی و ڕەسمی سەدام حسین لەناو پەرلەمانی کوردستانی تەسلیم کراو بە ڕژێم. دوژمنان هەمیشە گەر بۆیان نەکرا بێ لایەنەکانی ناو بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستان لەناو بەرن واتە (تصفیەی جسدیان) بکەن هەوڵیانداوە (تصفیەی سیاسی یا ئیعدامی سیاسیان بکەن) واتە تاوانە مێژووییە سیاسیە ڕەوشتیەکەی٣١ی ئاب ، وەك تاوانەکانی تری ساڵانی (١٩٦٩،١٩٦٦،١٩٦٤،١٩٦٣)..

و لە سەرەتای شۆڕشی نوێوە بە فەرمانی پارتی چوونەتە پاڵ ڕژێمی بەعسیەکان و بوونە سەرۆك جاش و هێزی تایبەت و کەوتونەتە ڕاگوازتنی دێهاتەکان و تاڵانکردن و سوتاندنی ناوچە قەدەغەکراوەکان و ڕاوە پێشمەرگە و کادر و پاشان بەشداری کردن لە ئەنفالەکان و وەرگرتنی مەدالیای خۆفرۆشی لە سەدام و لە پاش ڕاپەڕینیش لێپرسراو ودەسەڵاتداری ناو پارتی ئەوانەی کە مان تا ڕاپەڕین.

## ٢- ڕۆڵی ڕژێمی ڕەگەزپەرستی عەسکەرتاری تورکیا.

ئەم ڕژێمەش دەستێکی بالای هەبوو، لە خۆشکردنی ئاگری ناکۆکی نێوان پارتی و یەکێتی، لە سەرەتای هەڵگیرسانی شۆڕشی نوێ ، کە دەستە گوڵی تاوانەکەی کارەساتی هەکاری بوو ، پێویست بە باسکردنی ناکات ، لەبەر ئەوەی لە پێشەوە بە

درێژی باسکراوە . ئەم ڕژێمەش ، تا ئێستاش (٢٠٠٨)ە ، جێگورکە بە پشتیوانی خۆی بۆ لایەنێك ودژایەتی لایەنێکی تری کوردی دەکا، بۆ لەباربردنی هەوڵەکانی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد لە بە دەستهێنانی مافی چارەنوسی خۆیدا.

**٣- ڕۆڵی ڕژێمی ئێرانی سەردەمی شا و سەردەمی کۆماری ئیسلامی.**

ا- ڕۆڵیان لە شەڕی نێوان جەلالی ومەلایی لە ١٩٦٤ تا ١٩٧٠.

ب- ڕۆڵیان لە ڕوودانی ڕووداوی ئاشبەتاڵ و ئەو کارەساتە مێژووییە گەورەیە.

ج- ڕۆڵیان لە شەڕی نێوان پارتی(قیادە موەقەت) وحزبی دیموکرات و کۆمەڵە.

د- ڕۆڵیان لە شەڕی نێوان بەرەی جود و یەکێتی لە١٩٨١ تا ١٩٨٦.

هـ- ڕۆڵیان لە شەڕەکانی نێوان یەکێتی و حیزبە ئیسلامییەکان ، شەڕەکانی نێوان پارتی ویەکێتی لە١٩٩٤ تا ١٩٩٨.

## پانۆرامای ڕێکەوتنەکان.

پاش ڕەخسانی هەلومەرجەکانی ئاشتبوونەوەی گشتی ، کە بەهێزترینیان دەست پێکردنی گفتوگۆی نێوان یەکێتی وکۆماری ئیسلامی ئێران بوو، بە دەستپێشکەری و هاوکاری حسك ، ئیتر دەرگای گفتوگۆ وئاشتبوونەوەی براکان بە ڕووی یەکتردا کرایەوە. هەر بۆیە پانۆراماکە لەو هەوڵە گرنگ و ئازایانەی حسکەوە دەست پێدەکەین.

- لە ڕۆژی (١٨/٤/١٩٨٦)پاش چەند هاتوچۆیەکی تاکی ( حەمەی حاجی مەحمود و شێخ محەمەدشاکەلی و وەفدێکی حسك ( قادر جەباری ، شیخ محەمەد شاکەڵی ، حەمە ڕەحیم- خاڵە حاجی) چوونە یاخسەمەڕ و بۆ ماوەی ٦ڕۆژ تا ٢٤/٤/١٩٨٦ گفتوگۆیان لەگەڵ نوێنەرانی یەکێتی کرد و ڕێکەوتننامەیەکی دوو قۆڵیان مۆرکرد کە:

**یەكێتی**:بەشێكی داهاتی گومرگی ناوچەكە بۆ پێویستیەكانی حسك تەرخان بكات. لە رۆژی (١٠/٥/١٩٨٦) وەفدێكی پاسۆك (مولازم كەریم سەلام ، شەماڵ ، بێستون) هاتنە یاخسەمەڕ و تا(١٢/٥/١٩٨٦) لە بارەگای(م.س) یەكێتی مانەوەو لەو ٣ رۆژە گەیشتنە رێكەوتننامەیەك كە ناوەرۆكی بەیان ئیمزا كراوەكە تا رادەیەك هەمان خاڵەكانی ناوەرۆكی رێكەوتنەكەی نێوان حسك و یەكێتی بوو.*

لە رۆژانی (٧-٨/١١/١٩٨٦)پاش رێكەوتنی یەكێتی و كۆماری ئیسلامی بە بوونی مام جەلال لە تاران و بە بڕیار و هەوڵ وفەرمانی كۆماری ئیسلامی رێكەوتننامەی نێوان یەكێتی و پارتی لەلایەن مام جەلال وئیدریس بارزانی ئیمزا كرا.

**حزبی شیوعی**:لە رۆژی (١٥/١١/١٩٨٦) پاش رێكەوتنی یەكێتی و پارتی ئەمانیش ئەو رێكوتننامەیەی نێوان خۆیان و یەكێتی كە لە مانگی٦/١٩٨٦دا ئیمزای (مەلا ئەحمەدی بانی خێلانی و "م.س" یەكێتی) بلاوكردەوە . بەم جۆرە هەر پێنج لایەنە كوردیەكانی خواروی كوردستان، دەرگایان لەسەر شەڕی ناوخۆ و براكوژی داخست ، بەڵام بەم رێكەوتنە دوو قۆڵیانە دەرگای بەرەیەكی كوردستانی وپێنج قۆڵی خستە سەرپشت.

### ١٠-٥. بەرەی كوردستانی.

لە دوای ٢٢ ساڵ ناكۆكی وململانێ ، گرژبوون و خاوبونەوە و گرژبوون ، دوای چەندین زیانی گەورەی گیانی لە رۆڵە بە وەفا و تێكۆشەرەكانی كورد لە مەیدانی شەڕی براكوژی ، دوای لە دەستچوونی چەندین بارودۆخی گونجاو و هەلی هەڵكەوتو،

* پاسۆك: لە رۆژی٢٧/٨/١٩٨٢ لە گەرمەی شەڕی نێوان یەكێتی و جود و مقۆمقۆی رێكەوتنی یەكێتی و رژێمی عیراقی پرۆژەی رێكەوتن و دروستكردنی بەرەیەكی پێنج قۆڵی ، واتە جود و یەكێتی دا بەلایەنەكانی جود، بەڵام نە پارتی ونە شیوعی ونە حسك پەسەندیان نەكرد.

بۆ نزیککردنەوەی ڕێگای دوور، دوای چەندین ساڵ سوار بوونی ئەسپی دڵڕەقی تۆڵە وتۆڵە سەندنەوە و گوێ کەڕکردن  لە ئاستی بانگ و هاواری عەقل و لۆژیك، دوای بە فیڕۆدانی  ووزە و توانایەکی لە ڕادەبەدەری جەماوەری کوردستان بۆ ماوەی نزیکەی چارەکە سەدەیەك . دوای ناچاربوون و هاتنە پێشەوەی شەقی زەمانە و چۆك دادان ، بە هەموو لایەنەکان لە بەردەم زەبری شەقی زەمانەدا ، بەرەی کوردستانی لە پارتی سۆسیالیستی کورد(پاسۆك) و پارتی سۆسیالیستی کوردستان(حسك) و پارتی دیموکراتی گەلی کوردستان  و پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە(١٩٨٨/٥/٢)دا بە بەیانێك ڕاگەیەندرا .

هەر لە ناوەڕاستی ساڵی(١٩٨٦)وە ، یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان ، کەوتە هەوڵ و تەقەلای چڕ، بۆ خۆشکردنی زەمینەی ئاشتبونەوەی گشتی . لە هەموو کۆبونەوە دوو قۆڵیەکان و بەیاننامەی ڕێکەوتنەکان ئەم خاڵانەی تیا بەدی ئەکرا:

١- سوربونی هەموو لایەك لەسەر ئاشتبوونەوەی گشتی.

٢- بڕوای هەموو لایەنەکان بە دروشمی مافی چارەی خۆنوسین.

٣- ڕابەرایەتیکردنی خەباتی گەلی کورد لە کوردستاندا ؛ لەلایەن  بەرەیەکی کوردستانیەوە.

٤- پێویستی بوونی بەرەیەکی کوردستانی کە هەموو لایەنە کوردستانیەکان لە چوارچێوەی خۆیدا کۆکاتەوە و بێ گوێدانە گەورەیی و بچوکی ئەم حزب و ئەو حزب و سەلماندنی یەکتری و ڕێز لە بیروڕای یەکتری گرتن. دوای ئەو ڕێکەوتننامانەی نێوان یەکێتی و یەکەیەکەی حزبە کوردستانیەکان، مام جەلال سکرتێری گشتی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە ڕۆژی(١٩٨٧/٤/٢٢)ئەم نامەیەی ئاڕاستەی هەموو حزبە کوردستانیەکان کرد، پاش پرس و ڕا بە (م.س) کە زۆربەیان ئەندامانی سەرکردایەتی کۆمەڵە بوون.

**ئەمەش دەقی بروسکەی بەرێز مام جەلالە، بۆ هەموو لایەنە سیاسیەکانی بەرەی کوردستانی.**

**بروســــــــــــــکە.**

**برای هێژا کاك مەسعودبارزانی**

**برای هێژا کاك ڕەسول مامەند**

**برای هێژا کاك ئازادمستەفا**

**برای هێژا کاك سامی**

**سلاوێکی شۆڕشگێڕانەی گەرم: پێشنیار دەکەم ، ئاشتبوونەوەی نیشتمانیمان گەشە پێ بدەین و بیگەیەنینە ئاستی دامەزراندنی (بەرەی کوردستانی) بۆ ئەوەی ئەم بەرەیە ڕێبەرایەتی خەبات و شۆڕشی کوردمان بکا و ببێتە نموونەیەکی بەرچاویش بۆ دامەزراندنی بەرەی عیراقی فراوان . پێشنیار دەکەم نوێنەرانمان دەستبەجێ بە ئامادەبوونی نوێنەرێکی حزبی شیوعی عیراقی تێکۆشەر بۆ داڕشتنی پرۆگرام پەیڕەوی ناوخۆی بەرەی کوردستانی دەست بە کۆبوونەوەو ووتووێژ بکەن. پێشم باشە کۆبونەوەکان لە ناوچە ڕزگارکراوەکانی کوردستان ببەستریَ . ئێمە لە باری خۆمانەوە بەو پەڕی شانازی ئامادەین پێشوازی ومیوانداری کۆبونەوەکان بکەین ، هەروەها ئامادەین بۆ هەر شوێنێکی لە باری دیکە کە ئێوە پێشنیاری دەکەن.**

**قۆناغی گرنگی ئەمڕۆی شۆڕش ڕزگاریمان ، پێویستی بە هەرچی زووتر دامەزراندنی بەرەی کوردستانیە ...ئەو بەرەیەی کە دەبێتە ڕێگە خۆشکەری خەباتی هاوبەشمان لە پێناو هێنانەدی بەرەی نیشتمانی عیراقی فراوان.**

**چاوەڕێــــــــی وەلامــــــی ئیجابیتانـــــم**

**ڕێــــــــــزوســــــــــــلاو**

**دڵسۆزتان**

**مام جەلال**

هـەر چـوار لایەنە پێـشنیارپێ کراوەکـان دەم و دەسـت پێـشنیارەکەی هـەڤاڵ (مـام جـەلال )یـان قۆسـتەوە و پـشتگیری و پـشتیوانی خۆیـان بـۆ دەربـڕی و ئەمانـەش وەڵامەکانیانە.*

لە مەسعود بارزانیەوە.

برای بەڕێزمام جەلال

سلاوێکی شۆڕشگێڕانەی گەرم

پێشنیارەکەتان بۆ پێکهێنانی بەرەی کوردستانی پێویستیەکی گرنگ و پەسەندە. چونکە گەلەکەمان بە قۆناغێکی مێژوویی ترسناکدا تێدەپەڕێ ، خەباتمان لە بەرەی کوردستانیدا زامنێکی گرنگە بۆ هەڵوەشانەوەی پیلانەکانی دوژمن ، سەرکردایەتی حزب لە پێشنیارەکەتان دەکۆڵێتەوە لە پێناو ڕێ خۆشکردنی پێکهێنانی ئەو بەرەیە.

١٩٨٧/٤/٣٠

---

* ١- ئەم نامانە هەموویان لە (کورتە باسێکی – بەرەی کوردستانی) نوسینی ئازاد مستەفا، چاپی سوید، چاپخانەی شەهید فەرهاد، ساڵی ١٩٨٨، لاپەڕە،٨٧.وەرگیراون.

٢- دەقی ئەم نامانە هەموویان لە گۆڤاری ڕێبازی نوێ ژمارە(٥)مایسی ساڵی ١٩٨٧دا ، بلاوکراونەتەوە.

لە ڕەسول مامەندەوە.

**بۆ ئەمینداری گشتی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان هەڤاڵی هێژا مام جەلال.**

**سڵاوێکی شۆڕشگێڕانەی گەرم**

بە سوپاس و تەقدیری زۆرەوە پێشنیارەکەی ڕۆژی (١٩٨٧/٤/٢٢)ی ، بەڕێزتانمان وەرگرت کە ئاراستەی ئێمە ولایەنە کوردستانیەکانی ترتان کرد بوو، و تێیدا داواتان کردبوو. کە ئاشتبوونەوەی نیشتمانی لە کوردستاندا گەشە پێ بدەین و بیخەملێنین بە پێکهێنانی بەرەی کوردستانی ، بۆ ڕابەری کردنی شۆڕش و خەباتی گەلی کوردمان . و داوای وتووێژی دەستبەجێ تان کرد بوو ، بۆ هەمان مەبەست بە ئامادەبونی(حشع) . ئێمە ئەو هەڵوێستە شۆڕشگێڕانەی بەڕێزتان بە هەڵوێستێکی مەسئولانە دەزانین .و لە کاتێکی لە باردایە، جگە لەوەی تەعبیر لە ئارەزوی دێرینی خەڵکی کوردستان دەکا. وەڵامێکی شۆڕشگێڕانەی چەرگ بڕێنەرە بۆ فاشیەکانی بەغدا ، ئاواتە گڵاوەکانیان لەم کاتەدا دڕندەترین وچەپەڵترین هێرش وشاڵاوی ترسنۆکانە و نامرۆڤانەیان دەست داوەتێ بۆ قەلاچۆکردنی گەلی کورد و وێرانکردنی تەواوی ناوچەکانی کوردستان.هەنگاوێکی گرنگ و زەمینەیەکی باشیشە بۆ پەلەکردن لە پێکهێنانی بەرەی نیشتمانی عیراقی فراوان ، کە ووزە و توانای هەموو هێزە نیشتمانیە شۆڕشگێڕەکانی عیراق لە بەرنامەیەکدا بە خۆوە بگرێ. ئێمە ئامادەین لە هەر شوێنێك بێت ، دەست بە ووتو وێژ بکەین بۆ پێکهێنانی بەرەی کوردستانی هیوادارین بە جهودی هاوبەشی هەموو لایەك لەم پێناوەدا سەرکەوتوو بێت...

جارێکی تریش سوپاسی پێشنیارەکەی بەڕێزتان دەکەین و وەفدی مەکتەبی سیاسی حزبمان ئاگادار دەکەین ، کە ئەو پێشنیارانە وەك وەسیقەیەکی گرنگ لەبەر چاو بگرن لە کاتی ووتو وێژ وئامادەکردنی پرۆژەی بەرنامەی بەرەی کوردستانی.

ئیتر هەر بژین بۆ خزمەتی کێشەی ڕەوای گەلەکەمان.

سکرتێری حزبی سۆسیالیستی کوردستان عیراق

١٩٨٧/٤/٢٦

لە ئازاد مستەفاوە.

برا و هەڤاڵی هێژامان مام جەلال- ی بەڕێز

سلاوی ئازادی و یەکسانی

پێشنیارە مێژووییە دڵسۆزانەکەی (١٩٨٧/٤/٢٢)تان لەمەر(بەرەی کوردستانی) بە خۆشی و گرنگیەوە وەرگرت.بە هەموو کوڵ و دڵێکمانەوە بەوپەڕی ئامادەگی و بە سەر و ماڵ و ئەوەی هەمانە و نیمانە ئامادەین ، بەوەی پیمان بکرێ ، بەشداری ئەو هەوڵ و هەنگاوە مەزنەی پێشنیارتان کردوە بکەین و لە ئێستاوە ئێمە ئامادەین و چاوەڕێی فەرمانی بەڕێزتان و براو هاوپەیمانە دڵسۆزە شۆڕشگێڕە کوردستانیەکانی دیکە مانین ئێمەش پێمان باشە ئەو پێکگەیشتن و کۆبونەوە و هەنگاوانە لە ئامێزی وولاتەکەمان و لەسەر بستوە خاکی بە خوێن ڕزگارکراوی کوردستانە خۆشەویستەکەمان بێت و تا سەر ئێسك ومۆخ کوردستانی بێ.

بە ڕاستی بەرەی یەکگرتوی کوردستانی ، کە تەنیا دەرفەت و زەمینەیەکی پتەو وڕەسەنی بەرچا و ڕونی عیراقیشە ئەو چوارچێوەیە کە مانا و گوڕ وتین وناوەڕۆك بە پێکهاتنە گشتیە مێژووییەکە دەبەخشێ و وزەکان یەکدەخا لە جەنگی مان ونەمان ودیاریکردنی مافی چارەنوسی نەتەوەکەمان.بە هیوای هەلاتنی گزنگی خۆرەتاوی ئازادی و سەربەخۆیی وسەرفرازی نەتەوەکەمان کە لە ئاسۆگەی (بەرەی کوردستانی)یەوە ،دەیبینین.

حورمەت و ڕێزمان قبوڵ بفەرمون و هەر بژین بۆ کورد.

لە بری مەکتەبی سیاسی پاسۆك

برای دڵسۆزتان / ئازادمستەفا

١٩٨٧ /٤/٢٤

**له مەکتەبی سیاسی حزبی دیموکراتی گەلی کوردستانەوە**

**بۆ برای تێکۆشەر مام جەلال**

**سڵاوی خەباتی و برایەتی و شۆڕش و تێکۆشان.**

گەشەپێدانی ئاشتبوونەوەی گشتی بەرەو پێکهێنانی بەرەی کوردستانی بۆ سەرکردایەتی کردنی شۆڕشی گەلی کوردمان پێشنیارێکی گرنگ و بایەخدارە.

پێمانخۆشە نوێنەری هەموو حزبەکان کە لە بروسکەکە ناویان هاتوە بەردەوام یەکتربببینین و کۆبونەوە بکەن ، بۆ دانانی پەیڕە و پرۆگرامی ناوخۆی بەرەی کوردستانی و لێکۆڵینەوە لە هەموو لایەنەکانی ئەو پرۆژە گرنگە بەرەی کوردستانی مافێکی ڕەوای گەلە تێکۆشەر و چەوساوەکەمانە و دەبێتە بناغەی بەرەی عیراقی فراوان و سەرچاوەی بەهێزکردنی پەیوەندی هاوخەباتی لەگەڵ هێزو بزووتنەوە ڕزگاریخوازەکانی گەلانی ناوچەکە بە خۆشحاڵیەوە پەسەندی میوانداریتان بۆ بەستنی کۆبونەوەکان دەکەین ، یان لەهەر شوێنێکی تر کە بە باش دەزانرێت.

**لەگەڵ ڕێز و سڵاوماندا**

دوای چـەندین کۆبونـەوەی نوێنـەرەکانی حزبـەکان و ڕێکخراوەکـان و پـاش لێکۆڵینـەوە و گفتوگـۆی تێروتەسـەلی نێـوان هـەموو لایەنـەکان و ڕێکـەوتن (لەسـەر پێـشەکی ودیباجـە و دروشـم و ڕوونکردنـەوەی کێـشەی کـورد و هەڵسەنگاندنی شـەڕی ئیران –عیراق  و شـەڕی عیراق و کورد و چوارچێوەی کەمایـەتی نەتـەوەیی و هێـزی چـەکدار و ئـابوری نیـشتمانی و چارەسـەری کێشەی زەوی  ومەسەلەی نەوت و کانزاکانی کوردستان و سیاسەتی عەرەبی و کێشەی فەلەستین و سیاسەتی دەرەوە) وەك پرۆگرام. و
لەسەر پەیڕەوی ناوخۆی بەرەش(سەرکردایەتی سیاسی، مەکتـەبی تـەنفیزی، ئەنجومـەنی نیـشتمانی کوردسـتانی، دەزگـای پەیوەنـدی گـشتی، دەزگـای ڕاگەیانـدنی بـەرە، دەزگـای کاروبـاری ئیـداری و کۆمەلآیـەتی  ودادوەری ، دەزگـای کاروبـاری ئـاینی، دەزگـای دارایـی، دەزگـای ڕێکخـراوە پیـشەیی و دیموکراتیەکان ).دارێژرا.

## ڕاگەیاندنی ڕەسمی بەرەی کوردستانی.

ڕۆژی ١٩٨٨/٥/٢ کۆبونەوەیەکی فراوان بە بەشداری ئەم لایەنانـەی خـوارەوە سازکرا، بە مەبەستی بە ڕەسمی ڕاگەیاندنی بەرەی کوردستانی.

**نـــــاوی لایـــەنـەکـــــان:**

١- پارتی سۆسیالیستی کورد (پاسۆك)
٢- پارتی گەلی دیموکراتی کوردستان (پارتی گەل)
٣- پاڕتی سۆسالیستی کوردستان- عیراق (حسك)
٤-حزبی شیوعی عیراق- لقی کوردستان.
٥- پارتی دیموکراتی کوردستان- عیراق (پارتی)
٦- یەکێتیی نیشتمانی کوردستان– (ی.ن.ك).

بەڵام لایەنەکانی بەرەی کوردستانی ، دەرگای بەشداریکردنی لایەنی تری کوردستانیان بە کراوەیی هێشتەوە، تا لە رۆژی١/١١/١٩٩٠دا ئەم دوو حزب وبزووتنەوەیەش بوونە ئەندامی بەرەی کوردستانی.

٧- پارتی زەحمەتکێشانی کوردستان.

٨- بزووتنەوەی دیموکراتی ئاشوری.

دوای مۆرکردنی پەیمانی بەرەی کوردستانی و پەیڕوی ناوخۆی ، هەر یەك لە لایەنەکانی بەرەکە، لەم نامیلکەیەدا هەموو بەند و خاڵەکانیان چاپکرد. یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە نامیلکەیەدا بە کوردی وعەرەبی چاپی کرد.

کە ناوەرۆکەکەی بەم شێوەیەی خوارەوە بوو.

## ميثاق الجبهة الكردستانية العراقية

النظام الداخلى للجبهة الكردستانية.



له٢٠٠٨/٣/١٦

## سەرچاوەکان:


١- برایم جەلال، خوارووی کوردستان و شۆرشی ئەیلول،چاپی سێیەم، سلێمانی ،١٩٩٩.

٢- برایم جەلال، فەرهەنگی سیاسی،١٩٨٤،

٣- برایم جەلال، ماکسیزم – لینینیزم،بە زمانی سادە،١٩٨٣.

٤- برایم جەلال، کادر کێیە و چۆن پەروەردە دەکرێ؟،١٩٨٥.

٥- برایم جەلال، کۆمەڵەی رەنجدەران بۆ کوردستانیە،١٩٨٤.

٦- ئاوات قارەمانی، رێگا باریکەکان،٢٠٠٦.

٧- شەهید رێباز، قەندیل بەغدای هەژاند،بەشی دووەم، نیسانی ١٩٩٥.

٨- الاتحاد الوطني الكردستاني لماذا، تشرين الثاني ١٩٧٥.

٩- کۆمەڵەی مارکسی– لینینی، رەخنە ورەخنە لە خۆگرتن، ١٩٧٧.

١٠- کۆمەڵەی مارکسی لینینی کوردستان ، مەسەلەی نەتەوایەتی، زنجیرە ١، ١٩٧٧.

١١- کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان، پێویستی بوونی رێکخراوی تایبەتی چینی کرێکار و رەنجدەرانی کوردستان، مانگی کانونی دووەمی ١٩٧٩.

١٢- کۆمەڵە"بلاوکراوە"، ئۆرگانی ناوەندی کۆمەڵەی رەنجدەران،هاوینی ١٩٨٠.

١٣- من وثائق الجبهة الوطنية و القومية الديمقراطية في العراق"بلاوکراوە"، کانونی أول ١٩٨٠.

١٤- بیرەوەری ١١ ساڵەی کۆمەڵە، حوزەیرانی ١٩٨١.

١٥- حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، خیانەتەکانی قیادەی موقت،١٩٨١/٩/١٦.

١٦- دەزگای لێکۆلینەوەی ناوەندی کۆمەڵە، پارتی پێشرەوی چینی کرێکارانی کوردستان، ١٩٨١/١٢/١.

١٧- رێکخراوی سلێمانی _کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان، چەند سەرنجێکی رەخنەگرانە، زنجیرە حەوت، ١٩٨٢.
١٨- کۆمەڵە"گۆڤار"، ژمارە ٢، خولی ٢، شوباتی ١٩٨٢.
١٩- کۆمەڵە " گۆڤار"، ژمارە ٣، خولی ٢، ئاداری ١٩٨٢.
٢٠ - بەرنامەی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی،پەسندکراوی کۆنفرانسی دووی کۆمەڵە، مانگی ئابی ١٩٨٢.
٢١- بەرنامەی چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوایەتی، پەسندکراوی دووی کۆمەڵە، مانگی ئاب ١٩٨٢.
٢٢- کۆمەڵە " گۆڤار"، ژمارە ١، خولی ٢، کانونی دووەمی ١٩٨٢.
٢٣- کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان، عراقچێتی داگیرکەر و بورجوازی کوردستان- کوردستانی بوونی کرێکارن ورەنجدەرانی کوردستان، یسانی ١٩٨٣.
٢٤- کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان، یادی ١٣ ساڵەی لە دایکبونی کۆمەڵە، ١٩٨٣/٦/١٠.
٢٥- رەوا، ناسیۆنالیزم وئەنتەرناسیۆنالیزم ل مەسەلەی رزگاری نیشتمانیدا، کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان،ئایاری ١٩٨٤.
٢٦- کۆمەلەی رەنجدەرانی کوردستان،یادی ١٤ ساڵەی دامەزراندنی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان، ١٩٨٤/٦/١٠.
٢٧- عصبة شغيلة كردستان"کۆمەڵە"، لم يعد الصمت ممكناً،نيسان ١٩٨٥.
٢٨- دەستەیەك رۆشنبیری کورد لە دەرەوەی وولات، ئاشتبوونەوەی گشتی و سەرکردایەتی کۆمەڵە ، مفاوەزات،ژمارە ٢، سێبتەمبەری ١٩٨٤.
٢٩- کۆمەڵە " گۆڤار"،ژمارە ٤، خولی ٣، نیسانی ١٩٨٤.
٣٠- کۆمەڵەی رەنجدرانی کوردستان، بیرەوەری ١٥ ساڵەی دامەزراندنی کۆمەڵەی رەنجدەرای کوردسان، ١٩٨٥/٦/١٠.
٣١- کۆمەڵە" گۆڤار"، ژمارە ٦، خولی ٣، حوزەیرانی ١٩٨٥.
٣٢- کۆمەڵە "گۆڤار"، ژمارە ٧ ، خولی ٣، تیممووزی ١٩٨٥.

٣٣- كۆمەڵە " گۆڤار" ژمارە ٨، خولی ٣، ئەیلولی ١٩٨٥.پاشکۆ.
٣٤- كۆمەڵە " گۆڤار"، ژمارە ٨، خولی ٣، ئەیلولی ١٩٨٥.
٣٥- كۆمەڵە"گۆڤار"، ژمارە ١٠، خولی ٣، کانونی دووەم ١٩٨٦ .
٣٦- الجبهة الكردستانية العراقية_ ميثاق الجبهة ونظانها الداخلي،من منشورات الاتحاد الوطني الكردستاني،١٩٨٨.
٣٧- عزيز شريف، المسألة الكردية في العراق، طبعة الثانية، ١٩٨٧.
٣٨- راپۆرتێکی ، ئەنگیلیکا یـیر نوێنـەری سـەوزەکان لـە پەرلـەمانی ئـەلمانیا، بەناوی "چەکی کیمیاوی- راگواستنی زۆرەملیّ- گرتن و کوشتن"،سالی ١٩٨٩ لە لایەن کۆمیتەی ڕێکخستنی کوردستان لە شاری بەرلین وەرگێردراوەتە سەر زمانی کوردی و چاپکراوە.
٣٩ - ئازاد، راپـەرین و دبلۆماسـیەتی گفتوگـۆ، مەلبەنـدی ڕێکخـستنی سـلێمانی "ی.ن.ک"،١٥/ئابی/١٩٩١.
٤٠- عباس البدري،يوميات الانتفاظة .
٤١ - شـورا"رۆژنامـە"،راپۆرتـە هـەوالێکی رۆژانـەی راپەرینـە لەلایـەن بزوتنـەوەی شورایی ئامادەکراوە،١٤/٦/١٩٩١.
٤٢- مقابلة مسعود البارزاني من قبل صحيفة النداء اللبنانية،كانوني أول ١٩٨٨.
٤٣- ئالای شۆرش "رۆژنامە"، ژمارە ١،ئەیلولی ١٩٧٧.
٤٤- مەحمود سەنگاوی،بیرەوەری سەنگاوی،چاپی یەکەم ،سلێمانی - ٢٠٠٦.
٤٥- حەمـەی حـاجی مـەحمود، رۆژژمێـری پێـشمەرگەیەك،بەرگی یەکەم،سـلێمانی ،٢٠٠٥.
٤٦- حەمەی حاجی مەحمود،رۆژژمێری پێشمەرگەیەك، بەرگی دووەم،
٤٧- صلاح خرسان،التيارات السياسيه في كردستان العراق.
٤٨- نەوشیروان مستەفا، لە کەناری دانوبەوە بۆ خری ناوزەنگ،١٩٩٨.
٤٩- نەوشیروان مستەفا، پەنجەکانی یەکتری ئەشکێنن، ١٩٩٨.
٥٠- نەوشیروان مستەفا، خولانەوە ە بازنەدا، ١٩٩٨.

٥١- ئازاد مستەفا، كورتە باسێكی بەرەی كوردستانی.
٥٢- سیاسەتی بە عەرەبكردن لە كەركوك،كۆمەڵەی رەنجدەرانی كوردستان.
٥٣- مەلا بەختیار- حكمت محمد كریم، شۆرشی كودستان و گۆرانكارییەكانی سەردەم،١٩٩٢.
٥٤- ئازاد خانەقینی، مادینا،٢٠٠١.
٥٥- بەهرۆز گەلالی، كوردایەتی وهەلوێست، بەرگ یەكەم ،
٥٦-بەهرۆز گەڵی، كوردایەتیوهەلوێست ، بەرگی دووەم.
٥٧- كارەساتی مەنعی تجـولی سـلێمانی ١٩٨٥، لـە بلاْوكراوەكـانی گۆڤـاری سلێمانی.
٥٨- جلال الطالبانی، الغد دیمقراطی حرمان شعب من حق الحكم، من منشورات الاتحاد الوطن الكردستانی.
٥٩- بەهرۆز گەلاْلی، رەسول مامەند،٥٠ ساڵ تەمەن و ٣٣ ساڵ خەبات.
٦٠- رێوار صالح"مێرگەسۆری"، رێگایەك بۆ ئازادی،سلێمانی،٢٠٠٦.
٦١- سەروەر عەبدولرەحمان،"ی.ن.ك" دامەزراندن ودەستپێكردەوەی شۆرش،سلێمانی، ٢٠٠٤.
٦٢- شورش حسن عمر، حقوق الشعب الكردی فی دساتیر العراقیه.
٦٣- سامی عبدالرحمن، جولة فی الارض المحروقة.
٦٤- شێخ جەمال یْخ نوری، فاكتەرە دەرەكی وناوخۆییەكانی سەرنەكەوتنی بزوتنەوەی كورد.
٦٥- تالیب مۆریاسی، گەران بەدوای راستیدا.
٦٦- دیدار جلال طالبانی، دبیر كل أتحادیه كیهنی كوردستان،وفا كرمانشائی.
٦٧ - ئا/محەمەد شێخ عبدالكریم سۆلەیی، شەهیدمامۆستا عەزیز.
٦٨- فاتح رسول، چەند لاپەرەیەك لە مێژووی خەباتی گەلی كورد، بەرگی یەكەم.
٦٩- فاتح رسول، چەند لاپەرەیەك لە مێژووی خەباتی گەلی كورد،بەرگی دووەم.
٧٠- فاتح رسول، چەند لاپەرەیەك لە مێژووی خەباتی گەلی كورد،بەرگی سێیەم.

٧١- ئا/محەمەد شێخ عبدالكريم سۆلەیی،شەهید مامۆستا جەمال تایەر.
٧٢- ئا/محەمەد شێخ عبدالكريم سۆلەیی، شەهید ئارام و بزوتنەوەی شۆرشگێری کورد،بەرگی یەکەم.
٧٣- ئا/محەمەد شێخ عبدالكريم سۆلەیی، شەهید ئارام و بزوتنەوەی شۆرشگێری کورد،بەرگی دووەم.
٧٤- سیمینارێك لەسەر دانوساندن،برایم جەلال، ئەلمانیا- نۆرمبێرگ.
٧٥- برایم جەلال، رۆژژمێری سالآنە.
٧٦- حبيب محمد كريم، تاريخ الحزب الديمقراطی -العراق،١٩٤٦- ١٩٩٣.
٧٧- شێخ جەمال شێخ نوری، بیرەوەرییەکانی لە رێکخستنەکان کۆمەڵەدا.

# برایم جەلال مەجید.

- لە ١٩٤٣/١١/٢٥ دا لە شاری سلێمانی لە گەڕەکی سەرشەقام – دەرگەزێڕ ،لە دایك بوم.باوکم هەر لە هەمان گەڕەك لە دایك بووە. باوکم کوری مەجید کوری هاواری کوری ئیبراهیمە.لە بنەچەدا خەڵکی شاری ماردین"ی، ژووری کوردستانە و لە پەنجایەکانی سەدەی نۆزدە روویان کردۆتە خواروی کوردستان و لە شارۆچکەی"پردێ" نیشتەجێ بوون.مەجید هاوار لە ساڵی ١٨٧٧ لە پردێ لە دایك بووە و لە ساڵی ١٩٠٢ لە سلێمانی نیشتەجێ بووەو هەر لەوێش لە تایفەی شێرگەرەکان ژنی هێناوە.

- دایکم لە شارۆچکەی بازیان لە دایك بووە و لە عەشیرەتی هەمەوەندە.

- لە ساڵی ١٩٤٧ باوکم بە ماڵەوە چۆتە شاری رانیە و لەوێ دوکانی داناوە و سەرقاڵی کرین و فرۆشتنی خوری و مازوو و لۆکە و کەتیرە بووە.

- خوێندنی سەرەتاییم لە ساڵی ١٩٥٦ دا لە شاری رانیە تەواو کردووە،لەبەر نەبوونی قوتابخانەی ناوەندی لە رانیە بۆ خوێندن چوومەتە سلێمانی و قۆناغی ناوەندیم لە قوتابخانەی ناوەندی بەر خانەقا تەواو کردووە و خوێندنی دواناوەندیم لە ئامادەیی سلێمانی لە ساڵی ١٩٦١– ١٩٦٢ تەواو کردووە.

- هەر لە ساڵی ١٩٥٨ وە، ئەندامی رێکخراوی یەکێتی قوتابیانی کوردستان بووم.

- لە ساڵی ١٩٦٢ دا، پەیوەندیم بە ریزەکانی شۆرشی ئەیلولەوە کردووە.

- لە ساڵی ١٩٦٤ کەتومەتە سەنگەری باڵێ مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان و چومەتە شاری هەمەدان.

- لە ساڵی ١٩٦٨ بە نامەیەك وازم لە ریزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان باڵی مەکتەبی سیاسی هێنا.

- لـه مـانگی ئـاداری سـاڵی ۱۹۷۰ لەسـەر داوای بـاڵی مـەلایی ،پـارتی دیموکراتی کوردستان، دورخراومەتەوە بۆ شاری بەسراو ماوەی ساڵێك و چوار مانگ لەویٚ ماومەتەوە.

- لـه مـانگی حـوزەیرانی سـاڵی ۱۹۷۰ بوومـه ئەنـدامێکی دیـاری کۆمەڵـەی مارکسی لینینی کوردستان– بیروباوەری ماوتسی تۆنگ.

- لـه ساڵی ۱۹۷۲ لەسـەر داوای کۆمەڵـه داوای گواستنەوەم کـرد بـۆ شـاری کـەرکوك و لـه مـانگی تـەمموزی ۱۹۷۰ کارمەنـدی بەڕێوەبەریـەتی تەقاعـدی کەرکوك بووم.

- لـه مـانگی ئـایاری ۱۹۷٤ یەکـەم ئەنـدامی کۆمەڵـه بـووم کـه لەلایـەن ڕژێمـی بەعسەوە گیراوم و ئازار و ئەشکەنجه درام.

- لـه مـانگی نیـسانی ۱۹۷٥ دا، پـاش ئاشـبەتال ڕێگـه نـەدرام لـه کـەرکوك بمێنمەوە، گوێزرامەوە بۆ شاری سلێمانی.

- له مـانگی حوزەیرانی ساڵی ۱۹۷٥ لـه کۆمیتـەی شـارەکان کـارمکردووە تـا مانگی تەمموزی ساڵی ۱۹۷۸ .

- لـه ۱۹۷۸/۷/۱۰ دا بـۆ جـارێکی تـر چـومه شـاخ، وەك ئەنـدامی ناوەنـدی کۆمەڵه لەناو یەکێتیی نیشتمانی کوردستان کارمکردووە.

- لـه سـاڵی ۱۹۷۸ و تـا سـاڵی ۱۹۸۷ لـه زۆربـەی دەزگایـەکانی یـەکێتیی نیشتمانی کوردستان کارمکردووە.

- لــه ڕۆژی ۱/٥/ ۱۹۸۷ دا لەســەر بڕیــاری ناوەنــدی کۆمەڵــه و مەکتــەبی سیاسـی یـەکێتیی نیشتمانیی کوردستان چومه ووڵاتـی ئـەلمانیا و لـەوێش دیسان وەك ئەندامێکی یەکێتی ئیشمکردووە.

- لــه ســاڵی ۱۹۹٤ دەســتم لــه هــەموو کــارێکی ڕێکخراوەیــی یــەکێتی کشاندۆتەوە، تەنها وەك ئەندامێکی ئاسایی حیزبی ماومەتەوە.

**بەرهەمە چاپکراوەکانی:**

١- کادر کێیە و چۆن پەروەردە دەکریێ؟.نامیلکەیەکی چەند لاپەرەییە و پاشان لە دەوری کادیران کرایە سەرچاوەیەك دەخوێنرا و خوالێخۆشبوو، د.خەسرە خالێ ئەو دەرسەی دەوتەوە.

٢- فەرهەنگی سیاسی.کۆمەڵە زاراوەیەکی سیاسی و مێژووییە و کە لە دوو بەرگ پێکهاتبوو، بەرگی یەکەم کە زیاتر لە (١٢٠) زاراوە پێکهاتبوو، لە ساڵی ١٩٨٤ چاپکراوە و بلاّوکراوەتەوە.بەرگی دووەم بەر لافاوی چاوچنۆکی ئاغای سەیدیان کەوت ، کە بریار بوو چاپی کات، نە چاپکرا و نە ئەو دەستنوسەشم دەسکەوتەوە.

٣- مارکسیزم - لینینیزم بە زمانی سادە. نامیلکەیەکی وەرگێردراوە لە زمانی فارسیەوە بۆ سەر زمانی کوردی.لە ساڵی ١٩٨٤ چاپکراوە.

٤- کۆمەڵەی رەنجدەران بۆ کوردستانیە؟ نامیلکەیەکی ٥٠ لاپەرەییە لە ساڵی ١٩٨٤ چاپکراوە و پاشان دووجاری تر چاپکرایەوە.

٥- خوارووی کوردستان و شۆرشی ئەیلول- بنیاتنان و هەڵتەکاندن. کتێبێکی ٤٠٠ لاپەرەییە ،لە بارەی شۆرشی ئەیلول لە نێوان (١٩٦١ تا ١٩٧٥).سێجار چاپکراوە.

چاپی یەکەم:وولاّتی ئەلمانیا - شاری بەرلین ساڵی ١٩٩٨.

چاپی دووەم: وولاّتی سوید .مانگی نیسانی ١٩٩٩.

چاپی سێ: کوردستان - شاری سلێمانی. مانگی تشرینی یەکەمی ١٩٩٩.

